د.عەلی وەردی



Ibn khaldoun (1406-1332)

# لۆژیکی ئیبن خەلدون

وەرگێرانی: مەشخەڵ کەولۆسی



دکتۆر عەلی وەردی

# لۆژیکی ئیبن خەلدون

وەرگێرانی: عەبدوڵڵا جەبار (مەشخەڵ کەوڵۆسی)

چاپی دووەم

٢٠١١

**لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

**زنجیرە: (٥٢)**

**ناسنامەی کتێب**

---

- **لۆژیکی ئیبن خەلدون**
- نوسینی: دکتۆر عەلی وەردی
- وەرگێڕانی: عەبدوڵلا جەبار (مەشخەڵ کەوڵۆسی)
- بابەت: لیکۆڵینەوە
- نەخشەسازی ناوەوە: هەرێم یاسین
- بەرگ: فواد کەوڵۆسی
- تیراژ: ١٠٠٠
- نۆبەت و سالی چاپ: دووەم ، ٢٠١١
- شوێنی چاپ: چاپخانەی کەنج

*ژمارەی سپاردن: (٤٢٥)ی ساڵی (٢٠٠٦)ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێدراوە.*

---

ناونیشان: سلێمانی ــ بازاڕی سلێمانی ــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)



# پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس بۆ خودا کەیارمەتی دام وتوانیم ئەم پەرتوکە فەشەنگەی مامۆستا (د.عەلی وەردی)بکەمە کوردی و پێشکەشی کتێبخانەی کوردی بکەم.ئەوەیشی کەلەم ڕووەوە زیاتر دڵخۆشم دەکات ئەوەیە کەئەمە سێ یەمین کتێبی (د. علی وەردی)یەکەبەندەشەرەفی وەرگێڕانیم پێبدەبڕێ.دیارە پێشتریش هەریەك لەپەرتوکەکانی (وعاظ السلاطین –واعیزەکانی سوڵتان) و (الاحلام بین العلم والعقیدة – خەونەکان لەنێوان زانست و بیرو باوەڕدا)م وەرگێڕاوەو بەوپێیە بەش بەحاڵی خۆم هەوڵم داوە ڕاژە بەهزر و فەرهەنگی کوردی بکەم.

وەلێ لێرەدا دەمەوێت ڕازێ بدرکێنم سەبارەت بەوەرگێڕانی پەرتوکی (مهزلة العقل البشری)کە ئێستاکە بەڕێزێك وەریگێڕاوە... دەڵێم: لەساڵی (٢٠٠٢)دا بەهاوبەشی لەگەڵ مامۆستای ڕۆژنامەنووس (کامیل مەحمود)دا، ئەو پەرتوکەمان کردە کوردیو مافی چاپکردن و بڵاوکردنەوەیمان بەخشیە ئەو بەڕێزانەی کەلە (خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما)کاریان دەکرد. کەچی ئەو بەڕێزانە بەهۆی هەندێ گیرو گرفتەوە نەیان توانی پەڕاوەکە چاپ بکەن، بۆیە لەسەر ڕەفەکان دایان نا... ئیدی تەپ وتۆزی لەسەر نیشت و پێڵوەکانی لێکنا و چووە خانەی فەرامۆش کردنەوە... من ئەوقسەیە تەنها وەك ڕازێك بۆ مێژوی ڕۆشنبیریمانی دەدرکێنم، دەنا ئێستا کە بەڕێزێکی تر ئەرکی وەرگێڕانی ئەو پەرتوکەی لە هەستۆ گرتووە، من بەر لە هەموان دەست خۆشی لێدەکەم. زۆریش سوپاسی دەکەم کەتوانیویەتی ئەو سەرمایە فیکریە گرنگە پێشکەشی میللەتەکەمان بکات. وەلێ ئەمەش ناکاتە ئەوەی کە ئیدی نەگاڵێنم بەسەر ئەو بەڕێزانەی چاپ خانەدا کە پەڕاوەکەیان تاساند و خەویان لێخست. بەڵکو بەمافی

خۆمی دەزانم ڕوی گلەیی و گازندە بکەمە برادەرانی چاپخانەو لەسۆنگەی دواکەوتنی چاپکردنی پەرتوکەکەمەوە بۆڵەبۆڵیان بەسەردا بکەم !!.

*** *** ***

بێگومان نوسینەکانی مامۆستا وەردی، نوسینگەلێ قوڵ وبابەتی و زانستین و مامۆستا خاوەنی قورسایيەکی زانستی و ناوبانگێکی ڕۆشنبیری گاڵتە پێنەکراوە. پێدەچێت پەرتوکەکانیشی لەڕیزی پێشەوەی ئەو پەرتوکانەدا بن کە پەڕاوگەی کوردی پێویستی پێیەتی... بەوبەڵگەیەی کە لەکاتی بەکوردی کرانی نوسینەکانی مامۆستادا هەرزوو بەزوو لە بازاڕەکاندا نامێنن و خوێنەری کوردی بە تاسەوە لە نامێزیان دەگرێ و خۆی سەرقاڵی خوێندنەوەیان دەکات. ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەونوسینانە سەرلەنوێ دید و بۆچون و تێگەشتن وقەناعەتەکانمان بەرانبەر بەکۆمەڵگا و بەرانبەر بە بەشەر، بەرانبەر دیاردەکانی ژیانی مرۆڤ و پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان بەشێوازێکی زانستی و بێلایەنانە و ڕەخنەگرانە فۆرمات دەکاتەوە !!.

بەخوێندنەوەی نوسینەکانی (د.عەلی وەردی)و لەمیانەشیاندا ئەم پەرتوکەی کە هەنوکە لەبەردەستدایە (لۆژیکی ئیبن خەلدون). هێدی هێدی تێدەگەین کە تێگەشتنی ئێمە لە زۆرینەی چەمك و موفرەدەکانی ژیان سەقەت و ناکام و زیادەڕۆیە. دەرك بەو ڕاستیيەش دەکەین کەهەقە تێگەشتنێکی تۆکمە ترمان هەبێت و پتر لەقوڵاییەکانی ژیاندا مەلان بکەین، وەك لەوەی لەڕۆخەکانی دا هەبلکورمێین و جاروبار بەردێ توڕبدەینە نێو قوڵایی زەریاکەوە. کەچی خۆشمان بەمەلەوانێکی بلیمەت لەقەڵەم بدەین و پۆزلێبدەین و کەپۆ لەبەرانبەر خەڵکیدا بەرز بکەینەوە و بێزمان نەیەت تێکەڵاوی بویەری ژیانیان بین!!.

*** *** ***

ئەگەر لەهەوڵەکەمدا سەرکەوتووبێتم، ئەوا هەوڵەکەم وەك دیاریەکی بچکۆلانە لێ قبوڵ بفەرموون. ئەگەر سەرکەوتوش نەبووم و لە ئاودا جووتم کردووە، هەڵە وناتەواویەکانم بە زمانێکی زانستی وسەردەمیانە بۆ ڕاست بکەنەوە، مەمنون دەبم !!. چونکە لای هەموان ڕوونە کە ئەم کارە پرۆژەیەکی ڕۆشنبیریە و دەچێتە نێو کەلتوری گەلی کوردەوە و دەبێتە موڵکی هەموومان نەك بەتەنها وەرگێڕی کتێبەکە. بابە هەمووشمان ڕێگەنەدەین هیچ پرۆژەیەکی سەقەت و ناکام بێت و خۆی بخزێنێتە نێو پانتایی کەلەپوری ڕۆشنبیریمانەوە ئیا لەم هەوڵەی منەوە دەست پێبکەین، ئەگەر هەر بەرهەمێکی سەقەتتان بینی پەنجەی بۆ ڕابکێشن و ماڵی قەڵبیش سەر بەخاوەنیەتی (وەك کورد دەڵێت)... چونکە بەداخەوە کۆمەڵێك خەڵکی فێربوون بەبێ گوێدانە هیچ بەهایەکی زانستی پەڕەکان ڕەش دەکەنەوە... !!.

سوپاس بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەتیانە قەڵەمی ڕەخنەکانیان لەئاقار ئەم پەرتوکەدا بادەدەن. نەك سەربێییانە و منداڵانە.

لەگەڵ هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو خوێنەرانی بەڕێزی ئەم کتێبە...

*عەبدوڵڵا جەبار شەمسەدین (مەشخەڵ کەوڵۆسی)*

*٢٠٠٦/٣/١٦ پێنج شەممە*

بۆهەر پرسیار و تەماسێکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ئێمەدا دەتوانن یەك لەم دوو ڕێگەیە هەڵبژێرن :

ئیمەیل: mashxalkaulusy@yahoo.com

تەلەفۆنی نۆرماڵ (٠٥٣٨٨٤٠١٦٧)

## (پێشەکی)

ئێمە ئاتاجمان نیە بەوەی (ابن خلدون)بناسێنین، چونکە ئەو لەوە بەناوبانگترە کە ئێمە مانان پێناسەیبکەین... ئەوبەیەکێك لەبیرمەندە هەرەگەورەکان دەژمێردرێت لەجیهاندا... ئەم ناوبانگەشی لەو سۆنگەوەیە کەئەم یەکەمین کەس بووە بەشێوەیەکی واقعی لەکۆمەلگەی ئادەمیزادی کۆڵیوەتەوە، (لێکۆڵینەوەیکۆمەلگە)شی لەو قاوغە وەعزیە هێنایە دەرێ کەبەدرێژایی سەدە کۆنەکان وسەدەکانی ناوەڕاست بەسەرهزرەکاندا زاڵ بوو.

بەم دواییانە، لەبارەی (ئبن خلدون)دوە، لێکۆڵینەوەی زۆر کراوە، چەندین پەڕاو وتار لە وڵاتە عەرەبی و بیانیەکاندا لەمەڕ وی بڵاوکراونەتەوە... لەم میانەدا، ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە کە هەندێ لەتوێژەرانی عەرەب، حەزبە بەراوردکاری دەکەن لەنێوان ئیبن خەلدون و هەریەکێکی تر لە پێشەنگەکانی زانستی کۆمەڵناسی هاوچەرخ دا، وەك میکیا ڤیلی وفۆکۆ ومۆنتیسکۆ وهیگڵ ومارکس وکانت و سەبنسەرودۆرکهایم و...هتد. مەبەستیشیان لەم بەراورد کاریە ئەوەیە فەزڵی (ئیبن خەڵدون)بەسەرهەرکام لەوزانایانەدا دەربخەن، لەبنیات نانی زانستیکۆمەڵناسی دا.

ئەمرۆش من کەئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر ئیبن خەلدون پێشکەش دەکەم، نامەوێت لەسەرهەمان ڕێڕەوی ئەو توێژەرانە ڕێ بکەم..لەڕاستی دا من ناتوانم لەوەیئەوان لەوڕووەوە وتویانە، شتێکی زیاترو تازەتر بڵێم... بەڵکو لێکۆڵینەوەکەی من دوو ڕوو لەتێوەرەگەی (ئیبین خەلدون) دەکاتە خولگەیخۆی ولەسەریان دەخولێتەوە... یەکەمیان بریتییە لەلێکۆڵینەوە لەو (لۆژیك)ەی کە بیرکردنەوەی ئیبن خەلدون لەسەری ڕۆشتوە لەساتەوەختی بنیات نانیتێوردکەی دا... دوەمیشیان لێکۆڵینەوە لەوفاکتەرە فیکری ونا فیکریانەی کەیارمەتیان داوە لەبنیات نانی تێورەکەیدا... هەرلەبەر ئەوەش پەرتوکەکەم کردۆتە دووبەشەوە... هەریەك لەوبەشانەشم تایبەت کردوە بەلێکۆڵینەوەی یەکێك لەو دوو ڕوە.

## سەرەتای بایەخ پێدان:

بەرلەدەست پێکردنی لێکۆڵینەوەکە، هەقە ئاماژەبدەم بەو ڕاستییەی کەبایەخ دانی من بەئیبن خەلدون شتێکی تازەنیە، بەڵکوبۆ (پازدەساڵ)لەمەوبەر دەگەڕێتەوە...تەنانەت لەونامەیەدا کە لەزانکۆی (تەکساس) بڕوانامەی دکتۆرام پێ بەدەست هێنا لەساڵی (١٩٥٠)دا، بەشێکی فراوانم بۆ لێکۆڵینەوە لەئیبن خەلدون تەرخان کردبوو... بایەخدانی من بە (ئیبن خەلدون) تەنها لەسنوری پێشکەش کردنی ئەونامەیەو وەرگێڕانیدا لەلایەن زانکۆوە ڕانەوەستا، بەڵکو هەمیشە بەتامەزرۆییەوە هەر وتارو پەرتوکێ لەبارەی ئیبن خەلدونە وە، نوسرابێ وبڵاوکرابێتەوە دەستی خۆمم خستوە، جگە لەوەش هەوڵم داوە (چەندی بتوانم) لەپەرتوك و سەرچاوە عەرەبیە کۆنەکانەوە زانیاری لەبارەی ئیبن خەلدونەوە کۆبکەمەوە.

لەئەنجامی ئەو بایەخە بەردەوامەدا، لایەنێکی دیکەم لەئیبن خەلدوندا دۆزیەوە کەلەکاتی نوسینی نامەکەی زانکۆدا لێی بێئاگابووم... ئەویش بریتیەبوو لەلایەنی لۆژیکی. بەوهۆیەوە دەستم کردە پرسیار کردن لەخۆم: تۆ بڵێی ئیبن خەلدونیش لەسەرهەمان ئەوڕێڕەوە لۆژیکیە ئەرەستۆییە ڕۆشتبێ کەفەیلەسوفەکانی ئیسلام لەسەری دەڕۆشتن، یاخود لۆژیکێکی نوێ‌و تایبەت بەخۆی بنیات نابوو؟؟.

ئەوەی لەم ڕووەوە سەرنجی ڕاکێشا، بڵاوبونەوەی کتێبێ بوو لەبارەی ئیبن خەلدون وە، بەزمانی ئینگلیزی لەساڵی (١٩٥٧)دا، لەلایەن یەکێك لەخانە بەناوبانگەکانی بڵاوکردنەوەوە لەئینگلتەرا.. پەرتوکەکە لەنوسینی توێژەری عێراقی (د.موحسین مەهدی)ە، وئەونامەیەش لەخۆدەگرێ کەدانەر پێشکەشی زانکۆی (شیکاگۆ) (١)ی‌کردووە بەمەبەستی وەدەست هێنانی بڕوانامەی دکتۆرا.. ئەم پەرتوکەتایبەتمەندیەکەی ئەوەیەکە یەکەمین لێکۆڵینەوەیە بایەخی دابێ بەلایەنی فەلسەفی (لۆژیکی)لەنێوتێوەرەکەی ئیبن خەلدوندا... مامۆستا (تیای)

دەڵێت: (توێژەران کاتێ لێکۆڵینەوەیان لەسەر تیۆرەکەی ئیبن خەلدون کردوە، ئاماژەیان بەشتێکی دیکە نەکردوە جگەلەلایەنی کۆمەڵایەتی بیردۆزەکە، هەرچی لایەنە فەلسەفی (لۆژیکی)یەکەی نێو تیۆرەکەیەبەتەواوی فەرامۆشیان کردوە، لەمەدانەو لێکۆڵینەوە بەپێزە هەڵاوێرد دەکرێ کەبەرێز موحسین مەهدی سەبارەت بەفەلسەفەی مێژوو لای ئیبن خەلدون نوسیویەتی) (٢)من لەگەڵ ڕێزمدابۆئەوپەرتوکەو، سەرەڕێی ئەوەی کەهاوڕام لەگەڵی دا سەبارەت بەزۆرێك لەوڕاوبۆچونانەی کەتیایدا هاتوە... بەڵام من لەگەڵ یەك بۆچونی ناوئەوپەرتوکەدا ناکۆکم... بەڕێی دکتۆر مەهدی : ئیبن خەلدون لە تیۆرە کۆمەڵایەتیەکەیدا لەسەرهەمان ئەوبنەما لۆژیکیانە ڕۆشتوە کەئەفلاتۆن وئەرستۆو شوێنکەوتەکانیان (فەیلەسوفەکانی ئیسلام)لەسەری ڕۆشتون... دکتۆر دەڵێت: ئیبن خەلدون ج نەبووە، جگە لە قوتابییەکی دڵسۆزی فەیلەسوفە دێرینەکان، بەتایبەتی ئیبن ڕوشد، ئیبن خەلدون زانستەکەی خۆیی لەسەرهەمان ئەوبنەمایانە بنیات ناوە کەئەو فەیلەسوفانە بیرکردنەوەی فەلسەفی خۆیانیان لەسەر بنیات نابوو... بۆیە هیچ هەستی‌نەکردوە بەوەی ئاتاجێ هەیە بۆگۆڕینی ئەوبنەمایانە یاخود بۆگومان کردن لەڕاستی ودروستی‌یان) (٣) (دکتۆر مەهدی) بەم پەیڤە دەگاتە کۆتایی پێشکەش کردنی بۆچونەکەی و دەڵێت: (وادردەکەوێ، ئیبن خەلدون تاکە هزرڤانێك بووە هەوڵی داوە زانستێك بۆ کۆمەڵگە بنیات بنێ کەلەبنەڕەتی فەلسەفەکۆنەکانەوە سەرچاوەی گرتبێ و لەسەرهەمان بنەماکانی ئەوفەلسەفانەش دروست بوبێت) (٤) (دکتۆر مەهدی)دان بەوەدا دەنێت کەئیبن خەلدون لەبۆچونەکانیدا لەزۆرێك لەبیرمەندە مۆدێرنەکان دەچێت... بەڵام دووبارە دەگەڕێتەوەودەڵێت هەڵەیەکی گەورەیە گەر لەم ڕاستی یەوە ئەودەرەنجامە بەدەست بێنین کەبناغەفەلسەفیەکەی زانستی کۆمەڵناسی خەلدونی، هەمان ئەوبنەمایەکە زانستی کۆمەڵناسی نوێ لەسەری دامەزراوە. (٥)

## بۆچونی من لەمەڕ لۆژیکی خەلدونی:

من لەم ڕووەوە تاڕادەیەکی زۆر ناکۆکم لەگەڵ دکتۆر مەهدی دا... بەڕێی من ئیبن خەلدون بەشێوەیەکی گشتی شۆڕشی بەرپاکردوە بەسەر فەلسەفەی کۆن دا وبەتایبەتیش بەسەر لۆژیکی ئەرستۆیدا... خوێنەر لەبەشەکانیداهاتوی ئەم پەرتوکەدا بەکەمێ درێژدادڕیەوەئەم ڕاستیەدەبینێت.

من نکولی ناکەم لەوەی ئیبن خەلدونیش لە (مقدمة)کەیدا زۆرێکی لەوەدستەواژە فەلسەفی وپێوانەکاریە لۆژیکی یانە بەکار هێناوە کەفەیلەسوفەکۆنەکان وەکاریان دەبرد.. بەڵام ئەمە، ئەوەناگەیەنێ کەلەلێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیەکانیشی دا هەمان بنەماوڕێساکانی فەلسەفەی کۆنی بەکار هێناوە.. وەك دواتریش دەبینین ئیبن خەلدون زیادلەجارێك دانی بەوڕاستی یەدا ناوە، کەلۆژیکی کۆن سودوکەلکی هەیەبۆبیرمەند، چونکە لۆژیکی کۆن وادەکات کابرای بیرمەند زۆر لێزان بێت لەڕیزکردنی بەڵگەو پاساوەکاندا... بەڵام ئیبن خەلدون دووبارە دەگەڕێتەوە سەر ڕاستی یەکی جەوهەری – وەرگێڕ)وەدەڵێت، لۆژیکی کۆن پڕاوپڕ ناچەسپێ بەسەر ژیانی واقعی دا... بۆیەهەرکەس دەیەوێت لەژیانی واقعی تێ بگات، پێویستە بەگوێرەی لۆژیکێکی دیکەسەرنجی لێ بدات... خەریکە بڕوابکەم بەوەی ئەگەر ئیبن خەلدونیش لەسەرهەمان ئەو ڕەوتە لۆژیکی یە بڕۆشتایە کە فەیلەسوفەکانی بەرلەخۆی لەسەری دەڕۆشتن، ئەوا هەرگیز نەی دەتوانی زانستێکی نوێ بۆ ئێمە بەرهەم بێنێت... گومانم وایە ئەوئەفراندنە مەزنەی ئیبن خەلدون هێنایەکایەوە، لەوەوە سەرچاوەی گرت کەئەو پیاوە توانی خۆی قوتارو ڕزگاربکات لە لۆژیکی کۆن و لۆژیکێکی نوێ بۆخۆی هەڵبژێرێت.

لەسەدەکانی ناوەڕاست دا، لۆژیکی کۆن ببوە قاڵبێکی فیکریی دۆگماوچەق بەستوو، هەرکەبیرمەند تیای دادەژیا، وەك ئەوەی لێ دەهات کەلەنێو بازنەیەکی بۆشدا بسوڕێتەوەو چیترنەی دەتوانی لێ ڕزگار بێت. ئێمەلەبەردا هەریەکە لە

(فارابی وئیبن توفەیل وئیبن ڕوشدو.. هتد)مان بینیوە، کە شوێنکەوتەی لۆژیکی کۆن بوون، قسەشیان لەمەسەلە کۆمەڵایەتیەکان دا کردوە، کەچی زۆرجار لە بۆچونەکانیاندا جگە لە دووبارەکردنەوەی بۆچونەکانی ئیغریقە کۆنەکان چیدیکە بەدی ناکەین... لەوانەیە هەندێجار تازەکردنەوەی ئەو بۆچونانە ببینین، لەگەڵ ئەوەشدا ئەیان توانیوە لەوگەمارۆیە دەربازبن کەلۆژیکی کۆن بەسەریاندا سەپاندبوی.

هەرچی ئیبن خەلدونە، لەوگەمارۆیە خۆی ڕزگارکردو لێی یاخی بوو، لێرەدایە کە دەبینین توانیویەتی ئەو (باز)ە گەورەیە بێنێتەکایەوە کەلەزانستی کۆمەڵناسیدا دەبینرێ.. لەوانەیە زیادەڕۆویم نەکردبێ گەربەشێوەیەکی گشتی بڵێم: بیرمەند تاچەندە لەکۆت وبەندوباوەکانی لۆژیکی کۆن قوتاربێت، ئەوەندەش توانای ئەفراندنی هەیە لەبیرکردنەوەی دا، لەڕاستیش دا زانستە نوێ یەکان، چ زانستەسروشتی یەکان بن یاخودکۆمەڵایەتیەکان، نەیان توانی ئەوگەشە سەرسوڕهێنەرە بکەن، تائەوحەلەی (فرەنسیس بیکۆن) هەستا بەبەرپاکردنی شۆڕشە بەناوبانگەکەی دژبەلۆژیکی ئەرستۆیی وکەلەپوری فەلسەفی کۆن.

# "سوپاس و پێ زانین"

بەهەرحاڵ، لەم بۆنەیەدا دەمەوێت سوپاسی (ئەنستیتۆی توێژینەوە عەرەبیەباڵاکان)بکەم سەبارەت بەبانگ هێشت کردنم بۆپێشکەش کردنی چەند گوتارێك لەبابەتی ئیبن خەلدوندا... چونکەئەو بانگ هێشت کردنە بویە پاڵنەری ڕاستەو خۆ بۆدانانی ئەم پەرتوکە.

بیرۆکەی پەرتوکەکە ماوەیەك بوو، لەمێشکمدا دەهات ودەچوو، بەڵام تەمبەڵیم دەکرد لەوەدا کەبیخەمە چوارچێوەوشێوەیەکی ڕێك وپێك ونوسراوەوە، تائەوە بوو بەم دواییانە بانگهێشت کرام ووادەیەکیان بۆدانابووم بۆ پێشکەش کردنی گوتارەکان... ئیتر ناچار بووم بەوەی سەرشۆڕ بکەمەوە بەسەربابەتەکەدا وسەرقاڵی ئامادەکردنی پەرتوکەکەبم ولەر پێناوەدا شەو ورۆژبدەمە دەمیەك بۆیەهەقە ئاماژەبەوە بدەم کەئەم پەرتوکە،بەپەلە ئامادەکرا، ئینجاشتێکی ئاساییەگەر هەڵەوبەڵەو لاوازی ودووبارەبوونەوەی زۆری تێدابێت... وەڵێ لەگەڵ ئەوەشدا خۆشحاڵم پێی... ئەگەر بانگهێشتی پەیمانگەکە نەبوایەئەوا بیرۆکەکەی لەنێو (پەڕەوفاقەزەکانم دابەشپرزی دەمایەوە، تەنانەت لەوانەشە چارەنوسی بەفەراموش کردن و لەبیر چون بگەشتایەبەهۆی ئاڵ وگۆڕەکانی ڕۆژگارەوە.

هەرگیز پڕوپاگەندەی ئەوەش ناکەم، کەئەم پەرتوکە قسەی یەکلاکەرەوەی کردبێ لەوبابەتەدا کەلێکۆڵینەوەی تێداکردووە، بەڵکو تەنها دەتوانم ئەوە بڵێم کە هەوڵێکی سەرەتاییە لەپرس و بابەتێکی نوێ دا، ئینجا وەك هەرهەوڵێکی دیکەی سەرەتایی دەگونجێت لەم پەرتوکەشدا هەڵەوڕاست تێکەڵاوبوبن... بەڕاستی ئەوکەسە ڕاستیگوتوە کە دەڵێت: (هەندێجار "هەڵەکردن" دەبێتەڕێگەی گەشتن بەڕاستی).

# ڕەخنەیەك

ڕەنگە ڕەخنەگرێك لێرەدا بڵێت: ئەوە چییەئەت بینم خۆت سەرقاڵ کردوەبەئیبن خەلدون وبیرمەندەکۆنەکانەوە، ئایابیرۆکە زانستی یەتازەکان بایی ئەوەیان تێدا نیەکەبێ دەربەستت بکات لەوبابەتەکۆنانە؟

ئەم قسەیەم لەزاری زۆرکەسەوە بیستوە، لەڕاستیش دا قسەیەکە لەڕاستی خاڵی نیە، هەرچەندە من پێم وایە لێکۆڵینەوە لەبیرۆکە کۆنەکان هەندێ جار ڕێگەی ژیانی نوێمان بۆڕوناك دەکاتەوە، ئەم قسەیە بەتایبەت سەبارەت بەبیرۆکەکانی ئیبن خەلدون دەکەم... چونکە ئەوپیاوە لەقۆناغێکی فیکری وادا دەژیاکەلەهەندێ ڕوەوەلەم قۆناغەدەچێت کەئێمەی عەرەب ئەمرۆکەتیای دادەژین... زۆرێك لەفێرخوازانی نێونێمە، تاهەنوکەش بەوجۆرە لەپرسەکانی ژیان دەڕوانن کەفەیلەسوفەکۆنەکان دەیان ڕوانی !! ئیترئەم فێرخوازانە هەست بەخۆیان بکەن یان نا!! ئەوەتا ئەمانیش واقعەبێ پەردەو حاشاهەڵنەگرەکانی ژیان فەرامۆش دەکەن، وبەئاسمانی لۆژیکی ئەبستراکت وبیرۆکەتۆباییەکانیان دادەفڕن... بێ ئەوەی بزانن لەم چەرخەدا چ شۆڕشێ بەرپاکراوە بەسەرئەو لۆژیکەوپەیگیر بوون پێیەوە.

لێرەدا گرنگی ئیبن خەلدون بۆئێمە دەردەکەوێ، بەتایبەت لەم قۆناغە فیگریەی کە تیای دادەژین...ئەو پیاوە ڕەخنەی توندی ئاراستەی بنەماکانی لۆژیکی کۆن کرد، بەتایبەت لەڕوی‌پراکتیزەکردنیەوە بەسەربڕیاردەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی دا.. سەیریش لەوەدایە لەسەدەی چواردەی زانینی دائەمەی کردوە، کەچی دەبینین هەندێ لەفێرخوازانی لای ئێمە لەسەدەی بیستەمیشدا دەژین و تاهەنوکەش بەگوێرەی ئەولۆژیکە بیردەکەنەوەو دەمارگیریشن بۆی!.

گرفتی ئەو فێرخوازانە لەوەدایەکە تازەترینی ئەو بۆچونە زانستی یانە دەخوێننەوەکەسەدەی نوێ هێناویەتی، جاری واهەیە لەبەریشیان دەکەن ولەنێو ناهەنگ وجڤاتەکاندا دەم درێژیان پێوەدەکەن... بەڵام نازانن ئەو بۆچونە نوێ یانە لەسەربنەمای لۆژیکێکی جیاواز لەولۆژیکەکۆنەی ئەوان بنیات نراوە، رێك وردوان وەك ئەوکەسەی کۆشکێکیهەوربڕ دروست دەکات لەسەر هەمان ئەو بناغەیەی کەخانویەکی کۆنی دوونهۆمی لەسەر بنیات نراوە.

ئەوجۆرەکەسانە کۆمەڵگەکەیان دووچاری زیانێکی گەورە دەکەن، ئەگەربێ دەنگ بوونایە مەسەلەکە سوك دەبوو، بەڵام ئەمانە لەوجۆرە کەسانەن کەبەباشی لەدەمبەدەمە شارەزان، هەمیشە جڤاتە کانیان پڕدەکەن لەدەمبەدەمەوقڕە قڕو دەنگی بەرز... هەرکاتێ باسی تیۆرێکی تازەی زانستی یان بۆدەکەی، دەست بەجێ بەبێ ئەوەی ئاگاداری تەواویان هەبێت سەبارەت بەو تیۆرە، دەست دەکەنە دەمبەدەمە تیای دا، ئیدی هیچ ئاگاداری ئەو هەڤپەیڤینە زانستی یانەش نین کەلەنێوان زاناکاندا لەسەر ئەو تیۆرە کراوە... تەنانەت لەوانەشە بەئەنقەست ئەوبیردۆزە نوێ یەبەدرۆبخەنەوە !! بەپشت بەستن بەو پێوانە کاریە لۆژیکیە کۆنانەی کەلایان هەیەو، هەمیشە لەهەموکایەکاندا ئەو پێوانەکاریانە بەکاردێنن وەك چۆن جەنگاوەرێ شمشێرە بڕندەکەی لەهەموو جەنگێکدا بەکار دێنێ... ئینجا تۆش لەئاقاری ئەو جۆرەکەسانەدا، ناچاریت بێ دەنگ بیت، چونکە دەمبەدەمە لەتەك ئەو جۆرەکەسانەدا لەسنورێکدا ڕاناوەستێت... لەکۆتایشدا

هەردەبێ ئەوان سەرکەوتن بەسەرتۆدا وەدەست بێنن، چونکە توانایەکی زۆریان هەیەلەوتوێژو دەمبەدەمەدا... گەربارودۆخیش لەهەندێ باردا، ناچاری دەمبەدەمەی کردی لەگەڵیاندا ئەواناچار دەبی تەنها بەوتوێژکردن لەبارەی ئەو تیۆرەوە دەست کۆتا نەکەیت کەوتوێژەکە لەدەوری دەسوڕێتەوە، بەڵکو پێویستە بگەڕێینەوە سەرنەوبنەما لۆژیکیەسەرەتاییانەی کەبیردۆزەکە لەسەری بنیات

نراوە، ئینجانەمەش مەسەلەیەکە زۆرناڕەحەتە بتوانین سەرکەوتنی تێدا بەدەست بێنیت.. بەسەر ئەواندا.

زیانی ئەوانە لەم سنورەدا کۆتایی نایەت، هەندێ جار جڵەوی دەستەڵات دەکەوێتە دەستیان وپۆستی باڵالەدەوڵەت وکۆمەڵگەدا وەردەگرن.. لەوەدەمەشدا دیارە لەبەر ڕۆشنایی لۆژیکە کۆنەکەیاندا سەرنجی کاروبارەکانی خەڵکی دەدەن، هەربەگوێرەی ئەولۆژیکەش لەئاقاری کاروبارەکانی خەڵکیدا دەجولێنەوە، ئیدی هیچ ڕەخنەو ئامۆژگاریەکیش لەکەس وەرناگرن... کۆمەڵگەش وەك ئیبن خەلدون دەڵێن"ئاتاجیبەلۆژیکێ ترهەیە جیاواز لەلۆژیکی کۆن ".. وەلێ ئەو جۆرەکەسانە لەم ڕاستی بەحاڵی نابن ودانیشی پێدا نانێن، زۆرجاریش بیرکردنەوەکانیان دەبێتەهۆی زیان دان لەبەرژەوەندی گشتیولەمپەر دروست کردن لەڕێگەی کۆمەڵگەدا.

## ڕاستی یەکی ناسەقامگیر:

کۆمەڵگـەبریتی یەلـە (سیـستەمێکیکارلێککەری بەرژەوەندیـەکان)، بـە هەمیشەیش لەنێو ئاڵ وگۆڕی یەکبینە و گۆڕان کاری هەمیشەیی دایە... بەوپێ یـەش ئەوبڕوایـەی لـۆژیکی کـۆنی بەسـەردا ناچەسپێت کـەپێی وایـە (ڕاستی ڕەهایەو هەرگیز ناگۆڕێت)... مامۆستا (شیلر)لەمەڕ ئەو لۆژیکە دەڵێت : (لەبـەر ڕۆشنایی ئەو لۆژیکەیدا هەقیقەت تاکە، کەواتەڕاوبۆچونەکانیش پێویستە تیای داگۆك تـەبابن... تـۆش، پێویـستە یـان لەگـەڵ ئـەو ڕاستی یـەدابیت یـاخوددژی بیـت... ئەگـەر دژی بیـت ئـەوا تۆمـاڵ ویـران وسەرتێداچویت... ئەگـەر لەگـەڵ ئەوڕاستی یـەش دابیـت ئیترهـیچ کەسێك بـۆی نیـە پێچەوانەت بێـت یـاخود ڕەخنـەت لێ بگرێت، تەنانـەت لەوکاتەشـدا کـەتوڕدەبیت لەوکەسانەی کەلەمـەڕ ئـەو ڕاسـتی یەدەمبەدمـەت لەگـەڵ دەکـەن، هـەرتۆ لەسـەرهەقیت، هەقیقـەت هەقیقـەتی تۆیــە، یــان ڕاسـتتر تــۆ خــۆت هەقیقــەتی ئەگــەرخۆت دابڕێــی لەهەستەمرۆییەکانت) (٦).

ئەمەیـە هۆکـاری ئـەوەی کەهـەڵگرانی لـۆژیکی کـۆن بـەڕێی خۆیـان نـەبێ بەهیچ ڕاو بۆچونێکی تر قایل نابن، توڕەش دەبن لەوەی ڕەخنەیان لێ بگیرێت... هەقیقەت بەتەواوی‌لە هزریاندا بەرجەستە بوە، تەنانـەت بوەتـە ملکی ئـەمان و هیچ کەس بۆی نیە کێ بەرگێ یان لەگەڵدا بکات لەسەرئەو هەقیقەتە... هەرگیز دان نانێن بەوەدا کەخەڵکی دیکەش مافی ئـەوەیان هەیـە هەقیقـەتیان لـەلابێت.. ئـەم بڕوایەشـیان لـەو سۆنگەوەیە کـەمادەم هەقیقـەت ڕەهایـە کەواتـە دەبێـت لەلایەکدا بێـت، بێگومـان ئەولایەنـەش دەبێـت لایـەنی خۆیـان بێـت !! هەرچـی کەسـانی تـری جگەخۆیانـە هـەردەبێ لەسـەر پوچـەڵی وناڕاستی بـن... هەنـدێ لـەزانایانی کۆمەڵناسـی گەشـتونەتە ئـەو بڕوایـەی کـەبڵێن : لـۆژیکی کـۆن بۆیەلەســـەرئەوجۆرە بیرکردنەوەدیــــە، چــونکە لەســــەردتادا لەسەردەســــتی فەیلەســـوفەکانی ئیغریـــق داگەشــەی کــردو مــۆرکی ئــەوانی گــرت... ئــەو فەیلەســـوفانەش زۆرجــار ئاغــاوات (دەربڕینـــی — وەرگێــڕ)وخـــاوەنی کۆیلـەبوون..بەتایبـەت ئـەم قـسەیە بەسـەر ئـەفلاتۆن وئەرسـتۆی شـاگردی دا دەبڕێت... دیارە (لۆژیك)لەسەردەستی ئەماندا دروست بوو.

ئەمانـە خـەڵکانێك بوون، بـەو جۆرە لەڕاستی یـەکانی ژیـان نەدەگەشتن کەکۆیلەو کرێکارو خاوەن پیشەجۆراوجۆرەکان لێی حاڵی دەبن... ئەمانـە ڕوو بـەڕوی ئـەو گرفتانـەی ژیـان نەبونەتـەوە کـەوایان لێ بکـات بـەجۆرێکی واقعـی بیرلـەژیان بکەنـەوە، چونکە هـەرکات پێویـستیان بەشـتێك بوبێـت فـەرمانیان بەکۆیلەکانیان داوە شتەکەیان بۆ دروست بکەن، یـاخود بۆیـان ئامادەبکـەن، ئـیتر نازانن بابـای کۆیلـە چ دەردەسـەریەکی تـوش بـووە وچۆن تێکۆشاوەلەو پێنـاوەدا ئەوەنــدە دەزانــن لەکۆتایی ـدا شــتەکە بــەئامادەکراوی لەبەردەسـتیاندا سـازو ئامادەیە، ڕەنگە توڕەش ببن کاتێك ببینن شـتەکە کـەمێك ناتـەواوی هەیـە لـەو شێوەیەی ئـەوان پێشتر وێنایـان کـردوە... هەرئەمـەش وادەکـات، بیرکردنـەوەیان هەمیشە لەچوارچێوەی شێوەی کۆتایی و تۆکمەی شتەکاندا مۆڵ بدرێ.

لێرەدایەکە دەبینین لای ئـەوان هەقیقـەت فەوارەیەکی سـەربەخۆی هەیـە، واتە بەرێی ئەوا هەقیقەت بونێکی دابڕاوی هەیەلەتۆڕی ژیان وهەربـەوپێ یـەش دەگونجێـت سـەرنجی لێ بـدرێت، بـێ ئـەوەی بایـەخ بـدرێ بەپێوەنـدی وفاکتـەرە هاوپەیوەندەکانی دەوروبەری.

فەیلەسـوفەئیغریقی یـەکان بـەدابڕاوی لـە (ژیـان) دەژیـان، قوتابیـەکانیان دەوریـان دابـون وسـەبارەت بەڕاستی ڕەهـا وتوێـژیان لەگەڵـدا دەکـردن.. خۆیـان لەقـەرەی ڕاسـتی یـەواقعی یـەکانی ژیـان، نـەدەدا چونکە پێیـان وابـوو خـۆدان لەقەرەی مەسەلەی ئاوها لەشان وشکۆی بـەرزیان کـەم دەکاتـەوە ودادەبـەزێنێت.. ئەوەمەسەلەیەکە تایبەتەبەکۆیلەو کرێکـارو ڕەنجـدەران... فەیلەسـوفان پێویـستە بیرکردنەوەیان بەرزتربکەنەوە لەئاستی ئەوچینە (هیچ وپوچـە)!.. ئێمـە نکـوڵی ناکەین لەڕۆڵ و گرنگی ئەو فەیلەسوفانە لەدێرۆکی فیکری مرۆڤ دا...لەڕاستی دا ئەمان یەکەمین کەسانێك بوون کـەتوانییان بـیری مـرۆڤ دەرباز بکـەن لەقۆناغـە ئەفـسانەیی و جادوییەکـەی و بیگەیەنـنـە قۆنـاغی لـۆژیکی ڕێـك وپێـك... وەڵ دیـسپلینی فیکریـان بـەجۆرێکی تۆبـاوی کـرد، پترلـەوەی بـەجۆرێکی واقعـی کردبێتیـان، کەواتـە لەڕویەکـەوە سودیان بەفیکرگەیانـدو لەلایـەکی دیکەشـەوە زیانیان لێدا.

## دەرکەوتنی سەفسەتە:

لەئاقاری ئەوفەیلەسوفانەدا، هەندێ بیریار بەدەرکەوتن. ئەم بیریارانەلەوفەیلەسوفانە نێزیك تربوون لەلۆژیکی ژیانی واقعی یەوە... ئەمانە لەدێرۆکی فەلسەفەدا بە (سۆفستاییەکان)ناوبانگیان دەرکردوە.. ئەمان لایان وابوو لەدنیادا هەقیقەتی ڕەها بوونی نیە، بەڵکو هەقیقەتی ڕێژەیی لەگۆڕێدایە، ئەو ڕاستییەی هەندێ بەهەقی دەبینن، هەندێکی تربەلایانەوە پوچە.. کەواتەلەدیدی ئەماندا مرۆڤ پێوەری ڕاستی یە...لەبەرئەوە واچاوەڕوان دەکرا فیکری کۆمەڵایەتی لەسەردەستی ئەماندا زیاتر گەشەبکات وەك لەسەر دەستی فەیلەسوفەکاندا، وەلێ مەخابن لەجەنگەکەیاندا شکستیان هێناو فەیلەسوفەکان سەرکەوتنێکی مەزنیان بەسەریاندا تۆمارکرد، تا لەکۆتایدا وای لێهات ناوی (سەفسەتە)بویەنازناوێ بۆسەرکۆنەکردن ومەبەست لەبەکارهێنانی تەعبیر کردن بوو لەهەڵەکاری و بیرکردنەوەی خواروخێچ. وادیارە بۆیە فەیلەسوفەکان توانیویانە ئەوسەرکەوتنە یەکلاکەرەوە بەسەرسەفسەتەدا بەدەست بێنن، چونکەئەمان گەورەپیاووخاوەن دەستەڵات و پلەوپایەی بەرزبوون لەکۆمەڵگەدا، لەبەرانبەردا سۆفستاییەکان، چەند فێرکارێکی غەوارەبوون و لەڕێگەی فێرکردنەوە بژێوی خۆیان پەیدا دەکرد... چەندسەدەیەکیش دواتر، سەرکەوتن هەرلەدەستی فەیلەسوفەکاندا مایەوە..بەومانایەی کە هەمیشە فەلسەفە ببوە تایبەتمەندی گەورەپیاوەکانی نێونەتەوە جوداجودا کان. .هەروەك ئەوەی (تەرەف)ێکی فیکری بێت و جگەلەگەورە پیاوان، خەڵکی ڕەشۆکی بواری ئەوەی دەست نەکەوتبێ لەفەلسەفە بکۆڵێتەوە، پێویست بوە لە گۆشەنیگای گەورەپیاوانەوە سەرنج لەفەلسەفەبدات، نەخاسمە چونکەناچاریش بوە بەوەی لەئامێزی ئەواندا بژی و لە پاشماوەی سفرەوخوانی ئەوان بخوات. (٧)

ئەمەی گوتمان هۆکارێك بوە، وایکردوە لەنێو کەلەپوری فەلسەفەی کۆن دا بیرکردنەوەی واقیعبینانەی کۆمەڵایەتی دەگمەن بێت... فەلسەفەی کۆن سەرقاڵ بوە بەوبیرۆکە ڕەهایانەی کەلەپشتی ژیان وکۆمەڵگەوەن... هەرگا فەیلەسوفێ لەوشێوازە هاتبێتە خوارێ وسەرنجی کاروبارەکانی کۆمەڵگەی دابێت، ئەوابەناڤارێکی وەعزی وتۆباوی‌دا ملی ناوە، بەواتایەکی دیکەسەرنجی "ئەوەی پێویستە ببێت" ی داوە، نەك "ئەوەی کەبەکردەوەهەیە " اکتو مت وەك ئەوەی ئەفلاتۆن لەکۆمارەکەی داو فارابی لەشارە ڕێزمەندەکەی دا کردویانە.

## بازەکەی ابن خلدون:

لەبەررۆشنایی ئەوەیڕابورد دەتوانین پەی بەرین بەگرنگی ئەوبازەیکە ئیبن خەلدون لەدێرۆکی بیری کۆمەڵایەتی داهێنایەکایەوە ئیبن خەلدون یەکەمین هەوڵی بەئەنجام گەیاند بۆهێنانەخوارەوەی فەلسەفەوتێکەڵ کردنیبەکێشمەکێشەکانی ژیانی واقعی.

ئیبن خەلدون سەبارەت بەوکەسانەی کەلەپێش خۆیدا لەکێشە کۆمەڵایەتیەکانیان کۆڵیوەتەوە دەڵێت: ئەوانە ڕێبازی ئامۆژگاری یاخود وتاردانیان پەیڕەودەکرد، یانی هەوڵیان دەدا وتەی قەناعەت پێکەر بێننەوەبۆ ڕاکێشانی دڵی جەماوەر بەرەوبۆچونێ یاخود بۆ تەرێزپێکردنی جەماوەرلە بۆچونێ، یاخود بۆناچارکردنیان بۆئەوەی لەسەر ڕێبازێك برۆن کەتیای دا"پاراستنی جۆرومانەوەی" مسۆگەربکرێت. (٨)

وەڵێ ئەو (واتە"ئیبن خەلدون"- وەرگێڕ)موقەدیمەکەی نەبۆئەم مەبەستەداناودونەبۆئەوی تریان، مەبەستی ئەوەنیە ئامۆژگاری جەماوەر بکات یاخود بانگ هێشتیان بکات بۆپەیڕەو کردنی ڕێگەی چاك وناکارەپەسەندەکان، بەڵکو مەبەستی ئەوە بوە لەسروشتی ژیانی کۆمەڵایەتی بکۆڵێتەوە تاکوئەو یاساو ڕێسایانەبدۆزێتەوە کەکۆنترۆڵیان کردوە، ئیدی ئەویاسایانە پەسەندبن یان ناپەسەند. (٩)ناکرێ سوکایەتی بکەین بەو پەیڤەی ئیبن خەندون. . ئەگەرئەو قسەیەیەکێك لەبیرمەندەکانی ئەم چەرخە بیکردایە هیچ شتێکی گەورەو جێگەسەرنجی تێدا بەدی نەدەکرا، چونکەئەم پەیڤە بوەتە یەکێك لەوبناغانەی کەزانستە کۆمەڵایەتیە نوێ یەکانی لەسەردامەزراوە.. دیارەئەم زانستانەش خۆدووردەگرن لە (هەڵسەنگاندنی ڕەوشتی) لەتوێژینەوە کۆمەڵایەتیەکانیان دا... بەڵکوبەوجۆرە لەبویەر دەکۆڵێتەوە کەهەیە، بەچاوپۆشین لەوەی ئەو بویەرە

پەسەندە یان ناپەسەند، وەلێ لەسەردەمی ئیبن خەلدوندا لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیەکان بەپێچەوانەوە بوون.

بیرمەندەکان پێیان وابوو، پێویستە لەسەریان ئامۆژگاری کۆمەڵگە بکەن تاکو لەبویەرەناپەسەندەکەخۆی ڕزگار بکات، نەك لەوبویەرە بکۆڵنەوەو یاساوڕێساکانی نێوی بدۆزنەوە، لەدیدی واندا کۆمەڵگە نەخۆشە، چارەسەریشی تەنها بەوە دەکرێ کەبیرۆکە چاکەکانی بەسەردا بخوێندرێتەوە، چونکە گەرکۆمەڵگە بەوبیرۆکەباشانە بزانێت لەسەریاندەڕوات و، بەوەش خۆشنودی وشادومانی وچاکەی دەست دەکەوێ!!.

ئیبن خەلدون لای وایەکۆمەڵگە بەوشێوازە چارەسەر ناکرێت، هەرگیز ئامۆژگاریەڕوت وقوتەکان کاریگەری لەسەر مەردوم دانانێن. چونکە ئەوان لەژیانیان دابەگوێرەی سروشتی ئەو کۆمەڵگەیە ڕێ دەکەن کەتێیدا دەژین... هەرچی ئەوکەسانەشەکەئەو ئامۆژگاریانە لەخشتەیان دەبات وبێ ئەوەی سەرنج بدەن لەسروشتی کۆمەڵگەکەیان کاربۆ بەرجەستەکردنی ئەو ئامۆژگاریانە دەکەن، ئەمانە بەڕێی ئیبن خەلدون زیان لەکۆمەڵگە دەدەن پترلەوەی سودی پێ بگەیەنین، زۆرجاریش کارەکانیان دەبێتە هۆی بێ هودیی وبێ سەروبەری وخوێن ڕشتن، لەوانەیە ئێمەلەگەڵ ئەم بۆ چونەی ئیبن خەلدوندا کۆك نەبین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین نکولی لەو گرنگی یەمەزنە بکەین کەلەڕوی لۆژیکی یەوە هەیەتی... بەڕاستی ئەو گوتەیە شۆڕش وبەرخۆدا نێکە بەسەر لۆژیکی کۆندا... زۆر گرنگە ئێمە لەو شۆڕشە بکۆڵینەوە لەخاڵە چاك وخراپەکانیشی دا، تاکو لەژیانی نوێمان دابەرچاومانی پێ ڕوناك بکەینەوە.

## ئیبن خەلدون ومیكیاڤیلی:

دەگونجێت لەم ڕووەوە ئیبن خەلدون بەمیكیاڤیلی بەراوردبكەین، ئەو هزرڤانە ئیتالیە بەناوبانگەی كە نزیكەی سەدەیەك لەدوای ئیبن خەلدون ژیاوە... مامۆستا (ماكس لەرنەر)دەڵێت : لەپەڕاوەكانی میكلیاڤیلیداخەسڵەتێ دەبینین كەنزیكەلەوەی شۆڕشێك بێت لەبیرگردنەوەی سیاسی دا... ئەوهیومانیستانەیبەرلەو كتێبیان لەبارەیمیرەكانەوە دەنوسی، بەگوێرەی ئەو نەریتە ئایدیالیستیانە دەیان نوسی كەلەسەدەكانی ناوەڕاست دا باوبوون، چونكە بیرۆكە كەلامی ومیتا ڤیزیكی یەكان بەسەریاندا زاڵ بوون، وەڵێ میكیاڤیلی تەرێزی لەبیرۆكە میتاڤیزیكی وكەلامی وئایدیالستی یەكان كردو، ڕەوتی گشتی وی، ڕووەو واقعگەرایی سیاسی بوو، دیارەئەمەش مەسەلەیەكی نامەئلوف بوو لەسەردەمی ئەودا) (١٠)

توێژەران لەزۆر ڕوەوە لێكچونیان دیوەتەوە لەنێوانْ بۆچونەكانی میكاڤیلی وئیبن خەلدوندا (دەربڕینی وەرگێڕ)... لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵئەدات : تۆبڵێی میكاڤیلی موقەدیمەكەی ئیبن خەلدون ی خوێند بێتەوەدو ڕاو بۆچونەكانی خۆیی لێوەر گرتبێ، یاخود لەئەنجامی لێكۆڵینەوەدو لێزانی خۆیەوە گەشتوە بەو ڕایانە؟. .لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا هەریەكەلەمامۆستایان: (ژۆمبلاوتز و محەمەد عبداللە عەنان)ڕایان وایەمیكاڤیلی (موقەدیمەكەی)ئیبن خەلدونی نەبینیوەو هیچیشی لێ وەرنەگرتوە... مامۆستا (ژۆمبلاوتز)دەڵێت: (فەزڵ وڕێزی پێشینەیی دەگەڕێتەوە بۆئیبن خەلدون، لەبابەتی ئەو ئامۆژگاریانەدا كە میكیاڤیلی لەپەرتوكەكانیدا لەدوای سەدەیەك پێشكەشی كردن، بێ ئەوەی ئاشناییەكی پێشوەختی لەگەڵ ئیبن خەلدوندا هەبووبێت) (١١)

هەرچۆن بێت، لێرەدا شتێكی گونجاوە گەركەمێك ڕابوەستین وسەرنج بدەین تاببینین ئایا ڕاوبۆچونەكانی میكاڤیلی وبۆچونەكانی ئیبن خەلدون تاچ

ئەندازەیەك لەیەك دەچن، ئایا میکیافیلی لەڕوی ئەفراندن وڕەسەنایەتی لۆژیکەوە گەشتۆتە ئەو لوتکەیەی کەپێشینە عەرەبەکەی پێی گەشتبوو.

خەریکە بڕوابکەم بەوەی لەم ڕووەوە جیاوازیەکی گەورەهەیە لەنێوان ئەدووپیاوەدا... بۆئەوەی دەرك بەوجیاوازیە بکەین، پێویستە بزانین کەمیکیافیلی لەنوسینەکانیدا زۆرینەی جارمەبەستی ئەوە بووە کۆمەڵێ ئامۆژگاری کردەیی پێشکەشی میر بکات تاکوسودی لێوەربگرێت لەبەڕێوەبردنی ڕەعیەتەکانی دا... بەدەربڕینێکی تر میکیافیلی ئەی دەویست زانستێك لە (کۆمەڵگەناسی)دا بنیات بنێت، زانستێك کەبنەماو بناغەی خۆی هەبێت، وەك ئیبن خەلدون کردی.

لەم ڕووەوە دەگونجێت میکیافیلی بەو پیاوە بچوێنین کە لەگەڵ هاوڕێ یەکی دا دادەنیشێت و ئامۆژگاری دەکات کەچۆن لەناخ وسروشتی خەلکی تێ بگات وچۆنیش سودلەو تێ گەشتنە وەربگرێت لەلەهەلس وکەوت کردن لەگەڵ یان داو هەروەها لەپاراستن وبەڕێ کردنی بەرژەوەندیەکانی خۆیشی دا لەنێو ئەو خەلکەدا...لەڕاستی دائێمە دەبینین ئەو جۆرە ئامۆژگاریانە هەر لەدێرزەمانەوە لەنێو خەلکی داباون... هەرکەسێکیش بگری، توانای دەربڕینی ئامۆژگاری ئاوهای هەیە، ئیدی بەڕادەی کەم یاخود زۆر... تاچەندە مرۆڤ زیرەکتر بێت وپسپۆڕی فروانیەهەبێت وزیاتر تێکەلاوی خەلکی بێت، ئەوەندەش ئامۆژگاریەکانی نێزیکتر دەبن لەتێگەشتنی واقعی کۆمەلایەتیەوە.

وەڵێ گرفتەکە لەوەدایە کە مرۆڤ ناچارە بەوەی ئەوجۆرە ئامۆژگاریە کردەییانە لەچوار چێوەی وتو وێژە تایبەتیەکانیدا ئابلۆقە بدات، و تەنها پێشکەشی کەسانی باوەڕ پێکراوی خۆی بکات وەك هاوڕێ وخزمەکانی... مرۆڤ ناتوانێت ئەو ئامۆژگاریانەی بەئاشکرا لەشێوەی نوسراوو وتاردا ندا ئاراستەی خەلکی بکات...چونکە ئەمەبۆئەو گران دەوەستێت وپڕلەتەنگ وچەڵەمەیە

بەهۆی زاڵ بوونی بیرۆکە وەعزیەکان (ئامۆژگاریئامێز)بەسەر نوسین و وتاردانندا.

دەگونجێت بڵێین: هەموو مرۆڤێك بەشێوەیەك لەشێوەکان بیرمەندی کۆمەڵایەتیە، مادەم لەکۆمەڵگەدا دەژی، ئەوا هەردەبێ بەیەکێك لەخەسڵەتەکانی کۆمەڵگە ئاشنابێت وتێبگات خەڵکی لەو کۆمەڵگەدا چ ڕەوتێك پەیڕەودەکەن.. هەندێ جاریش کارامەیی کۆمەڵایەتی لای خەڵکی گرد دەبێتەوە ودوبارە لەشێوەی (پەندی بەربڵاو و ئەو دێڕە شیعرو .هتد)جوان و دەگمەن داولە دوتوێی پەرتوکگەلێ جودا جودا دا دەردەکەونەوە، دیارە ئەو پەرتوکانەش پەیوەستەگی گشتی یان لۆژیکێکی ڕونیشیان تێدا بەدی ناکرێت.. سەیرلەوەدایە، هەندێ لەبیرمەندان لەکاتێکدا بەدوو قۆڵی لەگەڵ هەندێ لەوانەدا دەدوێن کەمتمانەیان پێ دەکەن، و زۆرێك لەوکارامەییە کۆمەڵایەتیەی دەردەخەن کەهەیانە... لەژیانی ڕۆژانەشیاندا دودڵ نابن لەوەی بەگوێرەی ئەو لێزانی وکارامەییە یان بجوڵێنەوە... وەلێ هەرکە دەستیان کردە نوسینی کتێب یاخود لەسەر بڵندگۆی وتارداناخۆیان دیتەوە، دەست بەجێ دەگۆڕێن ودەبنە بیرمەندی (تۆباوی)! ودەم درێژی دەکەن بەنمونەباڵاکانەوە، ئەونمونانەی کەهیچ پەیوەندیەکیان بەژیانی کۆمەڵایەتیەوە نیە.

بەڕاستی میکیاڤیلی بەشۆڕشگێڕێ دەژمێردرێت بەسەر ئەو دووجەمسەریە لەبیرکردنەوەدا، وەك چۆن لەبەردا ئیبن خەلدون بەسەرهەمان دووندیی دا شۆڕشی بەرپاکرد... ئێمەلەکاتێکدا شۆڕشەکەی میکیاڤیلی بەرز دەنرخێنین، لەهەمان کاتدا ناتوانین بڵێین توانیوەتی شۆڕشەکەی بەگەیەنێتەئەو پلەیەیکەئیبن خەلدون پێی گەیاندبوو... لەوڕووەوە لەیەك دەچن کەهەردوکیان زۆرجارماوەی نوسراوەکانیان لە (کارامەیی کۆمەڵایەتی)یەوە وەرگرتوە. وەلێ لەڕویەکی دیکەوە لەیەکدی جیاوازن... هەرچی ئیبن خەلدونەکارامەییە کۆمەڵایەتیەکەی خۆی لەشێوەی ئامۆژگاریکردەیدا پێشکەش نەکردوە، وەك

میکیاڤیلی کردویتی... بەڵکو هاتوەبەشەجودا جوداکانی کۆکردۆتەوە و پەیوەستەگیەکی لۆژیکی نیمچە تەواوی لەنێواندا دروست کردون... بەوەش فەلسەفەیەکی گشتی هێنایەکایەوە بەبناغەی نوێوە...کەواتە ڕەوایە بێژین ئەولەهەمان کاتدا پسپۆڕێکی کۆمەڵایەتی وفەیلەسوفیش بوو... هەرچی میکیاڤیلیەئەو پەڕیەدەتوانین بەپسپۆڕێکی کۆمەڵایەتی پێناسی بکەین.

## تێڕوانینی خەڵكی لەودووانە

ئەوەی شیاوی باسكردنە ئەوەیە خەڵكی بەوچاوەوە سەیری میكیاڤیلی ناكەن كەسەیری ئیبن خەلدون یان پێ كردوە... خەڵكی لە میكیاڤیلی تورە بوون و جنێویان بەنوسراوەكانی دەدا... چونكەهەندێ شتی وایان تێدا دەبینی كەلەگەڵ یاساكانی ڕەوشت و ئاینە كاندا وێك نەدەهاتنەوەی... هەرلەبەر ئەوەش ناوی (میكیاڤیلی)بویەجنێوێ بەسەر زاریخەڵكیەوەوهەركات بیانەوێت باس لەسیاسەتی فروفێڵ وخەڵەتاندن بكەن، میكیاڤیلی یان وەبیر دەكەوێتەوە... (لرنەر)دەڵێت: (میكیاڤیلی لەهرزی خەڵكی داهاوشانی خودی شەیتانە) (١٢)

(ئیبن خەلدون)لەلایەنی خەڵكەوە ئەو ناوبانگ وشۆڕەتە بەدەی وەبەردا نەبرا... بەڵكو خەڵكی لەئافاریدا تەنها ئەوەیان كردكەلەسەدەكانی دواتردا پشت گوێ یان خست وفەرامۆشیان كرد، وەك لەبەشێكی ئەم پەرتوكەدا بەدورودرێژی باسی دەكەین... لەوانەیە زیادەڕەوی نەكەم ئەگەر بڵێم : بۆچونەكانی ئیبن خەلدون لەبۆچونەكانی هاوڕێ ئیتالیەكەی پترلەیاساكانی ڕەوشت وئاینەكانەوە دوور بوون ولادەر تریش بوون... بەڵام خەڵكی دەركیان بەوەنەكرد... (ئیبن خەلدون) تایبەتمەندی ئەوەی هەبوو، كەشێوازی دبلۆماسیانەی پەیڕەو دەكردو ڕاو بۆچونە لادەرەكانی بەروكەشێكی بریكەدار دادەپۆشی... هەمیشەبۆپشت ڕاست كردنەوەی بۆچون و بەڵگەكانی ئاماژەی دەدا بەئایەتی قورئان وفەرمودەكانیپێغەمبەر (د.خ)... لەكۆتایی وتەكانیشیدا بەزۆری هەندێ دەربڕین ورستەی ئاینی بەكار دەهێنا وەك: (خودا زاناترە)، (خودا ڕێنمونی كاربەرەو ڕاستی)...هتد.

ئیدی خەڵكیش وایان دەزانی ئەمیش وەكو شەرعناس و مێژوە وانەكانی تر لەسەر ڕێبازی خوداو پێغەمبەرەكەی دەڕوات بەڕێوە... دەناگەر مەرامە ڕاستەقینەكانی ئەویان بەڕونی بۆدەربكەوتایە، لەوانە بوو هێرشێ كوێرانەی وایان بكردایەتەسەر كەهەرگیز میكیاڤیلی هێرشی بەوجۆرەی بەخۆیەوە نەدیبێ.

## پەراوێزەکانی سەرەتا:

1) mahsin Mahdi ،Ibn khaldun 's philosophy of History ،George Allen & Unwin، (London 1957).

٢) گۆڤاری الفكری تونسی، مارس ١٩٦١، ل ٨٣.

3)8.p.cit. op ،Mahdi.

4)286. p ،Ibid.

5)293. p ،Ibid

6)F. C.S. Shillerr ،formal logic، (London. 1930) ،p. 398-399

٧)بگەڕێوە بۆ پەرتوکی "مهزله العقل البشری" نوسینی نوسەری ئەم چەند دێڕە.

٨)مقدمه ابن خلدون (چاپی لجنة البیان العربي)ل ٢٦٦.

٩)م س، ل ١٢٨- ١٢٩.

10)Max Lener ،Introduction ،in Machiavelli ،the prince، (Modern Library) ،p.xxxi.

١١)گۆڤاری الرساله، ژماره بیست سالّی یەکەم، ١٩٣٢/١١/١، قاهیره، ل ٢٠.

12)Max Lerner

# بەشی یەکەم

## (خەسڵەتەکانی لۆژیکی کۆن) (۱)

بۆنەوەی لەهەڵوێستی ئیبن خەلدون تێ بگەین لەبەرانبەر لۆژیکی کۆندا، پێویستە چەردەیەك زانیاریمان هەبێ سەبارەت بەسروشت وخەسڵەتەکانی ئەو لۆژیکە... لێرەدا ئەوەی شیاوی ئاماژە پێدان بێ ئەوەیەکەئەو لۆژیکەلەسەرەتادا شەقاوێکی پێشکەوتنخوازی مەزن بوو لەدێرۆکی بیری مرۆڤایەتی دا...چونکە یەکەمین هەوڵ وتەقالا بوو بۆ دیسپلین کردن ودانانی بنەماو ڕێسا بۆ بیر... لەڕاستیش دا (ئەرستۆتالیس)کەفەزڵی دانانی ئەو لۆژیکەی بۆدەگەڕێتەوە، یەکێك بودلەوانەی خاوەنی ئاوەزێکی گەورەو سەنگین بوون کەلەمێژوودا ئاوەزی ئاوها بەدەگمەن دەبینرێ.

وەڵێ گرفتی نێو لۆژیکەکەی (ئەرەستۆ)ش، وەك گرفتی نێو هەموو سیستەمەفیکری و کۆمەڵایەتیە مەزنەکانی دیکە وایە... سەرجەمیان لەسەرەتادا چالاکانە دەست پێ دەکەن ولەبارو گونجاون، دواتر پەیتا پەیتا بەرەو دۆگمان بون وگەندەڵ بوون دەچن... بەدەربرینێکی دیکە: ئەم لۆژیکەش گۆڕاو بویە کۆمەڵی کۆت و بەند وپرۆسەی بیرکردنەوەیان پەك دەخست وکۆتیان دەکرد، ئەگەرچی لەسەرەتادا بەرخۆدان وشۆڕشێکی (مەزنی فیکری بوو-وەرگێڕ).

لەچاخەناوەڕاستەکاندا، بیرمەندان بەچاوی سەرسامی وپیرۆزیەوە تەماشای لۆژیکەکەی ئەرستۆیان دەکرد، بەجۆرێ گەشتنە ئەودەرئەنجامەی کەئەو قاڵبەی ئەرستۆ دایدنابوو بۆبیرکردنەوە، بەقاڵبی هەرەکۆتاییان دادەناو پێیان وابوو بۆ

هیچ کەس ڕەوانیە ئەو قاڵبە بگۆڕێت یاخود گومان لەڕاستی ودروستی یەکەی بکات.

لەماوەی داهاتوودا، شرۆڤەی دوان لەو خەسڵەتە سەرەکیانە دەکەین کەلەلۆژیکی ئەرستۆدا بەدی دەکرا... پێم وایەئەو دووخەسڵەتەش بەناوبانگترین ودیارترین خەسڵەتی بوون وزیاد لەهەرخەسڵەتێکی دیکەش پەیوەندیان بەبابەتی ئەم پەرتوکەوەهەیە... یەکەمین خەسڵەتی ئەولۆژیکە ئەوەیەکە لۆژیکێکی (فۆرمی)بووە، دوەمینیان ئەوەیە کەلۆژیکێکی هەڵگوازتەکاری (استنباطی)بووە...

## فۆرمیی بوونی لۆژیك:

ئەرستۆ جیاوازی دەكات لەنێوان فۆرمی شتەكان و مادەی شتەكاندا.... بۆنمونە (پەیكەرێك)فۆرمێكی هەیە كەبریتی یەلەشێوە ڕواڵەتیەكەی. هەروەها مادەیشی هەیە كەبریتی یەلەومادەیەی (وەك مس یان مادەكانی هاوشێوەی كەپەیكەرەكەیان لێ دروست دەكرێت)... ئەرستۆ زاراوەی (هیولی)وەك ناوێك بڕیبوو بەسەر (مادە)دا... پێویستە لێرەدا ئاماژەبەوە بدەین كەزاراوەی (هیولی)لەهەندێ ڕووەوە جیاوازە لەوەی كەهەنوكە ئێمەبە (مادە یاخود بەرەگەز)دەربڕی لێ دەكەین... (هیولی)لای ئەرستۆ واتای ئەو مادەبنەڕەتیە دەگەیەنێت كەهەموو شتەكانی لەگەردوندا لێ پێك هاتوە... ئینجا ئەم (هیولی)یەش بەچەندین ڕواڵەت دەردەكەوێ بەگوێرەی ئەو وێنەو قاڵبەی كە وەری دەگرێت. (٢)

كاتێ لۆژیكەكەی ئەرستۆ بەوە پێناسەدەكەین كەلۆژیكێكی فۆرمی یە، مەبەستمان لەوەیەكە ئەو لۆژیكە گرنگی بەوێنەو ڕواڵەتی شتەكان دەدات ومادەكەی فەرامۆش دەكات... ڕونترین وئاشكراترین پراكتیزەكردنی ئەم لۆژیكە لەبواری (ئەندازە)دا دەبینرێت... ئەوەتا ئەندازیارەكان گرنگی دەدەن بەو شێوەیە كەشتەكان وەری دەگرن، وەك قوچەك و خەپلەیان وەك سێ گۆشەو بازنەو لاكێشە... ئیدی گوێ نادەن بەو مادەیەی كەئەو شێوانەی لێ پێك هاتوە... كاتێك لۆژیككارەكان سەیریان كرد لۆژیكەكەیان لەبواری ئەندازەو زانستە ماتماتیكی یەكانی تردا سەركەوتنی بەدەست هێنا، ئیدی وایان گومان برد كەلەهەموو بوارە فیكریەكانی دیكەش دا سەركەوتن بەدەست دێنێت... لەبەر ئەوە دەبینین هەموو لێكۆ ڵینەوە (فیزیكی وڕەوشتی و كۆمەڵایەتی و دەرونی...هتد)یشیان، مۆركی ئەو لۆژیكە فۆرمییە یان پێوە نراوە.

بۆنمونە: ئەگەر لە (دادگەری)بکۆڵنەوە، پێیان وایە ئەمیش بەهەمان مەردەی (هەرەم یان سێگۆشە)بونێکی سەربەخۆی هەیەو خاوەنی خەسڵەتی نەگۆڕو چەسپاوە، ئیدی بەوتەرزە دەست دەکەنە وتوێژ لەبارەی ئەو بابەتەوە، بەگوێرەی وێنە ئەبستراکتەکەی، بێ ئەوەی سەرنجی ناوەڕۆکەسۆسۆلۆژیەکەی بدەن، واتە بۆمادەکەی کەلە ڕووداوی بەش بەش پێك دێت وبەگۆڕانی بارودۆخی دەوروبەری، ئەویش گۆڕانی بەسەردا دێت.

لەڕاستی دا ئەرستۆ کاتێ لۆژیکەکەی دانا، مەبەستی ئەوەنە بوو... بەڵکو لەلێکۆڵینەوەکانی دا پێداگری دەکرد لەسەرگرنگی وبایەخی لێکۆڵینەوە لە (مادە)ی فیکر، سەرباری وێنەکەی... لەدیدی ویدا مادەو فۆرم لێك دانابڕێن وجیانابنەوە... هیچ مادەیەك بەبێ وێنەو شکڵ نابێ، بەهەمان شێوە هیچ وێنەو شکڵێکیش بەبێ مادەبوونی نیە... وەڵێ ئەو لۆژیککارانەی لەدوای ئەرستۆ پەیدا بوون، ئەخاسمە لەسەدەکانی ناوە ڕاستدا، ڕێڕەو ورێبازی مامۆستا یەکەمینەکەی خۆیانیان فەرامۆش کرد (واتەئەمانیش وەك هەموو شوێنکەوتەکانی ڕێبازە جودا جوداکان یان کرد کەهەمیشە لەڕێبازە یەکەمینەکە لادەدەن — وەرگێڕ)...ئەمانە هاتن هەموو بیر کردنەوەی لۆژیکی خۆیانیان مۆڵ دا تەنها لەوێنەو ڕواڵەت وشکڵی شتەکاندا، بەمەش دەستیان کردەهەڵفڕین لەجیهانی ئەبستراکت بوونی بیردا، دیارەئەمەش زۆر دوورە لەڕەوتە ڕاستەقینەکانی ژیانەوە). (٢)

بیرمەندەکان لەژێرکاریگەری لۆژیکی وێنەیی دا، وایان لێهات بەسوك وبێ ئەرزش سەیری ڕوداوە بچکۆلە و جودا جودا بەرهەرستەکانیان دەکرد، پێیان وابوو ئەوشتانە نابنەهۆی گەیشتن بەزانستێکی دڵنیایی هێنەرو ڕاست و دروست... لەدیدی ئەواندا زانستی ڕاست ئەو زانستەیەکە لەئەنجامی سەرنجدان لەمەسەلەگشتی و گشتگیرەکانەوە دروست دەبێ، ئینجا ئەو مەسەلانە سەقامگیرن وناگۆڕێن، کەواتەمەسەلە گەڵێ ڕاستەقینەشن، بەپێچەوانەی ئەوڕوداوە

گچکەوبەرهەستە گۆڕدراوانەوە کە بە ئەندازەی لەباریان بۆگۆڕانکاری لەهەقیقەت و ڕاستی دوورو خاڵین... بیرمەندەکان زیادە ڕەویەکی زۆریان کرد لەم جۆرە بیرکردنەوەیەدا، بەڕادەیەك وایان لێهات وەك ئەوەی لەنێو (قوللەی عاجی)دا بژین، بەواتایەکی دیکە: تەنها بیریان لەئاسمان دەکردەوە و ئەوسەرزەمینەیان پشت گوێ دەخست کەتیای دادەژیان.

یەك لەوبەسەرهاتە کۆمیدیانەی کەلەم ڕووەوە دەگێڕدرێتەوە ئەم بەسەرهاتەیە: دەڵێن ڕۆژێك کۆمەڵێ بیرمەندی ئەوروپی لەچاخەکانی ناوەڕاستدا، دانیشتوون قسەو باس و دەمبەدەمەیان لەسەر ددانەکانی هەسپ کردووە، هەرکامێکیان بۆ چونێکیان دەبێت.. سەیرەکەش لەوەدایە کەئەسپەکە لەپاڵیاندا دەبێت، دەیانتوانی بچن سەیری ددانەکانی بکەن، بەڵام ئەمەیان نەکرد. چونکە پێیان وابوو کارێکی ئاوا شایستەی بیرمەندانێکی وەکو ئەوان نیە!! هەروەها بڕواو متمانەی تەواویان هەبوو بەوەی کە لەڕێگەی بیرکردنەوەی ڕوت و دەمبەدەمەی لۆژیکیەوە دەتوانن بگەنە هەقیقەتی ددانەکانی ئەسپ.

شیاوی باسکردنە، زۆرینەی بیرمەندە موسوڵمانەکانیش لەم سەدە دوایانەدا لەپرۆسەی بیرکردنەوەیاندا بەهەمان ڕێگەدا دەڕۆشتن... دروست وەك ئەوەی ئیبن خەلدون لەپێناسەکردنیاندا دەڵێت : ئەوانە سەرنج لە "وێنەگەلێ "دەدەن کەدابڕنراون لە"ڕەگ وڕیشەکانیان " (٤)... ئەوەتا کاتێ توخنی توێژینەوەی هەندێ لەو کێشانەدەکەوتنەوە کەجیهانی ئیسلامی دەلەرزاند، بۆ نمونە وەك کێشەی (خەلافەت)دەبینین بەجۆرێ لێیان دەکۆڵیەوە وەك ئەوەی خۆیان لەجیهانێ تردابن.

## هەندێ نمونەی واقعی : -

بۆ ڕوون بوونەوەی مەبەست، نموونەیەکی سادە لەمەڕ (ماوەردی)خاوەنی پەرتوکی (الاحکام السطانية)وەردەگرین... ئەولەبەشێکی کتێبەکەیدا تاوتوێی مەسەلەی خەلافەت دەکات کەلەدووشاری جیادا درابێتە دوو پیاوی جیاواز...دیارە ئەمەش هەر بەڕاستی لەمێژوی ئیسلامیدا ڕوی داوە، ڕۆژگارێ کەخەلیفەکانی (فاتمی)لەقاهیرە لەگەڵ خەلیفەکانی (عەباسی)لەبەغدا ناکۆك بوون... ئەم ناکۆکیەش بەرەنجامی ڕامیاری وکۆمەلایەتی وکەلتوری جۆراو جۆری هەبوو... وەلێ (ماوەردی)هیچ گوێ بەوەنادات کەبەڕاستی ڕوی داوە، بەلکوتەنها لەڕووی ڕواڵەتی ئەبستراکتەوە سەرنجی بابەتەکە دەدات وڕێی شەرعناسەکان دێنێت وتاوتوێیان دەکات.

هەندێ لەشەرعناسەکان گوتویانە: پێشەوایەتی دەدرێت بەوپیاوەیان کەپێشی ڕکابەرەکەی دەکەوێت لەوەداکەپەیمان لەخەلك وەر بگرێت، پێشەوایەتیلێرەدا وەك ئەوەوایە دووپیاو بیانەوێ ژنێك بهێنن، جا لێرەدا مارەیی ئەو پیاوەیان دادەمەزرێت کەلەپێش دانەوژنە مارەدەکات.

هەندێکی ترلەشەرعناسەکان پێیان وایە ناکۆکی نێوان ئەو دووپیاوە پێویستە لەڕێگەی (قورعەکەشی)دوە یەکلایی بکرێتەوە، تاکو نەبنەدژی یەکتری، ئینجا (قورعە)بۆهەرکامیان دەرچوو، پێشەوایەتیبۆ ئەوە...هەندێکیتر لە شەرعناسەکان دەڵێن: پێویستە هەریەك لەو دووپیاوە سازش بۆیەکتری بکەن وواز لەپێشەوایەتی بێنن بۆبەرانبەرە کەیان، تاکو ئاشوبەکە یەکلا بێتەوە، ئیتر (ئەهلی حەل و عەقد)یەکێکیان هەڵبژێرێت، یان هیچکامیان هەڵنەبژێرێت ویەکێکی دیکەبێنێت ومافی پێشەوایەتی بداتێ، هەندێ شەرعناسی دیکەش ڕێی تریان هەیە (٥)

هەمووئەوشەرعناسانە، بە (ماوەردی)شەوە، ئەوناکۆکیە توندوتیژە لەبیردەکەن کەلەئیسلامدا (یان لەنێو سیستەمی حوکمداری ئیسلامیدا – وەرگێڕ)لەپێناوی خەلافەت دا سەری هەڵداوە وچۆن هەریەکە لەڕکابەرەکان هەوڵی داوە بەرانبەرەکەی بەتەواوی لەنێوبەرێت تاکوگۆڕەپانەکەی بۆ تەخت بێت وبەتەنها بۆخۆی بمێنێتەوە (وەرگێڕ)...لەدیدی ئەوشەرعناسانەدا ئەم مەسەلەیە لەوبابەتە بچوك ولاوەکیوناسەقامگیرانەیە کەشایستەنین بەوەی شەرع لێیان بکۆڵێتەوە... هەرلەبەرئەوەش تەنها لەڕووی وێنەو ڕواڵەتەوە لە (خەلافەت)یان دەکۆڵیەوە، بەگوێرەی ئەوەی لەهزرو ئەندێشەی خۆیاندا بوو... بەدەربڕینێکیتر: ئەوان باسیان لەوەدەکرد کەپێویستەخەلافەت چۆن بێت، نەك باس لەوەبکەن کەخەلافەت بەکردەوە چۆنە... لەبەرئەوە دەبینین ئەوان وبۆچونەکانیان سەبارەت بەخەلافەت لەجیهانێکدا دەژین، خەلافەتیش بۆخۆیلەجیهانێکی تردا.

ئەوان هەرگیز بۆجرکەیەکیش هەڵنەکوڕمان لەخۆیان بپرسن : چۆن دەگرێت قورعەکەشی بکرێت بۆ نمونە لەنێوان خەلیفەی عەباسی وخەلیفەی فاتمی دا، ئایا هەرگیز هیچکام لەوانە بەئەنجامی قورعەکەشی قایل دەبن؟ ئایا بەگوێرەی ئەو قورعەیە سازش لەسەر ئەوەدەکەن کەبەمافی خۆیانی دەزانن؟ (وەرگێڕ)... یاخود ئایا هەڵوێستی دەست وپێوەندو داروودەستەی هەرکامێکیان چۆن دەبیت؟ ئەوان چۆن قایل دەبن بەوەی خەلافەت بکەوێتە دەستی دوژمنە هەرەگەورەکەیانەوە؟ مرۆڤ (ئیترئەومرۆڤە هەرکەس بێت)ناتوانێت دەست هەڵبگرێت لەوپۆستە مەزنەو ئەومال وسامانە بەلێشاوە بۆکەسێکی تر !! مەگەر ئەوکەسە شێت بێت یان یەکێك بێت لەفریشتەکانی خودا؟... لەڕاستی دائەوشەرعناس وبیرمەندانەی کەپەیڕەوکاریئەولۆژیکیەفۆرمیە بوون، لەبیرکردنەوەیاندا سەبارەت بەکاروبارە جیاوازەکانی ژیان، بەزۆری بەم

جۆرەبیریان دەکردەوە... تائەمڕۆکەش زۆرینەیان لەسەرهەمان جۆرێبیرکردنەوە ماونەتەوە.

بۆنمونە: سەرنجێڕاوبۆچونی شەرعناسەکان بدەلەبارەی (بانك)ەکانەوە، ئەوشەرعناسانە، ئەوڕاستی یەلەبیردەکەن کەبانکەکان کۆڵەکەی ژیانی ئابورین لەم سەردەمەی ئێمەدا، بەجۆرێ کەئەستەمە ژیانێکی ئابوریڕێك وپێك دروست بکرێت بەبێ بوونی ئەوبانکانە کەپارەو سامان وەردەگرن لەوکەسانەی ناتوانن سامانەکە بەرهەم بێنن ودەیدەنە ئەوکەسانەی کەدەتوانن بەرهەمی بێنن لەبەرانبەر قازانجێکی کەم وساددا، ئەگەرئەمەش نەبوایە، ماڵ وسامانەکان وەك سەردەمانی کۆن بەشاردراوەیی لەژێرزەوی دادەمانەوە شەرعناسەکان چاولەم هەموو ڕاستی یەدادەخەن و، دەست بەجێ وبەوپەلەپڕوزە حوکمی ئەوەدەردەکەن کەکاری بانکەکان حەرام (قەدەغە)یە چونکە وەك (سوو)وایەکەئیسلام یاساغی کردەوە... ئەوان نایەن لەڕوی ناوەڕۆکە کۆمەڵایەتیەکەیەوە سەرنج لە (سوو)بدەن، بەڵکو لەڕوی شێوە یاخود وێنە لۆژیکیەکەیەوە سەرنجی لێ دەدەن... لایئەوان (سوو)هەموو کارێکە کەتیایدا برێك پارە بە (سوود)قەرزبکرێت، ئیدیهیچ جیاوازیەك نیەلەنێوان کاری ئەوسووخۆرەی پارەی (سوو)دەدالەسەردەمی نەفامیدا، لەگەڵ کاری بانکەکان لەم سەردەمەی ئێمەدا... لای ئەوان ئەوەندە بەسە بۆ یاساغ بوونی کارێك کەلەسەر ئەو وێنەو قاڵب وشێوەیە بێت کەئەهی لێ کراوەو یاساغ کراوە، ئیترهیچ بەلایانەوە گرنگ نیەکەلەڕووی کردەییەوە ئەوکارە زیان بەخشەیان سوود بەخش.

سەیرلەوەدایەکەئێمە لەکۆمەڵگەی ئیسلامیدا زۆرێك لەدیندارەکان دەبینین بەکردەوە (سوو)دەخۆن، تەنها ئەوەندەهەیە کەئەوکارەلەشێوەی کڕین وفرۆشتن وبازرگانیدا دەکەن، واتە ئەوان (بەڵێننامەکانی سوو)دەگۆڕن بەوێنەو فۆرمێکی شەرعی، ئیدی وادەزانن ئەوکارەلەڕیسوایی (حەرامێتی)

ئەومامەڵەیە فوتاریان دەکات. ئەمانە پارێزگاریلە (فۆرمی)مەسەلە شەرعیەکان دەکەن، ئیدی گوێ نادەن بەوەیگەرپێچەوانە بن لەگەڵ نێوەرۆك یاخود مادەکەی دا... زۆرجاریش دیومانە هەندێك لەوکەسانە بەگوێرەی داڕشتە (صیغە)شەرعیەکانیان ستەمیان لەخەڵکی کردوە، دروست وەك سووخۆرەکانی سەردەمی نەفامی.

هەندێ خەڵکی دۆگمای دیکەهەن کەماڵ وسامانەکانیان لەبانکەکەدا دادەنێن بەبێ ئەوەی قازانجی ئەوپارەیەقبوڵ بکەن ووەری بگرن...زۆرمان باسی ئەوەی پێشوی موسوڵمانەدەوڵەمەندەکانی هیندستان بیستوە، کەبانکەکانی بەریتانیا لەپارەو سامانی ئەوان قازانجێکی زۆروبێ شوماری کۆدەکردەوە، بەبێئەوەی هیچ جۆرە قازانجێکیان لەوسامان ومالە دەست بکەوێت... ئەمەش مانای ئەوەیەکە بەدەستی خۆیان سودوقازانجیان بەخشیوە بەدوژمنەکانیان، تەنهاو تەنها لەپێناوی ئەوەدا پارێزگاری بکەن لە (فۆرمی)فەرمانە شەرعیەکان!!.

## هەڵگوازتەیی بوونی لۆژیك:

دووەمین مۆرك وخەسلەتی لۆژیکەکەی ئەرستۆ ئەوەیەکە پەیڕەوی ڕێچکەی هەلگوازتەکاری دەکات... مەبەستمان لەمەش ئەوەیە، لۆژیکەکەی ئەرستۆ لەسەرەتاوە بەپشت بەستن بەهەندێ (کۆبەرەنجامی گشتی عەقلی)دەست بە توێژینەوە دەکات، دواتربەرەنجامی بچوك وتایبەتی لێ هەڵدەگوازێ... لێرەش دا پێچەوانە دەبێتەوە لەگەڵ ڕێبازی زانستی نوێدا... چونکەئەم زانستەلەسەربنەمای گواستنەوە لە (بەرەنجامی بچوك) وە بۆ (بەرەنجامی گشتی)دروست بوە، ئەم ڕێچکەو ڕێبازەش ناونراوە (ڕێبازی ئەزمونکاری)... ئەمەلەکاتێکدا لۆژیکەکەی لەمەڕ ئەرەستۆ هەلگوازتەکاریە ولە (کۆئەنجامە گشتیە عەقلیەکان)دوە دەگوازێتەوە بۆ بەرەنجامی تایبەت و بچوك.

گرنگترین ڕێگەش کەئەو لۆژیکە بەکاری دێنێت لەپرۆسەی هەلگوازتنەکەدا بریتی یەلەڕێگەی (پێوانەکاری - syllogism)... پێوانەکردنیش بەشێوەیەکی ئاسایی لەسێ بەش پێك دێت کەبریتین لە (پێشەکی گەورەو پێشەکی گچکەو بەرەنجام)... بۆ ڕوون بونەوەی مەبەست ئەونمونە بەربلاوە دێنینەوە کەلەزۆرینەی پەرتوکی لۆژیککارەکاندا دەبینرێ، نمونەکەش بەم شێوەی خوارەوەیە:

١-هەموو مرۆڤێك لەناودەچێ... ...... (پێشەکی گەورە)

٢- سوکرات مرۆڤە ........... (پێشەکی گچکە)

٣-کەواتە سوکرات لەنێودەچێ... ........ (بەرەنجام).

لێرەدا بواری ئەوەمان نیەکەباس لە (پێوانەکاری) بکەین لە هەموو شێوەو ئالۆزیەکانیدا. ئینجا سەرەنجام پێوانەکاریەکانی دیکەش دەکرێت بگەڕێنرێنەوە سەرهەمان ئەو وێنەسادەو ساکارەی کەلەنمونەکەی پێشودا ئاماژەمان پێدا.

گرنگترین بەش لەپێوانەکاری دابریتی یەلەپێشەکی یەگەورەکەی، چونکە بناغەیەکەو هەموو پێوانەکەی لەسەردادەمەزرێت... گرفت لەلۆژیکەکەی ئەرستۆدا ئەوەیەکەلە پێوانەکاریەکانیدا زۆرینەی جارەکان، پشت بەپێشەکی گەلێ دەبەستێ کەبەرۆتینیان دەداتە قەلەم، بەودیان دەداتەقەلەم کەراستی ودروستیان چەسپاوو نەگۆڕەو بۆهیچ کەس نیە گومانی لێ بکات، هەروەها ئەم پێشەکیانە لەولۆژیکەدابەزەرورەتێکی ئەقلی وادێنە هەژماندن کەهیچ پێویست بەبەلگە ناکەن... بۆ نمونە وەك ئەوەی دەلێین: (هەموو مرۆڤێك تیادەچێت)یاخود (خۆر سبەینان لەرۆژهەلاتەوە هەلدێ) یاخود (گشت لەبەش گەورەترە).

دەلێم لێرەدا گرفتێك هەیە، چونکە هەموو پێشەکیە لۆژیکیەکان لەم شێوە رۆتینیانەنین کەهیچ پێویستیان بەبەلگە نیە.

زانا کۆمەلناسەکان بۆیان روون بوەتەوە، هەموو ئەوەنێمە بەئاسایی ورۆتینی لەقەلەم دەدەین لەراستی دا شتانێکی رێژەیین، سەرجەمیشیان مل کەچی باوەکۆمەلایەتیەکان وپێشڤە چونەزانستی یەکانن، لەوانەیە ئەمرۆکەئێمە شتێ یاخود پرسێ بەرۆتینی وئاسایی لەقەلەم بدەین، کەچی دواتر روون دەبێتەوە کەئەوشتەش دەکرێت گومان لەراستی ودروستی یەکەیبکرێت، یاخود گومان لەزەرورەتەئەقلی یەکەی بکرێت... بۆ نمونە: جاران خەلکی بروایان وابوو زەمین تەختەو راخراوەو سەقامگیرەو خۆربەدەوری دا دەسورێتەوە... لەراستیش دا لەبەرچاوی کەسێك دا کەلەم گەردونەدا هیچ نەزانێت جگەلەوەی کەبەچاوەکانی تێ بینی دەکات مەسەلەکە هەروایە وزەوی راخراوەو سەقامگیرەوخۆربەدەوریدا دەسورێتەوە ئیدی هیچ جێگەی سەرسورمانیش نیەگەر ئەورایانە سەبارەت بەزەوی لای ئەو رۆتینی بن وبۆچونێبن کە ناگونجێت گومانیان لێ بکرێت... دوای ئەوەی زانست پێش کەوت، روون بویەوە ئەو بۆچونانە رۆتینی و ئاسایی نین. بەلکو مەسەلەی رۆتینی دیکە هاتن

وجێگەی ئەوانیان گرتەوە، تاوای لێهات بەپێی پێشکەوتنی زانست و شارستانیەت، مەسەلەناسایی ورۆتینی یەکان یەك لەدوای یەك دەهاتن وئەم جێگەی ئەوی دەگرتەوە.

زانستی نوێ لەسەر پرەنسیپی (ئەگەر)دامەزراوە... لەکاتێکدا لۆژیکی کۆن لەسەربنەمای (دڵنیایی)دامەزرابوو... ئینجا ئەم دوو لۆژیکەیەش گەلێك لێك دوورن... ئەرەستۆی پشت بەکۆمەڵێ (پرس)دەبەستێ کەگریمانی ڕاستی ڕەهای دەدرێتە پاڵ... لەبەرئەوە، هەربەرەنجامێك کەلێیەوە بەپێوانەکاری ڕاست هەڵبگوازرێ هەردەبێ ڕاست و جێگەی دڵنیایی وبێ گومانی بێت.

هەرچی زانستی نوێ یە، بۆی هەیە گومان لەهەموو شتێ بکات، هەرلەبەرئەوەش تیۆر و بیردۆز و ڕێساکانی بەگوێرەی ئەزمونکردنی ڕاستیە بچوکەکان دەردەهێنێ، لەولاتریش ڕادەگەیەنێت کە بیردۆز و ڕێسا وەدەست هێنراوەکانی لە ڕووی ڕاستی یەوە سنوردارن، بە گوێرەی ڕاستی و دروستی ئەو ڕاستی یانەی کە لێیانەوە وەرگیراون... بەو واتایەی کەڕەنگە ڕاستی دیکە دەربکەون و کارێ بکەن ئەم بیردۆز و ڕێسایانە ئاتاجیان بە گۆڕین یاخود گونجاندن هەبێت.

## بارەبەری ئارەزووەكان:

ئەوی جێگەی سەرنجە ئەوەیە، پێوانەكاری لۆژیكی لەسەدەكانی ناوەڕاست دا ببویە بارەبەرێ لەپێناوی ئارەزوە تایبەتەكان وبیروباوەڕەمەزهەبیەكاندا... هەركەس گەرەكی بێت بەلگەبێنێتەوە لەسەرڕاستی ودروستی ڕێچكەومەزەبێك، یان بۆچونێكی دیاریكراو هیچی لەسەرنیە جگەلەوەی بەدووی پێشەكیەكی گەوردا بگەڕێت كەگونجاوبێت بۆ هەلگوازتنی ڕایەك یان ڕێچكەیەك لێیەوە... هیچ ناڕەحەتیش نیە بۆی گەر لەنێو وتەی دانایان وپەندەبەربلاوەكان و دەقەناینی یەكاندا ئەوپێشەكیە بدۆزێتەوە... لەودەمەش دا، واتەلەكاتێكدا ئەو پێشەكیەی دیتەوە، ئیدی بەڕاستی یەكی بێ مشت ومڕی دەداتە قەلەم وهەمیشەش وەك چەكێكی بڕندە لەڕووی دژمنەكانیدا بەكاری دێنێت، دژەكانیشی بەڕۆلی خۆیان دەستەوسان نابن لەوەی وەكوئەم بكەن...!.

هەرلەبەرئەوەشە كەدەبینین پەیڕەوكارانی ڕێبازو مەزەبە ڕكابەرەكان وەك چۆن بەشمشێر لەگەلێ یەكداجەنگاون، بەهەمان شێوەش بەچەكی پێوانەكاری لۆژیكیش دژبەیەك جەنگاون.

ئەمەش یانی (پێوانەكاری لۆژیك)یش وەك شمشێری لێ هاتودو هەریەك لەگوروپە دژبەیەكەكان دەتوانێ لەبەرانبەر دوژمنەكەی دا بەكاری بێنێت... چونكەهەرگا، گەرەكیان بوبێت لەبەردەستیاندا سازوئامادەبوە. زۆرجاری واش دەبێ بەهەر هۆیەك بێ، وازلەڕێچكەو مەزەوەكەی خۆی دێنێت، لەم بارەدا دەست دەكاتەبەكارهێنانی پێوانەكاریە لۆژیكی یەكان بۆ پشت ئەستوركردنی بۆچونە تازەكەی، ئیتر ئەوەیلەبیردەچێت كە پێشتر ئەوپێوانەكاریانەی بۆ پشت گیری كردنی بۆچونەپێچەوانەكانی بەكاردەهێنا!!.

هۆكاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی ئەو پێشەكیانەی لۆژیككارەكان لەپێوانەكاریەكانیاندا بەكاری دێنن زۆربە سانایی دەستەبەر دەكرێت، بەڕادەیەك

دەتوانرێت نمونەی ئەو پێشەکیانە لەهەموو جۆرەکان وبۆ پشتگیری هەر ڕاو بۆچونێك بێت وەدەست بهێنرێت.

ڕاستی ئەم قسەیە لەو دەمبەدمە توندوتیژەدا ڕون دەبێتەوە کەلەنێوان گروپە ئیسلامیەکاندا رووی داوە.... هەرکام لەوگروپانە بگری لەبۆچونەکانیاندا پشتیان بەستوە بەئایەتی قورئان و فەرمودەی پێغەمبەر (دخ)، ئەو فەرمودە و ئایەتانەیان کردبوە پێشەکی بۆ پێوانەکاریە لۆژیکیەکانیان، گروپەکانی دیکەش پەنایان بۆئایەت و فەرمودەی دیکە دەبرد. بەوجۆرەجەنگەکەی نێوانیان دەبێتە (سجال)ونەسەرکەوتوی تێدا دەبێ ونەژێرکەوتوو (٦)بۆنمونە سەرنجی ئەو دەمبەدمەیەبدە کەلەئیسلامدا سەبارەت بەکوژرانی (حسەینی کوڕی عەلی)بەرپابوو... هەندێ ڕایان وابوو (حسەین)هەڵەی کرد کاتێ شۆڕشی لەدژی (یەزید)بەرپاکرد، وبەو پێ یەش (یەزید)لەسەرهەق بوو کەئەوی کوشت، ئەمانە پشت ئەستور بوون بەوفەرمودەیەی پێغەمبەر کەدەفەرمێت: (هەرکەس ویستی کۆمەڵ بوونی ئەم ئوممەتەپەرتەوازەبکات، بەشمشێر لێی بدەن، ئیتر ئەوکەسە هەرکەس بێت) (٧)کۆمەڵێکی دیکەلەهەمبەریاندا ڕایەکی پێچەوانەیان هەبوو، ئەمانیش پشت ئەستور بوون بەفەرمودەیەکی تری پێغەمبەرکەدەڵێت: (گەورەی شەهیدەکان لایخودا حەمزەی مامەە، ئینجا پیاوێك یاخیبو بێت لەپێشەوایەکی ستەم کاروفەرمانی چاکەی پێکردبێ وڕێگری خراپەی لێکردبێ، وئەویش کوشتبێتی) (٨)... کاتێ سەرنجی ئەو دوو بۆچونە دەدەین ولێیان دەکۆڵینەوە، دەبینین هەردوکیان ڕاست ودروستن، بەگوێرەی ڕاستی ئەو پێشەکیە لۆژیکیەی کەلێیەوە هەلگوازراوە... دەتوانین بەم شێوەیە ڕێی یەکەمیان داینێین:

١-هەرکەس کۆیی ئوممەت پەرت بکات پێویستە بکوژرێت... .... (پێشەکی گەورە).

٢-حسەین ئوممەتی پەرت کردوە.......... (پێشەکی گچکە).

٣- کەواتە پێویستەحسەین بکوژرێت... .... (ئەنجام).

هەروەها دەتوانین بۆچونی دوەمیشیان بەم جۆرە دابنێینەوە :

١-هەرکەس لەئیمامی ستەمکار یاخی بێت وبکوژرێت دەبێتە گەورەی شەهیدان... . (پێشەکی گەورە).

٢-حسەین لەئیمامی ستەمکار یاخی بوو و کوژرا... ............ پێشەکی گچکە).

٣- کەواتەحسەین گەورەی شەهیدانە... ............ (ئەنجام).

لەوانەیە کەسێ بپرسێ: چۆن دەبێ پەیامبەر دووفەرمودەی ئاوها پێچەوانەو دژبەیەك بفەرموێ؟... لەڕاستی دا ئێمە بەدووری ناگرین پێغەمبەر (دخ)لەدووکاتی جیاوازدا دووفەرمودەی ئاوها بفەرموێ بەگوێرەی پێویستی بارودۆخەکە... ئەویش (د.خ)وەك هەر ڕیفۆرمیستێکی دووربین، پێویستە لەڕووی جودا جوداوە سەرنجی بارو دۆخی ئوممەتەکەی بدات... وادەبێ هەندێ جار ئامۆژگاری نەتەوەکەی بکات بەوەی یەکگرتووبن و یەکریزبن لەبەرانبەر دوژمنەکانیاندا... هەندێ جاری دیکەش واپێویست دەکات ئامۆژگاری نەتەوەکەی بکات تا مل کەچی پێشەوای ستەم کارنەبن... شاراوەش نیەکەئەو مەترسی یەکبەهۆی ستەم وتۆبزی دەستەلآتدارەوە سەرهەڵئەدات زۆرجار کەمتر نابێ لەومەترسی یەکەلە داگیرکاری دەرەکیەوە پەیدا دەبێ لەسەر ئوممەت... کەواتە پێویستە ئوممەت ئاگادار بکرێتەوە لەسەرەنجامی بەدی هەرتکە مەترسی یەکە.

وادیارە لۆژیککارە کۆنەکان لەمە تێ نەدەگەشتن وپاساویان بۆی نەدەبینی... لەبەر ئەوە دەبینین هەریەکەلەگروپە ناکۆکەکان ئەوفەرمودانەی پێغەمبەریان بەدەستەوە دەگرت کەلەگەڵ مەرامەکانیاندا وێك دەهاتەوەو، دەگونجا لەگەڵ ئەوبەرەنجامانەدا کەئەمان خوازیاری بوون... هەرکاتێ فەرمودەیەکی پێچەوانەی ئەم فەرمودەیەشیان بدیایە، بەپەلە پڕوزە دەستیان دەگردە بەدرۆ خستنەوەیی و دەرخستنی لاوازی لەسەنەدەکەی دا (بەپێی زانستی فەرمودەناسی، فەرموده مەتنی هەیەکەبریتی یەلەتێکستی فەرمودەکە. هەروەها

سەنەدیشی هەیە کەبریتی یەلەوزنجیرەکەسانەی دەماو دەم فەرمودەکەیان گێڕاوەتەوە -وەرگێڕ)ئەوەی شیاوە لەم بۆنەیەدا ئاماژەی پێ بدەین، ئەوەیە فەیلەسوفی ئینگلیزی (فرەنسیس بیکۆن) لەبیرکردنەوەی خەلکی سەردەمەکەی خۆیدا دەرکی بەم گرفتە کردوە...ئەو بەسەرهات و چیرۆکی پیاوێ دەگێڕێتەوە کەنکولی وملە جەڕێی کردوە لەکاریگەری نزاو قوربانی... بەم هۆیەوە بردیانە پەرستگاو دەیان تابلۆیان لەو پەرستگایەدا نیشان دا، تابلۆکان ئەوکەسانە هەلیان واسیبون کەخودا لەنقوم بون وخنکان قوتاری کردبوون بەهۆی قوربانی کردن ونزاو پاڕانەوەکانیانەوە. دواترپرسیاری ئەوەی لێکراکە ئایادوای ئەو هەموو نمونەیە دان نانێت بەوەدا کەقوربانی کردن وپاڕانەوە سودوکەلکیان هەیە؟ کابراکەش لەوەلامدا دەلێت: بەلام ئەیتابلۆی ئەوکەسانە لەکوێدان کەسەرەڕێی نزاو قوربانیەکانیشیان هەرلەدەریادا نقوم بوون وخنکان؟ (٩)

بیکۆن لەرێگەی ئەم نمونەیەوە دەیەوێت پێمان بلێت : تابلۆی ئەوانەی ڕزگارو دەرباز بوون لەخنکان، ناکرێ بکرێتە بەلگەیەکی یەکلاکەرەوە لەسەر سودوقازانجی نزاو پاڕانەوەو قوربانی، چونکە ئەو تابلۆیانە نمایشی لایەنێك لەلایەنەکانی هەقیقەت دەکەن، بەتایبەت زۆرێکی ترهەن کەنزاو قوربانی یان کردەوەو سەرباری‌ئەوەش هەرنقوم بوون وبێگومان تابلۆکانیشیان لەپەرستگاکەدا هەلنەواسراوە.

لەبەر ئەوە ڕەوانیە بۆ ئێمەگەرتەنها تابلۆ هەلواسراوەکان بەهەند وەربگرین، گەروابکەین کەواتە ئەو تابلۆیانەمان کردۆتە پێشەکی یەك بۆپێوانەکاریە لۆژیکیەکەمان، بەوەش پرسی ئەو تابلۆیانە فەرامۆش دەکەین کەهەلنەواسراون بەهۆی نقوم بوونی خودانی تابلۆکانەوە.

مامۆستایان (ئەحمەد ئەمین وزەکی ئەجیب محمود)دەلێن: (بەدرێژایی چاخەکانی ناوەڕاست فەلسەفەلەسەربنەمای هەلە بنیات دەنراو نەدەبوە هۆی پەیدا بونی زانستی نوێ، ئەوفەلسەفەیە پێوانەکاری لۆژیکی کردبویە ڕێگەیەك

**بۆ پشتگیری کردنی ڕێچکەوبۆچونەکان... ئینجا پێوانەکاری لۆژیکی لەزۆر ڕویەوە هۆکارو میکانیزمێکی نەزۆکە، چونکە تۆ ناچاریت بەوەی هەرلەسەرەتاوە بەتەواوی خۆت مل کەچ وتەسلیمی پێشەکیەکانی بکەیت، مل کەچ بونێك کەهیچ گومان وڕا ڕاییەك هەڵناگرێ، لەوحەلەشدا هەرچەندە لەتۆژینەوەو بەرەنجام گیریەکەش دا کارامەو کارزان ولێزان بیت هێشتر سنوربەند کراوی لەکەوشەنی ئەو پێشەکیانەدا کەلەسەرەتاوە خۆت داوە بەدەستیانەوەو مل کەچیان بویت...) (١٠)**

## هەندێ نمونەی تر:

پوختەی قسان ئەوەیە کەپێوانەکاری لۆژیکی هۆکارێکی گرنگی پاشکەوتنی زانست وزانیاری بوو لەسەدەکانی نێوەڕاستدا... بەتایبەتیش ئاستەنگێکی گرنگ بوو بۆپەك خستنی گەشەکردنی زانستی کۆمەڵناسی... ئەوێ دەمێ، توێژەری کۆمەڵایەتی نەیدەتوانی بچێتە نێوخەڵك و وەك ئەوەی هەن لێکۆڵینەوەیان لەسەربکات، بەڵکو ناچاربوو بەوەی هەڵگوازتە کاری و پێوانەکاری بکات نەك توێژینەوەو ئەزموونکاری... هەرلەبەرئەوەش ئەو ئاماژە درەوشاوە وخوڵقێنەرانەی لەکیس دەچوو کەلەواقعە کۆمەڵایەتیەکاندان.

بۆنمونە: سەرنج بدە (فارابی)لە (شارە ڕێزمەندو ڕازاوە)کەی دا چی کردوە، ئەو بۆخۆشحاڵی وخۆشگوزەرانی هەرشارێك مەرجێکی پێویست دادەنێت، مەرجەکەیشی ئەوەیە کەئەوشارە پێویستە سەرۆکێکی بێت کەلەهەموو خەسڵەتەکانیدا کامڵ و بێ کەم و کوڕیبێت... ئایا فارابی ئەم مەرجەپێویستەی لەکوێوە هێنا؟ فارابی ئەم مەرجەی لەوپێشەکیەوە وەرگرتوە کەبۆ خۆیی دروستکردوەو لەپاشاندا بیرکردنەوەی خۆیی تێدا سنوربەند کردوەو نەی توانیوە بەهیچ جۆرێ لێی لابدات!!. فارابی دەڵێت: شاری چاك لەجەستەی تەندروست دەچێت، مادەم ئەندامی سەرەکی لەنێوجەستەدا بریتی یەلە (دڵ)وبەتەندروستی ئەو هەموو جەستەکە تەندروست دەبێت، ئەوا پێویستە لەشارە چاك وڕێزمەندە کەشدا سەرۆکێکی چاك وڕێزمەند هەبێت، ئەگینا شارەکە بەڕێی لەنێو چوندا مل دەنێت. (١١)

ئەوبەرەنجامەی کەفارابی پێی گەشتوەو بڕوای تەواوی پێی هەیە، ناکرێ هیچ ڕواڵەتێکی ڕاستی تێدابێت ئەگەر پێشەکیەکەی ڕاست نەبێت، ئینجا گرفتەکەش لێرەدکانەدایە.

پێشەکیەکەی وی لەسەر بنەمای لێکچواندنی شارەکە بەجەستەیەك دروست بوە، جائێمە چۆن دەتوانین دڵنیابین لەڕاستی ودروستی ئەو لێکچواندنە، وادیارە

فارابی پێی وایە ئەو لێکچونانە شتێکی ڕۆتینی وزەرورەتێکی ئەقڵین... تەنانەت لەوانەیە فارابی لەنێو قوللەی عاجی یەکەی دا دانیشتبێت وبیری کردبێتەوە، لەئەنجامیش دا بەو ڕۆتینە گەشتبێ !!کەلەڕاستی دائەم بەرەنجامە هیچ نیەجگەلە ئەندێشەیەکی بنیات نراو لەسەر بناغەیەکی ناواقعی.

بانمونەیەکی تر وەربگرین، نمونەکەشمان بریتی یەلە (فخرالدینی ڕازی) شەرعناسی بەناوبانگ، ئەم پیاوە پەرتوکێکی لەزانستی (فیراسەت)دا داناودو تیای دادەڵێت: (فیراسەت بریتی یەلەوەی بەهۆی بارە ڕواڵەتی و ئاشکراکانەوە بەڵگە هاوەری لەسەر ڕەوشتە شاردراوەکان بکرێت... ئەم قسەیەش بەو واتایە دێ، کەمیزاج یان ئەوەیە خودی دەرونە، یاخود ئامێرو ئامرازی دەرونە لەکردەوەکانیدا... هەرچۆن بگری وهەر کام لەو دوو واتایە بێت، هەردەبێ شێوەی ڕواڵەتی خەلق (ئەو شێوەی مرۆڤێکی لەسەر دروست کراوە – وەرگێڕ)لەگەڵ ڕەوشت وناکاری ناوەکی دا، هەردووکیان دەبێ شوێنکەوتەی مەزاج بن... گەر ئەمە سەلێنرا، ئەوا بەڵگەهاوەری بەهۆی شێوەی خەڵقەوە لەسەر ڕەوشتی ناوەکی، ڕێڕەوی خۆی وەردەگرێ، دروست وەك بەڵگە هاوەری کردن بەدەستەبەربونی یەکێك لەدووشتی پەیوەست وپێکڤە لکاولەسەردەستەبەربونی شتی دووەم، بێگومان ئەمەش بەڵگە هاوەری وبەهەندگرتنێکی ڕاست و دروستە) (١٢)

لەم قسەیەدا ئەدگارەکانی هەڵگوازتەکاری پێوانەیی بەجۆرێکی ڕوون وئاشکرا دەردەکەون، هەروەها ئەو هەڵەیەشی تێدا. دەردەکەوێ کەئەم هەڵگوازتەکاریە پێی دەکات. (ڕازی)دەیەوێت بەڵگە بێنێتەوە لەسەر ئەوەی زانستی فیراسەت لەسەر بنەمایەکی ڕاست دامەزراوە... کەلەڕاستی دا ئەم زانستە" وەك" لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیە مۆدێرنەکان سەلماندویانە" دورترین زانستی کۆنە لەڕاستی یەوە... چونکە ئێستاکە سەلێنراوە کەهیچ پێوەندیەکی ڕاستە وخۆنیە لەنێوان شێوەی ڕوخسارو جستەی مرۆڤێك لەگەڵ ئاکارو ڕەوشتی

دا... کەچی ڕازی وزانا فیراسەت ناسەکۆنەکانی وەك ئەوپێداگیریان دەکرد لەسەربوونی ئەو پێوەندیە.

ڕازی دەڵێت: (ئەوکەسانەی ئاژەڵ ڕادەهێنن وفێری دەکەن، هەر ئاژەڵێکیان بویت ڕێی بێنن بەهۆی خەسڵەتە هەست پێکراوەکانیەوە بەڵگە هاودری دەکەن لەسەر ڕەوشت وناکارە باش وبەدەکانی، ئیدی ئەو ئاژەڵە گوێ درێژبێت یان ئەسپ... هتد، جانەگەر ئەم واتایە لەئاقار ئا ژەڵ و دڕندەوپەلەوەردا لەبەرچاو بگرێت وبەڕونی دەربکەوێت ئەوا لەئاقار مەردوم دا باشتر لەبەرچاو دەگیرێت...)هەروەها ڕازی دەڵێت: (بنەماکانی ئەم زانستە لەزانستی سروشت ناسی ولق و پۆپەکانیەوە، تەنانەت لەگەڵ زانستی نۆژداری دا وەك یەکن، بۆیە هەر ڕەخنەیەك ناراستەی ئەم زانستە بکرێت. ئەوا ڕاستەو خۆ ناراستەی زانستی نۆژداریش کراوە....).

ئێمەنازانین چۆن ڕاستی ودروستی ئەم پێشەکیانە بسەلێنن کەڕازی هێناونی... ئەوەتا جارێك دەڵێت : میزاج یان ئەوەیە خودی دەرونە یان ئامێری دەرونە لەکردەوەکانیدا... یاخود دەڵێت: (مادەم زانستی فیراسەت لەجیهانی ئاژەڵاندا ڕاستە، ئەوا هەردەبێ لەجیهانی مرۆڤانیش دا ڕاستتربێت)... هەروەها دەڵێت: (زانستی فیراسەتیش وەکو زانستی پزیشکی لەسروشت ناسیەوە وەرگیراوە)... هەرچۆن بێت ئەم پێشەکیانەی کەلەدیدی ڕازی دابەڕۆتینی بینراون، ناکرێ لەدیدی توێژەرانی مۆدێرنیشدا بەڕۆتین سەیربکرێن، بەڵکو ڕەنگە پوچ وبێ ناوەڕۆکیش بن لەدیدی ئەم توێژەرانەدا.

بۆئەوەی بەتەواوی دەرك بکەین بەڕادەیئەو هەڵەیەی لەنێو بۆچونەکانی ڕازی داهەیە.. واهەندێ لەو ئەنجامانە دەخەینە پێش چاو کەبەهۆی پێوانەکاریە لۆژیکیەکانیەوە پێی گەشتوە. ڕازی دەڵێت :

* هەرکەس ڕوخساری گۆشتن بێت، کەسێکی تەوەزەل ونەزانە، ئەم بەڵگەیەش لە "گا" وە وەرگیراوە.

★هەرکەس ڕوخساری بچوك بێت، کەسێکی ناچیزەو پیس و لاوازە، ئەم بەلگەیەش لە (مەیمون) ەوە، وەرگیراوە.

★هەرکەس دەم وچاوی درێژکۆللە بێت، کەسێکی کەم شەرم و چەداوە ڕووە، ئەم بەلگەیەش لە (سەگ)ە وە، وەرگیراوە.

★ هەرکەس دەم وچاوی لاوازبێت، کەسێکە زۆر گرنگی بەکاروبارەکانی دەدات، چونکەزۆری بیرکردنەوە وشکەهەلاتنی پێوەیە.

★ هەرکەس کەڕاکەی (ناوچەی نێوان گوێچکەکەوچاو–وەرگێڕ) هەلاوسابێت ورەگی لاملی گۆشتن بێت، کەسێکی توڕەیە، چونکە مرۆڤ لەکاتی توڕەبوندا وا دەردەکەوێ.

کەسێك ڕوخساری ناشیرین بێت ڕەوشتیشی چاك نابێت بەدەگمەن نەبێت، چونکە میزاجی شێوەی دروستکران ورەوشتی ناوەکی هەریەك میزاجە، جائەگەر ئەو میزاجە تەواو کامڵ بێت ئاسەواری ئەو کامڵێتی یەلەسەر ڕواڵەت وناواخنی مرۆڤ پێکەوە دەردەکەوێ، ئەگەر ناکامڵیش بێت بەهەمان شێوە.... (٢)

## كەسایەتی لۆژیككارەكان:

كاریگەری پێوانەكاری لۆژیكی تەنها لەسەر بواری زانستی كورت هەڵنەهێنراوە، بەڵكو پەلی كێشاوە بۆ نێو بواری كەسێتی لەژیانی پەیڕەوكارانی ئەو ڕێچكەدایە.

لای هەندێكیان پێوانەكاری وای لێهات وەك ئەوەی یاری یەك بێت لەدەستیان داوبەگوێرەی ئارەزووەكانیان یاخود بەپێی بەرژەوەندیە كانیان ئاراستەیان دەكردو بەكاریان دەهێنا... ئاشكرایە هەندێ لەلۆژیككارەكان زۆر بالادەست بوون لەئاراستەكردنی پێوانەكاریە لۆژیكیەكانیدا بەجۆرێك توانیویانەبەلگەی یەكلایی كەرەوە بێننەوە بۆ پشت گیری كردنی ڕایەك وپێچەوانەكەشی...

وادیارە زانیاری فراوان و ئاگایی ئەوان یارمەتی دەرێكی باشیان بوە بۆئەوەی هەرپێشەكیەكیان گەرەك بوبێت دەستیان كەوتبێ ئیدی ئەو پێشەكیە لەهەر جۆرێك بێت، بۆیەهەركاتێ نەیان توانی بێت لەقورئاندا ئەو پێشەكیە دەستی خۆیان بخەن، پەنایان بردۆتەبەر فەرمودە، ئەگەر لەمیشدا دەستیان نەگەوت پەنایان بردۆتە بەر وتەی زانایان وپەندو نمونە بەربلاوەكان... ئینجا ئەگەر لێرەش دادەستەو سان وەستابێتنەوە، هیچ سڵیان یان نەكردۆتەوە لەوەی پێشەكی ئەقلی بۆخۆیان دروست بكەن و، دواتر بەوەیشی لەقەلەم بدەن كەئەو پێشەكیە یەكێكە لەوڕۆتینانەی كەهەموو ژیرەكان لەسەر ڕاستی و دروستی یەكەی كۆك ویەك دەنگن... ئینجا واوەیلا بۆئەوكەسەی كەبەرەخنەو نارەزایی لەڕوویاندا دەوەستێتەوە !.

دەكرێت بێژین (جاحظ)كەم تازۆرێك لەم جۆرە مۆدیلە بووە، دەبینین لەزۆر بابەتدا شتی نوسیودو لەهەمان كاتدا لەپێچەوانەی ئەو بابەتانەشدا شتی نوسیوە، نوسراوێكی نوسیوە لەستایشی (مەی)داو، نوسراوێكی دیكەیشی لەسەرزەنشت كردن وبەخراپ باسكردنیدا داناوە... هەروەها نوسینی نوسیوە

لەستایشی نوسەراندا ولەسەرزەنشت کردنیشیاندا... هیچ دودڵیش نەدەبوو لەوەی جارێك فەزڵی عەلی بدات بەسەر سەحابەکانی تردا، جاێکی دیکەش بیخاتە دوای هەموو سەحابەکانەوە!! هەروەها دەگەڕایەلگەی دەدۆزیەوە بۆهەندێ گرۆهی ئاینی لەدژی دوژمنەکانیان، کەچی پاشتر مەسەلەکەی پێچەوانە دەکردەوەو ئەمجا بەلگەی بۆدوژمنەکانیان دەدۆزیەوە لەدژی ئەمان!!.

یەکێك لەوبەسەرهاتە سەیروکۆمیدیانەی کەلێی دەگێڕدرێتەوە سەبارەت بەوەی کەچەند شەیدای پێوانەکاری لۆژیکی بووە، ئەم ڕووداویە :

دەڵێن ڕۆژێك (جاحظ)لەگەڵ (ابن ماسویە)داپێکەوە لەسەرخوانی یەکێك لەوەزیرەکان گرد دەبنەوە... (ابن ماسویە) پزیشك بووە... خۆراکەکە بریتی بوو لەماسی و شیرەوا (وەرگێڕ —لای پزیشکەکانی ئەو سەردەمەش باو بوو گوایەخواردنی ئەو دووخۆراکە پێکەوە زیان لەتەندروستی دەدات. بۆیە (ابنماسویە)ئامۆژگاری (جاحظ)دەکات کەهەردوو خواردنەکە پێکەوە نەخوات... (جاحظ)گوێ نادات بەئامۆژگاریەکەی بەلکو دەستی کردەمشت ومڕێکی لۆژیکی لەگەڵ ئەو پزیشکەدا و گوتی: ئەی شێخ، لەوە بەدەرنیە کەماسی یەکە لەسروشتی شیرەکەبێت یاخود. دژی بێت، جانەگەر دژی یەکتربن ئەوا ئەمیان دەوای ئەویانە، ئەگەر یەك سروشتیان هەبێت، ئەوا باوای دابنێین کە هەرلەیەکێکیانمان خواردوە !!. (ماسویە)لەوەلامدا دەڵێت: (بەخودای من شارەزای کەلام نیم "مەبەست لەزانستی کەلام-وەرگێڕ "بەلام باوکی عوسمان بەدڵی خۆت بخۆ، ئینجا بزانە سبەینێ چ دەبێ) (جاحظ)بۆشانەخرێکردن زۆری خوارد لەئەنجامدا ئەوشەوە لایەکی لەشی وشك بوو هیچ جووڵەو هەستێکی تێدانەما... ئەوجاگوتی : دەی بەخودای ئەمەبەرەنجامی پێوانەکاری ئەستەم بوو) (١٤)

ئەم بەسەرهاتە لەوانەیە ڕاست بێت ولەوانەشە ڕاست نەبێت... بەلام دوورنیەڕوداوی ئاوهابەسەر (جاحظ) داهاتبێ بەتایبەت کەدەبینین هێندە شەیدای پێوانەکاری لۆژیکی بووە... ئەو چیرۆکەش لەگریمانەی ڕاست بونی دا،

نمونەیەكی باشە بۆئەو هەڵەیەی كەلۆژیككارەكان بەهۆی پێوانەكاریەكانیانەوە تێوەی دەگلێن وتێی دەكەون... ئیدی بەسە هەڵەی ئاوها ببێتەهۆی ئەوەی لایەگیان وشك بێت؟!.

یەكێكیتر لەو هەڵەو ناتەواویانەی كەزۆرجار لۆژیككارەكان بەهۆی پشت بەستنیانەوە بەپێوانەكاریی، تێی دەكەون، بریتی یەلەوەی زۆربەپەلە هەرهەواڵێك ڕەت دەكەنەوەو بەدرۆیدا دەخەنەوە كەنامەئلوف بێت لەلایان ونەچێتە ئەقڵیانەوە... زۆرجاریش لەم سەردەمەی خۆماندا ئەوهەڵەیان لێ دیتراوە... لەم ڕووەوە دەگرێ چیرۆكی پەیدابوونی ڕادیۆ لەعێراقدا وەك نمونەیەك باس بكەم... بەرلەچارەگەسەدەیەك، كاتێ‌بۆیەكەمجار ڕادیۆ لەعێراق داپەیدابوو كابرایەكم بینی گاڵتەی بەڕادیۆش وبەوكەسانەش دەكرد كەبڕوای پێ دەكەن!.

بەڕادیۆی دەگوت : كاڵایەكی بازرگانیە ومەبەست لێی چاوبەست كردن وگاڵتەكردنە بەخەلكی، ئەگەرنا، هیچ ماقوڵ نیە ڕادیۆ دەنگێك لەجێگەیەكی دوورەوە وەربگرێت. ئەگەر ڕادیۆ ڕاست بوایە وڕاستی بكردایە دەمانتوانی دەنگی (حاجی محەمەد)ی پێ ببیستین كەلەگوندی (دوجەیل) نیشتە جێ یە... ئەم پیاوەش لەڕووی پێوانەكاریە لۆژیكیەكەیەوە هیچ جیاوازیەكی نیەلەگەڵ ڕازی یان فارابی یاخود (جاحظ)دا... چونكە ئەمیش لەسەرەتادا پێشەكیەكی لۆژیكی دێنێت ودەڵێت : بیستنی دەنگ لەجێگەیەكی دوورەوە ماقول نیەو ناچێتە ئەقڵەوە، دواتر دێت وبەرەنجامی داواكراوو پێویست لەو پێشەكیەوە هەڵدەگوزێ.
ئیتر من نازانم ئەوكابرایە چی گوتوە لەكاتێكدا كەپاش ماوەیەكی كەم تەلەفزیۆن داهات، واهەست دەكەم مل كەچی دیفاكتۆ (ئەمری واقع)بوبێت ودەركی بەوە كردبێت كەپێوانە كاریەكانی لەگەڵ ئەو ژیانە سەیرو نامۆیەدا ناگونجێن كەتیای دا دەژی !!.

باپیرەی نوسەری ئەم چەند دێڕەش، بەسەرهاتێکی هاوشێوەی هەیە، ئەویش بەوەناسرا بوو کەحەزی لەبواری لۆژیکەبووە... ڕۆژێکیان باسی ئەوەیان بۆکرد بووگوایە بیانیەکان گالیسکەیەکیان لەتەختەدار وئاسن دروستکردوەو ناویان ناوە (فرۆکە)وبەئاسماندا دەفڕێت... ئەویش گوتوێتی: هەرگیز ئەمەلەگەڵ ئەقڵدا ناگونجێت و ماقوڵ نیە، پاشان ئاوڕی دایەوە بەلای چەکوشێکدا کەلەلایەکەوە دانرابوو، وەك ئەوەی بیەوێت لەو چەکوشە پێشەکیەکی لۆژیکی دەربێنێت، گوتی: ئەو چەکوشە لەئاسن ودار دروست کراوە. ئایادەگونجێت بەئاسماندا هەڵفڕێت؟؟... ئامادەبوان گوتیان: نەخێر... بڕوایان بەقسەکەی کرد!! هێندەی نەبرد جەنگی جیهانی یەکەم هەڵایسا، لەوکاتەدا فرۆکە هاتە سەرشاری بەغداو لەئاسمانەوە بۆمبی بۆخەڵکی دەهاویشت. لەوکاتەدا باپیرەی من تەماشای ئەو ئاسمانەی دەکردو سەرسام ببوو نەی دەزانی چ بێژێ.

کەسێك لەوانەی متمانەو بڕوام پێیان هەیە، بۆیگێڕامەوە کەواجارێك لەمیوانداری یەکێك لەسەرخێڵەکاندا دەبێت لەناوچەی فوراتی ناوەڕاستدا... ئەمیش دەستی کردۆتە باسکردنی بەفرگرە"ثلاجة" بۆ شێخ ومیوانەکانی. باسی ئەوەی کردوە کەچۆن (بەفرگرە)شت سارد دەکاتەوەو سەهۆڵیش دروست دەکات بەهۆی کارەباوە... لەو کاتەدا یەکێك لەئامادەبوان کەدیارە پیاوێ شەرعناس ولۆژیکی بوە، بەڕوی داهەڵشاخاوەو، گەرەکی بوە تواناى زانستی خۆی نیشانی ئامادەبوان بدات... گوتویەتی : ئەمەشتێکی نەستەمە!... مشت ومڕەکەی ئەولەسەربنەمای ئەم پێوانەیە بووە:

١-شتی گەرم، ناگونجێت ساردیی بەرهەم بێنێت..... (پێشەکی گەورە)

٢-کارەبا شتێکی گەرمە... ........................... (پێشەکی گچکە)

٣- کەواتە کارەبا ساردیی لێ بەرهەم نایەت... ................ (ئەنجام)

باپیرەی نوسەری ئەم چەند دێڕەش، بەسەرهاتێکی هاوشێوەی هەیە، ئەویش بەوەناسرا بوو کەحەزی لەبواری لۆژیکەبووە... ڕۆژێکیان باسی ئەوەیان بۆکرد بووگوایە بیانیەکان گالیسکەیەکیان لەتەختەدار وئاسن دروستکردووەو ناویان ناوە (فڕۆکە)وبەئاسماندا دەفڕێت... ئەویش گوتوێتی: هەرگیز ئەمەلەگەڵ ئەقڵدا ناگونجێت و ماقوڵ نیە، پاشان ئاوڕی دایەوە بەلای چەکوشێکدا کەلەلایەکەوە دانرابوو، وەك ئەوەی بیەوێت لەو چەکوشە پێشەکیەکی لۆژیکی دەربێنێت، گوتی: ئەو چەکوشە لەئاسن ودار دروست کراوە. ئایادەگونجێت بەئاسماندا هەڵفڕێت؟؟... ئامادەبوان گوتیان: نەخێر... بڕوایان بەقسەکەی کرد!! هێندەی نەبرد جەنگی جیهانی یەکەم هەڵایسا، لەوکاتەدا فڕۆکە هاتە سەرشاری بەغداو لەئاسمانەوە بۆمبی بۆخەڵکی دەهاویشت. لەوکاتەدا باپیرەی من تەماشای ئەو ئاسمانەی دەکردو سەرسام ببوو نەی دەزانی چ بێژێ.

کەسێك لەوانەی متمانەو بڕوام پێیان هەیە، بۆیگێڕامەوە کەواجارێك لەمیوانداری یەکێك لەسەرخێڵەکاندا دەبێت لەناوچەی فوراتی ناوەڕاستدا... ئەمیش دەستی کردۆتە باسکردنی بەفرگرە"ثلاجة" بۆ شێخ ومیوانەکانی. باسی ئەوەی کردوە کەچۆن (بەفرگرە)شت سارد دەکاتەوەو سەهۆڵیش دروست دەکات بەهۆی کارەباوە... لەو کاتەدا یەکێك لەئامادەبوان کەدیارە پیاوێ شەرعناس ولۆژیکی بوە، بەڕوی داهەڵشاخاوەو، گەرەکی بوە توانای زانستی خۆی نیشانی ئامادەبوان بدات... گوتویەتی : ئەمەشتێکی نەستەمە!... مشت ومڕەکەی ئەولەسەربنەمای ئەم پێوانەیە بووە:

١-شتی گەرم، ناگونجێت ساردیی بەرهەم بێنێت..... (پێشەکی گەورە)

٢-کارەبا شتێکی گەرمە... ........................ (پێشەکی گچکە)

٣- کەواتە کارەبا ساردیی لێ بەرهەم نایەت... ................. (ئەنجام)

ئەوکەسەی ڕوداوەکەی بۆگێڕامەوەگوتی: ئیدی منیش لەبەرانبەرئەو لۆژیکەدا هەستم بەسەرشۆڕی کرد!!.

لەوەی ڕابورد پوختەی ئەو بەرەنجامەی بەدەستی دێنین بریتی یەلە: ئەوپێوانە کاریە لۆژیکی یەی کەخەڵکی لەچاخەناوەڕاستەکاندا ولەمیانەی مشت ومڕو دەم بەدەمەکانیاندابەکاریان دەهێناو، تاهەنوکەش هەندێ خەڵك بەکاری دێنن، ناگونجێت بۆئەوەی بکرێتە ڕێسایەك بۆ لێکۆ ڵینەوەی زانستی ودۆزینەوەی ڕاستی... بەڵکو زۆرگونجاوە بۆئەوەی بکرێتە چەکێك بەدەستی مرۆڤەوە تاکوبۆ بەرگری یاخود هێرش بەکاری بێنێت، بەگوێرەی داخوازیەکانی سۆز یان بەرژەوەندی یاخود بیروەڕەکانی... ئەم پێوانەکاریە، وەك یەکێك لەتوێژەردوە هاوچەرخەکان دەڵێت: ئامرازێکە مرۆڤ دەتوانێت، بەهۆیەوە ڕاستی شتێ بسەلمێنێت وهەربەهۆی ئەویشەوە ڕاستی پێچەوانەی ئەو شتەش بسەلمێنێت) (١٥)

## پرەنسیپەکانی لۆژیکی ئەرستۆیی:

لەماوەی ڕابوردودا باسم لەدوو خەسلەتی لۆژیکی ئەرستۆیی کرد، کەبریتی بوون لەفۆرمی بوون وهەلگوازتەکاریی بوونی ئەو لۆژیکە... لێرەش دا دەمەوێت باس لەوبنەماو پرەنسیپانە بکەم کەئەو لۆژیکە پشتیان پێ دەبەستێ یاخود لەسەریان دامەزراوە.

لەئەنجامی لێکۆڵینەوەمدا لەلۆژیکی ئەرستۆیی، دەتوانم بەرەنجامگیری ئەوە بکەم کەئەم لۆژیکە سێ پرەنسیپ و بنەمای بناغەیی هەیە کەبریتین لە:

١-پرەنسیپی ئەقڵ گەرایی

٢-پرەنسیپی هۆکار گەرایی

٣-پرەنسیپی چی یەتی.

لەوانەیەشتێکی سودبەخش بێت گەربەکورتی هەریەك لەوسێ بنەمایە شیی بکەمەوە، چونکە پەیوەندیەکی توندوتۆڵیان هەیە بەشۆڕشەکەی ئیبن خەلدونەوە بەسەرلۆژیکی ئەرستۆیی دا. لەبەشی داهاتوشدا دەبینین بەچ شێوەیەك هەندێ لەبیرمەندانی ئیسلام هەوڵیان داوە ڕەخنەکاری ئەوبنەمایانە بکەن و، بەوەش زەمینەسازییان کردوە بۆ ئیبن خەلدون لەشۆڕشەکەی دا.

بالەسەرەتاوە لەپرەنسیپی ئەقلانی بوونەوە دەست پێ بکەین، یانی متمانەی ڕەهابەئەقڵ وبەتوانای ئەقڵ لە دۆزینەوەی ڕاستی دا... جاران فەیلەسوفەکان پێیان وابوو دوو ڕێگەهەیە بۆ (زانین)وڕێگەی سێ هەم بوونی نیە، ڕێگەکانیش بریتین لەهەست کردن وئەقڵ... هەرچی هەستەکانە هەمیشەلەبەردەم ئەگەری‌هەڵەکردندان.... کەواتە جگەلە ڕێگەی ئەقڵ ڕێگەیەکی دیکە لەگۆڕێدا نەما بۆزانینی ڕاست وپەی‌بردن ودۆزینەوە.

(ئیبن مەسکویە)دەڵێت: (هەرچەندە دەرون زۆرێك لەبنەماکانی زانیاری لەهەستەکانەوە وەردەگرێت، بەڵام هەرلەناخی خۆی دا هەندێ کردەوەو بنەمای دیکەی هەیەکە هەرگیز لەهەستەکانەوە وەریان ناگرێت... ئەوانیش بریتین

لەوبنەما بەرزو بڵندانەی کەپێوانەکاریە ڕاستەکانیان لەسەر بنیات دەنرێ... هەتا دەڵێ : هەستەکان تەنها پەی بەشتە بەرهەستەکان دەبەن، وەڵێ دەرون، دەتوانێ پەی بەرێ بەهۆکاری پێکڤە گونجان یاخود جیاوازی لەنێوان شتەبەرهەستەکان دا)هەروەها دەڵێت: (ئەگەر دەرون بڕیاری دا لەسەر"هەست" کەڕاستگۆ بوە یاخود درۆزن بووە، ئەوا ئەم بڕیاردانەی لەهەستەوە وەرناگرێت، چونکە هەست پێچەوانەی خۆی نابێتەوە لەوەدا کەبڕیاری لێوەدەدات... جگەلەوەش ئیمەدەبینین دەرونی ژیر، پەی بەزۆرێك لەوهەڵەوناتەواویانە دەبات کەهەستەکان لەبنەمای کارەکانیدا تێ دەکەون ولەوحەلەشدا بڕیاری خۆیانیان بەسەردا دەدات. وەك ئەوهەڵەیەی کەهەستی "بینین" دەیکات لەدوور یان نزیك بینینی شتەکاندا...) (١٦)

پوختەی مەبەستی (ئیبن مسکویە)لەم قسەیەی دا کەدیارە ڕێی هەموو فەیلەسوفە کۆنەکانیشە، ئەوەیەکە ئەقڵ توانایەکی سروشتی هەیەبۆ بڕیاردان لەسەر بەرهەستەکان وڕونکردنەوەی ڕاستی وچەوتی تیایاندا، ئینجا ئەم توانایەش لەهەستەکانەوە وەرنەگیراوە، بەڵکو لەخودی ئەقڵەوە هەڵقوڵاوەو وەرگیراوە.

ئەمەهۆکاری دانەبەزینی فەیلەسوفەکان بوو بۆناستی پرسەبەرهەستەکان تاکو پەی بەڕاستی یەکانی نێوی بەرن وخوێندنەوەی بۆبکەن وەك زاناکانی سەردەمی نوێ دەیکەن... بەڵکو تەنها بەو (کۆ بەرەنجامە ئەقڵیانە)کومسایان دەهات کەلەرێ ی بیرکردنەوەی ئەبستراکتەوە پێی دەگەشتن، ئینجا دەهاتن هەرلەو (کۆبەرەنجامانە)ش ئەو ئەنجامانەیان هەڵدەگواست کەپێویستیان بوو... بۆیە ڕەنگەلێرەدا ڕەخنەگرێك ڕوو بەڕوویان ببێتەوەو بڵێت : ئەو دڵنیاییە، یاخود ئەومتمانە ڕەهایەتان لەکوێ وە بۆهات بەوەی ئەو (کۆنەنجامە گشتی)یانەی ئەقڵ پێی دەگات ڕاست و دروستن؟ ئێوە چوزانن لەوانەیە ئەو (کۆنەنجامە گشتی)انەش، دوچاری هەڵە ببن وەك چۆن هەست پێکراوەکان

دووچاری هەڵەدەبن؟غەزالی ئەم ڕەخنەیەی ئاراستەکرد... کەچی ئیبن ڕوشد بەم جۆرە وەڵامی دایەوە، گوتی: (لای هەموان زانراوە کەلێرەکانە ڕێگەیەك هەیەدەمان گەیەنێتە هەق وڕاستی، پەی بردنیش بەڕاستی، لەزۆرینەی شتەکاندا لەئێمەیاساغ نیە... بەڵگەش لەسەرئەمە ئەوەیە، ئێمە بڕوای تەواومان هەیە بەوەی لەزۆر بەیشتەکاندا ئێمەلەسەرهەق ڕاوەستاوین، ئەمەش دەبێتەهۆی دڵنیایی بۆکەسێك خۆی سەرقاڵی زانستەکانی دڵنیایی کردبێت... هەروەها بەڵگەیەکی دیکەش لەسەرئەم مەسەلەیە ئەوەیەکەئێمە تامەزرۆییەکی زۆرمان هەیەبۆ ناسین و زانینی هەق... جائەگەر پەی بردن بەهەق قەدەغەکراو بوایە ئەوا تامەزرۆیش بۆناسینی ئەو هەقە پووچەڵ دەبوو... زانراویشە کە شتێ نیەلەبنەڕەتی سروشت ودروستکرانیش پوچەڵ بێت) (١٧)

سەیرلەوەدایە کە (ئیبن ڕوشد) هەوڵ دەدات بەڵگە بێنێتەوە لەسەر ڕاستی ودروستی ئەو (کۆنەنجامەگشتی)یانە، لەڕێگەی خودی (کۆئەنجامەگشتیەیە)کانەوە!!... ئەوەتا دەڵێت : مادەم ئێمە تامەزرۆی ناسینی هەقین، ئەوادەبێ پەی بردن بەوهەقەگونجاوبێت؟!

بەڵگەشی بۆئەم قسەیەی ئەوەیە کەدەڵێت : ناکرێ لەبنەڕەتی سروشت ودروست کراندا شتێکی پوچەڵ هەبێت... ئینجا ئەگەر لێشی بپرسین : ئایالەکوێ وەئەم کۆبەرەنجامە گشتی یەت هێنا؟ دەڵێت : ئەوە شتێکی زانراوو دان پێدا نراوە، یانی یەکێکە لەو مەسەلانەی کەهەموو ژیرەکان، لەسەر ڕاستیەو دروستی یەکەی ڕێك کەوتوون.

هەرچۆن بێت. فەیلەسوفە ئەقڵ گەراکان، هەمیشە سوکایەتی یان کردوە بەمەسەلەی "هەست" ولەدیدی ئەواندا "هەست " ئامان گەیەنێتە ڕاستی ڕەها... لەدیدی ئەواندا، هیچ ڕێگەیەکیش نیە بۆئەوەی بمان گەیەنێتە ڕاستی ڕەها تەنها ڕێگەی ئەقڵ نەبێت، بەمەرجێك ئەو ئەقڵە بەهیچ شێوەیەك پشت بە"هەست " نەبەستێت. بەتایبەت فەیلەسوفەکانی "ئیغریق"هەرشتێکیان

بەکەم وبێ ئەرزش دەزانی کە"هەست" ێتێدا بەکاربێت. بەهێزترین گومان بەلای ئەوەدایە کەئەم بەسوك وبێ ئەرزش سەیرکردنەش دەگەڕێتەوە بۆبەسوك سەیرکردنی جەستە لەچاو ئەقڵ... ئەوان بڕیاریان وابوو جەستە" تۆپەڵەمادەیەکی فانیە، بەڵام ئەقڵ بونەوەرێکی ڕوحانی نەمرە... لەبەرئەوە هەرکەس ئەقڵی وەکار بردایە لەلای ئەوان لەو کەسە بەنرخ وبەرێزتر بووکە جەستەی بەکار بهێنایە.... واتە بیرمەند لای ئەوان لەکرێکار بەرێز تربوو.

ئەفلاتۆن پێشنیاری ئەوەی کرد (فەیلەسوف)ە کان پێشەوایەتی و سەرکردایەتی خەڵکی بکەن، ئەو لای وابوو یەکێك لەهەڵە گەورە سیاسیەکان بریتی یە لەبەشداری کردنی (کرێکار)لەبەڕێوە بردنی دەسەڵات دا... کاتێکیش ئەرخەمیدس لەزانستە ئەزمونیەکان دا دەرکەوت وهەندێ ئامێری دروست کرد، ئەوان پاساوی ئەوکارەیان بۆ دەداو دەیانگوت ئەرخەمیدس ناچار بوە ئەوکارە بکات، وەك ئەوەی سەرقاڵ بوونی بەدروست کردنی ئەو ئامێرانەوە کارێ بێ کەشایستەی پیاوێکی بیرمەندی سەربەچینە بەرزەکان نەبێت) (١٨)

ئەمە یەکێك بوو لەوهۆکارە کارایانەی کەوایان کردبوو ئیغریقە کۆنەکان و لەدوای ئەوانیش موسوڵمانەکان، لەزانستە ماتماتیکی یە کاندا زۆر دەرکەوتوو بن وئەو زانستانە بگەیەننە پلەیەکی بەرزلە وردەکاریدا... ئەو زانستانە، زانست گەلێکی ڕووتی ئەقلی بوون، یاخود بەدەربڕینی لۆژیکی "زانستێکی فۆرمی" بوون نەك (مادی)یان "بەهەست"... لەڕاستیش دا زانستە ئەزمونیەکان لەم چەرخە نوێ یەدا دوای ئەوە پێش کەوتن کەهەستی "ئەقڵانیەت "لەسەر تەختەکەی هاتە خوارێ و، کەم تازۆرێ هەستی "مادیەتی" بە"هەست "جێگەی گرتەوە.

شیاوی ئاماژەپێدانە کە ئێمە بەم قسەیە نامانەوێت لەنرخ و بەهای هەستی ئەقڵانیەت کەم بکەینەوە، یاخود دای ڕنین لەهەرکاریگەری و ئاسەوارێکی باش لەدێرۆکی فیکری مرۆڤایەتی دا... ئێمە هەست بەنرخ و بەهای هەستی

ئەقلانیەت ناکەین، وەك مامۆستا مارتندیل" دەڵێت... تائەوکاتەی کەلەگۆشەنیگا ولەبەر ڕۆشنایی ئەوکاتەدا سەرنجی دەدەین کەتیایداسەری هەڵداوە... ئەو ڕێچکەیە بۆیەکەمجار لەمێژودا لەسەردەستی ئیغریقیە کۆنەکان سەری هەڵدا لەکاتێکدا بیرکردنەوەی ئەفسانەیی، یان وەك (مامۆستا مارتندیل)بەبیرکردنەوەی (ئاینی – جادوگەری)ناوی دەبات، بەتەواوی کۆنترۆڵی هزرو مێشکی مەردومی کردبوو.

کەواتە هەستی ئەقڵ گەرایی هەنگاوو شەقاوێکی پێشکەوتنخوازانە بوو، سەبارەت بەوبیرکردنەوەیە... لێرەوە ئەوقسەیە وەراست دەگێڕدرێت کەدەڵێت : لۆژیکەکەی ئەرستۆ دەستکەوتێکی قەشەنگ بوو لەسەردەمی خۆیدا... ئەوە بوو دژایەتی ئەفسانەگەرێتی کردوو پاڵی بەخەڵکەوە نا، بەرەو پشت بەستن بەئەقڵ. (١٩)

لەڕاستیش داتانەمرۆ هەستی ئەقڵ گەرایی خاوەنی گرنگی یەکی گاڵتە پێنەکراوە... ئەمە گەربزانین تاهەنوکەش هەندێ لەگەلانی دنیا لەنێونەزانین و ئەفسانەگەرێتیدا دەژین، ئینجا چارەسەری سەرەتاییش بۆحاڵ وباڵی ئەونەتەوانە بەوە دەبێت کەهانی بیرکردنەوەی لۆژیکی بدەین وهەڵیان بنێین تالەگۆشەنیگای ئەقڵی یەوە سەرنجی مەسەلەکان بدەن.

هەستی ئەقڵ گەرایی زیان لەبیرکردنەوە نادات، لەنێو ئەو گەلانەدا نەبێت کەزانست تیایانداگەشەی کردوەو شارستانیەتیش پێشکەوتوە... چونکە لەحاڵەتیپێشکەوتن دا، هەستی ئەقڵ گەرایی لەمپەر دروست دەکات لەڕێگەی تێڕوانینی ئەزمونکاری واقعی دا... وەڵێ گەلەنەفام (واکەوتوو)ەکان، لەسەرەتاوە ئاتاجێکی زۆریان هەیەبەهەستی ئەقڵ گەرایی، ئەمەش وەك زەمینە سازکردن بۆگەشەکردنی هەستی زانستی نوێ تیایاندا.

## پرەنسیپی هۆکار گەرایی:

هەنوکە دێینە سەر شرۆڤەکردنی پرەنسیپی دووەمی لۆژیکی ئەرستۆیی، کەبریتی یەلەپرەنسیپی هۆکارگەرایی، یان ئەوبنەمایەی کەهەندێ جار بە (بنەمای سۆنگەیی)ناوزەد دەکرێت... بەواتای ئەوەی هەموو ڕووداوەکانی گەردون مل کەچی ڕێسایەکی ڕەقن، یاساکەش بریتی یەلەیەدوای یەکداهاتنی هۆکارو ئەنجام... بەم پێودانگەش ڕوداوەکان بەبێ سۆنگە نین یاخود بەهۆی ویستێکی وشیارەوە سەرهەڵ نادەن، بەڵکو پەیوەستەگیەکی زەروری هەیەلەنێوان هەر ڕوداوێك و هۆکار (سۆنگە)کەی دا... بۆنمونە ئەگەر ئاگربەرشتێك بکەوێت کەلەبار بێت بۆ سوتان، لەبارێکی یارمەتی دەردا بۆ سوتان، ئەوا ئەوشتەهەردەبێ بسوتێت... ئەمڕۆکە ئێمە ئەم پرەنسیپی هۆکارگەراییە بەشتێکی ڕۆتینی دەزانین کەهەرمشت ومریان گومانێك لەبەرانبەری داڕاست نیە... بەڵام لەڕاستی دا"وەك مامۆستا کلسن" دەڵێت، مەسەلەکە وانیە. ئەوەتا گەلەسەرەتاییەکان لەوە تێ ناگەن وبەشتێکی ڕۆتینی وئاسایشیی نازانن. (٢٠)

ئەگەرلەناکاو ئاگرلەشتێ بەربوو، مرۆڤیسەرەتایی ئەوئاگر تێ بەربونە بەجادوی جادوگەرێ دەزانێ، یان بەکردەوەی (گیان)ێکی دەزانێ کەویستویەتی تۆڵە لەکەسێك بکاتەوە. بەپێچەوانەی مرۆڤە شارستانیەکانەوە، زۆرناڕەحەتە کەسێکی سەرەتایی بەدوی هۆکارو سۆنگەیەکی مادی دا بگەڕێ بۆ گرگرتنی شتێ... جارێك وارێکەوت تیمساح دووژنی یەکێك لەهۆزە سەرەتاییەکانی خوارد، پیاوێکی شارستانیش کەلەنێو ئەو هۆزەدا دەژیا، توانایتیمساحەکە بدۆزێتەوەو بیکوژێت، لەوکاتەدا خشڵ وزێرو زیوی ژنەکانی لەنێو ورگی تیمساحەکەدا دۆزیەوە... ئەمەش بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە لەسەر ئەوەی ئەو تیمساحە ژنەکانی خواردوە، وەڵ ئەقڵی سەرەتایی ناتوانێ لەم بەڵگەیەتێ بگات یاخود قبوڵی بکات...

تیمساح هەرگیز دەست درێژی ناكاتەسەر كەس، وایان دەزانی ژنەكان جادوگەرێ كوشتونی، هەرئەو جادوگەرە تیمساحەكەی بەكار هێناوە بۆفڕاندنی ژنەكان، خشڵ وزێڕو زیوەكەیشی وەك كرێ لەجادوگەرەكە وەرگرتوە !! (٢١)

دەربارەی پرەنسیپی ئەقڵ گەرایی چیمان گوت، دەتوانین سەبارەت بە پرەنسیپی هۆكارگەراییش بیڵێین، دۆزینەوەی ئەمیش لەسەردەمی خۆیدا هەنگاوێكی‌پێشكەوتنخوازانە بوو، وەڵێ دواتر بویە كۆسپێك ولەمپەر دروست دەكات لەڕێگەی ڕەوتی پێشكەوتنی زانستی دا. هەركات ڕوداوێكی واروی داكە هۆكارەكەی ئاشكرا نەبێت، دەست بەجێ لۆژیككارەكان پەنادەبەنە بەرنكولی لێكردن وبەدرۆخستنەوەی. ڕەنگە ڕوداوەكە ڕاست بێت و خەڵكێكی زۆریش دیتبێتیان، كەچی لۆژیككارەكان بڕوای پێ ناكەن وبەڕاستی نازانن، مادەم نەزانن هۆكارەكەی چی یە... ئیدی نازانن كەلەوانەیە هەندێ جار هۆكارەكان بەشێ بن لەنهێنی یەشاردراوەو پەنهانیەكانی سروشت، ئەو نهێنی یانەی كەهێشتر زانست پەیی پێ نەبردون وپەردەی لەڕولانەداون... ئەوان ڕاهاتوون لەسەرئەوەی ڕوداوەكان بەگوێرەی ئەو هۆكارانە لێك بدەنەوە كەدەگونجێت لەتەك ئەقڵیاندا، ئیدی نازانن كەئەقڵیان سنوردارەو، لەوانەیە زانست شتێ بدۆزێتەوە كەوابكات ئەو ڕوداوەی لەدیدی ئەواندا ئەستەمە، ببێتە شتێكی گونجاوو ئاسایی.

ئەم هەستەتا هەنوكەش بەسەر هزرومێشكی زۆرێك لەفێرخوازاندا زاڵە، بەتایبەت لەوڵاتە عەرەبیەكاندا... چەندین جاربینیومانن كەنكولی یان لەو بابەتانە كردوە كەتازەكی خراونەتە ژێر لێكۆڵینەوەی زانستی یەوە، وەك خەواندنی موگناتیسی یاخود بیرگۆڕكێ یاخود هەواڵدانەكانی خەون و بابەتی هاوشێوە. بەبیانوی ئەوەی گوایە بابەت گەلێ ئەفسانەیی یاخود میتا فیزیكین وناكرێت لێكدانەوەی مادیانەیان بۆ بكرێت !.

زاناكان لەڕۆژئاوادا هەندێ ڕاستی یان دۆزیوەتەوە، بۆنمونە وەك بونی هەندێ بەڵگەو ڕوداو كەدەكرێنە بەڵگە لەسەر بوونی بیرگۆڕكێ لەنێوان كەسێك

وكەسێكی تردا بەبێ بوونی هۆكارێكی مادی ئاشكراو ناسراو لەنێوان ئەو دووكەسەدا... ئەوان ئەیان توانیوە ئەو ڕوداوانە بەدرۆدابخەنەوە، چونكە ڕوداوی ڕاستەقینەن ودەكرێت بخرێنە بەر ئازمایشی زانستی یەوە، بۆیەگریمانەی ئەوەیان داناوەكەهەندێ شەپۆل (كارۆ موگناتیسی)هەبن كەهێشتی زانیاری پەی پێنەبردون، وایان داناوە كەلەوانەیە ئەو شەپۆلانە هۆكاری ئەوبیرگۆڕكێ یەبن... زانستی نوێ لەئافاریھەموو شتەكاندا ئاوهایە، ئایەت ڕوداوە واقعیەكان بەدرۆ بخاتەوە، تەنها لەبەر ئەوەی هۆكارەكانیان نازانێت. بەڵام هەندێ لەفێرخوازان بەم ڕایەقایل نەبوون، چونكە ڕاهاتوون لەسەر بەدرۆخستنەوەی هەر شتێ كە ئەقڵیان نەتوانێ لێكی بداتەوە.

دەكرێ هەڵوێستی هەندێ لەفێرخوازان لەعێراقدا لەهەمبەر پەرتوكی (خوارق اللاشعور)دا كەلەساڵی (١٩٥٢)دا بڵاوم كردەوە وەك نمونە لەسەر ئەو گوتەیە وەربگرین.. لەو پەرتوكەدا هەوڵم داوە نوێترینی ئەو ڕاو بۆچونانە كورت بكەمەوە كەزاناكان لەڕۆژئاوادا پێی گەشتون لەبابەتی بیرگۆڕكێ وبابەتەكانی تردا... كەچی ئەو فێرخوازانە شاڵاوێكی بێ ئامانیان كردە سەرپەرتوكەكەو، بەوەیان دایە قەڵەم گوایە پەرتوكێكە بانگەشە بۆئەفسانە دەكات ولەسەر بنەمای نازانستیش نوسراوە. .

ئەوهێرشە جارێكی ترو لەدوای چاپ كردنی پەرتوكی (خەونەكان لەنێوان زانست وبیروباوەڕدا)لەساڵی (١٩٥٩)دا، كرایەوە سەرم یەكێك لەبەردنجامەكانی ئەو دەمبەدمەی لەسەر ئەم كتێبەی كۆتایی بەرپابوو، مشت ومڕێك بوو لەسەر ڕوو پەڕی لاپەڕەكانی گۆڤاری (المثقف)ی بەغدایی، لەنێوان من ویەكێك لەهاوڕێ كانمدا كەئەویش مامۆستای زانكۆیە.

ئەو هاوڕێ یەم ڕێی وابوو: لەڕووی زانستیەوە بیرگۆڕكێ پرسێكی نەگونجاوە، هەرگیز زانست نەگەشتودو ئاشكاتە شتێ تایبەت بەومەسەلەیە.

چونکه ئەو پرسه یەکێکه لەو پرسانەی کەلەسەر بنەمای میتافیزیکی دادەمەزرێت.

وەڵامی منیش بۆئەو بۆچونە، ئاوها بوو: زانست مەسەلەکانی دڵنیایی وبێ مشت ومڕیی و یەکلایی بوونەوە ناناسێت وپێیان ئاشنانیە، بەڵکو زانست هەمیشە گومان دەردەبڕێت، وەڵامی یەکلاکەرەوە پێشکەش ناکات، چونکە پەیی بەهەموو نهێنی یەکانی سروشت نەبردوە، ڕەنگە لەداهاتودا لەو نهێنی یانەشتی وابدۆزرێتەوە کەوامان لێ بکات زۆرێك لەم بڕواو بڕیاروحوکمانەی ئێستامان بگۆڕین. (۲۲)

بەڕاستی ڕێکەوتێکی سەیر بوو، کەهێشتر ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو مشت ومڕەدا تێ نەپەڕی بوو، تائەوەبوو هەندێ هەواڵی زانستی بڵاو بویەوە، هەواڵەکان باسیان لەوە دەکرد کە زانکۆی (لینینگراد)ی ڕوسیا دەستی کردۆتە بایەخ دان بە مەسەلەی (بیرگۆڕکێ)و خەریکە لەو ڕودوە هەندێ ئازمایشی زانستی وەئەنجام دەگەیەنێت... هەواڵەکان ئەوەشیان دوپات کردەوە کە (پرۆفیسۆر لیوند فاسلیف)سەرۆکی بەشی (فەسلەجە) لەزانکۆی (لینینگراد) سەرپەرشتی ئەوتاقی کردنەوەو ئەزمونکردنانە دەکات... (فاسلیف) لەلێدوانێکی دا بۆ ڕۆژنامە نوسەکان گوتی: (بەڵێ، ئێمە شرۆڤە ولێکدانەوەیەك شك نابەین بۆئەو دیاردەسایکۆلۆژیە، بەڵام ئەمەماناى وانیەکەبەزەرورەت ئەولێکدانەوەیە بوونی نیە... لەڕاستی دا چالاکی مێشك بریتیەلەتیشك دانەوەیەکی فیزیایی... ئەم تیشکدانەوەیەش هێندە لاوازو سستە تارادەیەکی واکەهەستی پێ ناکرێت لەنێو مێشکدا، وەلێ لەهەندێ باروذۆخدا کاریگەری لەسەر مێشکێکی تردادەنێت...ئەمەش شتێکی ئەستەم نیە... لەکۆتایشدا ڕەوتی وردەکاری زانستی ئەو تەم ومژە دەڕەتێنێ ونهێنی یەکە ئاشکرادەکات).

کاتێك یەکێك لەڕۆژنامە نوسەکان لێی پرسی : ئایا بیرگۆڕکێ فێڵ وچاوبەست نیە؟... فاسلیف زەردەخەنەیەکی هاتەسەرلێو گوتی: سەردەمێکمان

گوزەراند کەخەواندنی موگناتیسی تێدا بەفێڵ وچاوبەست لەقەڵەم دەدرا، کەچی ئەمڕۆش بۆچارەسەری هەندێك لەنەخۆشینەکان بەکار دەهێنرێت). (٢٣)

پوختەی ئەوەی دەمەوێت لەم ڕووەوە بیڵێم، ئەمەیە: ڕەنگە پرەنسیپی هۆکار گەرایی لەبناغەسروشتی‌یەکەی داڕاست ودروست بێت، بەڵام هەندێ لەبیرمەندەکان هێندە پێی پابەنددەبن تاڕادەیك وایان لێدەکات ڕوداوە ڕاستی یەبینراوەکان بەدرۆدا دەخەنەوە، تەنهالەبەر ئەوەی ناتوانن شرۆڤە ولێکدانەوەیەکی مادی بۆئەو ڕوداوانەبکەن... کاتێکیش پەرتوکە فەلسەفی وکەلامیەکانی چاخەکانی ناوەڕاست دەخوێنینەوە، دەبینین سەرجەمیان (پرەنسیپی (هۆکارگەرایی)یان بەکار هێناوە بۆنکوڵی کردن لەزۆرێك لەوشتانەی، کەلەسەردەمی نوێ داڕاستی ودروستی یان سەلمێنراوە.

## پرەنسیپی چۆیەتی:

بائێستا بێینەسەرگۆتاپرەنسیپی ئیولۆژیکی ئەرەستۆیی، کەئەویش پرەنسیپی (چۆیەتی)یە... پوختەی ئەم پرەنیسپەش ئەوەیەکەدەڵێ : هەمووشتێ چۆیەتی (ماهەیەت)ی چەسپاوی خۆی هەیە، ناگرێت ئەوچۆیەتیەلەتەك خۆیدا هاودژوناتەبابێت وگۆڕانکاری بەسەردا بێت... ئەم پرەنیسپەسێ ڕێسای هەیەکەلۆژیککارەکان بە (یاساکانی بیر)ناوزەدیان کردوە... یاساکانیش ئەمانەن:

١-یاسای خۆیەتی = قانون الذاتیة = Law Of Identity.

٢- یاسای هاو دژنەبوون = قانون عدم التناقض = Law Of Contradition.

٣- یاسای نێوەندی بەرزەوەکراو"لابراو" = قانون الوسط المرفوع = Law Of Excluded Middle.

ئەم یاسایانەش بەرووکاری جیاوازیپرەنسیپی (چۆیەتی)دێنە هەژماردن... یاسای یەکەمیان باس لەوە دەکات کەهەرشتێ بگری خۆی هەرخۆیەتی، واتە ئەوشتە هەرخودی ڕاستەقینەی خۆیەتی وبەتێ پەڕینی کات گۆڕانی بەسەردا نایەت... چونکە هەندێ خەسڵەت وتایبەت مەندی تێدایە کەلەمیانەی گۆڕانکاریەکاندا بەسەقامگیری ونەگۆڕی دەمێننەوە... بۆنمونە ئەگەر بڕیارماندا لەسەرشتێ کەباش وبەکەڵکە ئەوا ئەم بڕیارە پێویستە بۆهەتا هەتایە بەڕاستی ودروستی بمێنێتەوە وگۆڕانی بەسەردا نەیەت.... یاسای دووەمیش باس لەوە دەکات کەهەرشتێ بگری ناگرێ دووهاودژ لەنێویدا کۆببنەوە، واتە ئەوشتەیان باشە یاخود خراپە وهەرگیز ناگونجێت لەهەمان کاتدا هەم باش بێت وهەم خراپ... سێ یەمین یاساش پێداگری لەوەدەکات کەلەنێوان دووشتی هاودژدا

نێوەندێ نیە، واتە شتەکان یان باشن وەیاخود خراپن و، ئیدی لەوناوەڕاستەدا شتی سێهەمین نیەکە نەباش بێت ونەخراپ (٢٤)

فەیلەسوفەکانی ئیغریق بڕوایان وابوو : شتی ڕاستەقینە ئەوەیەکە هەرگیز گۆڕانکاری بەسەردا نەیەت، بونی گۆڕانکاریش تیایدا بەلگەیە لەسەربوونی ناتەواوی لەنێو پێکهاتەو کەینونەی ئەو شتەدا... .لەبەر ئەوە ئیبستیمۆلۆژیا بەواتا تەواوەکەی تەنها لەسەربنەمای ئەوشتانە دادەمەزرێت کەلەبارنین بۆ گۆڕانکاری (٢٥)

هەروەها ئەفلاتۆن بڕوای وابوو، کۆبونەوەی هاودژەکان لەشتەبچوك وجوزئیەکان دا هۆکاری دابەزین وهاتنە خوارەوەی ئەوشتانە یەلەسەر (پلەکانی بوون)و هۆکاری دابەزینی ئەوشتانەیەبۆ ئاستێکی نزمتر... مادەم هەرتاکە شتێ بۆی هەبی گەورەبێت وبچوکیش بێت گەرم بێت وساردیش بێت، کەواتە ئەوشتە هەم بوونی هەیەوهەم بوونی نیە... کەواتە ئەوشتە یەکێکە لەوشتە گۆڕدراوانەی کە بۆهەرجۆرە ئالٚ وگۆڕێك لەبارن وبەشێك نین لەڕاستی یەنەگۆڕونەمرەکان (٢٦)ئەم بڕوایەش بوو وای لە ئەفلاتۆن و فەیلەسوفە کۆنە کانی تر کردبوو کەخۆیان زۆر بەرزتربگرن لەزانینی شتەبچوکەکان، ئەو شتانەی کە ژیان جمەی دێت لێیان. لەهەمان کاتیشدا بەرەو ڕووی بیرۆکە ڕەهاکان دەچوون، ئەو بیرۆکانەی کەهەرگیز گۆڕانکارییان بەسەردا نایەت وپێچەوانەی خۆیان نابنەوە... واتە ئەوان حەزیان نەدەکرد بەشتێك ئاشنابن کەناتەواوی لەبونیاد و کەینونەو پێکهاتەکەی داهەبێت.

هەندێ جار لۆژیکی کۆن بە (لۆژیکی کەینونە)ناوەزەرد دەکرێت، ئەمەش بەبەراورد لەگەلٚ لۆژیکی زانستی نوێ داکەبە (لۆژیکی گۆڕان)دەناسرێت... ئەمێستا هەموو گەردون، بەسەرجەم دیادەرکانیەوە، بەوچاوە سەیردەکرێت کەلەئالٚ وگۆڕی بەردەوامدایە و ئێمەناتوانین بەشێوەیەکی ڕاستەقینە لەشتەکان

تیَ بگەین، لەكاتێكدا نەبێت كە بەچاویلكەی گۆڕان وئالْ وگۆڕسەرنجیان لیَ بدەین.

دەكرێت بلْێین : هیگلْ یەكێكە لەوفەیلەسوفە مەزنانەی كەبەشداری یان كردوەلە دامەزراندنی لۆژیكی گۆڕانی نویَ دا. ئەم بەپێچەوانەی (پرەنسیپی چیەتی) یەوە، ڕێی وابوو هیچ شتیَ ناتوانی بونێكی خۆیی هەبێت. بەلْكو پێویستی بەوەیە لەقولاْییەكانی پێكهاتنی دیاودژەكەشی لەخۆبگرێت... بەبوونی ئەو هاودژبوونە لەپێكهاتەی شتەكەدا، گۆڕان وئالْ وگۆڕی لەسە ردەردەكەوێت... هەرئەمەش وایكردوە گەردون لەبزاڤێكی بەیوەست وبەكبینەونەسرەوت دابێت... (هیگلْ)بیردۆزەكەی خۆی لەسەر بنەمای ئەوە دارشتوە كەهاودژ بوون خەسلەتێكی بنەرەتیە لەسروشتی شتەكاندا... بەوەش بەشێكی گەورەی لۆژیكی كۆنی رماند.

(داروین)لەپاش (هیگلْ)هات و تێورە بەناو بانگەكەی لەمەڕ (پێشكەوتن یان پەرەپێدان)هێنایە كایەوەو ئاوازێكی نویَی بەكەرەناكەدا كرد، وەك لەپەندە عارەبیەكەدا هاتوە... لەدوای (داروین)پرسی (پەرەپێدان) بویە مۆدێلی سەردەم. هەمووشتیَ لەپێشكەوتن وپەرە پێدان وئالْ وگۆڕێكی بیَ كۆتایی دایە...لەلای (داروین)هۆكاری پەرەپێدانەكەش بریتی یە لە (ململانیَ)... ئەمەش لەرووی بنەرەتەلۆژیكیەكەوە جیاوازی نیە لەگەلْ چەمكی (هادژبوون)دا كە (هیگلْ) هێناویەتە ئاراوە... بەوجۆرەش وێنەكە لەهزردا كاملْ وتەواو بوو، هیچ گرنگیەك نەما بۆئەوراستیە نەگۆڕە رەهایانەی كەلۆژیككارەكۆنەكان ستران یان پێدا دەگوت؛ لەرابوردودا لۆژیك فۆتۆگرافی بوو، ئێستاكە بوەتە سینەمایی، جاران بیَ جموجولْ بوو هەنوكە بزێو وپڕ جولْەیە (٢٧).

شاردراوەش نیە كەئەم ئالْ و گۆڕەی لەبواری لۆژیك دا هاتۆتە گۆڕیَ، چ كاریگەریەكی گەورەی دەبیَ لەسەر سەرهەلْدان ودروست بونی زانستە كۆمەلاْیەتیەكان بەگشتی وزانستیكۆمەلْناسی بەشێوەیەكی تایبەتی... دیاردە

کۆمەڵایەتیەکان نەگۆڕ یاخود ڕەهانین، بەڵکو لەلایەکەوە لەگۆڕانێکی هەمیشەیی دان، لەلایەکی دیکەشەوە چەندین ڕوکاریان هەیە، هەرگرۆهێکی مەردوم بگری لەگۆشەنیگای خۆیەوە سەرنجی لێ دەدات و لێی ڕادەمێنێ، هەندێکیان بە (باش)ی دەبینن وهەندێکی دیکەش بە (دزێو)یسەیردەگەن، هەندێکی دیکەش بەنیواونیوی دەبینن... ناکرێت خەڵکی لەسەریەك ڕاو یەك بۆچون کۆببنەوەو یەکرابن لەمەڕ ئەومەسەلەیە... هێندەیان جیاوازی هەیە لەبەرژەوەندی وسۆزو نەریت وگرێ دەرونیە کانیاندا کەوایان لێ بکات بەهەمیشەیی جیاوازو ناکۆك بن... ژیانی کۆمەڵایەتی بەوجۆرە ڕێ دەکات، بۆیە هەرکەس بیەوێت بەجۆرێکی ڕاست ودروست لەوژیانە تێ بگات، پێویستە لەگۆشەنیگای خودی ژیانە کۆمەڵایەتیەکەوە سەرنجی لێ بدات.

# پەراوێزەكانی بەشی یەكەم

١) ئەم لۆژیكەبەگەلێك ناوی جودا جوداوە ناسراوە، هەندێ جار پێی دەگوترێت لۆژیكی كۆن، یان كلاسیكی، یان ئەرەستۆیی، یاخود ئەغریقی، وەیان لۆژیكی فۆرمی... .هتد. ئێمە حەزمان نەكرد لەم پەرتوكەدا تەنها ناوێك لەو ناوانە بەكار بێنین. بەلكو بەگوێرەی پێویست و بابەتەكە هەركات باس لە لۆژیك كرابێ هەرناوێكیان گونجاو بووە دامان ناوە. تەنانەت هەندێ جار ناچار بووین تەنها بە وشەی لۆژیك ئاماژەی پێ بدەین، كەدیارە مەبەستیشمان لە لۆژیكی كۆنە.

٢) احمد امین و زكی نجیب محمود، قصة الفلسفة القدیمة، قاهیره ١٩٥٨، ل ٢٢٨.

٣) جمیل صلیبا وكامل عیاد، المنطق و طرائق العلم العامة، بیروت ١٩٤٨، ل ٦٠-٦١.

٤) مقدمه ابن خلدون (چاپی لجنة البیان العربي)، ل ٢١١.

٥) علی بن محمد الماوردی، الاحكام السلطانیة، قاهیره ١٩٦٠، ل ٩.

٦) سجال : لەزمانی عارەبیدا بەجەنگێك دەگوترێت "سجال" كە نەسەركەوتووی تێدایە و نە دۆڕاو.... بڕوانە: المنجد في اللغه، چاپی ٢٥، ل ٣٢٢... وەرگێڕ.

٧) ابوبكر بن العربی، العواصم من القواصم، لێكۆڵینەوەی محب الدین الخطیب، قاهیره ١٣٧٢ ك، ل ٢٣٢.

٨) هبه الدین الحسین، نهضة الحسین، النجف ١٩٤٦، ل ٩.

٩) احمد امین وزكی نجیب محمود، قصة الفلسفة الحدیثة، قاهیره، ١٩٤٩، بەرگی ١، ل ٦٤.

١٠) هـ س، ل ٦١.

١١) علی عبدالواحد واڤ، فصول من اراء اهل المدینة الفاضلة، قاهیره، ١٩٦١، ل ٢٩- ٢٥.

١٢) فخر الدين الرازى، كتاب الفراسه، پاريس، ١٩٣٩، ل ٤-٥.

١٣) هـ س.

١٤) لەم بارەیەوە بنوارە پەرتوکی " اسطورة الادب الرفيع " نوسینی نوسەری ئەم چەند دێڕە، ل ٢٢٧- ٢٧٨ و ئەوانی تر.

15) Henry Thomas ،The Living World of philosophy. (philadelphia ،1946) ،p.91.

١٦) احمد بن مسكويه، تهذيب الاخلاق، بيروت، ١٩٦١، ل١٠.

١٧) عبده الحلو، ابن رشد، بيروت، ١٩٦٠، ل ٩٢.

١٨) زكى نجيب محمود، المنطق الوضعي، قاهيره ١٩٥٦، ل ٢٩٢ — ٢٩٤.

19) DON MARTINDALE ,THE NATURE & TYPE OF SOCIOLOGICAL THEORY,LONDON1961, P.9.

20) HANS KELSON , SOCIETY & NATURE , LONDON 1946. P.II.

٢١) ليفي برهل، العقلية البدائية، ترجمة الدكتور محمد القصاص و مراجعة الدكتور حسن الساعاتى، ل ٤٢- ٤٣.

٢٢) بنوارە درێژەی گفت و گۆکە لە: مجلة "المثقف" البغداديه، ژمارەکانی : ١٥، ١٦، ١٧، ١٩، ساڵی ٢.

23) LINK MAGAZINE, OCT.8.1961.P.29.

٢٤) على سامى النشار، المنطق الصورى، قاهيره ١٩٥٤، ل ٥٦-٦١.

25) JOHN DEWE ,LOGIC, THE THEORY OF INQUIRY, NEW YORK,1938.P.84.

٢٦) زكي نجيب محمود، خرافة الميتافيزيقيا، قاهيره ١٩٥٣، ل ١٥٣.

27) HENRY THOMAS, OP CIT , P.97.

# بەشی دووەم

## (لۆژیکی ئەرستۆیی لەئیسلامدا)

توێژەران ناکۆکن لەدیاری کردنی ئەوکاتەدا، کەتێیدا دەستکراوە بەوەرگێرانی لۆژیکی ئەرستۆیی بۆسەرزمانی عەرەبی. هەندێکیان پێیان وایەلەسەردەمی ئەمەویەکاندا دەست بەو پرۆسەیەکراوەو هەندێکی دی سەرەتای سەردەمی عەباسی بەدەست پێکی ئەوپرۆسەیە دادەنێن. وەلێ هەرچۆن بێت ئەم لۆژیکە ئاسەوارێکی زۆر مەزنی داناوەلەسەر کەلتوری ئیسلامی... موسوڵمانەکانیش لەئاقاری ئەو لۆژیکەدا بوونە دووگرووپی دژبەیەك... گروپێکیان ئەو لۆژیکەیان وەرگرت وبەوپەڕی گەرم وگوڕییەوە گەردنگیری بون‌و، دەمارگیریش بوون بۆی وبەتەواوکەری قورئانیان دایە قەلەم... گروپەکەی دیکەش ڕەخنەیان لێگرت ودژایەتی یان کردوبەهاوتای (زەندەقیەت) یان دایەقەڵەم ودروشمەکەشیان بریتی بوولە (هەرکەس خۆیسەرقاڵ مەنتیق بکات دەبێتە زەندیق)!

لەم بەشەدا مەبەستمان ئەوەنیە، درێژەی ئەومشت ومڕە باس بکەین کەلەئیسلامدا بەرپا ببوو لەنێوان لایەن گرانی ئەولۆژیکەو نەیارەکانیی دا... چونکە لەبۆنێمە سەختە بتوانین لەم بوارەدا هەموو لایەنەکانی ئەو مشت ومڕە لێك بدەینەوە... ئێمەتەنها هەندێ لەوخاڵانە ئاماژە پێ دەدەین کەپەیوەندیەکی ڕاستەوخۆیان هەیەبەو بابەتەمانەوە کەهەنوکە لەبەردەستماندایە وبریتی یەلە ئیبن خەلدون وهەڵوێستی وی لەئاقار لۆژیکی ئەرستۆیی دا.

ئەوەی شیاوی ئاماژە پێدانە ئەوەیەکەئەوکەسانەی لەنێو موسوڵماناندا ڕەخنەیان لەم لۆژیکە گرتوە لەهەندێك ڕووەوە جیاوازن لەوکەسانەی کەلەچاخی

نوێ داهەمان کاریان کردوە... فەیلەسوفانی سەردەمی نوێ کاتێ ڕەخنەیان ئاراستەی لۆژیکی ئەرەستۆیی کردوە مەبەستیان ئەوەبوە بانگەشەبکەن بۆ لۆژیکێکی نوێ، مەبەستیان بانگەشەکردن بوو بۆ لۆژیکی زانستی ئەزمونکاری ولێکۆڵینەوە واقعیەکان... وەلێ ئەو موسوڵمانانەی کەڕەخنەیان لەو لۆژیکە گرتوەی، لەزۆربەی بارەکاندا مەبەستیان بەرگری کردن بوە لەئایدلۆژیای ئاینی وپاریزگاری کردن لەبێ وەیی وسەلامەتی ئەو ئایدلۆژیایە لەنێو دەرونەکاندا... لەنێو هەموویاندا دەتوانین تەنها یەك بیرمەندیان لێ هەڵبوێرین کەئەویش ئیبن خەلدونە. ئەم بیرمەندە هەوڵی دا ڕەخنە لەولۆژیکە بگرێت بۆئەوەی کەم کورتیو ناتەواویەکانی دەربخات لەتێ گەشتنی ژیانی کۆمەڵایەتی دا... لەم ڕودوە ئیبن خەلدون بەڕادەیەکی گاڵتە پێنەکراو لەفەیلەسوفەکانیسەردەمی نوێ دەچێت.

وەك لەماوەی دادێ دەبینین، ئیبن خەلدون زۆرێك لەڕەگ و یشاڵی ڕەخنە لۆژیکیەکانی لەپێشینەکانی خۆی وەرگرتوە... بەڵام بۆچونەکانی ئەوانی گۆڕیودو پەرەی پێداون تاکو بیان گونجێنێت لەگەڵ بیرکردنەوە کۆمەڵایەتیەکانی خۆیدا... بەبڕوایمن دیاریترین ئەوکەسانەی کەلەم ڕودود کاریگەرییان لەسەر ئیبن خەلدون داناوە بریتین لە: غەزالی و ئیبن تەیمیە... لەڕاستیشدا ئەم دووپیاوە گەورەترین دووکەسێکن کەلەهەموو سەدەکانی ناوەڕاست دا ڕەخنەیان لەلۆژیکی ئەرەستۆیی گرتوە، ئیدی چ لەئەوروپادا یاخود لەوڵاتە ئیسلامیەکانی دیکەدا... ئەو دوانە هەرچەندە لەپێناوی مەرامێکی ئاینی ڕوتدا ڕەخنەیان لەو لۆژیکە گرتوە، وەلێ لەم میانەیەدا گەشتونەتە هەندێ ڕاو بۆچون کەلەزۆر ڕودوە لەڕاوبۆچونی فەیلەسوفە مۆدرێرنەکان کەمترنین.

بەرلەوەی باس لەڕاوبۆچونی هەریەك لەغەزالی و ئیبن تەیمیە بکەم، پێم باشە کەمێك باس لەگروپی (شوکاکەکان)بکەم کەبەرلەو دووکەسە ڕەخنەیان لەو لۆژیکەگرتوە، هەروەها کەمێکیش هەڵوێستەبکەم لەتەك (جاحظ)و بۆچونەکانیدا.

## ڕاوبۆچونی "شوکاك"ە کان:

شوکاکەکان گروپێکی سەیربوون لەجیهانی ئیسلامیدا بەدەرکەوتن، ئاسەوارو کاریگەری ئەمان لەبیرکردنەوەو ژیاری ئیسلامیدا وەك کاریگەری وئاسەواری سۆفستاییەکان وایەلەشارستانیەتی ئیغریقیدا... ئەم گروپە سەبارەت بەڕێچکە گوماندۆزیەکەیان پەرتوك ونوسراوی زۆریان نوسی. بەڵام سەرجەمی ئەو نوسراوانە سوتێنران وفەوتێنران، هەنوکەش هیچ لەئاسەواری ئەونوسراوانە نەماوەتەوە جگەلەو ئاماژانەی کەدەبینین لەنێو نوسراوی ئەو ڕەخنە گرانەدا کە ڕەخنەیان ئاراستەی ڕاوبۆچونی ئەم گروپە کردوە. ئەو ئاسەوارانەش کەلەو نوسراوانەدا دەبینرێن بریتین لەدەربڕینی ناتەواو و ڕاو بۆچونی ئاوەژووکراو.ئێستاش لەسەربێ ئێمەناوی ئەندامەکان وکەسایەتیەکانی ئەو گروپە نازانین، زانینێك کەلێی دڵنیابین... هەرچەندە دەتوانین هەندێکیان ئاماژە پێ بدەین، وەك : صاڵح کوڕی عبدلقدوسی زەندیقی ناسراو، ئیبن ڕاوەندی کەتا ئێستاکەش بەغدادیەکان نوکتەکانی وی سەبارەت بەدانایی یەکانی وەدی هێنەر"خالق" دەگێڕنەوە، هەروەها پزیشکی ناسراو بەمحمد کوڕی زەکەریای ڕازی.

(شوکاك)بەشێوەیەکی گشتی ئەومشت ومڕە لۆژیکیە یان بەبێ ئەرزش دەبینی کەلەکات وسەردەمی خۆیاندا بەسەر مێشکی لۆژیککارەکاندا زاڵ ببوو، هەروەها بەچەکێکیان دەزانی بەدەستی گروپە ناکۆکەکانەوە، پێشیان وابوو ئەو لۆژیکە هیچ هەقێکی پێ ناسەلمێت ومرۆڤیش ناگەیەنێتە دڵنیایی... لەم ڕودوە دەیانگوت: (هەرچی شتێ بەمشت ومڕ بسەلمێنێت، بەمشت ومڕیش هەڵدەوە شێتەوە). ئەگەری ئەوەش زۆرەکە (غەزالی)ڕاو بۆچونی ئەم گروپەی خوێندۆتەوە ولەڕوپەکی پاسیفەوە سودی لێ وەرگرتوە.

شوكاكەكان دەڵێن: (ئێمە ئاگامان لەنایین و ڕاو بۆچون وگوتە جیاوازەكانە، هەر گرووپێك بگرێ بانگەشەی ئەوەدەكات گوایە بڕوای خۆی لەبیرو ڕاپێشینەكانە، هەر گرووپێكیش لەگەڵ بەرانبەرەكەیدا دەبەرێك ڕادەچن ونیواو نیودەبن، لەوانەیە یەكێكیان لەجڤاتێكدا سەركەوێت، كەچی لەجڤاتێكی دیكەدا بەرانبەرەكەی بەسەری دا سەردەكەوێت، ئەم سەركەوتن ودۆڕاندنەش بەگوێرەی ئاست وتوانای ڕونكردنەوەیە لەوكەسەدا كەگفت وگۆ كەسازدەدات، لەوەدەمەدا ئەوان لەوجەنگاوەرانە دەچن كەسەركەوتن تاوێك بۆ ئەمیانە تاوێكیش بۆئەوی تریان دەبێت...ڕاستی یەكەی ئەوەیە لێرەكانەدا گوتەو بۆچونێك لەئارادا نیەكە سەركەوتنەكەی ئاشكراو دیاربێت، چونكە ئەگەر هەبوایە لەخەڵكی بزر نەدەبوو، خەڵكیش لەبەرانبەریدا ناكۆكی دووبەرەكی یان تێنەدەكەوت، وەك چۆن دووبەرەكی یان تێ ناكەوێت لەبەرانبەر ئەو شتانەدا كەبەهەستەكانیان وئەقڵیان دەرگی پێ دەكەن، وەك چۆن ناكۆك نابن لەبەرانبەر ژمێرە (حساب)دكان وهەموو ئەو شتانەی دیكەش داكەبەڵگەی تەواویان لەسەرە...چونكە ئەستەمە ڕاستی بۆخەڵكی دەركەوێت وئاشكرابێت كەچی خەڵكی بێ مانایانە دژایەتی بكەن و، قایل بن بەلەنێو چون وبەدبەختی دنیاو دوارۆژ بەبێ هۆ... كەواتە هەموو گروپەكان شوێنی ئەو شتە دەكەون كەلەسەری پێگەیون، یان شوێن ئەوەدەكەون كەیەكێكیان بەبێ سەلماندن ودڵنیایی، بەئەندێشەی خۆی دیاری دەكات كەفلان شت هەقە. كۆمەڵێكی زۆریش دەبینین كەخوازیاری زانستی فەلسەفەن وتیای داڕۆچون، مۆركی ئەوەیان بەخۆیانەوە ناوەگوایەلەسەرهەق ڕاوەستاون ولەخەڵكی ڕەشۆكی جیابونەتەوە "دەربڕینی وەرگێڕ"... هەندێكی دیكە شارەزاییان پەیداكرد لە"عیلمی كەلام " دا، تەمەنی خۆیان لەوپێناوەدا بەخەرج داوبەتەواوی تیایدا ڕۆچوون، شانازیشیان بەوەوە دەكرد كەجیاوازی نێوان هەق وناهەقیان بەبەڵگەوە بۆئاشكرا بود، كەچی دواتر هەموویان دەبینین، فەیلەسوفەكانیشیان وشارەزاكانی عیلمی كەلامیش... هەرهەموویان ناكۆك ولێڵ

یەکدا جیاوازن، وەك جیاوازبوونی خەلکە ڕەشۆکی ونەزانەکە، بەلکو توندوتیژتریش !! جانەگەر بەلگەکانیان چەردەیەك ڕاستی تیدابوایە، ناکۆکی یان تێ نەدەکەوت، بەلکو بەدرێژایی ڕۆژگار ئەوڕاستی یە ئاشکراودیار دەبوو... جگەلەوەش هەندێ جار فەیلەسوفێ یان موتەکەلیم "کەسی شارەزای عیلمی کەلام —وەرگێڕ" دەبینین بڕوای بەمەقولەیەك هەیە، مشت ومڕی لەسەر دەکات ودژایەتی ئەوکەسەش دەکات کەبڕوای پێی نەبێ، کەچی هێندە ناباشتێکی دیکە دەبینێ ولەبڕوابونی بەومەقولەیە پاشگەز دەبێتەوە کەپێشتر بڕوای پێ بوو، ئینجا مشت ومڕدەکات وهەوڵ وکۆشش دەدات بۆپوچەڵ کردنەوەی ئەومەقولەیەی کەلەبەردا بڕوای پێی هەبوو: ... هەموو ئەمانەش بەلگەن لەسەر پوچەڵی وگەندەڵی بەلگەکان) (١)

## ڕاو بۆچونی جاحظ:

لەبەشی ڕابردودا باسمان لەڕاوبۆچونەکانی (جاحظ)کردو، گوتمان ئەو زۆر تامەزرۆی پێوانەکاری لۆژیکی وبەکار هێنانی ئەو پێوانەکاریە بوەلەشتێك وپێچەوانەکەیشی دا... هەرچۆن بێت ئەو یەکێك بوو لەپێشەواکانی موعتەزیلە، بێگومان موعتەزیلەش لە هەموو خەڵکی دیکە زیاتر لۆژیکیان بەکار هێناوە وبڕوایان پێی هەبوە...وەڵێ لێرەدا هەقە باس لەوە بکەین کە (جاحظ)پەیڕەوی لەهەموو ڕاو بۆچونەکانی موعتەزیلە نەکردوە، بەڵکو لەوکەسانە بووکەخاوەنی ئەقڵێکی داهێنەرو ڕۆشنبیریەکی فراوانن... بۆیە زۆرجاریش بینیومانە لەڵ هەندێ بۆچونی موعتەزیلەدا دژو ناتەبابوە.

(جاحظ)تیۆرێکی هێنایە ئاراوە کەپێچەوانەی موعتەزیلەو بۆچونەکانیان بووە "دەربڕینی وەرگێڕ " (٢)ئەو بیردۆزەش بایەخێکی کەمی نیەلەبابەتی لۆژیك دا... مایەی نیگەرانیمانە کەدەبینین ئەو تیۆرە بەهەموو وردەکاریەکانیەوە کە (جاحظ)هێناویەتەکایەوە نەپارێزراوە... بەڵکو وەکو زۆرێك لەپەرتوك ونوسراوەکانی دیکەی (جاحظ)ئەم تیۆرەش فەوتاوە یاخود بزر بووە... هەندێ ئاسەواری کەمی لێ ماوەتەوە، ئەو ئاسەوارەش لەپەرتوکی ئەوکەسانەدا دەی بینرێتەوە کەیاخود ڕەخنەیان لە (جاحظ)گرتوە یاخود نوسراوەکانی ئەویان وەرگێڕاوە.

بەگشتی تیۆرەکەپێچەوانەیە لەگەڵ ئەقڵ گەرایی دا. کەوەك باسمان کرد یەکێك بوو لەپرەنیسپەکانی لۆژیکی کۆن... لەلێکۆڵینەوەی ئەو پاشماوەی کەماوەتەوەبۆمان دەردەکەوێت (جاحظ) بڕوای وایە ئەقڵی مرۆڤ ناتوانێت بەجۆرێکی تێرو تەواو ڕاستی یەدەرەکیەکان ببینێت، چونکە ئەقڵ سنوربەند کراوە لەبوارێکی دیاریکراودا وناتوانێت ئەو سنورە تێ پەڕێنێت، ئەقڵ لەم حاڵەی دا وەکو هەستی (بینین)وایە... ئەوەتا تۆبەچاوەکانت تەماشای دنیا دەکەیت بەڵام ناتوانیت هەمووشتەکانی پێ ببینیت. چونکە هەستی (بینین)ی تۆسنورداره، لەلایەکەوە بەربەستە چڕەکان ولەلایەکی تریشەوە ماوە دورەکان

سنوری بۆ دادەنێن... کەواتە مرۆڤێك ناتوانێ ئەو شتە ببینێت کەمرۆڤێکی تردەی بێنێت. مەگەربواری بینینی هەردوکیان وەك یەك بێت... ئەقڵیش هەروایە... بۆیە ستەم دەکەین ئەگەر داوا لەخەڵکی بکەین سەبارەت بەمەسەلەکان بڕیاری وەك یەك وهاوشێوەیان هەبێت... چونکە بواری ئەقڵیان لێك جیاوازە، کەواتە هەردەبێت بڕیاردانەکانیشیان جیاوازبێت، ئەمەش شتێکی سروشتی وئاساییە.

(جاحظ)هاوڕایە لەگەڵ موعتەزیلەدا لەوەدا کەدەڵێن مرۆڤ دەتوانێت بەگوێرەی ئارەزوی خۆی ویستەکانی ئاراستە بکات.بەڵام ئەم توانینە لای (جاحظ)مانای ئەوە ناگەیەونێ کە مرۆڤ دەتوانێ بەگوێرەی ئارەزوی خۆیشی بیر بکاتەوە.

چونکە ئەوەتا بۆنمونە : تۆ دەتوانیت پێڵوەکانی چاوت بکەیتەوەو داشیان بخەیت وەلێ ناتوانیت دوورتر لە بواری بینینی خۆت شت ببینیت. یاخود ئەگەر توشی نەخۆشی (کوێری ڕەنگەکان) بوبیت، دەتەوێت ڕەنگی سور لەڕەنگی ڕەش جیابکەیتەوە کەچی ناتوانیت... مەسەلەی بیرکردنەوەش هەروایە.

مرۆڤ دەتوانێت بیرلەشتەکان بکاتەوە ودەشتوانێت بیریان لێ نەکاتەوە، بەڵام ناتوانێت بیرلەشتانێك بکاتەوە کە دەکەونە دەرەوەی چوارچێوەی بیرکردنەوەیەوە، یاخود ناتوانێ بیرلە شتێ بکاتەوە کەئەقڵ نەتوانێ بەتەواوی وەری بگرێ.

بەڕاستی ئەم تیۆرە (جاحظ)ی یە، زۆر جوان و نایابە. زۆریش نزیك دەکەوێتەوە لەوەی زاناکۆمەڵناسە مۆدێرنەکان لەبابەتی "کۆمەڵایەتی بوونی ئیبستیمۆلۆژیا" وەپێی گەشتون... ئەگەر ڕۆژگار ئەو بیردۆزەی بەهەموو وردەکاریەکانیەوە بۆ بپارستینایە، لەوانە بوو شتی وامان تێدا بدۆزیایەتەوە کەوایان بکردایە (جاحظ) لەئیبن خەلدون مەزنتر ببینین بەتایبەت لەڕوی قەشەنگی توێژینەوەی کۆمەڵایەتیەوە... بۆیە وادەردەکەوێ ئەو تیۆرە بەلای

شەرعناس ومرۆڤە دۆگماكانەوە باش نەبوە، بۆیەهەوڵیان داوەبۆلەناوبردن ولەباربردن وبزركردنی تیۆرەكە (دەربڕینی وەرگێڕ).

ڕەنگە یەكێك لەوهۆكارانەی وایان كردوە شەرعناسەكان لەتیۆرەكەی (جاحظ)توڕەبن، ئەوەیەكەئەو تیۆرە مرۆڤ دەگەیەنێتە ئەو بڕوایەی بڵێت: كافرەكان هیچ بەرپرس نین بەرانبەر بەكوفرانە كردنیان وخوداش سزایان نادات لەسەری!!... بۆنمونە: بابایەكی كافری نەخوێندەوار كەلەگوندێكی دابڕاودا دەژی، بەهیچ بیروباوەڕێ ئاشنا نیەجگەلەو بیروباوەڕەی كەخۆی لەسەری پێگەشتوە و گەورە بووە، لەبەرئەوە تەنها لەچوار چێوەی ئەو بیروباوەڕەدا دەتوانێت بیر بكاتەوە... ئینجا لەسەر ئەوەش نەسەرزەنشت دەكرێ ونەسزاش دەدرێ... چونكە خوداش داوا لەسەروی تواناوە لەهیچ نەفسێ ناكات... بەڕێی (جاحظ)خودا سزای تەنها ئەو كافرانە دەدات كەدەرك بەهەق دەكەن وبەلاّم بڕوای پێ نایەنن، لەترسی لەكیس چونی دەستەلاّت یاخود پێشەوایەتی ئاینی یان هەرهۆكارێكی دی. (٤)هەرچۆن بێت، تیۆرەكەی (جاحظ)كاریگەریەكی زۆری هەبوو لەنێو پانتایی بیرگردنەوەی (غەزالی)دا، ئەوەتا دەبینین غەزالی لە پەرتوكەكانیدا هەندێجار پشتیوانی لەو تیۆرەو هەندێ جاری دیكەش ڕەخنەی ئاراستە دەكات.

غەزالی سەبارەت بەو بۆچونە دەڵێت: (لەڕوی ئەقڵیەوە ئەم بۆچونە ئەستەم نیە، ئەگەر شەرع پشتگیری بكردایە شتێكی ڕەوا دەبوو) (٥)... ئەمەش مانای وایە غەزالی بیردۆزەكەی (جاحظ)ی بەلاوە ماقوڵ و پەسەندە، بەلاّم لێی دەسڵەمێتەوەچونكە شەرع پشتیوانی لێ ناكات... بەهێزترین گومانیشم بەلای ئەوەدایە كەغەزالی بەجۆرێ كەخۆی هەستی پێ نەكردوە سودی لەو تیۆرە وەرگرتوە، یانی تیۆرەكە كاریگەریەكی نەستی كردۆتە سەربیرگردنەوەی غەزالی، تەنانەت ڕەنگە ئەو تیۆرە یەكێك بوبێت لەوهۆكارانەی كەلەنێو ئاوەزی ئاوەكی ئەودا كار لێكیان كردوەو لەكۆتایشدا ئەو ڕەخنە گرنگەی لێ بەرهەم هات كەغەزالی ئاراستەی (ئەقڵ ولۆژیك)ی كرد.

## ڕەخنەگەرایی غەزالی:

شتێکی ئاسان نیەلەمیانەی چەند دێرێکی کەمدا بەغەزالی ئاشنا بین، ئەو پیاوە خاوەنی ئەقڵیەتێکی ڕێزپەڕی وابوو کەهەڵکەوتنەوەو دەرکەوتنەوەی ئاوا ئەقڵیەتێك لەماوەی چەند وەچەو نەوەیەکی یەك لەدووی یەکدا شتێکی دەگمەنە. غەزالی لەزۆربەی بیروبۆچونەکانیدا پێشی سەردەمەکەی خۆی کەوتبوو، هەروەها کەسایەتی وی جیاوازیەکی ئاشکرای هەبوو لەتەك کەسایەتی شەرعناس وفەیلەسوفەکانی تردا.

قازی ئیبن عەرەبی دەڵێت: (غەزالیم لەچۆڵەوانیەکدا بینی، گاڵۆکێکی بەدەستەوە بوو جەوەنە (٦)یەکی ئاوی بەسەرشانەوە بوو، پێشترلە بەغدا بینیبوم کەچوارسەد مێزەر لەگەوره پیاوانی نێو خەڵك ئامادەی وانەکانی دەبون و زانیار یان لێ وەردەگرت... لێی نێزیك کەوتمەوەو سلاوم لێکردو پرسیم : ئەی پێشەوا، ئایا وانە وتنەوە لەبەغدادا باشترینە لەم حاڵە؟؟، وەڵامی غەزالی ئەوە بوو بە تیلە چاوێکی بێزاری و توڕەییەوە سەیری ئیبن عەرەبی کردو پاشان بەچرپە هەندێ وتەی سۆفیگەری وگۆپلە هۆنراوەی گوت، لەدێرێکی ئەو هەڵبەستەدا دەڵێت :

**غزلت لهم غزلا دقیقا فلم اجد لغزلی نساجا فكسرت مغزلی (٧)**

واتە (ڕستنێکی وردو ڕێك وپێکم بۆڕستن، بەڵام کەسێکم نەبینی ڕسراوەکەم بۆ بچنێ، بۆیە تەشیەکەمم شکاند).

غەزالی دەڵێت: کەسێکم نەدیوە ڕسراوەکەم بۆ بچنێ بۆیەتەشیەکەم شکاند. ئەم گوتەیەش ئاماژەیە بەڕادەی ئەو ئازاردی کەغەزالی هەستیێ دەکرد لەبەرانبەر ئەو دۆگما بونەدا کەزاڵ ببوو بەسەر مێشکی هاودەمەکانی دا.

لەڕاستیش دا غەزالی لەژیانیدا پشکێکی زۆری لەسەرسەختی ورەخنەی تاڵ بەرکەوتوە، ئەوە بوو دوژمن وناحەزەکانی بەزەندەقیەت تاوانباریان کردبە هۆی ئەو ڕاو بۆچونە تازانەوە کە هێنابونیە ئاراوە (٨)وەك هەموو ئەو نوێخوازانەی کەبەتازەگەریەکی نامەئلوفەوە ڕووبە ڕوی هاودەمەکانیان دەبنەوە.

ئەو ئاسەوارەی غەزالی لەبیرکردنەوەی ئیسلامیدا بەرپای کرد زۆر مەزن و دەگمەن بوو. یەك لەو ئاسەوارانە بریتی بوو لەوەی توانی سەرنجی موسوڵمانان ڕاکێشێت بەلای گرنگی وبایەخی لۆژیکداو هەروەها بەلای بایەخی لێکۆڵینەوە لەلۆژیکیش دا.

ئەم کارەی غەزالیش بەخاڵی وەرچەخان دادەنرێت لەهەڵوێستی موسوڵمانان دابەرانبەر بەلۆژیکی ئەرەستۆیی... لەبەردا زۆربەی شەرعناسەکان بەچاوی سوکایەتی وحەرامێتی یەوە سەرنجی لۆژیکیان دەدا، کەچی دواترولەژێرکاریگەری غەزالی دادەستیان کردە گرنگی دان بەلێکۆڵینەوەی لۆژیك وبەکار هێنانی لەزانستە جۆراو جۆرەکاندا... تەنانەت هەندێکیان فێربوونی (لۆژیك)یان بە (فەرزی کیفایە) (٩)دایە قەڵەم. (١٠)

یەکێك لە ووتەبەناوبانگەکانی (غەزالی)ئەم گوتەیەتی کەدەڵێت: (هەرکەس زۆرشارەزای لۆژیك نەبێت، هیچ متمانەیەك بەزانیاریەکانی نیە)هەروەها ڕایشی وابوو کەلۆژیك سودوکەڵکی هەیە لەهەموو زانستە تێوریەکانیدا، ئیدی ئەو زانیاریانە ئەقڵی بن یاخود شەرعی.

سودەکەیشی بریتیەلەقوتار بوون لەدەستەڵاتی هەست ودەستەڵاتی ئارەزو، لەولاتریش دەست گرتن بەدەستەڵاتی ئەقڵەوەو گەشتن بەپلەکانی کامەرانی. (١١)

تێ بینی دەگرێ غەزالی زۆربەی بکات چەندناوێکی تری لەلۆژیك ناوە وەك (مەحەك وپێوەرو ترازوو). هەندێ بڕوایان وایە غەزالی بۆیە ئەم ناوانەی بەکار هێناوە تاگوخۆی دەرباز بکات لەخەشم و توڕەیی شەرعناسە هاوچەرخەکانی (١٢)من ڕام وایەغەزالی لەپێناوی مەرامێکی تردا ئەوکارەی کردوە، بەڕێی من بۆیەئەوناوانەی بەکار هێناوە تاکوئاماژەبدات بەوەی کەلۆژیك ئامێرێکەو بەکار

هێنانی سنوردارە، دروست وەکو ترازو وایەکە بۆسەنگ گیری وکێشانی هەندێ شتی دیاری کراو بەکاردێت و، ناکرێت بۆکێشانەکردنی شتی تر بەکار بهێنرێت.

غەزالی پێی وایە بەکارهێنانی لۆژیك لەوزانستانەدا ڕاستەکەپێك دێن لەو (کۆبەرەنجامە گشی)انەی کەهەموو ئەوانەی سەرنجیان لەزانستەکە داوە لەسەریان کۆکن، لەوحەلەدا دەتوانن بەهۆی لۆژیکەوە وردەبابەت لەو کۆبەرەنجامانە (دەربڕینی وەرگێڕ)دەربێنن، لێرەدا غەزالی دەڵێت: (بابەلگەکانیان یاسایەکی هەبێت کەهەموویان دانی پێدا بنێن، چونکەئەگەر لەسەر ترازووەکە رێك نەکەوتن، ئەوا ناکرێت ناکۆکی نێوانیان بەکێشانەکردنەکە هەلگیرێت ونەهێڵرێت) (١٣)

غەزالی لەم ڕووەوە جیاوازە لەو فەیلەسوف ولۆژیککارە کۆنانەی کەبڕواو متمانەی ڕەها یان بەلۆژیك هەبوو... بەکارهێنانیشیان لەهەمووکایەو بوارەکاندا بەلاوە ڕاست ودروست بوو... بەرێی غەزالی بەلگەی لۆژیکی دەستەوسانە لەوەی مرۆڤ لەپرسە خودایی ورۆحیەکاندا بگەیەنێتە دەربەندەکانی دڵنیایی... چونکەئەوپرسانە مەزنترو قوڵترن لەوەی ئەقڵی سنورداری ئێمە پەییان پێبەرێ، واتە ئەو مەسەلانە دەکەونە دەرەوەی چوارچێوەی بەلگەی لۆژیکی و تێڕامانی ئەقڵی یەوە.

هەروەها غەزالی ڕەخنە لەو موتەکەلیمانە دەگرێت کەهەوڵ دەدەن بیروباوەڕی خۆیان لەسەربنەمای ئەقڵ ولۆژیك بنیات بنێن.

لای وی پێویستە بڕوای ئاینی خۆمان لەسەر بنەمای ئەو بناغەیە بنیات بنێن کە (سروش یاخود کەشفی سۆفی)هێناویانە، پێی وایە تاچەندە بڕوا لەپێوانەکاریەکانی لۆژیك وبەلگەکانی لۆژیك دووربکەوێتەوە، ئەوەندە لەدڵ ودەروندا بەهێز دەبێت ولەڕاستیشەوە نزیکتر دەبێت.

غەزالی دەڵێت: (زانستە ئەقڵی یەکان دابەش دەبن بۆدنیاییەکان وناخیرەتیەکان. زانستە دنیاییەکان وەك زانستەکانی نۆژداری وژمێرەو ئەندازەو ئەستێرەناسی وپیشەو پیشەسازیەکانی تر... زانستە ناخیرەتیەکانیش وەك

زانینی حاڵ وباڵی دڵەکان وبەڵای کارەکان وناسینی خوای گەورەو خەسڵەت وکردارەکانی...ئەم دووزانستەش لێك جیاوازن).

مەبەستم لەجیاوازی ئەو دوو زانستە ئەوەیە گەرهەرکەس خۆی بۆیەکێکیان تەرخان بکات تائەو رادەیەی تیایدا رۆبچێت، ئیدی تارادەیەکی زۆر کورت بین دەبێ بەرانبەر زانستەکەی تر... هەرلەبەر ئەوەیە کەدەبینین بلیمەت وبیرتیژەکان لەکارو بارەکانی دونیاو لەنوژداری وژمێرەو ئەندازەو فەلسەفەدا، نەفام ونەزانن بەرانبەر زۆرینەی زانستە ئاخیرەتیەکان... ئەمەش بۆئەوە دەگەرێتەوە کەهێزو توانای ئەقڵ سود بەهەردوو مەسەلەکە پێکەوە ناگەیەنێت، لەم حاڵەشدا یەکیان دەبنە لەمپەر لەبەردەم کامڵ بون لەدووەمیاندا) (١٤)غەزالی پێی وایە پلەو پایەی ئەقڵی لۆژیکی لەهەست بەرزترە وبەرەنجام گیریەکانیشی راست ودروست ترە، لەهەمان کاتیشدا لە (کەشفی سۆفی)خوارو کەم ترە... غەزالی ئەو گوتەیەی فەیلەسوفەکانی وەرگرتودو لێیانەوە دەگوازێتەوە کە گوتویانە ئەو زانیاریانەی لەسەر بناغەی "هەست" بنیات نراین ئەگەری هەڵە بونیان هەیە بەبەراورد لەگەڵ زانیاریە ئەقڵیەکاندا، زانستە هەستیەکان هیچ دڵنیاییەکیان تێدا نیەو متمانە بەراستی یان ناکرێت (١٥)

ئەوەتا بۆنمونە تۆ تەماشای ئەستێرەیەك دەکەیت و زۆر بەبچوك دێتە بەرچاوت، دواتر بەڵگە گەڵ ئەندازەیی دێنە ئاراو پێت دەڵێن کەقەبارەی ئەو ئەستێرەیە لەقەبارەی زەوی گەورەترە. هەروەها کاتێ سەیری سێبەر دەکەیت وات دێتەبەر نیگا کەهیچ جمو جوڵێکی نیەو راوەستاوە، دواتر ئەقڵ دێت و نیشانت دەدات کەسێبەریش لەجمو جوڵ و بزاوتن دایە، ئەمەشت لەگۆرانی شوێنی سێبەرەکەوە دەست دەکەوێ کەسات لەدوای سات جێگەکەی دەگۆردرێت. ئەمەش یانی ئەقڵ هەست بەدرۆ دەخاتەوە. ئێمە چوزانین لەوانەشە لەپشتی ئەقڵەوە توانایەك هەبێت ئەقڵ بەدرۆدا دەبخاتەوە، وەك چۆن ئەقڵ هەست بەدرۆدا دەخاتەوە. غەزالی دەڵێت: (زۆرت متمانە بەمن هەبوو تاکو دەستەڵاتی ئەقڵ هات ومنی بەدرۆدا خستەوە، ئەگەر دەستەڵاتی ئەقڵ نەبا تۆ بەردەوام

دەبویت لەسەر بڕوابونت بەمن، لەوانەیە لەپشتی دەرك پێکردنی ئەقڵیشەوە دەستەڵاتێکی تر هەبێت. دەستەڵاتێك کەتێیدا درۆی ئەقڵ لەبڕیارەکانیدا دەربکەوێت، وەك چۆن دەستەڵاتی ئەقڵ بەدەر کەوت وەهەستی بەدرۆداخستەوە لەبڕیاردانەکانی دا) (١٦)

غەزالی کەلەم شرۆڤە کاریەی دەبێتەوە دەگاتە ئەو بڕوایەی کەلەپشتی ئەقڵەوە ئیدراکێکی بڵند تر هەیە، ئەو ئیدراکەش لەسروشی پێغەمبەران وکەشفی سۆفیەکاندا خۆی دەبینێتەوە، کەواتە پێویستەبیروباوەڕەئاینی یەکان لەسەر بنەمای ئەم سروش وکەشفە دا بمەزرێت.

لەوانەیە ئێمە لەئاقاری ئەم بەرەنجامەدا لەگەڵ غەزالیدا هاوڕا یاخود دژوناکۆك بین، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناتوانین نکولی لەو هێزو پێزو توانایە بکەین کەلەنێو ئەو شرۆڤەو بەرەنجامەدا هەیە... ئەو پێداگری لەوە دەکات کەلەم گەردونەدا کۆمەڵێ ڕاستی وهەقیقەت هەن کە ئەقڵی ئێمە دەستەوسانە لەوەی لێی تێ بگات... ئینجا بەم بەرەنجامگیریەی ئەو پڕەنسیپی ئەقلانیەتەی هەڵوەشاندەوە کەبەسەر مێشك وهزری فەیلەسوف و لۆژیککارەکانی کۆندا زاڵ ببوو. ڕەنگە زیادە ڕەویش نەکەین ئەگەر بڵێین : غەزالی لەم ڕەخنەیەی دا زۆرلە (کانت)ی فەیلەسوفی ئەڵمانی دەچێت کە نزیکەی حەوت سەدە لەدوای غەزالی بەدەرکەوت.

غەزالی، تەنها بەڕەخنە گرتن لەپڕەنسیپی ئەقڵ گەرایی دەستی هەڵنەگرتوە، بەڵکو ڕەخنەی ئاراستەی پڕەنسیپی هۆکارگەراییش کردوە... لەم ڕەختە کاریەی دیکەشدا لە (هیوم)ی‌فەیلەسوفی ئینگلیزی دەچێت کەبەماوەیەکی کەم بەرلە (کانت)ژیاوە... پوختەی بۆچونەکانی غەزالی سەبارەت بە پڕەنسیپی (هۆکارگەرایی)بەم تەرزەیە: ئێمە بەدوای یەکدا هاتنی ڕوداوێ لەدوای ڕوداوێکی ترەوە دەبینین، ئیدی ڕاهاتوین ڕوداوی یەکەم بە "هۆکار" و دووەم بە"ئەنجام " ناوزەد دەکەین، ئەمە تەنها نەریتێکی ئەقڵیەو خوومان پێوە گرتوە... ئەم خوو پێوە گرتنەش نابێتە بەڵگە لەسەر بوونی پەیوەستەگیەکی زەروری لەنێوان دوو

ڕووداوی بەدوای یەکدا هاتودا، گوایە هەمیشە ئەم پەیوەستەگیە ڕوو دەدات بەبێ ئەوەی گۆڕانی بەسەردا بێت.

جائەگەر بۆ نمونە "سوتان" لەدوای بەرکەوتنی "ئاگر" بێت، ئەمەبەو واتایە نایەت کەبەرکەوتنی "ئاور" دەست تێوەردان ولاقەیەکی هەیە بەڕووداني "سوتان "ەکەوە... بەڵکو مەسەلەکە تەنها مەسەلەی بەدوای یەکدا هاتنە نەك هیچی تر، ئەم بەدوای یەکدا هاتنەش بەفەرمانی خودا بوە، تەنانەت هەندێ جاریش ئەگەر خوا بیەوێت ئەم بەدوای یەکدا هاتنە ڕونادات) (١٧)

جگەلەوەش غەزالی دەرکی بەوە کردوە کەبەم جۆرە نکولی کردن لە"هۆکار گەرایی"دەبێتە هۆی ئەوەی چاوەڕوانی ڕودانی هەندێ ئەستەمی زۆرناشکرابکەین" دەربڕینی وەرگێڕ). پێمان وابێ دەگونجێت پەرتوکێك لەدەستماندا ببێتە ئاژەڵێك، یاخود "گۆزەڵە"یەکی ئاو ببێتە دار سێویکی گەورە... غەزالی بەم جۆرە وەڵامی ئەم گومانە دەداتەوە: خودای گەورە زانستێکی بۆدروست کردین بەوەی ئەو شتانە گونجاون وەلێ خودا نایانکات، ئێمەش بانگەشەی ئەوە ناکەین کەهەردەبێ ئەوشتانە ببن... بەڵکو دەگونجێت ڕووبدەن، دەشگونجێت ڕوونەدەن... ئەوەندەهەیە کەبەردەوامی نەریتی جارلەدوای جاری ئەو حاڵە، ئەوەلە مێشکماندا دەچەسپێنێت کەهەمیشە بەگوێرەی نەریتی ڕابردوو ڕوودەدات... خودا لەجۆ گەنم بەرهەم ناهێنێت ولەتۆوی هەڵوژەش سێو نایەنێتە بەر، وەلێ هەرکەس بەچاوی سەرنجەوە سەیرو سەمەرەکانی زانست بخوێنێتەوە، لەتواناو دەستەڵاتی خوا ئەوە بەدوور ناگرێت کە لەبارەی موعجیزەی پێغەمبەرانەوە باس دەکرێ) (١٨)

شیاوی باسە "غەزالی " گەرەکی بوە نکولی لەزەرورەتی ئەقڵی بکات لەنێو پرەنسیپی هۆکارگەرایی دا، تاکو بوارێك والا بکات بۆوەراست گێڕانی ئەو دیاردە نائاساییانەی کەلەسەر دەستی پێغەمبەراندا بەدەر کەوتوون... لەبەرانبەردا (ئیبن ڕوشد)بەدوورو درێژی ڕەتی داوەتەوە، لەمیانەی ڕەت دانەوەکەی دا دەڵێت: (ئێمە پێویستمان بەوەنیە بۆبڕواکردن بەمۆجیزەی پێغەمبەران، بنەمای

هۆکارگەرایی بڕوخێنین و هەڵی بوەشێنینەوە، چونکە ئەو مۆجیزانەی کەڕاستی بونیان سەلمێنراوە لەڕوی نەقلیەوە ئەستەم نین، بەلکو ئەو مۆجیزانە لەبابی دانانی ڕێسای گونجاولەگەڵ هەقدان، ڕێسای بەسود بۆکامەران کردنی هەموو مەردوم، وەك لەمۆجیزەی قورئاندا دەردەکەوێ) (١٩)

سەیر لەوەدایە "غەزالی" بڕوای وایە بەتەنها پێغەمبەران نین کەلەسەردەستیان دا کردەوەی نائاسایی ونەریت بەزێن ڕوودەدات، بەلکو پیاو چاك وجادوبازەکان)یش هاوبەشی پێغەبەرانن لەم خاڵەدا، تەنها ئەوەندە هەیە گەر کارەکەی لەسەر دەستی پێغەمبەرێك بەدەرکەوت ناو دەنرێت "مۆجیزە" ئەگەر لەسەر دەستی پیاو چاك "وەلی" یەگیش دا دەرکەوت بە"کەرامەت" ناودەبرێت وهەرچی ئەوکردەوانەشە کەلەسەردەستی جادوبازەکاندا دەردەکەون بە"فێڵ یان چاوبەست وجادوو" ناودەبرێن. سەرجەمیشیان یەك جۆرن، بەپێچەوانەی پرەنسیپی هۆکارگەراییەوە ڕوودەدەن... هەروەها غەزالی جیاوازی دەکات لەنێوان (پێغەمبەرو پیاو چاك)دا، بەوەی یەکەمیان بەو کردەوەیە ململانێ لەگەڵ خەلکی دا دەکات بەلام دووەمیان ئەو ململانێ یەناکات. لەڕوو تریشەوە جیاوازی نێوان پێغەمبەرو پیاو چاك وجادووگەریش لەلایەکی ترەوە لە (باشی ڕێبازو ڕێڕەو)دکەیاندا دەردەکەوێت، واتە ئەگەر ئەوکەسەی کردەوە نائاساییەکەی لێ دەبینرێت ڕێبازی ژیانی باش و ڕەوشت وناکاریشی چاك بێت ئەوا یان پێغەمبەرێ یاخود پیاوچاکێکە، دەنا گەر ئەو کردەوەیە لە خراپەزکایدا بەکاربێنێت ئەوە جادوگەرێکی گەندەڵە. (٢٠)

## ئیبن تەیمیە ولۆژیك

ئیبن تەیمیە یەکێکە لەکەسایەتیە فەلسەفیە مەزنەکان لەئیسلامدا، بەلای منەوە لەدوای غەزالی دووەم کەسەلەڕووی هێزو توانای ئەفراندنی فیکریەوە، ئەخاسمە لەولایەنەدا کەپەیوەستە بەلۆژیکەوە.

وەلێ ئیبن تەیمیە لەڕویەکی ترەوە جیاوازی هەیە لەگەڵ غەزالی دا.جیاوازیەکەشیان ئەوەیە کە دیتمان "غەزالی " لەکۆتا ڕۆژگارەکانی تەمەنی دا لەخەلك بێ ئومێد بوو، ئیدی لەژیان دورە پەرێز بوو. چونکە (چنەر)ێکی شایستەی بە (ڕێس)ەکەی خۆی نەدیتەوە.

وەلێ ئیبن تەیمیەبێ ئومێد نەبوو، ئیبن تەیمیە گۆشەگیریشی هەڵنەبژارد، بەلکو بەشداری ژیانی خەلکی دەکرد ولەگەڵیاندا هەوڵ وخەباتی بێ وچانی دەدا، تاکار گەیەنەوەی جارێکیان لە ساڵی (٧٠٢)دا کەل وپەلی جەنگی پۆشیی وشان بەشانی سوپای عەرەبی دژ بە مەغۆلەکان لەنزیکی دیمەشق دادەجەنگا، نەك هەرئەوەندە، بەلکو برواو دلگەرمی ئەم یەکێك بوو لەهۆکارەکانی سەرکەوتن بەسەر مەغۆلەکاندا... سەرباری ئەوەش بەهۆی بوێری وڕاشکاوێتی خۆیەوە لەڕاگەیاندنی بۆچونەکانیدا لەچەوساندنەوەو زیندانی کردن بێ بەش نەبووە !!

بەلکو پشکی وی‌لەزیندانی کردن ونەشکەنجەدان بەڕادەیەك بوو کەلە زیندانادا کۆچی دوایی کرد. (٢١)

(ڕەخنەگرتن لەلۆژیك)لەسەردەستی‌ئیبن تەیمیەداگەشتە ترۆپك، ڕەخنەکانی ئەم بەرانبەر لۆژیك تەنها لەهەڵوەشاندنەوەی پرەنسیپی ئەقڵ گەرایی و هۆکارگەرایی دا کورت هەڵنە هێنراوە، وەکو غەزالی ڕەخنەکانی خۆی لە ودووبوارەدا کورت هەڵهێنا بوو، بەلکو ئەم هەوڵی دا ئەو بناغەیە بوچەڵ بکاتەوە کە هەڵوازتەکاری لۆژیکی و پێوانەکردنی لەسەر دامەزراوە... لەم ڕوەیانەوە ئیبن تەیمیە لە (فرانسیس بیکۆن) و (ژۆن ستیوارت مل) دەچێت.

گرنگترین شتێ ئیبن تەیمیە لەم ڕودوە کردوێتی، بریتیە لە وەی گومانی کرد لەڕاستی ودروستی ئەو کۆبەرەنجامە گشتی یەئەقلیانەی کەلۆژیککارە

کۆنەکان دەیانکردنە پێشەکی بۆ پێوانە کاریە لۆژیکیەکانیان ولەبەلگەکانیشیان دابەجۆرێ پشتیان پێ دەبەستن کەبۆ هیچ کەس نەبوو گومانیان لێ بکات ومشت ومڕیان لەسەر بکات... بەڕێی ئیبن تەیمیە ئەو کۆبەرەنجامە گشتی یانە نەپێویستن ونەئاساییشن وهیچ بونێکی دەرەکیشیان نیە... بەلکو لەوشتە ڕێژەیانەن کەخەلکی جیاوازیان تێ دەکەوێت لەخەملاندنیاندا... یانی ئەو شتەی لای هەندێ خەلك ئاساییە لەوانەیە لای هەندێکی ترئاسایی نەبێت... ئیبن تەیمیە لەو ڕوەوە دەلێت: (خەلکی لەهێزو تواناى مێشکیاندا جیاوازیەکی زۆرترو گەورە تریان هەیە وەك لەجیاوازی هێزی وتواناى جەستەییان) (٢٢)

ئیبن تەیمیە وادەبینێ، کۆبەرەنجامە گشتی یە ئەقلیەکان هەندێ جار ئاسایی دەبن وەك لەزانستەکانی ماتماتیکدا دەدەکەوێ. ئەو بەرەنجامانەی کەزانستی ئەندازە پشتیان پێ دەبەسێت، ئاسایین وخەلکی لەهەمووکات وشوێنێکدا یەکڕاو کۆك بوون لەسەر ڕاستی ودروستی یان، بەلام لەزانستەکانی دیکەدا بەوشێوەیە نیە، بۆنمونە وەك لەزانستی نۆژداری دا دەدەکەوێ، لێرەکانەدا کۆبەرەنجامەکان بەهۆی ئەزمونی تاکەکەسی مرۆڤەکانەوە دروست بون و وەچە لەدوای وەچە گوازراونەتەوە. لەم حەلەشدا ڕەنگە ئەزمونی دیکە بێنە گۆڕێ ونەوانی پێشوتر هەلبوەشێننەوە.

بەڕێی ئیبن تەیمیە کۆبەرەنجامەکان لەمێشك وهزرەکاندان وبەخۆیان قەوارەیەکی دەرەکی خۆیان نیە، ئینجا ئەو بەلگە لۆژیکیەی کەلەسەر ئەوکۆبەرەنجامانە بنیات دەنرێت مرۆڤ ناگەیەننە زانستێکی دلنیاکەر. بەلکو دەیگەیەننە هەندێ پرسی گومان هەلگر.. زانستی هەق لەلای ئیبن تەیمیە ئەوزانستەیە کە هەقیقەتەکانی لەو شتە بچوکانەوە وەردەگرێت کەقەوارەی دیاریکراوی دەرەکی "دەربڕینی وەرگێڕ" یان هەیە، نەك لەو کۆبەرەنجامانەوە کەلەمێشك وهزرەکاندا دەخەملێنرێت... باشترین ڕێگەکەش کە مرۆڤ دەگەیەنێتە زانستی هەق، بریتی یەلەگواستنەوە لە (جوزئی)یەوە بۆ (جوزئی)... یان وەك شەرعناسەکان ناوی دەنێن پێوانەکردنی نادیار لەسەر

بینراو... ئینجا ئەم پێوانە کردنەش ئەگەر ئەزمون ڕێکی بخات وپڕەنسیپی هۆکارگەرایش سنوربەندی بکات، مرۆڤ دەگەیەنێتە دڵنیایی) (٢٣)لەمەوە دەردەکەوێ کە ئیبن تەیمیە لەمەسەلەی پڕەنسیپی هۆکارگەرایی دالەگەڵ غەزالی دا گۆك ویەك ڕانیە، وەلێ ئەو ناکۆکیەش پتر ڕواڵەتیە وەك لەوەی ڕاستەقینە بێت... هەرچی غەزالیە، نکولی ئەوەی لە خەڵکی نەکردوە کەپڕەنسیپی هۆکار گەرایی لەزانستەکانیاندا بەکار بێنن، تەنها نکولی لەوە کردوە کەئەو پڕەنیسپە لەدەرەوەی هزردا ئامادە باشی هەبێت... واتەلەلای غەزالی هۆکار گەرایی نەریت وخوویەکی هزری و زیهنیە ولەزۆربەی بارەکانیش دا ڕاست ودروستە، چونکە خوای گەورە ویستی وابوە کارەکان بەگوێرەی ئەو نەریتە بڕۆن بەڕێوە، لەگەڵ زانینی ئەو ڕاستیەیەدا کە خوا توانای ئەوەشی هەیە هەرکات ئارەزوی کرد ئەو نەریتە بگۆڕێت.

ئیبن تەیمیە جیاوازی کردوە لەنێوان "گونجان" ی زیهنی و " گونجان "ی دەرەکی دا... گونجاوی زیهنی ئەوەیە شتێ بێ بەمێشك دا ئیدی گریمانەی هەبوونی بکرێت، نەك لەبەرئەوەی کەئەزانرێت ئەوشتە بوونی هەیە، بەڵکو لەبەرئەوەی بەگوێرەی ئەقڵ دەزانرێت بونی ئەوشتە گونجاوە... هەرچی گونجاوی دەرەکیشە، ئەوەیە شتێ بەمێشك دابێت و دان بنرێت بەبوونی دا، لەبەرئەوەی دەزانرێت کەهەربەڕاستی ئەوشتە بوونی هەیە، یاخود هاوتای ئەوشتەی بونی هەیە) (٢٤)

بەم جیاکاریە، ئیبن تەیمیە خۆی جیاکردۆتەوە لەو فەیلە سوفانەی کەسەرقاڵی لێکۆڵینەوە میتا فیزیکی یەکانیان بوون لەسەر بناغەی دابڕینێکی زیهنی کەهیچ پەیوەندیەکی بەواقعی ژیانەوە نەبوو... ئیبن تەیمیە دەیەوێت فەیلەسوفەکان بڕیارو حوکمەکانیان لەڕێگەی پێوانەکردنی نەدیتراو لەسەر دیتراو بێننە دەست... نەك هەمیشە بەناسمانی " گونجاوی ڕەهای ئەقڵی "دا بفڕن...

## پوختەی ئەم بەشە:

لەم بەشەدا تێ بینی سەرهەڵدانی چوار بزاڤی فیکریمان کرد، کەهەریەك لەلای خۆیانەوە هەوڵیان دا لەگرنگی هەستی ئەقڵ گەرایی ولۆژیکی ئەرەستۆیی کەم بکەنەوە، هەر هەوڵێکیش سودی لەهەوڵی پێش خۆی وەرگرتوەو دواتر هەولیشی داوە فراوانتری بکات وبەرەوپێشی بەرێت... کاتێ دەگەینە سەر ئیبن تەیمیە، دەبینین ئەم لەرەخنەگرتنی دا لەلۆژیك گەشتۆتە لوتکە، یان وەك لەیەکێك لەپەرتوکەکانیدا ناوی ناوە" هەڵوەشاندنەوەی لۆژیك".

هەریەك لەو چوار هەوڵە، کۆششی کردوە بۆ گەمارۆدانی بەکارهێنانی ئەقڵ ولۆژیك لەبازنەیەکی بەرتەسك تر لەو بازنەیەی هەوڵی پێشوتر تێیدا دانای بوو... دواترئیبن تەیمیە دێت و زۆربەی بەشەکانی ئەو ئەپارتمانە دەرمێنێت کەفەیلە سوفانی ئەقڵ گەرا لەکۆن دا بنیاتیان نابوو.

ئەو وادەبینێ ئیبستیمۆلۆژیای مرۆڤ دووجۆرە، ئاینی وسروشتی... لەبواری ئیبستیمۆ لۆژیای ئاینی دا هیچ پێویستیەکمان بەبەکار هێنانی لۆژیك نیە، بەڵکو پێویستە ئەو زانیاریە ئاینی یە لە"پێشینە چاکەکان " دوە وەربگرین، ئیدی بواری ئەوەشمان نیە مشت ومڕی تێدا بکەین یاخود لۆژیك کاریی بکەین وبەوەش ئاینەکەشمان و ناراستەکاریەکانیپێشینانیشمان تێك بدەین. هەروەها لەبواری زانستی سروشتیشدا لۆژیك کاریەنامان گەیەنێتە زانستێکی دڵنیاکار. زانستە سروشتیەکان لەدیدی ئیبن تەیمیە دا زانست گەلێ ئەزمونین پڕلەوەی پێوانەیی وهەڵگوازتەکاری بن... زانیاری ڕاست و دروستیش " لەنێوان زانستە سروشتیەکاندا ئەوەیانە کەپەیوەستە بەواقعەوە و، لەوەوە بنەماکانی خۆی وەردەگرێت... خەریکە بگەمە ئەو بڕوایەی کە ئیبن تەیمیە لەو هەوڵەی دا بناغەیەکی داناوە بۆ" ڕێڕەوی ئەزمونکاری واقعی " کەزۆر بەڕونی لەلای ئیبن خەلدونیش دەی بینین... ئەگەر ژیاری ئیسلامی بواری ئەوەی بۆ بڕەخسایە کەلە گەشەو پێشکەوتن بەردەوام بوایە، وەك ئەو ماوەیەی ئیبن تەیمیە وئیبن خەلدونی تێدا دەرکەوت... ڕەنگە (ڕێڕەوی ئەزمونکاری)زۆر زیاتر لەو پێشکەوتنەی گەشەی بکردایە کەلەسەر دەستی ئەو دوو بیرمەندە مەزنەدا بەخۆیەوە بینی..

## پەراوێزەکانی بەشی دووەم

١) احمدامين، ضحى الأسلام، قاهيره ١٩٤٣، ل ٣٤٩ — ٣٥٠.

٢) شفيق جبرى، الجاحظ — معلم العقل والأدب، دار المعارف بمصر، ل ١٧١.

٣) وادیارە شارستانیەتی ئیسلامی زۆرێك لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتی بەرهەم هێناوە، بەڵام بەداخەوە لەبەر چەندین هۆکاری جیاوازسوتێنراون یاخود لە نێو براون... ئەگەر ئەو نوسراوە ئیسلامیانە سەرجەمیان بمانایەوە، لەوانەیە شتی وامان تێدا بدیایە کەلە هەندێ ڕودوە لە تیۆرەکەی ئیبن خەلدون بڵند تر بوبان.

٤) احمدامين، ضحى الأسلام، قاهيره ١٩٤٣، بەرگی ٣، ل ١٣٤.

٥) ه س، بەرگی ٣، ل ١٣٤.

٦) لە تێکستە عارەبیەکەدا دەڵێت : (وعلى عاتقه ركوه) ئینجا (ركوه)بەپێی لێکدانەوەی (المنجد)بریتی یە لە (اناو صغير من جلد يشرب فيه الماء.... بڕوانە المنجد في اللغه، چاپی ٣٥، ل ٢٨٧) منیش لە بەرانبەری ئەو ووشەیەدا، ووشەی (جەودنە)م بەکار هێنا وەك باشترین بەرانەر لە کوردیدا.....وەرگێڕ.

٧) ابو بكر بن العربى، العواصم من القواصم، قاهيره ١٣٧١ ك، ل ٢١.

٨) ابو حامد الغزالى، فيصل التفرقة بيت الأسلام والزندقة، قاهيره ١٩٦١، ل ١٠٧.

٩) فەرزی کیفایە: فەرزێکە گەرهەندێ لەموسوڵمانان جێ بەجێ ىبکەن لەسەر ئەستۆی ئەوانی دیکە هەڵدەگیرێت. وەرگێڕ.

١٠) على سامى النشار، مناهج البحث عند مفكرى المسلمين، قاهيره ١٩٤٧، ل١٣٠ — ١٤٠.

١١) ابو حامد الغزالى، معيار العلم، قاهيره ١٣٤٦ ك، ل ٢٧ — ٣٥.

١٢) علی سامی النشار، هـ س، ل ١٤١.

١٣) ابو حامد الغزالی، فیصل التفرقه، ل ١٨٨.

١٤) سلیمان دنیا، الحقیقة فی نظر الغزالي، ل ٢٠٦ – ٢٠٧.

١٥) احمد بن مسکویه، تهذیب الأخلاق، بیروت ١٩٦١، ل ١٠ -١١.

١٦) ابو حامد الغزالی، المنقذ من الضلال (تحقیق و تقدیم جمیل صلیبا و کامل عیاد) دیمەشق ١٩٦٠، ل ٢٣.

١٧) هـ س، ل ١٢ – ١٦.

١٨) ابو حامد الغزالی، تهافت الفلاسفه، قاهیره ١٩٤٧، ل ٢٣٦ – ٢٤١.

١٩) جمیل صلیبا و کامل عیاد، (مقدمة المنقذ من الضلال)، ل ١٥.

٢٠) سلیمان دنیا، الحقیقة فی نظر الغزالي، ل ٥١٧.

٢١) محمد ابو الزهره، ابن تیمیه، قاهیره، ل ٤٢- ٩٢.

٢٢) علی سامی النشار، مناهج البحث عند مفکری المسلمین، ل ١٦٥.

٢٣) هـ س، ل ١٧٨.

٢٤) هـ س، ل ١٦٩.

# بەشی سێیەم

## (ئیبن خەلدون و لۆژیکی ئەرەستۆیی)

چوار ساڵ پاش کۆچی دوایی" ئیبن تەیمیە"... ئیبن خەلدونی هاوڕێمان لەدایك بوو. (١)لە (مقدمە)کەی ئیبن خەلدوندازۆرێك لەوڕاوبۆچونانە دەبینین کەئیبن تەیمیە و غەزالی هێنابویانەوە، لەبابەتی ڕەخنەگرتنی ئەقڵ و لۆژیك دا... ئەو بۆچونانەش لە (مقدمە)دا هەندێ جار بەواژەگەلێ هاوشێوەی ئەو واژانە دەربڕیان لێکراوە کە ئیبن تەیمیە وغەزالی بەکاریان هێناون و، هەندێ جاری دیکەش بەواژەی جیاواز، لەگەڵ پارێزگاری کردن لەواتاکان.

جێگەی خۆیەتی لێرەکانەدا ئامازەبەوەبدەین کەئیبن خەلدون لەنمایش کردنی ڕاو بۆچونە لۆژیکیەکانی دا میتۆدێکی بەکار هێناوە کەلە پێچ وپەناوتەم ومژ خالی نیە... ئەو، ڕێبازی لۆژیکی خۆیی بەجۆرێکی واڕوون نەکردۆتەوە کەخوێنەرلەیەکەم سەرنجدا لێی حالی ببێت... "ڕەخنەکار " یەلۆژیکیەکانیشی لێرەو لەوێ لەدوو توێی (مقدمە)کەدا بەشپرزی هاتونەتە گۆڕێ، بەجۆرێ شپرزن کەبەنارەحەت خوێنەر دەتوانێت لەدویان بچێت ولەنێو سیستەمێکی خاوەن ئەدگاری ڕون و ئاشکرادا پەیوەستەگی یان لەنێواندا بدۆزێتەوە... جگەلەوەش، میتۆدی (ئیبن خەلدون) بەشێوەیەکی گشتی، لەوتەرزە میتۆدە پێکفە گونجاوانە نیە کەهەندێکی هەندێکی تری ڕون بکاتەوە.

وادیارە ئەو (سروشتە دبلۆماسیەی کە ئیبن خەلدونیپێوە ناسرابوو، وای کردوەبە ڕونی وڕاشکاوی بۆچونەکانی دەرنەبڕێت، وەك ئەوەی ترسابێت هەندێك لەوانەی لێ بوروژێت کەلەو ڕاوبۆچونانە تورەو نەبانن، بۆیەپێچ وپەناو قەوج و قلۆچی تێدەخات (دەربڕینی وەرگێڕ). جارێ ڕایدەکێشێت وجارێ دەی

هێنێتەوەیەك... من بۆخۆم دان بەوەدا دەنێم، کەتاکو چەند جارێك بەوردی وچاوی سەرنجەوە (مقدمە)کەم نەخوێندەوە، نەم توانی بەباشی لێی حاڵی ببم، هەرجارێکیش کەدەم خوێندەوە ڕوپەکی نوێم لەبۆچونەکانی (ئیبن خەلدون)دەدۆزیەوە... کێ دەزانێ؟ لەوانەیە تاھەنوکەش دوور بم لەوەی بەڕاستی و وەك خۆی لەئیبن خەلدون تێ گەیشتبم.

## ئیبن خەلدون وپرەنسیپی هۆکارگەرایی:

(دکتۆر جمیل صلیبا)و (دکتۆر کامل عیاد)دەڵێن: (ئیبن خەلدون لەمەڕ پرەنسیپی هۆکارگەرایی لەتەك غەزالی داناکۆك و پێچەوانەیە)... ئەوان لەم ڕایە یاندا پشتیان بەدوو دەستەواژەی نێو (مقدمە)بەستوە، دوودەستەواژەکەش ئەمانەن:

١-سروشت لەکردەوەکانیدا وازلە نزیکترین ڕێگەناهێنێت تالەبریتی دا دورترین وپرلەتەم ومژ ترین ڕێگەپەیڕەو بکات).

٢- پێغەمبەرانیش درودو سڵاوی خوایان لەسەربێت لەبانگەوازکردنیاندا بۆلای خودا بەهۆی هۆزو تایفەوە هەروابوون، ئەوان ئەگەر خودا مەیلی بوایە بەهەموو گەردون پشتیوانی لێ دەکردن، بەڵام خودا مەبەستی بوو کاروبارەکان بەگوێرەی نەریت "عادەت" بەڕێوە بچن) (٢)

گومانم وایە لەو دوو دەربڕینەدا، ئەخاسمە لەدووەمیاندا، پشتگیری ڕاوبۆچونی غەزالی تێدایە لەبارەی پرەنسیپی هۆکار گەراییەوە... وەك لەبەشی ڕابردودا بینیمان غەزالی پێی وانیە (هۆکارگەرایی)ڕێسایەکی‌توندو تیژی سروشتی یە.

بەڵکو پێی وایە نەریتێکە وخودا ویستویەتی لەگەردوندا پەیڕەوی لێ بکرێ، ئینجا خوداش توانای ئەوەی هەیە ئەو نەریتە ببەزێنێت یاخود بیگۆڕێت... دەربڕینی دووەمی ئیبن خەلدون، ئاماژە بەم بۆچونەی غەزالی دەدات کەدەڵێت: (بەڵام خودا مەبەستی بوو کاروبارەکان بەگوێرەی نەریت بەڕێوە بچێت). سەرباری ئەوەش دەبینین ئیبن خەلدون لەمۆجیزەو کەرامات و کارە نائاساییەکانی جادودا، هەمان ئەو بۆچونەی هەیە کەغەزالی هەیەتی، لەلای ویش هەموو ئەودیاردانە بەزاندنی پرەنسیپی هۆکار گەرایین.

دکتۆر (تەها حسەین)یش، بۆچونێکی نێزیك بەبۆچونەکەی دکتۆران (صلیباو عەیاد)ی هەیە... ئەویش پێی وایە پرەنسیپی هۆکار گەرایی یەکێکە لەو سێ بناغەیەی کە (ئیبن خەلدون)تیۆرە کۆمەلایەتیەکەیی لەسەر بنیات ناوە... تەها حسەین لەبارەی (ئیبن خەلدون) ئەوە دەلێت: (ئەو وەکو "کۆرنۆ" پێی وانیەکە هۆکار لەخودی خۆی دا ئاسەوارێکە لەئاسەوارەکانی رێکەوت، یاخود ئاسەوارێکە لەئاسەوارەکانی پێکگەیشتنی رێکەوت لەنێوان دوو گروپە هۆکاردا، دیارەئەوەش بنەمایەکە پێچەوانەیە بە فەلسەفەی ئەقڵ گەرایی) (٣)

"تەها حسەین" پێی وایە ئیبن خەلدون بەهەمان شێوەی فەلسەفەی ئەقڵ گەرایی، بڕوای بەپرەنسیپی هۆکار گەرایی هەیە، واتە بەپێچەوانەی بیرو بڕوای ئەوکەسانەوەی کەناکۆك بوون لەگەڵ ئەو پرەنیسپە دا، وەکو غەزالی وهیوام وکۆرنۆ. " وەلێ دواتر (تەها حسەین)پاشگەز دەبێتەوەو دان بەوەدا دەنێت کە (ئیبن خەدون)هەندێ هەلاوێری داناوە بۆ پرەنسیپی هۆکارگەرایی، ئەو هەلاوێریانەش لەو بابەتانەدان کەباس لەمۆجیزەو کەرامات وکردەوەی جادوبازەکان دەکەن) (٤).

ئیدی من نازانم چۆن (تەها حسەین)دەتوانێت بڕوا بوون بەو هەلاوێرە نەریت بەزێنانە، لەگەڵ بڕوا بون بەپرەنسیپی هۆکارگەرایی کەفەلسەفەی ئەقڵ گەرایی باسی لێدەکات. پێکەوە بگونجێنێت؟!.

هەرچۆن بێت، ئێمە دەتوانین بەئاشکرا پەی بەرین بەڕاو بۆچونی (ئیبن خەلدون)لەبارەی پرەنسیپی هۆکارگەراییەوە، لەوبەشەی (مقدمە)دا کەتەرخانی کردوە بۆ لێدوان لەسەر (عیلمی کەلام)، ئەوەتا دەلێت: (ڕوداوەکان لەجیهانی بونەوەراندا، ئیدی لەکردارە"زاتیەکان " یەکان یان لەکردەوە مرۆییویاخود ئاژەلیەکان بن، لەهەرکامیان بن پێویستە هۆکار گەلێ ڕێخۆشکار لەپشتیانەوە بێت، بەلکو بەگوێرەی نەریت بەڕێوە دەچن و پێکدێن... ڕوکاری ئاسەوارو کاریگەری ئەوهۆکارانەش لەزۆرێك لەڕوداوە بەرهۆکاندا نادیارە... ڕاستی

وچۆنێتی کاریگەریەکەش نادیارە. "ما اوتیتم من العلم الاقلیلا= ئێوە چەردەیەکی کەمی زانست نەبێ، چی دیکەتان نەدراوەتێ" لەبەرئەوە بڕیارماندا سەرنجی لێ نەدەین وسەرتاپای هەڵ بوەشێنینەوەو ڕوبکەینە وەدی هێنەری هۆکارەکان وبکەرو دروست کەری ئەو هۆکارانە). (٥)لێرەدا بەڕونی ئاسەوارو جێ پەنجەی غەزالی تێ بینی دەکەین... دەگرێت بڵێین:

(ئیبن خەلدون)لەوەدا جیاواز بوو لەغەزالی، کەچەندین جار دووپاتی ئەوەی کردۆتەوە کەناوەزی مرۆڤ دەستەوسانە لەوەی تێ بگات لەچۆنێتی کاریگەری دروستکردنی هۆکارەکان لەسەر (ڕوداو)... لێرەدا ئیبن خەلدون لەڕەوتی زانستی نوێ نێزیك دەکەوێتەوە... ئەمیش هەروەکور غەزالی دەڵێت: ئێمەلەڕێگەی ئەریتەوە بەپرەنسیپی هۆکارگەرایی ئاشنا بووین... بەلام لەلایەکی دیکەوە دەڵێت: ئەو ئەریتەش هەندێ جار هەڵە دەبێت، چونکەئاشنایی ئێمە بەرانبەر هۆکارەکان سنوردارە... لەبەر ئەوە پێویستە سەرنجی لێنەدەین، بەڵکو ڕووبکەینە خودای وەدی هێنەری هۆکارەکان.

## ئیبن خەلدون وپرەنسیپی ئەقڵ گەرایی:

ئاسەوارو کاریگەری غەزالی لەسەرئیبن خەلدون، لێرەدا زیاتر دەردەکەوێت وەك لەمەسەلەی پرەنسیپی هۆکارگەرایی دا. ئیبن خەلدونیش وەکو (غەزالی)پێی وایە ئاوەزی مرۆڤ سنوردارە وناتوانێت سەرنجی ڕاستێیەکانی گەردون بدات لەچوار چێوەی سنورێکی دیاریکراودا نەبێت و، نابێت لەو سنورەدەربچێت... ئەم ڕایەشی لە (مقدمە)دا وبەچەندین شێوەو لەزۆر بواردا هاتوە...لەیەکێك لەبابەتەکاندا (ئیبن خەلدون) بەم جۆرە دەدوێت :

متمانە بەوە مەکە کەئەقڵ "دەربڕینی وەرگێڕ" پێت دەڵێت گوایە دەتوانیت بەتەواوی کۆنترۆڵی بونەوەرو هۆکارەکانی بکات، گوایە دەتوانێت هەڵوێستە لەسەر وردەکاریەکانی هەموو وجود بکات، بەڕاستی ئەم ڕایەی ئەقڵ بێ ئەرزش ودەبەنگانەیە "دەربڕینی وەرگێڕ"...ئاگات لەوە بێ کەوجود لای هەردەرك پێ گەرێ لەسەرەتا دا، لەدەرك پێکراوەکاندا قەتیس دەبێ ولەو بوارە تێ ناپەڕێت... لەڕاستیش دامەسەلەکە بەپێچەوانەوەیە، ئەگەر پرسیار بکرێ لەئاژەڵێکی بێ زمان و ئەویش بێتە گۆ، دەبینین نکوڵی لە شتە ماقولەکان (ئەو شتانەی ئەقڵ سەلماندونی" وەرگێڕ")دەکات... ئەگەر ئەوەت زانی، ئەوا ڕەنگە جۆرە ئیدراکێکی تر هەبێت جیاوازلەئیدراکی هێمە. چونکە ئیدراکی ئێمەش دروستکراوە. ئینجا وەدی هێنراوەکانی خودا گەورەترن لە دروستکراوەکانی مەردوم و، سنوربەندکردنیش نادیارە، هەرچی وجودیشە چوار چێوەیە لەوە فراوانتری هەیە... ئەمەش ئەنگیەك نیە بۆ ئەقڵ ودەرك پێ کردنەکانی، بەڵکو ئەقڵ ترازویەکی ڕاستەو، بریارەکانی دڵنیابین ودۆیان تێدا نیە.بەلام تۆ چاوت لەوەنیە هەندێ مەسەلەی تربەو ترازوە بکێشێت، وەك پرسەکانی یەکن پەرستی ورۆژی بەرێ وڕاستی پێغەمبەرایەتی وڕاستی خەسڵەتەکانی خواوەندێتی... چونکە ئەمە چاولەئەستەم بڕینە. نمونەی ئەمە، وەکو پیاوێ وایە کەچاوی

لەوەبێت ئەو ترازووەی زێڕی پێدەکێشێت، چیاکانیشی پێ بکێشێت، ئەمەش دیارە کەئەستەمە... ئەمەسەرباری ئەوەی کەترازو لەبڕیارەکانی دا ڕاستگۆ نیە. وەلێ ئەقڵ سنورێکی هەیە وتیای دادەوەستێت وتێ ناپەڕێت بۆئەوەی کۆنترۆڵی زانیاریەکانی تایبەت بەخوداو خەسڵەتەکانی بکات، چونکە ئەقڵ گەردیلەیە کەلەردیلەکانی ئەو وجودەی لێیەوە پەیدابوە...) (٦)

گومانی تێدا نیە کە ئیبن خەلدون ئەم ڕایەی لە (غەزالی)یەوە وەرگرتوە، ئەوەتا تێ بینی وێك چونێکی گاڵتە پێ نەکراو دەکەین لەنێوان دەربڕینەکانی (غەزالی)ودەربڕینەکانی (ئیبن خەلدون)دا، ئەوەی بەتایبەت سەرنجی مرۆڤ ڕادەکێشێت ئەوەیەکە (ئیبن خەلدون) ئەقڵی وێك چاندوە بە (ترازوو)، پێشی وایە ترازی تایبەت بەکێشانەکردنی (زێڕ)ناگونجێت بۆئەوەی (چیاکان)ی پێ کێشانە بکرێت، لەبەشی ڕابردوشدا ئاماژەمان بەوەدا کەغەزالی لۆژیکی بە (ترازوو، پێوەر، مەحەك)ناوزەدکردنی.

بەڵام (ئیبن خەلدون)لەڕەخنەکاری کردنی ئەقڵ دا لە (غەزالی)دوورتر ڕۆشتوە. هەرچی غەزالیە، بڕوای وایە، ئەقڵ دەستەوسانە لەوەی تێ بگات لەپرس ومەسەلە خواییەکان... کەچی (ئیبن خەلدون)بڕوای وایە ئەقڵ کورت دەهێنێ لەتێ گەشتنی پرسە کۆمەڵایەتیەکان وپرسە خواییەکانیش.

هەروەها (غەزالی)بڕوای وابوو، ئەوکەسانەی پسپۆڕن لەزانستە ئەقلیەکاندا تاچەندە قوڵتر ڕۆبچن لەوزانستەدا، کورت بێن تردەبن لەتێ گەیشتنی زانستە خواوەندیەکاندا، دواتر (ئیبن خەلدون)دێت ودەڵێت ئەو جۆرە کەسانە کورت بێنن لەوەشدا کەلەسیاسەت وپرسەکانی دیکەی کۆمەڵگەی تێ بگەن.

(ئیبن خەلدون)لە (مقدمە)کەیدا، بەشێکی داناوە بەناوی (سەبارەت بەوەی زانایانی نێو ئادەمیزاد، دورترنین لە سیاسەت ورێچکەکانی)وە... مەبەستیشی لەزانایان ئەو کەسانەیە کەلەزانستەکانیاندا پەیڕەوی لە (پێوانەکاری لۆژیکی) دەکەن. سەبارەت بەو زانایانە دەڵێت: (ئەوان لەژیانی زانستی خۆیاندا ڕاهاتون

لەسەر ئەوەی ڕۆچن بەنێو واتاکانداو دایان ڕنن لەشتەبەرهەستەکان وبیان کەنە کۆبەرەنجامی گشتی... ئینجا خۆیان ڕاهێناوە لەسەرئەوەی ئەو کۆبەرەنجامانە بچەسپێنن بەسەر سیاسەت و کاروبارەکانی تری کۆمەڵگەدا... هەرلەبەر ئەوەشە کەدەبینین لەو ڕووەوە شکستێکی زۆریان بەردەکەوێت).

لەدیدی (ئیبن خەلدون) دا سیاسەت پێویستی بەوەیە خاوەنەکەی ڕەچاوی بارودۆخی "ئاوەدانی"ش بکات، وەك ئەوەی لەڕواڵەتی دەرەوەیدا دیارە، زۆرجاریش کۆبەرەنجامە گشتی یەکان پێچەوانە دەبن بەجوزئیاتە دەرەکیە ڕاستەقینەکان... هەرلەبەر ئەوەشە کەپیاوێکی نەخوێندەواری سروشت ساغ لەسیاسەتکردن داسەرکەوتوتردەبێت لەزانایەکی لۆژیککار... چونکە ئەو پیاوە بەسروشتی هەستەوەری خۆی سەرنجی مەسەلەکان دەدات وبڕیارەکانی لەسەر بنەمای پێوانەکردن وگشتاندن بنیات نانێ، ئەم کابرایە لەوحاڵەی دا لەو مەلەوانە دەچێت کەلەکاتی شەپۆل داندا لەڕۆخ دورناکەوێتەوەو بەوجۆرەش لەخنکان ونقوم بوون پارێزراودەبێت... (ئیبن خەلدون)بەم جۆرە کۆتایی بەم بابەتەدێنێت: (لێرەدا دەردەکەوێت، کەبەڕاستی لۆژیکسازی لەهەڵە کردن بەدەرنیە، چونکە زۆرێ لێ دابڕینی تێدایەو دوریشە لەجیهانی بەرهەستەوە) (٧)

(ئیبن خەلدون)لەبەشێکی تری (مقدمە)کەی دا، زۆر بەئاشکراتر ڕاو بۆچونی خۆی ڕادەگەیەنێت، ئەوبەشەی ناوناوە (سەبارەت بەپوچەڵ کردنەوەی فەلسەفە وگەندەڵی پەیڕەوکارانی)... لەم بەشەدا ئەوە ڕون دەکاتەوە کەئەو لۆژیکەی فەیلەسوفەکان پەیڕەوی لێ دەکەن لە دوو ڕووەوە کورت دەهێنێ... ڕوی یەکەمیان وەك باسمان کردلە سەرنجدان و تێڕامانی مەسەلە خواییەکاندا دەردەکەوێ... ڕوی دوەمیشیان لەکاتی سەرنج دان لەبونەوەرە بەرجەستەو فەیارە دارەکاندا دەردەکەوێت یاخود لەبابەت ئەوەی فەیلەسوفەکان بەزانستی سروشتی (سروشتناسی)ناوی دەبەن.

ڕووگاری کورت هەڵهێنانی لۆژیك لەم ڕووەوە، بریتی یەلەوەی ئەو بەرەنجامە هزریانەی کەبەسنورو پێوانەکاریەکان دێنەدەست دڵنیاکارنین، زۆر جاریش هاوتا نین لەگەڵ ئەوەی لەدەرەوەدا هەیە: (مەگەر لەحاڵێکدا هەستەکان گەواهی بۆ بدەن، لەوبارەشدا بەڵگە وسەلێنەریان ئەو گەواهی دانەی هەستە نەك بەلگەکانی ئەوان، جاکەواتە ئەودڵنیاییە لەکوێندەرێ یە کەچنگیان دەکەوێت؟)(٨)

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە (ئیبن خەلدون) پەرەی داوە بە بۆچونەکەی (غەزالی)و لەوبۆچونەدا ڕێچکەیەکی پەیرەو کردوە کەلەوانەیە غەزالی پێی قایل نەبێت. غەزالی متمانەی بەو زانیاریە نەببوە کەلەڕێی هەستەوە وەدەست دێت، لەم ڕووەوە هاوڕایە لەگەڵ ئەو فەیلەسوفە دێرینانەداکە سوکایەتی بەهەست دەکەن وبەهەڵەی دەبینن... دەکرێت بڵێن: غەزالی بڕوای وابوو دووجۆر (لۆژیك)یان دووجۆر ترازوی فیکری هەیە : یەکەمیان ئەو لۆژیکە ئەرەستۆییەیە کەبۆ هەموو زانستەکان دەگونجێت جگەلەمەسەلە خواییەکان... دووەمیان ئەو لۆژیکە (دۆزەکاریی - کشفی)یەکەمەسەلە خواییەکان دەکۆڵێتەوە... (ئیبن خەلدون) لۆژیکی سێیەم دەخاتە پاڵ ئەو دوو لۆژیکە، ئەویش (لۆژیکی هەستی)یە، ئەو ڕێی وایە ئەم لۆژیکە گونجاوو لەبارە بۆ تێ گەیشتنی پرسەکۆمەڵایەتیەکان.

وادەردەکەوێت (غەزالی)ویستویەتی پرسە سۆسۆلۆژیەکانیش وەکو زانستەسروشتیەکان مل کەچی لۆژیکی ئەرەستۆیی بن... لێرەدا (ئیبن خەلدون) دێت ودەڵێت: هەندێ زانست هەن وەکو ئەندازیاری وماتماتیك و... هتد، مل کەچی لۆژیکی ئەرستۆیی دەبن، وەلێ هەندێ زانستی دیکە، مل کەچی ئەو لۆژیکە نابن، وەکو زانستی کۆمەڵناسیی... بەڕێی وی پێویستە زانیاری کۆمەلایەتی لەهەستەوەرەکانە وە وەربگیرێن و پێیەوە پەیوەست ولکاو بن... ئەگەر (ڕنەکاری)و دورکەوتنەوە لەهەستەوەرەگانی تێدا زۆربوو. ئەوا چارەنوسی

مسۆگەر نابێ... لای (ئیبن خەلدون)هەست ڕاستگۆترە لەپێوانەکاری لۆژیکی، لەتێ گەیشتنی پرسە کۆمەڵایەتیەکاندا.

لەمەوە ڕون دەبێتەوە، کە (ئیبن خەلدون)بڕوای بەبوونی سێ جۆر (لۆژیك)هەبوە:

١-لۆژیکی دۆزەکاریی، کەگونجاوە بۆ لێکۆڵینەوەی مەسەلە خوایی ورۆحیەکان وپرسی وەك ئەمانە.

٢-لۆژیکی ئەقڵانی، ئەمیش گونجاوە بۆلێکۆڵینەوە لەپرسە پێوانەییەکانی وەك ئەندازەو ماتماتیك و... هتد.

٣-لۆژیکی هەستی، ئەمیش گونجاوە بۆ لێکۆڵینەوەی پرسە (کۆمەڵایەتی و سیاسی و...هتد) ە کان.

لەچەند بەشێکی داهاتودا، دەبینێ چۆن (ئیبن خەلدون)ئەو سێ جۆرە لۆژیکەی لەژیانی فیکری خۆی دابەکار هێناوە... ئەو لەسەرەتاوە دان بەوەدا دەنێت کە (مقدمە)کەیی لەژێرکاریگەری ئیلهامی هەنوکەیی دا نوسیوە، دروست وەك سۆفی گەراکان... لەلایەکی ترەوە دەبینین بەشەکانی (مقدمە)کەیی لەسەر شێوەی ڕێکخستنی بەلگەکان ڕێکخستوە، لەمەیاندا ڕێك وڕەوان وەکو لۆژیککاران وزانایانی ئەندازە مامەڵەی کردوە، لەکۆتایشدا هەوڵ دەدات زۆربەی بیرو بۆچونەکان لەبویەری بەرهەستی کۆمەڵایەتیەوە هەڵگوازێ و لێخوندنەودیان بۆبکات. "دەربڕینی وەرگێڕ".

## ئیبن خەلدون و ئیبن تەیمیە:

دەگونجێت بڵێین: (ئیبن خەلدون)ڕێی غەزالی وئیبن تەیمیەی پێکەوە تێکەڵ کردوە ئەوجار توانیویەتی بکاتە گەڵاڵە کردنی ئەو بۆچونە. بەوەش توانیویەتی ڕایەکی نوێ بێنێتەکایەوە کەلەگەڵ میزاجی کۆمەڵایەتی ڕاستەقینەی خۆی دا بگونجێت... وەك لەبەردا ئاماژەمان پێدا (ئیبن تەیمیە)ڕێی وابوو ئەو بەڵگە وسەلماندنە لۆژیکیەی کەپشت بەکۆبەرەنجامی ئەقڵی دەبەستێ، مرۆڤ ناگەیەنێتە زانیاریەکی دڵنیاکەر، بەڵکو مرۆڤ دەگەیەنێتە هەندێ مەسەلەی گوماناوی کەتەنها لەمێشکدا دەخەملێنرێن.

زانیاری ڕاستەقینەش لای (ئیبن خەلدون)ئەو زانستەیە کەبڕیاردکانی لەو شتە بچوکانەوە وەردەگرێ کەبەبوونی دەرەوەیاندا دیاری دەکرێن... ئیبن تەیمیەلەو ڕووەوە دەربڕینێکی خۆش هەیە، ئەوەتا جیاوازی کردوە لەنێوان (ئیمکانی هزری)و (ئیمکانی دەرەکی)دا، بەوەی یەکەمیان پشت بەبیرکردنەوەی ئەبەسترا کتیکی دەبەستێت، لەکاتێکدا دوەمیان پشت بەلێخوندنەوەی هەستی دەبەستێت.

ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئەوەیە کە (ئیبن خەلدون)نیش لەبەشێکی (مقدمە)کەیدا باس لەئاوا جیاوازیەکی نێوان ئەو دوو (ئیمکان)ەدەکات. بەڵام یەکەمیان ناودەنێت (ئیمکانی ڕەهای ئەقڵیی)و دوەمیشیان ناودەنێت (ئیمکان بەپێی ماوەی شتەکان"وەرگێڕ) (٩). (ئیبن خەلدون) لەمیانەی باسکردنی ئەو خوەی خەڵکیدا باس لەوجیاوازیە دەکات، کەهەمیشە ڕاهاتون لەسەر بەدرۆ خستنەوەی هەر هەواڵێك کە پێی ئاشنانەبن ولایان نامەئلوف بێت. خەڵك ڕاهاتون لەسەر ئەوەی ئەگەر هەواڵی ڕوداوێکی سەیر ببیستن کەلەنێو نەتەوەیەکی دوردا ڕوی دابێت وئەمان پێی ڕانە هاتبن وروداوی وایان لەنێو

کۆمەلگەی خۆیاندا نەدیبێ، دەست بەجێ بەدرۆی دەخەنەوەو گاڵتەی پێ دەکەن... وەك ئەوەی بەسەر (ئیبن بەتوتە)داهات، ئەم پیاوە گەڕیدەی بوو، بە وڵاتە دوورەکاندا دەگەڕا، کەگەڕایەوە ناوهۆزەکەی خۆی وهەندێ هەواڵی سەیروسەمەرەی ناوئەو وڵاتە دوورانەی بۆگێڕانەوە، دەست بەجێ نکولیکان کردوو بەدرۆیاندا خستەوە.

(ئیبن خەلدون)لەم ڕووەوە، لەشێوەی ئامۆژگاری دا بۆ خوێنەران، دەدوێت ودەڵێت: (نکولی وملەجەڕێ لەشتێ مەکە، کەلەلایەتۆ باو نەبێت وپێی ئاشنا نەبێت ولەچاخ وسەردەمەکەیشت دانمونەی ئەو شتە نەبێت... زۆرێك هەن"دەربڕینی وەرگێڕ" هەرگا گوێبیستی ئاوا هەواڵێك دەبن لەنەتەوە پێشینەکانەوە دەست بەجێ ملە جەڕێ دەکەن، ئەمەش ڕاست نیە، چونکە حاڵ وباڵی بوون وئاوەدانی ناچون یەك وجیاوازە، ئینجا هەرکامیان گەشتبنە پلەیەکی خوارو یان پلەیەکی مام ناوەندی، ئیدی مانای ئەوەنیە کە هەموو پلەکان تیای دا قەتیس بوون و کۆتاییان هاتوە) (١٠)

(ئیبن خەلدون)بۆ زیاتر ڕوون بوونەوەی مەبەست، لەم ڕووەوە، چیرۆکێکی خۆش دەگێڕێتەوە: جارێك یەکێك لەسوڵتانەکان، شالیارێکی خۆی لەگەڵ کوڕە بچوکەکەیدا، زیندانی دەکات، شالیارەکەو کوڕە بچوکەکەیچەند ساڵێك لەزینداندادەمێننەوە، کوڕە بچوکەکە گەورە بوو... هەرکەئەقڵی کرایەوە، سەبارەت بەو گۆشتەی کەبۆیان دەهاتە نێو زیندانەکەوە، پرسیاری لەباوکی دەکرد، کەئایا ئەو گۆشتەی لەناو خواردنەکەماندایە، گۆشتی چ ئاژەڵێکە؟ ئەو منداڵە لەژیانیدا مەڕی نەدیبوو، لەنێو ئاژەڵاندا تەنها مشکی‌ناو زیندانەکەی دیبوو ! بۆیە وایدەزانی مەڕیش وەکو مشك وایە !! بەڵام باوکی نکولی لەو بۆچونەی منداڵەکەی دەکرد... ئیبن خەلدون بۆیە ئەم بەسەرهاتەدەگێڕێتەوە تاکو بیسەلێنێت کەچۆن بۆچونەکانی مرۆڤ لەو چوار چێوەیە دەرناچن کەپێی ڕاهاتوە لەژینگەسنوردارەکە دا... لەبەر ئەوە زۆر نارەحەتە مرۆڤ تەسەوەری شتێ بکات کەپێی ئاشنا نەبێت، .مەگەر بە پێوانەکردن لەسەر (مەئلوف)بێ.

(ئیبن خەلدون)بەم جۆرە دەگاتە کۆتایی ئەو بۆچوونەی کەدەڵێت: (دەسابا مرۆڤ بگەڕێتەوە بۆ بنەڕەتی خۆی، باتوانادارب ێ بەسەرناخی خۆیدا، بالەڕێگەی ئەقڵ وسروشتی زگماکیەوە جیاوازی بکات لەنێوان سروشتی "گونجاو" و "نەگونجاو "دا... ئینجا هەرچی شتێ چوە چوارچێوەی "گونجاو" دوە قبوڵی بکات... هەرچیش لەو چوارچێوەیە دەرچوو ڕەتی بکاتەوە لێرەشدا مەبەستمان لەئیمکانی ڕەهای ئەقڵیی نیە، چونکە چوارچێوەی ئەمە فراوانترین شتە، بەڵکو مەبەستمان لەئیمکانە بەگوێرەی مادەیشتەکان...) (١١)

## مادە لەلای ئیبن خەلدون :

لە (مقدمە)کەی ئیبن خەلدوندا و لەزۆر جێگەدا هەندێ دەستەواژەمان بەرچاو دەکەوێت کەتیایاندا باس لە (مادە)کراوە، هەندێ جاربەواژەی (تاك)وهەندێجاری دیکەش بەواژەی "کۆ"... بەڕێی من ئەو دەستەواژانە لەووی لۆژیکی یەوە بایەخێکی زۆریان هەیە، جێگەی دلگرانی ونەفسوسیشەکەدەبینین ئەوکەسانەی توێژینەوەلەسەر (ئیبن خەلدون)دەکەن، گرنگی شیاوی خۆی بەو دەربڕینانە نادەن... تەنانەت هەندێکیان لەژێر ڕۆشنایی چەمکی نوێی (مادە)دا لەو دەربڕینانە تێ گەشتون کەلە (مقدمە)داهاتون، ئەمەلەکاتێکدا (ئیبن خەلدون)مەبەستی لەبەکار هێنانی واژەی (مادە)لەهەندێ ڕووەوە جیاواز بوە لەو واتا نوێیەی مادەدا کەهەنوکە باوە.

(ئیبن خەلدون) کاتێ باس لە (مادە)دەکات وئاماژەی پێ دەدات بەگوێرەی ئەو چەمکە کۆنەی لێی تێ دەگات کەلەنێو فەیلەسوفانی سەردەمی خۆیدا باو بوە... بۆیە نێزیك ترین زاراوەی نوێ لەچەمکی (مادە)وەلای (ئیبن خەلدون) بریتێیەلە (ناوەڕۆك)یاخود (ناواخن)... لەبەشی یەکەمی ئەم پەرتوکەشدا بینیمان چۆن لۆژیکی کۆن گرنگی بەفۆرمی بیرۆکەکان یاخود بەشێوازی دەرەوەیان دەدابە بێ ئەوەی هیچ بایەخێ بدات بەناوەڕۆك یاخود ناواخنی ئەو بیرۆکانە... بەواتایەکی دیکەئەو لۆژیکە سەرقاڵ بووبە (کۆبەرەنجامە گشتێیە ئەقلّیەکانەوە)وهیچ گوێی نەدەدا بەو نێوەڕۆکە (مادی)یەی لەبویەردا ئامادەگی هەبوو.

ئیبن خەلدون هات وشۆڕشێکی بەرپاکرد بەسەر ئەو لۆژیکە (فۆرمی)یەدا...دەیەوێت هزرڤانان ببنەخاوەنی لۆژیکێکی (مادی)... ئەم شۆڕشەی ئیبن خەلدونیش لەو دەستەواژەو دەربڕینانەدابە دەردەکەوێت کەئاماژەمان پێدان، وەك چۆن لەهەندێ شتی تریش دادەردەکەوێت... ئەو دەربڕینانەش زۆرو زەوەندن ولەدووتوێی لاپەڕەکانی (مقدمە)دا

بڵاوبونەتەوە... ئێمە لەماوەی دادێ، هەوڵ دەدەین وەك نمونە هەندێ لەودەربڕینانە وەرگرین:

١/ سەرەتا بەئاماژەدان بەو دەربڕینە دەست پێ دەكەین كەلەبەردا نوسیمان لەباسكردنی وێكچونێكی نێوان (ئیبن خەلدون)و (ئیبن تەیمیە)دا، لەمەسەلەی جیاوازی كردن لە نێوان (ئیمكانی هزری)و (ئیمكانی دەرەكی)دا... وەك دیتمان (ئیبن خەلدون)"ئیمكانی دەرەكی" ناوناوە "ئیمكان بەگوێرەی مادەی شت"... بەمەش (ئیبن خەلدون)ویستویەتی ڕەخنەلەو هزرڤانانە بگرێت كەڕاهاتون لەسەرئەوەی لەڕێگەی داڕنینی هزریەوە جیاوازی بكەن لەنێوان هەواڵە "گونجاو"و"ئەستەم " دكاندا... یاخود لەڕێگەی سەرنج دان لەمەسەلەكان بەگوێرەی وێنە ڕەهاكانیان نەك بەگوێرەی مادە "ئێوەڕۆك"ە ڕێژەییەكانیان ... (ئیبن خەلدون)گەرەكیەتی ئەو هزرڤانانە مەسەلەكان بەگوێرەی هاوشێوەكانیان بەراورد بكەن و پێوانەی شتەنادیارەكان بكەن لەسەر شتە دیارو ئامادەكان، وەك لەبەشێكی تری (مقدمە) دا بەڕاشكاوی دانی بەم مەبەستەدا ناوە. (١٢)

٢/ هەرلە (مقدمە)دا، دەربڕینێكی دیكە هاتوەو ئەم مەبەستە بەجۆرێكی باشتر ڕون دەكاتەوە... لەم دەربڕینەدا (ئیبن خەلدون)ڕەخنە لەمێژونوسە پاشینەكان دەگرێت وبە (تەقلیدكار)و (ئەقڵ وسروشت تەمبەڵ)پێناسەیان دەكات وبەوە منەتباریان دەكات كە گۆڕانكاری و ئاڵوگۆڕی بەردەوامی نێو مێژوو فەرامۆش دەكەن... ئەوەتا دەربارەیان دەڵێت: (هەواڵی وڵاتان وبەسەرهاتی ڕوداوی چاخە یەكەمینەكان كۆدەكەنەوەو بۆمانی دەنوسن "دەربڕینی وەرگێڕ"... وێنەیەكی داڕنراومان لەناوەڕۆكەكانیان بۆدەگوازنەوە، وەك شمشێرێك لەكێلان دەرهێنرابێت...) (١٣)ئەمەش بەومانایە دێ كە (ئیبن خەلدون) سەرزەنشتی مێژونوسان دەكات چونكە ئەو مێژونوسانە هەواڵەكان بەگوێرەی وێنە هزریە ئەبستراكتیكی یەكانیان دەگوازنەوەو ناواخنەواقعی یەكانیان فەرامۆش دەكەن...ئەو مێژوناسانە بەكەسێك دەچوێنێت كەشمشێر

وازێ دێنێت وتەنها بەکێلانەکەیکومسایی دێت، ئەمە لەکاتێکدا مەبەست شمشێرەکەیە، وکێلان تەنها هۆکارێکە بۆ پارێزگاری کردنی شمشێرەکە.

ئەم دەربرینەی ئیبن خەلدون، دەربرینێکی (ئیبن هەیسەم)ی زانای فیزیا ناسی ناسراومان بیردەخاتەوە... ئیبن هەیسەم)لەپەرتوکی (المناظر)دا، بەددق ئاوا دەڵێت: (سەرنجی زۆرێك لەڕاو بۆچون وبیروباوەڕەکانم داوەو، دەبینم هیچ هودەیەکیان نیە، ڕێچکەیەکمان بەرەوهەق ناخەنە بەردەم ورێبازێکی باشیشمان نیشان نادەن بەرەوڕێی دڵنیاکەر، لەئەنجامدا هەستم کرد ناتوانم بگەمە هەق، مەگەر لەرێی ئەو بۆچونانەوە نەبێت کەڕەگەزو پێکهێنەرەکەی مەسەلە هەستیەکان بێت وفۆرمەکەیشی پرسە ئەقلیەکان بێت) (١٤).

ڕەنگە ڕاست بێت بڵێین: ئیبن هەیسەم لەبواری فیزیادا شۆڕشی بەرپاکردوە بەسەر ئەولۆژیکە فۆرمیەدا، وەك چۆن (ئیبن خەلدون)لەبواری کۆمەڵناسی دا شۆڕشی بەسەر لۆژیکە فۆرمیەکەدا بەرپاکرد، هەردووکیشیان لەبواری تایبەتی خۆیاندا شتی نوێ یان هێنایەکایەوە.

٢-ئیبن خەلدون لەوبەشەی (مقدمە)دا کەتەرخانی کردوە بۆباسکردنی (لۆژیك)ئاماژەیەکی ڕوون دەکات بۆئەوەی لۆژیککارە پاشینەکان سەرقاڵ بەفۆرمی بیرۆکەکان ونێوە ڕۆکەکانیان فەرامۆش کردوە... هەروەها ئاماژەشی بەوەکردوە کەپێویستە مادە (نێوەرۆك)ی‌شتەکان جێگەی بایەخ وپشت پێ بەستن بێت لەهونەری (لۆژیك کاریی) دا... لەوڕەوە دەڵێت: (...دواتر هاتون باسیان لەپێوانەکردوە لەڕوی بەرهەم هێنانی داخوازیەکانەوە بەشێوەیەکی گشتی، نەك لەڕوی مادەو ناواخنەکەیەوە، تەنانەت سەرنج لێدانیان بەگوێرەی ناوەڕۆك لابردوە، لەهەرپێنج پەڕاوەکەدا : بەڵگەو مشت ومڕو وتاردان وهۆنراوەو سەفسەتە. ڕەنگە هەندێکیان کەمێکیان لێ وەرگرتبێ، دەنافەرامۆشیان کردوە، وەك ئەوەی هەرنەبوبێ "هەرچەندە لەوهونەرەدا گرنگ پڕبایەخیشە......) (١٥)

ڕەنگە شتێکی سودبەخش بێت گەر ئەو لێدوانەی (دکتۆر علی عبدالواحدوافی)لێرەدا بگوازمەوە کەدەربارەی ئەو گوتەیەی (ئیبن خەلدون) دەڵێت: (یانیسەرەڕێی ئەوەی (مادە- ناوەرۆك)گرنگ و ڕەچاو کراوە لەهونەردا، چونکە پەیوەستە بەماوەی پێوانەکاریەکەوە لەڕوی ڕاستی ودروستی پێشەکیەکانی وگونجانی لەگەڵ واقیع دا... وەڵ لێکۆڵینەوەکانی تر پەیوەستن بەپێوانەکردن لەڕووە فۆرمیەکەیەوە... بێگومان لێکۆڵینەوە لەڕوی ناوەڕۆك وڕادەی ڕاستگۆیی پێشەکیەکانیەوە زۆر گرنگ ترە لەلێکۆڵینەوەی لەڕوی فۆرۆم وبارودۆخە بەرهەم هاتوەکانیەوە... لەبەرئەوە توێژەرە مۆدێرنەکان زۆرینەی بایەخ وگرنگی توێژینەوەکان ئاراستەی لۆژیکی مادە یاخود لۆژیکی پراکتیزەیی دەکەن "ئەمەش پرۆگرامەکانی لێکۆڵینەوە Mrethodologie ش دەگرێتەوە " ئەمەلەکاتێکدا گرنگی یەکی کەم دەدەنە لۆژیکی فۆرمی) (١٦).

٤-لەوبەشەدا کە (ئیبن خەلدون)تەرخانی کردوە بەناوی "سەبارەت بەپوچەڵکردنەوەی فەلسەفەو پەیڕەوکارانی "، ئەویەشەی کەلەبۆنەیەکی پێشودا ئاماژەمان پێدا، (ئیبن خەلدون)ئەو هەڵەو کەم و کوڕیانە ئاماژە پێ دەدات، کەفەیلەسوفەکان تێی دەکەون بەهۆی پێوانەکاریە فۆرمی یەکانیانەوە... ئەوەتا دەڵێت: (بەراورد کردن لەنێوان ئەو بەرەنجامە هزریانەی لەڕێگەی پێوانەکاریەکانەوە "وەك خۆیان دەڵێن" دێتە دەست، لەگەڵ ئەوەی لەدەرەوەدا هەیە دڵنیاکەر نیە، چونکە ئەوبڕیارانە هزری وگشتگیرو کۆن، وەڵ مەوجودە دەرەکیەکان بەگوێرەی ناوەڕۆکیان دەناسرێنەوەو دیارن، تەنانەت ڕەنگە لەنێو ناوە ڕۆکەکانیاندا شتێ هەبێ کەبەربگرێ لەو بەراورد کردنە) (١٧)

لێرەدا (ئیبن خەلدون)بەڕوونی باس لەجیاوازی نێوان وێنە ئەبستراکتیکیە هزریەکان وڕاستیە دەرەکیە مادیەکان دەکات، لەبەشێکی تری (مقدمە)کەی دا ئەم مەبەستەی زیاتر ڕون دەکاتەوە، لەو ڕوەوە دەڵێت : کەسێکی نەخوێندەوار گەڕانەهاتوە لەسەر داڕنینی هزری، زۆرجار لەلۆژیککارەکان ڕاستگۆ تر دەبێت

لەبڕیاردانەکانیدا... چونکە (ئەو کابرایە چونکە ڕانەهاتوەلەسەر دارنینی هزری، حوکم بەسەر هەرمادەیەك وهەرجۆرە بارودۆخێکدا بەگوێرەی تایبەتمەندی مادەوبارودۆخەکە دەدات ئیدی لەحوکم دانیدا پەل ناهاوێژێ بۆ پێوانەکردن یاخود گشتاندن ولەزۆربەی تێڕامانەکانیشی دالەمادەبەرهەستەکان جیانابێتەوە ولەهزری خۆیدا ئەو مادەیە تێ ناپەڕێنێ، وەك مەلەوانێك کەلەکات وساتی شەپۆلدا لەوشکانی دوورنەکەوێتەوە... بەوەش لەسیاسەت کردنیداله هەلەکردن پارێزراودەبێت ولەمامەڵەکردنیشی دالەتەك هاوڕەگەزەکانیدا خاوەنی سەرنجی ڕاست وڕێك دەبێت... لێرەشدا دەردەکەوێت کەلۆژیك سازی لەهەڵەکردن بەدورنیە، چونکە دارنینی هزری تێدایەو لەهەستەوەرەکانیش دوور دەکەوێتەوە...) (١٨)

لێرەدا بەشێوەیەکی ڕونی گاڵتە پێنەکراو، هەڵوێستی (ئیبن خەلدون)لەبەرانبەر لۆژیکی فۆرمی دا ڕون دەبێتەوە هەرتوێژەرێ کاتێ ئەو ڕستەو دەربڕینانەی (ئیبن خەلدون) دەخوێنێتەوە کەباسی (مادە)یان تێدا کراوە، ناتوانێت ڕێی ئەوکەسانە پەسەند بکات، کەپێیان وایە (ئیبن خەلدون)لەبیرکردنەوەی کۆمەڵناسیانەی خۆیدا پەیڕەوی لەلۆژیکی فۆرمی کردوە، چونکەوەك لەپێشەوە ئامازەمان پێدا مادەو فۆرم دووشتی پێچەوانەن، بۆیە ناگونجێت (ئیبن خەلدون) لەتیۆرەکەی دا پەیڕەوی لەلۆژیکی فۆرمی بکات، لەکاتێدا لەو دەربڕین ودەستەواژە ئامازە پێدراوانەی ڕابردوشدا، ئەو لۆژیکە پرۆتستۆ بکات.

٥- ئەمەوێت کۆتایی بەلێکۆڵینەوەی ئەم دەربڕینانە بهێنم بەئامازەدان بەدەربڕینێك کەتیایدا بەشێوەیەکی تەم ومژاوی ئامازەبەوشەی (مادە)کراوە، ئەم دەر بڕینەش هەرلە دووتوێی (مقدمە)داو لەباسی تایبەت بە (دەسەڵات وپلەو پایە)داهاتوە، (ئیبن خەلدون) دەڵێت: (دەرکەوتوەکە دەسەڵات وپلەوپایە بریتی لەتواناداری مرۆڤ لەوەی تەسەروف بکات لەکاروباری ئەو هاوڕەگەزانەی

کەلەزێر دەستی دان بەرێگەدان ویاساغ کردن وخۆسەپاندن بەچەوساندنەوە و، زاڵ بون بەسەریاندا، تاکو ناچاریان بکات بەوەی زیانەکان لەخۆیان دوربخەنەوەو، سودو قازانجەکانیشیان مسۆگەر بکەن. بەدادپەروەرانەو بەگوێرەی بڕیاری شەرعەکان وسیاسەت... تادەڵێت : مەبەست لەیەکەمیان چاودێری وعینایەتی خوایە، دوەمیشیان هەرلەنێو یەکەمدایە، وەك سەرجەم ئەو بارودۆخە نەخوازراوو خراپانەی لەنێو قەزای خواییدان، چونکە لەوانەیە خێروچاکەیەکی زۆر مسۆگەر نەبێت ئەگەر خراپەیەکی کەمیان لەگەڵ دا نەبێت، لەپێناوی مادەکان دا، بەوەش خێرەکە لەدەست دەرناچێت، بەڵکو هەرلەناونەوشتەدایە کەخراپەکەمەکەی تێدایە...) (١٩)

شیاوی باسە (دکتۆر علی عبدالواحد وافی)، لەم وتەیەی کۆڵیوەتەوە. دەربارەی دەربڕینی (لەپێناوی مادەکان دا)کەلەو وتەیەدا هاتوە، دەڵێت : لەهەموو ڕونوسەکاندا هەروا نوسراوە، دەلالەت ومانایەکی ڕوونیشی نیە... (٢٠)

بەڕێی من ئەو دەربرینە سەرەڕێی ئەوەی ڕون نیە، بەڵام خاڵی وبێ بەش نیە لەدەلالەتێکی مەزن... ئێمە دەتوانین باشترلەو دەربڕینە تێ بگەین ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی دەربڕین وگوتەکانی ڕابردودا سەرنجی لێ بدەین وبەراوردی بکەین بەو دەربڕینانەی ترکەتیایاندا باس لە (مادە)یاخود (مادەکان) کراوە... من نکولی لەوە ناکەم کە (ئیبن خەلدون)واژەی (مادەکان)ی لەم جێگەیەدا بەجۆرێ بەکار هێناوە، کەلەگەڵ میتۆدی بەکار هێنانی ڕێزمانی لەزمانی عارەبی دا وێك نایەتەوە، رەنگە لەم ڕوەوە دەمەلاسکێی فەیلەسوفەکانی کردبێتەوە، هەرچۆن بێت من گومانم وایە (ئیبن خەلدون)بەو دەربڕینەی مەبەستی هاوشێوەی مەبەستەکانی تری هەبوە.

(ئیبن خەلدون) دەڵێت: خێرو چاکەیەکی زۆر، دەستەبەرو مسۆگەر نابێت، مەگەر بەبونی کەمێ خراپە نەبێت "لەپێناوی مادەکان دا"... من وادەزانم مەبەستی لەوقسەیە ئەوە بوە، مادەم چاکە سروشتێکی (مادی)هەیە، ئەوا

پێویستە تێکەڵ بێت بەشتێ لەژیانی واقعی دا کەدزبێت پێی... (ئیبن خەلدون) بەوە پێچەوانەو ناکۆك دەوەستێت لەگەڵ ئەو لۆژیککارە کۆنانەدا کە سەرنجێکی فۆرمیی ئەبستراکتیکییان دەدایە چاکەو خراپەو پرسەکانی دیکەی ژیان. لەبەرئەوە، ئەوان پێیان وابوو بیرۆکەکان نمونەیی و ڕەهایی هەرکامیان بگری بونێکی خودیی هەیەو سەربەخۆیە لەقەوارەکەی داو لەوانی تر جودایە.

تایبەتمەدیەکی (ئیبن خەلدون) ئەوەیەکە بەگوێرەی ناوەڕۆك سەرنجی پرسەکان دەدات، ئەو ناوەڕۆکەی کەپێکدا ئاڵاوە لەگەڵ تۆڕی ژیاندا، نەك بەگوێرەی وێنە وفۆرمە ڕەهاکانیان... لەبەشی دا هاتوش دا بۆمان ئاشکرا دەبێ کە (ئیبن خەلدون) لەو تێڕوانینە (مادیە)واقعیەی داگەشتۆتە چ ڕادەیەك.

## پەراوێزەکانی بەشی سێیەم:

١) ئیبن تەیمیە ساڵی ٦٢٧ کۆچی کۆچی دوایی کردووە، ئیبن خەلدون ساڵی ٧٢٢ کۆچی لەدایك بووە.

٢) ابو حامد الغزالي، المنقذ من الضلال (تحقيق وتقديم جميل صليبا وكامل عياد)ل ١٥- ١٦.

٣) طه حسين، فلسفه ابن خلدون الأجتماعية، (ترجمه محمد عبدالله عنان) قاهيره ١٩٢٥، ل ٤١.

٤) هـ س، ل ٤١- ٤٢.

٥) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي) ل ١٠٣٥ — ١٠٣٦.

٦) هـ س، ل ١٠٣٧ — ١٠٣٨.

٧) مقدمه ابن خلدون (طبعة المكتبة التجارية) ل ٥٢٤ — ٥٤٣.

٨) هـ س، ل ٥١٦.

٩) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي) ل ٥٠٦.

١٠) هـ س، ل ٥٠٤.

١١) هـ س، ل ٥٠٦.

١٢) هـ س، ل ٢١٩.

١٣) هـ س، ل ٢١١.

١٤) جميل صليبا وكامل عياد، المنطق و طرائق العلم العامة، بيروت ١٩٤٨، ل ٨.

١٥) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي) ل ١١٠٦ — ١١٠٧.

١٦) هـ س، ل ١١٠٦.

١٧) مقدمه ابن خلدون (طبعة المكتبة التجارية) ل٥١٦.

١٨) هـ س، ل ٥٤٢- ٥٤٣.

١٩) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي) ل ٩١٠.

٢٠) هـ س، ل ٥١٠.

# بەشی چوارەم

## (ئیبن خەلدون و یاساکانی بیر)

لەبەشی ڕابردودا، هەندێ گوتەو ڕاو بۆچونمان لەئیبن خەلدونەوە گواستەوە، بینیمان چۆن هەوڵی داوە (بەوبۆچونانە)لۆژیکی ئەرستۆیی پوچەڵ بکاتەوە...هەنوکە دەمانەوێت بەشێوەیەکی گشتی لەتیۆرەکەی ئیبن خەلدون بکۆڵینەوە، تاکو بزانین بەگوێرەی بنەماکانی لۆژیکی ئەرستۆیی ڕێ دەکات، یاخود پێچەوانەیە بەو لۆژیکە.

بەرلەوەی لێکۆڵینەوەکە دەست پێ بکەین، واباشترە وەدوی ئەو ناوەڕۆك یاخود (تەوەر)ەدا بگەڕێین کەتیۆرەکە بەدەوری دادەسوڕێتەوە...لێرەشدا ڕوبەڕوی نارەحەتی دیاری کردنی پێگەی سەرهەڵدان وگەشەکردنی تیۆرەکە دەبینەوە، چونکە ئیبن خەلدون هەوڵی نەداوە تیۆرەکەی لە نێو سیستەمێکی ڕێك وپێك دا نمایش بکات... هەرکەس بەجۆرێکی ڕوکەشانە (مقدمە)بخوێنێتەوە، ڕەنگە دوچاری سەرگەردانی ببێت، بەهۆی ئەو هەمووبابەتەشپرزو سەرپێ پیانەی کە ئیبن خەلدون لە دوتوێی (مقدمە)دا هێناونی...لەوانەیە بەم هۆیەوە زۆرێك لەقەشەنگی و پێکڤە پەیوەستی نێو تیۆرەکە لەخوێنەر بزر ببێت... لەڕاستی دائیبن خەلدون بەجۆرێکی نازنجیرەیی تیۆرەکەیی نوسیوە. بەڕادەیەك خوێنەر نازانێت لەکوێدا دەست پێ دەکات و لەکوێدا کۆتایی دێت، پێدەچێت هەر ئەمەش وایکردبێ توێژەران ناکۆك بن لەدیاری کردنی تەوەری تیۆرەکە وجیاکردنەوەی کرۆك و نێوە ڕۆکی تیۆرەکە لەتوێکڵەکانی.

## تەوەری تیۆرەكە كامەیە:

مامۆستا (ساطع الصری)پێی وایە : بیرۆكەی (دەمارگیری)ئەو تەوەرەیەكە زۆرینەی باس وخواسە كۆمەڵایەتیەكانی نێو (مقدمە)كەی ئیبن خەلدون ئەبەدەوردا دەسوڕێتەوە...هەرلە دیدی (حەصری)دا ئەو بیرۆكەیە سیستەم (Systems)ێكی، تێروتەواو پێك دێنێت لەكۆمەڵناسی دابەشێوەیەكی گشتی ولەكۆمەڵناسی سیاسی دا بەشێوەیەكی تایبەتی...وەك (حەصری)ش دەڵێ : خوێنەر ناتوانێ بەخوێندنەوەی بەشێ یان چەند بەشێكی (مقدمە)بیرۆكەیەكی تەواو سەبارەت بە (دەمارگیری)لای خۆی گەڵاڵە بكات، چونكەئیبن خەلدون هاتوە بەشێوەی پلە بەپلە وبەش لەدوای بەش لەمیانەی بەشەكانی (مقدمە)وە، تیۆرەكەیی دارشتوە، وەك هەموو ئەو بیرمەندانەی كەتیۆری دورو درێژو سیستەمانی مەزن دادەرێژن... (١).

ئەم بۆچونەی (حەصری)برێ تۆكمەیی و بەهێزی تێدایە... تێ بینی دەكرێ زۆرێكی تریش لەتوێژەرەكان چ عەرەب بن یان بیانی لەم ڕووەوە هەمان ئەم ڕایەی (حەصری)یان هەیە... بەم دوایانەش پەرتوكێكم موتالاكرد، كە لەنوسینی مامۆستا (دۆن مارتندیل)بووكە یەكێكە لەزانا كۆمەڵناسە ئەمریكی یەكان، ئەم مامۆستایەش لەمەڕئەم مەسەلەیە هەمان ئەو بۆچونەی هەیە... (٢)

سەبارەت بەتەوەری تیۆرەكەی ئیبن خەلدون، دكتۆر تەها حسەین ڕایەكی دیكەی هەیە، ئەم پێی وایە تیۆرەكە لەدەوری بابەتی (دەوڵەت)دادەخولێتەوە، بەوپێیەش دكتۆر تەها حسەین دەگاتە ئەوبەرەنجامەی كەدروست نیە نازناوی (زانای كۆمەڵناس)بدەینەئیبن خەلدون، یاخود لەڕیزی زانا كۆمەڵناسە مۆدێرنەكاندا بی پۆلێنین... بەڕێی وی چونكە پرسی (دەوڵەت)بەرتەسك ترە لەوەی بگونجێت بۆنەوەی بابەتێ بێ لەزانستی كۆمەڵناسی دا... (٣)

من بۆخۆم لەگەڵ بۆچونەكەی (حەصری)شدا ولەگەڵ بۆچونەكەی (تەها حوسەین)یشدا ناكۆكم... بەڕێی من تیۆرەكەی ئیبن خەلدون لەدەوری بابەتێ دەسوڕێتەوە كەچوار چێوەیەكی فراوانتر وگشتگیرتری هەیە چ لەبابەتی

(دەمارگیری)ش و چ لەبابەتی (دەوڵەت)یش... بەگوێرەی گومانی من ئەو تیۆرە لەدەوری (دەشتەکێتی وشارستانیەت)وململانێی نێوان ئەو دووانە دەکۆڵێتەوە. دەگونجێت بڵێین: ئەو تیۆرە دوولایەنی هەیە، لایەنێکی بێ بزاوت (Static)ولایەنێکی پڕبزاوت (Dynamic). لایەنی بێ بزاوت لەو تیۆرەدا بریتی یەلەدیاری کردنی خەسڵەتەکانی دەشتەکێتی وشارستانیەت، ورونکردنەوەی چۆنێتی بەدەر کەوتنی هەریەك لەو خەسڵەتانە... هەرچی لایەنی پڕجوڵەشە لەتیۆرەکەی دا، بریتی یەلە لێکۆڵینەوەی کارلێك کردن وململانێی نێوان دەشتەکێتی وشارستانیەت ونەو دیاردە کۆمەڵایەتیانەی بەهۆی ئەو کار لێك وململانێ یەوە دێنە ئاراوە.

وام دێ وەخەیاڵ داکەئیبن خەلدون سەرنجی بارو دۆخی مەردومی داوە لەسەردەمی خۆیدا و، بۆی دەرکەوتوە کەلەدەوری دووجەمسەردا گردبونەتەوە وجەمسەری سێیەمیان نیە، ئەو دووجەمسەرەش (شارنشینی ودەشت نشینی)ن، ئینجا سەرنجی داوە لەهەردوو گروپەکە، بینیویەتی لەلایەکەوە خەسڵەتەکانی یەکەم دژوناتەبایە لەگەڵ خەسڵەتەکانی گروپی دوەمدا، لەلایەکی تریشەوە هەردوو گروپەکە لە کارلێك کردنێکی یەکبینەدان... لەئاکامدا گەشتۆتە ئەو ئەنجامەی کەکۆمەڵگە لەهەموو ڕوداوەکانی ڕابردوی وداهاتوشی دا، چ نیە جگەلەبەرەنجامی ئەم کارلێك ودژایەتیەی نێوان ئەم دووگروپە.

ئەگەر ئەمڕۆکە ئیبن خەلدون زیندوو بکرابایەوەو (ئەلەتریك)ی ببینیایە، لەوانەیە زۆر پێی شادومان ببوایە... چونکە ئیبن خەلدون بەهەمان ئەو شێوازە وێنای کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کردوە کەدیاردە ئەلەتریکی یەکانی تێدا ڕودەدات...ئەوەتا ئەو دووجەمسەری هەیە؛ سالب وموجەب، تەزوی ئەلەتریکیش بەهۆی پێك گەیاندنی ئەو دوو جەمسەرەوە دروست دەبێ.

ئێمە نکولی لەوە ناکەین کەتیۆرەکەی ئیبن خەلدون چەردەیەك (ناسۆتەنگی)تێدا دەبینرێت. چونکە ئەو سەرنجی کۆمەڵگەی خۆیی داوە ئیتر وای زانیوە هەموو کۆمەڵگەکانی دیکەی مرۆڤ لەسەرهەمان تەرزو شێوازی ئەو

كۆمەڵگەیەن كەخۆیی تیادەژی "دەربڕینی وەرگێڕ"...كەچی سەرباری ئەو كەم وكوڕیەش، دەبینین ئیبن خەلدون زۆر تیای دا سەركەوتوو بوە... بەوەی كەلایەنی (بێ بڕاوت)و (پڕبڕاوت)ی‌كۆمەلگەی دۆزیوەتەوەو بەدووی ئەو دیاردانەشدا كنەكاری كردوە كەلەبەرەنجامی كارلێكی ئەو دوو لایەنەوە دێنە ئاراوە، ئەمە وای لێكردوە زۆر نێزیك بێت لەو مۆركەی كەزانستی كۆمەڵناسیی تازە بەرەو ڕوی دەچێت.

ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئەوەیە كەدەبینین باوكانی زانستی كۆمەڵناسی تازەش. وەكو: كۆنتی فەرەنسی وسەبنسەری ئینگلیزی و واردی ئەمریكی، بایەخی زۆریان داوە بەدابەش كردنی توێژینەوە كۆمەڵایەتیەكانیان بەسەر دوولایەن دا: پڕبڕاوت وبێ بڕاوت... (٤)وادیارە زانستە مۆدێرنەكانیش لەدابەش كردن دا هەمان ئەم شێوازەیان هەیە. هەرتوێژەرێكیش بگری، كەبیەوێت دیاردە سروشتی وكۆمەڵایەتیەكان بتوێژێتەوە، تێ بینی هەبوونی ئەو دوولایەنە دەكات، ئیدی ناچارە بەوەی لەباری (بێ بڕاوتی)دا توێژینەوەی خەسڵەتەكانی بكات و، دواتریش لەكاتی جوڵەو كارلێكشی دا توێژینەوەی ئەو گۆڕانكاریانەبكات كەبەسەریدا دێت.

هەرچۆن بێت، ئێمە چاوەڕوانی ئەوە ناكەین ئیبن خەلدونداببەش كاریەكەی بەشێوەیەكی ڕێك وپێك وبەهەمان تەرزی زانا مۆدێرنەكان پێشكەش بكات...بەڵكو دروستە بێژین ؛ ئیبن خەلدون وشیار نەبووە بەرانبەر ئەو دابەش كاریەو بەڕونی دەرگی پێ نەكردوە... بگرە بەگوێرەی سروشتی زگماكی خۆی وبەسادەیی بەسەری دا چووە، لەئەنجامیشدا تیۆرەكەی هاتۆتە كایەوە و هەردوولایەنی (بێ بڕاوت و پڕبڕاوت)ی بەجۆرێكی خۆنەویست تێدا دەركەوتوە... ئەگەر ئیبن خەلدونیش لەقۆناغێكی زانستی وادا بژیایە كەئەو زانایانەی تێدا ژیاون، ڕەنگە لەڕوی دابەش كاری وڕونكاری داڕشتنی تیۆرەكەی دا بگەشتایەتە ئاستی ئەو زانایانە.

## تیۆرەکەو لۆژیك:

لێرەدا مەبەستمان ئەوەنیە وردەکاری و درێژ دادڕی تیۆرەکەی ئیبن خەلدون وەك ئەوەی هەیە لەهەردوولایەنی (پڕ بزاوت -بێ بزاوت) ی دابڕانین وئاماژەی پێ بدەین... چونکە ئەمە بابەتێکە ئێمە ئامانەوێت لەم پەراوەماندا توێژینەوەی لەسەر بکەین، بەڵکو دەمانەوێت بزانین ئایا ئەو تیۆرە دەگونجێت لەگەڵ بنەماو پڕەنسیپەکانی لۆژیکی ئەرستۆیی دا یاخود ناکۆکە لەگەڵی دا.

لەبەشی یەکەمی ئەم پەرتوکەدا ئەو پڕنسیپە بناغەییانەمان ئاماژە پێ داکە (لۆژیکی فۆرمی) لەسەریان دادەمەزرێت، گوتمان پڕەنیسپی (چۆیەتی)یەکێکە لەو بنەمایانە... پاشتر باسمان لەوە کرد کەئەو پڕەنیسپە پێك هاتوە لەسێ یاسا، وئەم یاسایانە لۆژیککارەکان ناویان ناون (یاساکانیبیر)، وبیریتین لە:

١)یاسای خۆیەتی...

٢) یاسای ناهاودژێتی...

٣)یاسای نێوەندی بەرزەوەکراو.

کەسەرنجی تیۆرەکەی ئیبن خەلدون دەدەین، دەبینین لەسەربنەمای پوچەڵ کردنەوەی ئەو یاسایانە دامەزراوە، ئەخاسمە هەردوو یاسای یەکەم ودووەم، دەشگونجێت بڵێین: لایەنی (بێ بزاوت)ی تیۆرەکە لەسەر بنەمای پوچەڵ کردنەوەی یاسای (نادژێتی)دامەزراوە، هەروەها لایەنی (پڕبزاوت)ەکەشی یاسای (خۆیەتی)پوچوڵ دەکاتەوە.

یاسای (نادژێتی)دەڵێت: ئەگەر شتێ باش و جوان بێت، ئەوا ناگونجێت خراپ ودزێو ببێت، وەك لۆژیککارە کۆنەکانیش دەڵێن : هەرگیز دووشتی هاودژ پێکەوە کۆنابنەوە، یانی هەرشتێکی باش، پێویستە لەسەرجەم خەسڵەتەکانیدا باش بێت، شتی خراپ و دزێویش، پێویستە لەسەرجەم خەسڵەتەکانی دا بەو شێوەیە بێت، واتە خراپ ودزێو بێت... وەڵێ ئیبن خەلدون لەبابەت لایەنی (بێ

بزاوت)ی تیۆرەکەی دا ئاماژەی داوە (بەهەندێ بنەمای –وەرگێڕ)پێچەوانەی ئەو یاسایە. ئەوەتا کاتێ توێژینەوە لەسەر (دەشتەکێتی)دەکات، هەندێ خەسڵەتی هاودژی باس دەکات کەباشیشیان تێدایەو خراپیش، واتە دەشتەکیەکان لەهەمان کاتدا باشیشن و خراپیشن، ئەمەش بەگوێرەی ئەولایەنە دەردەکەوێت کە ئێمە لێیەوە سەرنجیان لێ دەدەین.

ئەگەر لەگۆشەنیگاو لایەنێکی دیاری کراوەوە سەرنجیان بدەین، دەبینین لەهەموو خەلکی درەندەترو تالانچیو تێکدەر ترن، ودورترینی خەلکیشن لەزانیاری وهونەرو پیشەوەریەوە... وەلێ کاتێ لەڕوویەکی ترەوە سەرنجیان دەدەین دەبینین کۆمەلی خەسلەتی جوانیان تێدایە وەکو ئازایەتی وبێ وەیی سروشت ودورکەوتنەوە لەتەرەف وسوکی وبێ ئەرزشی... لەدیدی ئیبن خەلدوندا (شارنشین)یش هەروایە...لەشارستانیەکاندا ئەدگارەکانی پیشەسازی وزانست وهونەر لەلایەکەوە دەبینرێت و، لەلایەکی دیکەشەوە ئاکاری تەرەف وترسنۆکی وفڕو فێل بازی لەنێوشارنشینەکاندا ئامادەگی یان هەیە.

ناڕەحەتە بیرمەندە کۆنەکان بتوانن ئەم تێگەشتنە لەڕەوشت بەئاسانی وەربگرن، چونکە ئەوان ڕاهاتون لەسەر ئەوەی لەسەر بنەمای دابەش بون لەڕەوشت ڕابمێنن و سەرنج بدەن، ئەوان پێیان وایە هەرکەسێ یاخود هەرکۆمەلگەیەك بگری، لەتوانای دا هەیە هەموو ئاکارە باشەکان وەرگرێت ولەئاکارە دزێوەکانیش دوور بکەوێتەوە... ئەمەیە کەلەزاراوەسازی نوێ دابە (دابەش کردنی کەسێتی - Depersonalization)ناودێر دەکرێت...ئەمەش بەڕونی لای هزرڤانانی ئیسلامی ونەخاسمە لەدەمبەدەمە تایفە گەری یاخود نەتەوەییەکانیاندا ڕەنگی داوەتەوە.

بۆنمونە مشت ومڕیان دەکرد لەبارەی ڕێزداری وشکۆمەندی هاوەلان یاخود پیاوە یەکەمینەکانی ئیسلامەوە...لەدیدی ئەوان دا هەریەکێ لەو پیاوانە یانەوەتا خاوەنی هەموو ڕێزو شکۆیەکە، یان ئەوەتا تەواو بێ ڕێزوبێ ئەرزشە،

.ئیدی پێویستە سەرجەم خەسڵەت وکردەوەکانی تریشی هاوتاو گونجاو بن لەگەڵ ئەو مۆرکە گشتی یەدا کەئەمان بۆ یان بڕیارداوە...بەجۆرێ ئەگەر کردەوەیەکی ناشایستە لەپیاوێکی شکۆمەند بینراو گێڕدرایەوە، دەست بەجێ گێڕانەوەکە وەدرۆ دەخەنەوە دەڵێن ناچێتە ئەقڵەوە، بەلای ئەوانەوە هەرگیز ناگونجێت پیاوێکی باش کردەوەی ناشایستەو دزێوی لێ بوەشێتەوە، بائەوکردەوەیە زۆر بچوك وبێ ئەرزشیش بێت.

لەگۆشەنیگای هەمان بیردۆزیشەوە سەرنجی نەتەوەکانیان دەدا، کاتێ مشت و مڕیان لەبارەی گەل گەرایی (شعوبیەت)گەشتە سەختی، تێ بینی ئەوەمان تێدا بەدی دەگردن... ئەو گروپەی عەرەبیان خۆش دەویست هەموو بایەخێکیان دابوو بەئاشکرا کردن و دۆزینەوەی خەسڵەتە باشەکانی عەرەب و دانیان نەدەنا بەهیچ خراپەیەکدا کەبخرایەتە پاڵ عارەب، هەرچی شعوبیەکانیشە بەپێچەوانەوە بوون، هەوڵیان دەدا عەرەب داڕنن لەهەر شکۆ ورێزێك و هەموو خراپەیەکیشی بدەنە پاڵ.

لێرەدا بایەخ وگرنگی‌ئیبن خەلدون وەدەردەکەوێت، ئەو پێی وایە مرۆڤ ناتوانێت بەئارەزوی خۆی هەموو خەسڵەتەباشەکان لەخۆی دا کۆبکاتەوە، مرۆڤ ئاکارو ڕەوشتی لەو کۆمەڵگەیەوە وەردەگرێت کەتیای دا دەژی، کۆمەڵگەش بەڕۆڵی خۆی، لەبابەتی ڕەوشت وئاکاری‌دا مل کەچی بارودۆخە ئابوری و ڕامیاری وکۆمەڵایەتیەکانی دەوروبەریەتی، یان ئەوەیە دەشتەکی دەبێت یاخود شارستانی، لەهەرکام لەو دووبارەشداپێویستە کۆمەڵگە ئاکار گەلێ وا هەڵبژێرێت کە گونجاو بێت بەو بارەی تیای دایە.

لای ئیبن خەلدون ڕەوشت بریتی یە لە (باو)و (نەریت)ەکۆمەڵایەتیەکان وملکەچی ویست وخواستی تاکە کەس نابێت، ئەو تاکەکەسەش کەدەیەوێت پێچەوانەی کۆمەڵگە بێت لەنەریتەکانی دا، چارەنوسی شکست وتیاچونە...(٥)کەواتە تاکەکەس ناچارەبەوەی خۆی بگونجێنێت لەگەڵ نەریتە باوەکاندا، بەباش و خراپیەوە.

## تیۆرەکە وپاسای خۆیەتی :

وەك ئاماژەمان پێدا، یاسای خۆیەتی لەلۆژیکی کۆن دا دەڵێت: هەرگیز شتەکان بەگوزەرکردنی کات ناگۆڕێن، چونکە هەندێ تایبەتمەندی وخەسڵەتی وایان تێدایە کەلەماوەی گۆڕانکاریەکەدا بەنەگۆڕی دەمێننەوە... (ژۆن دیوی)باسی ئەوە دەکات کەچۆن لۆژیکی کۆن لەسەر بناغەی (نەگۆڕی)دامەزراوە، بەگوێرەی ئەو لۆژیکە هەرشتێ بونێکی ڕاستەقینەی هەبێت، ناکرێ بگۆڕێ، هەرگا گۆڕانی وەسەردا هات، ئەوەلای لۆژیکی کۆن بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەوشتە بوونی ڕاستەقینەی خۆی بزرکردوە... (٦)

کاتێ دێینەسەر تێورەکەی ئیبن خەلدون، پوچەڵ کردنەوەی ئەم یاسای خۆیەتیەی تێدا دەبینین، ئەمەش بەتایبەت لەلایەنی (پڕبزاوت)ىتیۆرەکەی دا دەردەکەوێت... ئیبن خەلدون پێی وایە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ئەوە لەدوای ئەوە لەگۆڕانکاریەکی یەکبینەدایە، سنورێکیش لەئارادا نیە کەئەم گۆڕانکاریە لەئاستی دا ڕابوەستێت... ڕەنگە ڕەخنە گرێك ڕاست بێتەوەو بڵێت: ئیبن خەلدون لەکاتێکدا لەخەسڵەتەکانی (دەشتەکێتی وشارسانێتی)دەکۆڵێتەوە پێی وایە ئەم خەسڵەتانە نەگۆڕاون، بەڵکو بەنەگۆڕی ماونەتەوە لەوکاتەوە خوا دەشتەکێتی وشارستانێتی دروست کردوە تائەو چەرخەی کە ئیبن خەلدونی تێدا ژیاوە.

بۆ وەڵامی ئەم ڕەخنەیە دەڵێم: ئیبن خەلدون پێی وانە بوو ئەو خەسڵەتانە مۆرکی نەگۆڕن وخەڵکی لەسەر ئەو مۆرکە دروست کراون بەگوێرەی پێکهاتەی ئەقڵی یاخود جەستەییان، بەڵکو بەڕێی ئیبن خەلدون ئەو خەسڵەتانە لەو سۆنگەیەوە کەخەڵکی لەبارو دۆخێکی کۆمەڵایەتی وادا دەژین کەناچاریان

دەکات بەوەی بەو خەسڵەتانەوە دەق بگرن، بەم پێ یەش پێویستە بەگۆڕانی ئەوبارو دۆخانە، خەسڵەتەکانیش بگۆڕێن.

ئیبن خەلدون لەکاتێکدا سەبارەت بەخەسڵەتی (ئازایەتی)بەراورد دەکات لەنێوان دەشتەکێتی و شارستانێتی دا، ئاماژەیەکی ڕاشکاوانە بۆئەم ڕاستیە دەکات ودەڵێت: (مرۆڤ ڕۆڵەی خو ونەریتەکانیەتی نەك ڕۆڵەی سروشت ومیزاجی... ئەو بارودۆخەی خویان پێوە دەگرێ، دەبێتە ڕەوشت ونەریت ومەلەکەو جێگەی سروشت و زگماك دەگرێتەوە، لەنێوان ئاددمیزاد دا ئەمە ڕاست و دروستەو زۆریش دەبینرێ، خوداش هەرچی بوێ دەیخولقێنێ...) (٧)

ئەمەش یانی، ئەو خەسڵەتانەی ئیبن خەلدون لەمەڕ (دەشتەکێتی و شارستانێتی)باسی دەکات، لەسروشتە نەگۆڕە مرۆییەکان نین، بەڵکو بەرەنجامی ئەو بارودۆخانەن کەمەردوم تیایاندا دەژی... بەجۆرێ ئەگەر بۆ نمونە ئاڵ وگۆڕێکی جوگرافی لەبیاباندا ڕوبدات وبارودۆخی بیابان بگۆڕێت، لەم حەلەدا دەشتەکیەکان ناچار دەبن خوو بەهەندێ خەسڵەتی دیکەوە بگرن (کەبگونجێت لەتەك بارودۆخی نوێ دا)

## ئیبن خەلدون وسوڕی کۆمەڵایەتی:

ئیبن خەلدون پێی وایە بەهۆی ململانێی نێوان دەشتەکێتی و شارستانیەتەوە، دێرۆکی کۆمەڵگەی مرۆڤ بەسوڕی یەك لەدوای یەکدا دەڕوات، ... مادەم کۆمەڵگە بوە بەدوو بەشی (دەشتەکی وشارستانێتی)یەوە، هەروەها مادەم هەرکام لەو دووگروپە هەڵگری خەسڵەتی دژبە گروپەکەی ترە، ئەوا هەردەبێ بەجۆرێك لەجۆرەکان ململانێ بکەوێتە نێوان ئەو دوو گروپەوە... هەرچی مرۆڤە دەشتەکیەکانە چاویان بەرایی نادات شارستانیەکان ببینن لەنێو نازو نیعمەتی شاردا. لەکاتێکدا خۆیان لەنێو بیابانە وشك و بێ فەڕەکەیاندا قەتیس بوون. ئەمان جەنگاوەر و چەلەنگ وبەهێز، لەبەرانبەدا شارستانیەکان پڕ نازو نیعمەت و ترسنۆك... بۆیە هەردەبێ ڕۆژێك بێت دەشتەکیە نازارو چەلەنگەکان هێرش بکەنە سەر شارستانیە پڕنازو نیعمەتەکان وتاڵانیان بکەن وزاڵ بن بەسەریاندا وئیدی بواریان لەبەردەم دا والا ببێت تاکو دەوڵەت و بنەماڵە فەرمان ڕەواکان دابمەزرێنن... وەلێ دەشتەکیەکانیش هەرکات تامی نازو نیعمەتی شارستان دەکەن، پلە بەپلە خەسڵەتی بەهێزی وزبری ودەمارگیری خۆیان لەدەست دەدەن، بەوەش ئەو دەوڵەتە لاواز دەبێت کەدایان مەزراندوە... لەم کاتەدا ئەو دەشتەکیانە هەلیان چنگ دەکەوێت کەهێشتر لەبیابان دان وتوانیویانە پارێزگاری خەسڵەتەبنەڕەتی و سروشتی یەکانیان بکەن، ئەم دەشتەکیانە هێرش دەکەنە سەر دەوڵەتەکەو لەجێ کەیدا دەوڵەتێکی نوێ دادەمەزرێنن، بەم جۆرەش دێرۆکی کۆمەڵگە سوڕێکی تر دەخولێتەوە.

لەدیدی ئیبن خەلدوندا، سوڕی کۆمەڵایەتی هەردەبێ ڕوبدات، هەموو دەوڵەتەکانیش مل کەچی دە بن، هیچ دەوڵەتێ نیە بۆهەتا هەتایە بەهێز بێت

وهەرگیز ژێرنەکەوێت، هەردەوڵەتێ بگری تەمەنێکی هەیە وەکو تەمەنی تاکە کەس، بەچابوکی و چالاکی دەست پێ دەکات، دواتر پیر دەبێت ودەمرێت... هەندێ جار (فاکتەری لەناکاو)دێتەکایەوەو ئاستەنگ دروست دەکات، لەڕێی بەدوای یەکدا هاتنی سوڕەکاندا، یاخود هەندێ جار ئەو (فاکتەرە لەناکاو)انە، تەمەنێ دەوڵەتێ لەدەوڵەتەکان درێژدەکەنەوە، وەلێ سەرباری ئەوەش سوڕەکە ڕاناوەستێت، دەوڵەتیش هەرچی بێت، کۆتاییەکی هەردەبێ کەتیای دا دەمرێت، وەك چۆن تاکە کەس دەمرێت.

لێرەدا گرنگی (دەمارگیری)بەدەردەکەوێت کە ئیبن خەلدون لەزۆرێك لەبەشەکانی (مقدمە)دا بەدورو درێژی باسی لێوە کردوە... دەمارگیری لای (ئیبن خەلدون)ئەو پەیوەستەگیە کۆمەلایەتیەیە کەڕۆڵەکانیخێڵ (هۆز)یان هەر گرۆهێکی تر، پێکەوە دەبەستێتەوەو، وایان لێ دەکات لەخۆشی وناخۆشی داهاوکاری وهەماهەنگی یەکتر بکەن... لەژیانی دەشتەکێتی دا، دەمارگیری زۆر بەهێزەو دەبێتە هۆی ناکۆکی وململانێ لەنێوان خێڵ و تیرە جیاجیاکاندا، ئینجا هەرگا ئەم ناکۆکیە لەنێوان دەمارگیریە جیاجیاکاندا لەژێر کاریگەری بانگەشەیەکی ئاینی یاخود هاوشێوەی ئەو بانگەشەیەدا لاوازو خەفە دەبێت، هێندە نابات دووبارە بەو پەڕی تواناو هێزێکی تێك شکێنەرەوە سەرهەلئەداتەوە کەئەمجارە هیچ شتێ لەڕێگەی دا خۆی ڕاناگرێت...ئەم هێزە بەرەو شارستانەکان دەکشێت، وەکو باسمان کرد تائەوکاتەی دەوڵەتە نوێ یەکە دادەمەزرێنێت، ئیدی دەمارگیری یەکە دەست دەکات بەسست و لاواز بوون بەهۆی نغرۆ بونی هەلگرانیەوە لەنێو نازو نیعمەتی شارستانێتی دا... ئەوێ دەمێ سیاسەتمەدارانی دەوڵەتەکە دەست دەکەنە بەکارهێنانی سەربازی بەکرێ گیراو بۆ پاراستنی دەوڵەتەکە... ئەو بەکرێ گیراوانەش ڕەنگە کەم تا زۆرێك لەو ڕووەوە بەسود بن، وەلێ ناتوانن بۆ ماوەیەکی درێژ خۆڕابگرن لەبەرانبەر ئەو شەپۆلە تازەیەی کەلەبیابانەوە دێت و بارگاویە بە دەمارگیری یەکی سەخت "دەربڕینی وەرگێڕ".

## ئیبن خەلدون ودەوڵەتی ئەمەوی:

ئیبن خەلدون بەپێچەوانەی زۆرینەی مێژونوسە موسوڵمانەکانەوە سەرنجی (دەوڵەتی ئەمەوی)دەدا کەلەشام دا وەدەرکەوت... ئەو مێژونوسانە بەخۆیان زانیبێت یان نا، لەبیرکردنەوەیاندا مل کەچی یاساکانی لۆژیکی کۆن بوون...هەرلەبەر ئەوە لەسەرنج دان وهەڵسەنگاندنی (دەوڵەتی ئەمەوی)دا بوونە دوو گروپەوە... گروپی یەکەم سەرنجی چڕدەکردەوە بەسەر لایەنە باشەکانی دەوڵەتی ئەمەوی دا وپێی وابوو ئەو دەوڵەتە لە سەرەتاوە تا کۆتاییەکەی، دەوڵەتێکی باش بودو هەستاوە بەسەرخستنی ئیسلام ولەم پێناوەشدا وڵاتانێکی زۆری فەتح کردوە... هەرچی گروپی دووەمە بەپێچەوانەوە، هیچی لەدەوڵەتی ئەمەوی دا نەدەبینی جگە لەخراپەو لادان لە ڕێڕەوی پێغەمبەر..

وادیارە زۆرینەی مێژو نوسەکانی ئیسلام لەڕیزی گروپی دووەمدا بوون، هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زانستی مێژو ئەدگارەکانی بەئاشکرا دەرنەکەوتن لەسەردەمی عەباسیەکان دا نەبێت، شاراوەینەکە ئەو سەردەمەش لەسەر بناغەی دژایەتی کردنی دەوڵەتی ئەمەوی دامەزرا بوو. (٨)

لەپاشاندا ئیبن خەلدون هات وبەو پێیە سەرنجی دەوڵەتی ئەمەوی دا کەلە دەوڵەتەکانی تر جیاواز نیە...بەو مانایەی کەدەوڵەتی ئەمەویش لەسەرەتادا بەباشی دەستی پێکردوەو دواتر هێدی هێدی بەردو خراپ بوون ڕۆشتووە، لەسەرەتاوە لە ڕۆح وکرۆکی ئاینەوە نێزیك بوە، دواتر ئەوە لەدوای ئەوە خەلیفەکانی لەنێو تەرەف ونازو نیعمەت دا نغرۆ بوون... هەر وەچەیەکیان دەهاتنە پێشێ لەوەچەی پێش خۆیان پرتەرەف ترو دوور تربوون لەپێداویستی یەکانی (چاکە)وە... تاکو لەکۆتایی داسەرەنجامیان بەداڕمان گەیشت... (٩)هەریەك لەدەوڵەتەکانی عەباسی و فاتمی و ئەیووبیش هەر وایان بەسەر هات.

ئەمەش ئەوەی دەگەیەنێ، ئیبن خەلدون بەپێچەوانەی زۆربەی مێژو نوسەکانەوە ڕێی وایە هۆزی ئومەییە بەسروشتی خۆیان خراپ وشەڕانگێز نەبوون... بەڵکو ئەوانیش وەك هەموو خەڵکی دیکە مرۆڤ بوون وملی کەچی بارودۆخە کۆمەڵایەتیەکان بوون، هیچکامیشیان لەخراپە یان چاکەی کردەوەکانیاندا دەست و دەستەڵاتیان نەبووە، چونکە هەرچۆن بگری ئەویش مل کەچی سوڕی کۆمەڵایەتی بوە.

لەمەوە بۆمان ڕون دەبێتەوە کە بەراستی ئیبن خەلدون هاوڕاو قایل نیەبە یاسای خۆیەتی، ئەو یاسایەی کەدەڵێت: هەرشتێ ئەگەر باش بێ یاخود خراپ بێ، بەو حاڵەوە بۆ هەتا هەتایە دەمێنێتەوەو گۆڕانی بەسەردا نایەت... یانی بەڕێی ئیبن خەلدون شتێ لەوانەیە لەسەرەتاوە (خاس)بێ، بەڵام دواتر دەگۆڕێت و (خراو)دەبێت، هیچ شتێکیش نیە بۆماوەیەکی دوورو درێژ لەسەر حاڵ ودۆخی یەکەمجاری بەنەگۆڕی بمێنێتەوە.

## یاسای "ناوەندی" بەرزەوە کراو:

لەوەی ڕابورد، بینیمان چۆن تیۆرەکەی ئیبن خەلدون یاسای خۆیەتی ویاسای نادژێتی پوچەڵ کردەوە... هەنوکەش گەرەکمانە هەڵوێستی ئەم تیۆرە بزانین سەبارەت بەسێ یەمین یاسای فیکر کەبە (یاسای ناوەندی بەرزەوەکراو)ناوزەد کراوە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەم یاسایەدا، لۆژیکیستە دێرینەکان، ڕاهاتبون لەسەر ئەوەی هەموو شتەکان بۆ دووبەشی پێچەوانەو ناکۆك بپۆلێنن کەسێ یەمینیان نەبوو یان نێوەندێکیان لەنێواندا نەبووە... لەم لاشەوە دیتمان کە ئیبن خەلدون کۆمەڵگەی مرۆڤی دابەش کردوە بۆ هەردوو گروپی (دەشتەکێتی وشارستانی)، جائایا ئەمە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئیبن خەلدونیش لەم پۆلین کاریەی دا بەگوێرەی یاسای ناوەندی بەرزەوەکراو ڕێی کردوە؟.

بۆئەوەی بتوانین وەڵامی ئەوپرسیارە بدەینەوە، واباشترە لەیەکێك لەو ڕەخنانە بکۆڵینەوە کەزانستی نوێ ئاراستەی یاساوی ناوەندی بەرزەوەکراوی کردوە... ئێستا کەڕوون بۆتەوە کەئەو پۆلاندنە دوجەمسەریەی کە ئەو یاسایە دەیکات هیچ بونێکی ڕاستەقینەی لەدەرەوەی هزرەوە نیە، بەڵکو دروستکراوی ئەقڵێ خۆمانەو ئێمە زۆرجار لەپێناوی هەندێ مەرامی کردەیدا هاناو پەنای بۆ دەبەین.

بۆنمونە ئێمە هەموو شتەکان لەسەر بنەمای (ساردێتی وگەرمێتی) دابەش دەکەین، کەچی لەڕاستی دا شتەکان مل کەچی ئەم پۆلاندنە جوت جەمسەریە نابن، بەڵکو لەڕاستی دا جیاوازو دابەش کراون بەسەر چەندین پلەی یەك لەدوای یەکدا، هەر پلەیەك لەپلەکەی دوای خۆی کەمترە بەڕادەیەکی زۆر لاواز، لەم ڕووەوە هێڵێکی سروشتی نیە کەشتەکان لەیەك جیا بکاتەوە... ڕەنگە هەندێ واگومان بەرن کە (پلەی سفری سەدی)سنوری جیاکردنەوەیە لەنێوان ساردی وگەرمی دا، بەڵام لەڕاستی دا ئەم پلەیەش چ نیە جگەلەسنورێکی

ئیعتیباری کەزاناکان وەریان گرتوە، چونکە لەو پلەیەدا ئاوی پاکژ دەبەستێت ودەبێتە سەهۆڵ... لەوەش تێ پەڕێ ئیدی ئەو پلەیەش هیچ نیە جگە لەپلەیەکی ئاسایی و جیاوازیەکی لەتەك پلەکانی دیکەی گەرمی دانیە.

بەهەمان تەرزیش، ئێمە ڕاهاتوین لەسەر پۆلاندنی خەلکی لەڕوی کورتی و درێژی قەدو بالآیانەوە، ئەوەتا بەهەندێکیان دەڵێین بەژن بەرزو بەهەندێکی تریان دەڵێین بالآکورت...بەلآم ئێمەئەگەر کۆمەڵێ خەلك کۆبکەینەوەو بەگوێرەی کورتی و درێژی بالآیان لەسەر ڕاستە هێڵێك بیان وەستێنین، دەبینین سەریان شێوەی (هێڵێکی لار)وەردەگرێت، لەوکاتەشدا زۆر ناڕەحەتە بۆمان کەبتوانین سنورێ بدۆزینەوە بۆ جیاکردنەوەی بالآبەرزەکان لەبەژن کورتەکان لەنێو ئەو کۆمەڵە خەلکەدا... تەنانەت ئەگەر لەپێناوی هەر مەرامێکی کردەیدا ناچاربین بەوەی سنورێکیان لەنێواندا دیاری بکەین، ئەوا ئەو سنورە (ئیعتباری)دەبێت... لەوحەلەدا ئەو کەسەی کەلەتەنیشتی سنورەکەوە ڕاوەستاوە ڕەنگە بەبالآکورتی لەقەلەم بدەین، بەلآم کەسەیری دەکەین جیاوازی بالآی ئەم لەگەڵ بالآی ئەوکەسەی کەبەتەنیشتیەوە لەودیوی هێڵە ئیعتبایەکەوە ڕاوەستاوە جیاوازیەکی ئەو تۆو پڕبایەخ نیە.

لەبەر ئەم هۆکارەیە کەدەبینین بیرکردنەوەی نوێ پشتی لەیاسای نێوەندی بەرزەوەکراو کردوەو لەجێگەی داکاربەیاسای (پلەبەندی)دەکات... ئەمڕۆکە شتەکان لەکاتی پۆلاندنیان دالەسەر شێوەی پلەبەند (Continuum) دادەنرێن و پلەکان تیای دابە دووی یەکدا دێن و.ئەمەش بەو مانایە نایەت کەپۆلاندنی جوت جەمسەری بەتەواوی بەکارهێنانی ڕاگیراوەو پوچەڵ کراوەتەوە... لەڕاستی دا ئێمە ئەو پۆلاندنە هەر وەکار دەبەین، چونکە کەلکی کردەی تێدایە... بۆنمونە ئێمە قوتابیان دەپۆلێنین بۆ (دەرچووەکان)و (کەوتوەکان)، لەم حەلەدا نمرەیەکی دیاری کراو دادەنێین، بۆنمونە (پەنجا)، ئیدی وادادەنێین هەرکەس ئەو نمرەیە بەدەست بێنێت (دەرچوە)و هەرکەسیش نەتوانێت بەدەستی بێنێت (کەوتوە).

## ئیبن خەلدون وپاسای پلەبەندی:

پێم وایە، ئیبن خەلدون دەرکی بەو ناتەواویە کردبێ کە لەڕووی واقیعیەوە دەکەوێتە نێو ئەوپۆلاندنە دوو جەمسەریەوە، ئەوخەلکی پۆلاندوە بۆ دوو گروپ (دەشتەکی و شارستانی)، بەلام کاتێ لەحال و باڵیان دەدوێت ئاماژەی داوە بەوەی کەبەپلەی جیاواز دەکەونە ئەو دوو بارەوە، بەگوێرەی ڕادەی سەختی ولاوازی دەرکەوتنی خەسڵەتەکانی دەشتەکێتی وشارستانێتی تیایاندا.

لەبەشێکی (مقدمة)دا ئیبن خەلدون دەشتەکیەکان دابەش دەکات بەسەر سێ گروپ دا بەگوێرەی ڕۆچونیان بەژیانی بیابان داو دەرکەوتنەوەیان لەپێداویستی یەکانی شارستانیەت. لەپلەی هەرە توندڕەوی دەشتەکیەکان دائیبن خەلدون ئەو دەشتەکیانەی داناوە کەلەژیان وگوزەرانیان دا پشت بەخێو کردنی (وشتر)دەبەستن، لەدوای ئەمان و لەپلەی دووەمدا ئەو دەشتەکیانە دێن کە (مەڕوچێل) بەخێودەکەن، .لەپلەی سێ یەمیشدا ئەوانە دێن کەپیشەی کیشاوەرزی وجوتیارییان هەڵبژاردووە... (١٠)

لەو بەشانەشدا کەڕاڤەی حاڵ وباڵی (شارستانیەت)دەکات. ئیبن خەلدون خەڵکە شارستانیەکانیشی بەسەر چەند پلەیەکی جیاجیادا دابەش کردوە، وەلێ ئەوەندە هەیە کەلەمیاندا ژمارەی پلەکانی دەست نیشان نەکردوە. وەك لەپۆلاندنی دەشتەکیەکاندا ژمارەی پلەکانی دەست نیشان کردوە... ئەوەتا لەکاتێکدا باس لە (پیشەسازیەکان) دەکات، دەڵێت ئەو پیشانە لەڕوی جۆراو جۆری وباشی وخراپیییانەوە دەگۆڕێن بەگوێرەی جیاوازی (ئاوەدانی شارستانی)... لەهەندێ لەو شارانەدا کەلەژیانی دەشتەکێتی یەوە نزیك ترن ئەو پیشەسازیە سادانە دەبینین کەپەیوەندیان بەپێداویستی یە پێویستیەکانی ژیانەوە هەیە وەکو (دارتاشی و ئاسنگەری ودرومان و چنین و قەسابی)... ئینجا بەگوێرەی گەشەی ئاوەدانی وزۆربونی تەرەف، پیشەسازی تروەدەردەکەوێت وەکو

(پێستە خۆش کردن وزەڕەنگەری و دروست کردنی کەوش)، بەم پێودانگەش پیشەوەرەکانی وەك: (ڕۆن گەری، مس گەری، گەرماوچی، ئاشپەز، ئاودێر، گۆرانی بێژ، تەپڵ لێدەر، ئاشەوان، کاغەزچی...)دەبینرێن... هەرکات ئاوەدانی لەو سنورەش تێ پەڕی، هەندێ پیشەی سەیر بەدەردەکەون، کەئەم پیشانە بەدەگمەن لەشارە گچکەکاندا دەبینرێت، وەك: (ڕۆشتن بەسەر گوریس دابە حەواوە، ڕاهێنان وفێرکردنی پەلەوەرو گوێدرێژ، فێرکردنی سەما، جادوگەری وفاڵچێتی)... (١١)

ئەم جیاوازیەی نێوان شارەکان تەنانەت لەژیان وبارودۆخی (سواڵ کەر) ەکانیشدا ڕەنگی داوەتەوە. ئیبن خەلدون لەم ڕووەوە دەڵێت: (لەشاری "فاس" دا سواڵ کەرم دیوە لەڕۆژەکانی قوربانی کردندا داوای نرخی قوربانیەکانیان کردوە، یان دیومن سوالی گۆشت وڕۆن وپۆشاك وقاپ وقاجاخ یان کردوە... بەجۆرێ ئەگەر لەشاری (تەلەسان یان وەهران) سواڵ کەرێ داوای شتی وابکات، ئەوا نیگەران دەکرێت ودەردەکرێت... تەنانەت هەواڵی دەوڵەمەندی وتەرەفی (قاهیرەومیسر)مان پێدەگات کەبەڕاستی جێگەی سەرسوڕمانە، بەڕادەیەك زۆرێك لەهەژارانی "مەغریب" دەیانەوێت بەوهۆیەوە بگوازنەوە بۆ (میسر)، چونکە بیستویانە خۆش گوزەرانی لەمیسردا لەجێگەکانی تر زیاترە... ئینجا خەلکی ڕەشۆکیش وادەزانن کەئەوە بەهۆی بەخشندەیی خەلکی ئەو وڵاتەوماڵ وسامانی خەزن کراویانەوەیە، یان بڕوایان وایە خەلکی ئەوێ (واتە میسر – وەرگێڕ)لە خەلکی هەموو جێگەیەکی تر بەخشندەو دەست گوشاد ترن... دیارە ئەمەش وانیە، بەلکو هۆی ئەوەیە کەئاوەدانی قاهیرە ومیسر زیاترە لەئاوەدانی شارەکانی تر، بەوهۆیەشەوە بارو گوزەرانیان گەورە ترو باشتر بوە) (١٢)کەواتە لەبەر ڕۆشنایی تیۆرەکەی (ئیبن خەلدون) دادەکرێت خەلکی بەگوێرەی ئەم پلە بەندیەی خوارەوە بپۆلێنین:

دەشتەکێتی = ١)ئەوانەی وشتر بەخێودەکەن.٢)مەڕدارەکان. ٣)کشاوەرزو جوتیارەکان.

شارستانێتی = ١)شارە بچوکەکان. ٢)شارە مام ناوەندەکان.٣)شارە گەورەکان.

پێویستە لێرەدا ئاماژە بەڕاستی یەك بدەین کە (ئیبن خەلدون) لەم پۆلێن کاریەی دا بەتەواوی ووردنەبووە، وادیارە هەستە واقیع گەراییەکەی رێگربوەلەوەی بتوانێت ئەو چینانە بەشێوەیەکی نەگۆڕو ورد دیاری بکات... ئەوەتا دەبینین هەندێ جارلەنێوان چینە سەرەکیەکاندا هەندێ چینی لاوەکی دادەنێت، وەك لەنێوان حوشتردارەکان ومەڕدارەکانی دا گروپێکی دەشتەکی دانراون کەلەگوزەران و ژیانیان دا پشت بەبەخێوکردنی هەم وشترو هەم مەڕیش دەبەستن.

## ئیبن خەلدون وعەرەب:

حەزناکەم کۆتایی بەم بەشە بێنم، بەرلەوەی ڕێی ئیبن خەلدون لەبارەی عەرەبەوە نمایش بکەم... بەڕاستی لێ تێکچونێکی گەورە سەبارەت بەوڕایە هاهۆتە کایەوە، بۆیە پێویستە لەبەر ڕۆشنایی ئەو لێکدانەوە لۆژیکەی کەپێشتر بۆ تیۆرەکەی (ئیبن خەلدون)

مان گرد، ئەم مەسەلەیە بتوێژینەوە... (ئیبن خەلدون) لەهەندێك بەشی (مقدمە)دا ئاماژەی بەعەرەب داوەو بەشێوەیەك باسی کردون کەسەرزەنشت وبەسوك سەیرکردنی پێوە دەبینرێت... لەجێگەیەکدا سەبارەت بەعەرەب دەڵێت: هەرگا عەرەب زاڵ بون بەسەر وڵاتاندا کاوڵی و وێرانەیی ڕودەکاتە ئەو وڵاتانە... لەجێگەیەکی تردا دەڵێت: عەرەب دورترین خەلکێکن لەسیاسەت وبەڕێوەبردنی "ملك" دوە...لەجێگەی سێ یەمین دا دەڵێت: ئەو کۆشك وتەلارانەی کەهی عەرەبی زووبەوو ڕوو لەوێران بوون دەکەن...لەجێگەی چوارەمین دا دەڵێت: عەرەب دوورترین خەڵکن لەپیشەسازیەوە... لەپێنجەمین جێگەدا دەڵێت: عەرەب هەمیشە (لەبەر لوت بەرزی وخۆبەزل زانینیان)خۆبەدوور دەگرن لەوەی بەدووی زانیاری بکەون.... هتد.

ئەم گوتانە، پاڵی بەهەندێ لەتوێژەرانەوە ناوە کەبێژن: ئیبن خەلدون) پیاوێکی شعوبی وبەربەری بوەو هەوڵی داوە لەشان وشکۆی عەرەب دابەزێنێت وبەجۆرێکی ناشیرین وبریندارکەر سەرزەنشتیان بکات... تەنانەت یەکێك لەنەتەوە پەرستە خوێن گەرمەکان بۆنەتەوەی عەرەب، بەو هۆیەوە ڕقی لە (ئیبن خەلدون)هەستاو کارگەییە ئەوەی وتاری ئەداو داوای سوتاندنی کتێبەکانی (ئیبن خەلدون) و هەڵگێڕانەوەی گۆڕەکەیی دەکرد بەناوی نەتەوە پەرستی یەوە). (١٣)

مامۆستا (ساتع حەصری) لەهەمبەر ئەو مەسەلەیەدا هەڵوێستێکی دیکەی هەیە، بەرای وی (ئیبن خەلدون) مەبەستی لەو پەیڤانەی دەشتەکیەکان بووە

نەك عارەبەکان، بۆ پشت گیری کردنی ئەم ڕایەشی کۆمەڵێ بەڵگەی زمانەوانی ومێژویی و کۆمەڵایەتی دێنێتەوە، تارادەیەکی گاڵتە پێ نەکراویش لەم ڕوەوە سەرکەوتوو بووە... (١٤)بەم دواییانەی ئەم بۆچونەی (حەصری)لای توێژەرانی عەرەب پەسەند کراوەو هەندێکیان ئەو بۆچونەی وی بەسەنگی مەحەك دادەنێن لەم مەسەلەیەدا.

من بۆ خۆم پشتگیری لەبۆچونەکەی (حەصری)دەکەم لەزۆر ڕوەوە، چونکە (ئیبن خەلدون) لەکاتێکدا باس لەخراپەکانی عەرەب دەکات مەبەستی پێی خراپەکای دەشتەکیەکانە... بەڵام من گەرەکمە لێرەدا کەمێك هەڵکوڕمێم وبپرسم : ئایا واژەی (عەرەب)لەبەکارهێنانی (ئیبن خەلدون) دا یەکسان هاوتایە لەگەڵ وشەی (دەشتەکی)دا لەڕوی واتاوە؟ یاخود لەڕوی واتاوە هەنێ لێك جودان؟!.

ئەم پرسیارە ماوەیەکی دوورودرێژ سەراسیمەی کردم، تاکو بەم دواییانە هەندێ برگەم لە (مقدمە)دا دۆزیەوە کەوایان لێکردم لەوبارەوە ڕایەکم لەلا گەڵاڵە بێت، ئەو ڕایەش لەهەندێ ڕوەوە پێچەوانەی بۆچونەکەی (حەصری)یە.

بەهەر حاڵ، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوەیە کاتێ (ئیبن خەلدون) باس لەهەردوو خەسڵەتە (باش وخراپ) ەکانی دەشتەکێتی دەکات، لەگەڵی داناوی (دەشتەکی)دەبات، بەڵام لەکاتێکدا کەبەتەنها خەسڵەتە خراپەکان باس دەکات، ئەوکاتە ناوی (عەرەب)ی‌لەگەڵدا دێنێت.

ڕەنگە لەکاتی خوێندنەوەی (بەشی دووەم)لە (دەروازەی دووەم)ی (مقدمە)دا، پەی بەهۆکاری (ئەو هەڵوێستە بەرین)واتە لەوبەشەدا کەتیایدا (ئیبن خەلدون)دەشتەکێتی دەپۆلێنێ بۆ سێ بەش، بەگوێرەی ڕۆچونی بەنێو ژیانی بیابان و دورکەوتنەوەی لەخەسڵەتەکانی شارستانیەت... لەم بەشەدا (ئیبن خەلدون)ئاماژە دەدات بەنەتەوە دەشتەکیە جۆراو جۆرەکان، وەك: فارس وتورکومان وسەقالبە وکوردو بەربەرو عەرەب. هەوڵ دەدات ئەو نەتەوانە دابەش بکات بەسەر سێ پلەدا.

لەکۆتایی بەشەکەش داناماژەیەکی ئاشکرا دەکات بۆئەوەی کەعەرەب لەهەموو ئەو نەتەوانەی تر زیاتر لەژیانی بیاباندا ڕۆچووەو تایبەتمەندی پەیدا کردوە لەبەخێوکردنی وشتردا، هەرچی نەتەوە دەشتەکیەکانی ترە، لەوانەیە سەرەڕێی وشتر، ئاژەڵی دیکەی وەکو مەڕو چێڵ بەخێوبکەن، هەندێ لەونەتەوانەش تەنها بەجوتیاریەوە سەرقاڵن وەك سەراپای بەر بەرو عەجەمەکان... (١٥)لەمەوە بۆمان ڕون دەبێتەوە کە (ئیبن خەلدون) لەکاتێکدا ئاماژەیە (عەرەب)دەکات بەشێوەیەکی گشتی مەبەستی لەدەشتەکیەکان نەبووە، بەڵکو مەبەستی نمونەی هەرە توندوتیژی دەشتەکێتی بووە، واتە ئەو نمونەیە کەلەهەموو نموونەکانی تر دوورترە لەخەسڵەتەکانی شارستانیەتەوە، وەك زانیاری وپیشەسازی و ئاوەدانی.

ڕەنگە لێرەدا کەسێك بپرسێت، ئایا چ هۆکارێك پاڵی ناوەبە (ئیبن خەلدون)ەوە تاکو ئەوڕایەی لەبەرانبەر عەرەب دا لەلا گەڵاڵە ببێت؟ یاخود ئایا هەربەڕاستی عەرەب لەگەلانی دیکە دەشتەکی تربوون؟.کەوابێت ئەی چی بڵێین بەرانبەر شارستانێتی دێرینی یەمەن، وشارستانیەتی تەدمورو بەترا، یاخود بەرانبەر شارستانیەتی گەورەی ئیسلامی کەعەرەب بەشداریەکی چالاکانەیان تێیدا هەبوو؟ وادیارە (ئیبن خەلدون) لەژێرکاریگەری ئەوکەش وهەوا فیکری وکۆمەڵایەتیەدا کەئەودەم لەوڵاتانی ڕۆژ ئاوا (یعەرەبی –وەرگێر)دا زاڵ بوون، هەموونەو ڕاستی یانەی لەبیر کردوە.

هەرچۆن بێت، ئێمە ناتوانین لەو وتانەی (ئیبن خەلدون)ەوە کەتیایاندا سەرزەنشتی عەرەب دەکات، ئەو بەرەنجامە وەدەست بهێنین کەمەبەستی سەرزەنشت کردنی عەرەب بوە بە شێوەیەکی ڕەها... ئەمە شتێکە لەگەڵ لۆژیکی (ئیبن خەلدون)دا ناگونجێت و وێك نایەتەوە... بەڵکو ئەو لەهەموو شتێکدا بەلایەنی کەمەوە دوو ڕووی دیوە (چاکەو خراپە)... ئینجا لەکاتێکدا ئەو خراپانەی عەرەبی باسکردوە، ویستویەتی بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ بڵێت: بەئەندازەی ئەوخەسڵەتە دەشتەکی وخراوانەی‌لەعەرەب دان، بەدیوەکەی تردا

خەسڵەتە باشەکانی دەشتە کێتیشیان تێدا کۆبۆتەوە. واتە لەکاتێکدا لەنەتەوەکانی تر دوورترین لەزانیاری وئاوەدانی وپیشەسازیەوە، لەهەمان کاتدا لەنەتەوەکانی تر: ئازاترو بەهێزو دامەزراو ترن ونێزیك تریشن لەخەسڵەتەکانی چاکەو دینداریەوە.

وادەردەکەوێت ئەوانەی هێرش کردنە سەر عەرەبیان داوەتە پاڵ (ئیبن خەلدون)لەبەر ڕۆشنایی لۆژیکی کۆندا (مقدمە)کەی ئەویان خوێندۆتەوە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو لۆژیکەدا کەپێی وایە هەرگیز ناگونجێت دوو خەسڵەتی پێچەوانە لەیەك کاتدا ولەنێو یەك شتدا کۆببنەوە... بۆیە گەشتونەتە ئەو بڕوایەی کەمادەم ئیبن خەلدون سەرزەنشتی عەرەبی کردوە کەواتە ئیتر ماقوڵ نیە عەرەبی خۆش ویستبێ، یاخود ئارەزووی ستایش کردنیانی هەبوبێ... دەنا ئەوانە ئەگەر لەهەمان ڕوانگەی (ئیبن خەلدون) خۆیەوە سەرنجی مەسەلەکانیان بدایە هەرگیز نەدەکەوتنە نێوئەو هەڵەیەوە.

یەك لەو وەسفانەیکە (ئیبن خەلدون) بڕیویەتی بەباڵای عەرەبدا، ئەوەیەکە عەرەب بە (امە وحشیە) (١٦) ناوزەد دەکات... (ئیبن خەلدون) مەبەستی لەم دەربڕینە جیاوازە لەو مەبەستەی ئێمە لەچەرخی نوێ دا ئەو وشەیەی بۆ وەکاردەبەین... ئێمە ڕاهاتوین لەسەر ئەوەی (توحش)لەنێو نەتەوەکاندا بەخەسڵەتێکی زۆر دزێو لەقەڵەم بدەین، لەبەر ئەوە کاتێ ئەو دەربڕینەی ئەو دەخوێنینەوە وادەزانین وەسفێکی زۆر دزێوی عەرەبی کردوە... لەڕاستی دا مەبەستی لە (توحش)نیشتە جێ بونی بیابان وڕۆچون بوە بەنێو بیاباندا دوورلە شارستانیەت... لەبەکارهێنان وبەگوێرەی زاراوەی (ئیبن خەلدون)یش، ئەو دەستەواژەیە سەرزەنشت نەبووە، بەڵکو وەسف کردنێکی بابەتیانە بووە، لەدیدی شارستانیەت دا سەرزەنشتەو لەدیدی دەشتەکێتیش دا ستایشە... بەو تەرزەش، زۆرینەی هەرە زۆری مەسەلەکان لای (ئیبن خەلدون)ڕێژەیی بوون.

# پەراوێزەكانی بەشی چوارەم

١) ساطع الحصری، دراسات عن مقدمة ابن خلدون، قاهیره١٩٥٢، ل ٢٣٢.

2) Don Martindale ،The nature ant types of Sociogical Theory ،London ،1961 ،p 132.

٣) طه حسین، فلسفه ابن خلدون الآجتماعیة، (ترجمه محمد عبدالله عنان)، ل ٥٨- ٦٥.

4) Don Martindale ،op. cit ،p. 70.

٥) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البیان العربی)، ل ٦٩٢ – ٦٩٣.

6) Logic ،john Dewey ،p 84.

٧) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البیان العربی)، ل ٤١٩.

٨) احمد امین، ضحی الأسلام، قاهیره ١٩٢٨، ج ٢، ل ٢٧ – ٣١.

٩) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البیان العربی)، ل ٥٤٥ – ٥٤٨.

١٠) هـ س، ل ٤١٢.

١١) هـ س، ل ٩٢٥ – ٩٢٦.

١٢) هـ س، ل ٨٦١ – ٨٦٢.

١٣) ساطع الحصری، دراسات عن مقدمة ابن خلدون، قاهیره١٩٥٢، ل١٥١.

١٤) هـ س، ل ١٥١ -١٦٨.

١٥) مقدمة ابن خلدون، (طبعة لجنة البیان العربی)، ل ٤١٢ – ٤١٣.

١٦) هـ س، ل ٤٥٣.

# بەشی پێنجەم

## (ئیبن خەلدون ولۆژیکی شەرعناسەکان)

لەبەشی سێ یەمدا بینیمان چۆن (ئیبن خەلدون) بانگەشەی دەکرد بۆ گرنگی دان بەناوەڕۆکی (مادی)مەسەلەکان، لەبریتی گرنگی دان بەوێنە هزریە ئەبستراکتیکیەکانیان... هەنوکەش گەرەکمانە بزانین ئایا خودی خۆی "دەربڕینی وەرگێڕ" ئەو بانگەشەیەی بەرجەستە گردوە لەکاتێکدا سەرنجی هەندێ لەو مەسەلەو پرسانەی داوە کەهزری شەرعناسەکانیان سەرقاڵ کردبوو..

(ئیبن خەلدون) لەژینگەیەکی (فیقهی)داپێگەیشت، ئەمیش وەك هەموو هاودەمەکانی، زانستە ئاینی یەکانی خوێند بوو. بۆیە واچاوەڕوان دەکرا کەئەمیش لەمیانەی ئەو لۆژیکە فۆرمیەوە سەرنج لەمەسەلەکان بدات کەشەرعناسەکانی ئەو سەردەمە ڕاهاتبون لەسەر ئەوەی لەمیانەیەوە سەرنج بدەن (لەپرسە جۆراو جۆرەکان –وەرگێڕ)، کەچی دەبینین ئەم لە (مقدمە)کەی دا پێچەوانەی ئەوان دەبێتەوە... ئەوان ڕاهاتبوون هەمیشە لەدوای ڕوت کردنەوەو داڕنینی مەسەلەکان، ڕوت کردنەوەیەکی ئەقڵی پێوانەیی، ئەوجا سەرنجیان لێ دەدا... وەلێ (ئیبن خەلدون) مەسەلەکان بەتێکەڵی لەتەك واقعی کۆمەلایەتی یاندا تاوتوێ دەکات و سەرنجیان لێ دەدات... بەدەربڕینێکی تر: ئەم لەمیانەی لۆژیکێکی مادیەوە سەرنج لەپرسەکان دەدات نەك لەمیانەی لۆژیکیْفۆرمیەوە.

لەماوەی دادێ هەوڵ دەدەین هەندێ نمونە لەم ڕووەوە بێنینەوە، نمونەکانمان لەهەندێ بەشی جیاوازی نێو (مقدمە)دوە کۆکردۆتەوە.

## بۆچونی ئیبن خەلدون سەبارەت بەپادشایەتی:

زۆرێك لەشەرعناسەكان ڕاهاتون لەسەر جیاوازی كردن لەنێوان خەلافەت وپادشایەتی دا، خەلافەتیان بەباش وپادشایەتیان بەخراپ دایە قەڵەم، ئەمەش وەك هەمیشە لەئەنجامی ڕاهاتن وخوگرتنیانەوە بوو بە (دارِنینی هزریەوە)، ئەو دارِنینە هزریەی‌كەمەسەلەكان دەپۆلێنێ بۆ دووبەشی هاودژ كەسێ یەمینیان نیە... مێژونوسەكان كەوتنە ژێر كاریگەری ئەم بۆچونەوەو، وایان دایە قەڵەم كەخەلافەتی ڕاست تەنها لەو چوار جێ نیشینەدا قەتیس ماوە كەلەدوای كۆچی دوایی پێغەمبەر (د.خ)دەستەلآتیان گرتۆتە دەست... ئەو جێ نشینانەیان ناونا (خەلیفەكانی ڕاشدین)، بەلآم ئەوانی تركەلەدوای ئەمانەوە دەستەلآتیان گرتە دەست، لەدیدی مێژونوسەكاندا خەلیفەی ئاسایی بوون ولەپادشایەتی یەوە نزیك تربوون، وەك لە خەلیفایەتی، ئەم بۆچونەشیان لەسۆنگەی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەرەوە بووگە دەفەرمێت: (خەلافەت سیی ساڵە ودواتر دەگەڕێتەوە سەر پادشایەتی).

ئیبن خەلدون ڕایەكی تری هەیە سەبارەت بەپادشایەتی، لەدیدی ئەمدا ناكرێت پادشایەتی بەدزێو وخراپەیەكی ڕەها لەقەڵەم بدرێ، بەڵكو ئەمیش وەكو دیاردە كۆمەڵایەتی یەكانی تر، ڕەنگە باش بێت وڕەنگە خراپیش بێت، بەگوێرەی ئەو دەلاقەیەی كەلەمیانەوە سەرنج لەمەسەلەی (پادشایەتی)یەكە دەدەین...ئیبن خەلدون لەوبارەیەوە دەڵێت: (بزانەكە شەرع نەهاتوە سەرزەنشتی پادشایەتی بكات تەنها لەبەر خودی پادشایەتیەكە، بەڵكو سەرزەنشتی ئەو گەندەڵی و خراپانەی كردوەكەلێیەوە سەرهەڵئەدەن وەكو ستەم وچەوساندنەوەو چێژ نۆشیی، دیارە ئەم خراپانەش قەدەغەن ولەهەمان كاتدا بەرەنجامی پادشایەتیشن... هەروەها شەرع ستایشی دادگەری وبەرپاكردنی سروت ومەراسیمە ئاینی یەكانی كردوەو لەناقاریشیان دا پاداشتی داناوە، بۆی هەیە

هەموو ئەمانەش بەرەنجامی جۆرێکی تربن لەپادشایەتی "دەربڕینی وەرگێڕ"... کەواتە سەرزەنشت کردنی پادشایەتی کەوتۆتە سەربارێك لەبارەکان و شێوازێك لەشێوازەکانی پادشایەتی، نەك کەوتبێتە سەرجەمی ڕواڵەتەکانی دەرکەوتنی پادشایەتی، بەو پێ بەشەرع سەرزەنشتی پادشایەتی نەکردوە لەبەر خودی پرسی پادشایەتی، داوای دورکەوتنەوەو وازهێنانیشی لەپادشایەتی نەکردوە) (١)

تێ بینی دەکەین، ئەم پەیڤانەی ئیبن خەلدون پوچەڵ کردنەوەیەکی ئاشکرای (یاسای ناهاو دژێتی)لەخۆ دەگرن، کەیەکێکە لەبناغەکانی لۆژیکی فۆرمی. وەك لەبەردا باسمان لێوە کرد... بەگوێرەی ئەو یاسایەهەرشتێ بگری، یان باشەیاخود خراپە، ناگونجێت هیچ شتێ لەهەمان کاتدا باشیش بێت وخراپیش بێت... وادیارە ئیبن خەلدون ئەو یاسایەی لەشێوازی (ڕوت کردنەوەی فۆرمی)دا دیوە، ئەو شێوازەی کەتیای داچاکە وخراپە لە (هزر)دا بەجیاکراوەیی لەیەکدی دادەنرێت، ئەمەلەکاتێکدا لەجیهانی واقع (مادی)دا بۆی هەیە لەهەمان کاتدا شتەکان هەم چاك وهەم خراپیش بن، بەو واتایەی کاتێ لەڕویەکەوە سەرنجی لێ دەدەین بە (چاك)ەدی بینین، وەلێ کەلە ڕویەکی دیکەوە سەرنجمان دابە (خراپ)ەدی بینین.

ڕەنگە زیادە ڕەوی نەکەم گەربڵێم، ئەم ڕایەی ئیبن خەلدون لەڕویەك لەڕوەکانەوە "دەربڕینی وەرگێڕ" لەڕاوبۆچونی زانای کۆمەڵناسیی ناسراوی ئەم سەردەمە (مانهایم) دەچێت... بەڕێی (مانهایم)ڕاستی دەرەکی وەك هەرەم وایەو چەندین ڕوکاری هەیە... خەلکیش لەناقاری داناکۆکی یان تێدەکەوێت، چونکە هەرکۆمەڵێکیان بگرین لەڕویەکی دیاری کراوەوە سەرنجی لێ دەدات وڕوەکانی تر فەرامۆش دەکات، بەو واتایەش هەرگروپێ وێنەیەکی دیاری کراو لە هەقیقەت وەردەگرێ کەجیاوازە لەو وێنانەی گروپەکانی دیکە وەری دەگرن، ئینجا گەربێت وبەدەوری هەقیقەت دابخولێینەوە ولەهەموو ڕوەکانەوە سەرنجی لێ بدەین، ئەوکاتە بۆمان دەردەکەوێت هەموو ڕاکانی خەلکی لەبارەیهەقیقەتەوە لەوانەیە لەهەمان کاتدا ڕاستیش بن وهەڵەش بن. (٢)

## قورەیش وخەلافەت:

شەرعناسەكان یەكڕان (جگەلەكەمەریزپەڕێكیان)لەسەر ئەوەی كەپێویستە خەلافەت لەنێو قورەیش دابێت ولەنێو قورەیش دەرنەچێت. شەرعناسەكان لەم ڕایەیان دا پشتیان بەفەرمودەیەكی پێغەمبەر (د.خ)بەستوە كە دەفەرمێت: (الائمە من قریش) (٣)... لێرەدا (هەوڵ دەدات لێكدانەوەیەكی كۆمەڵایەتیانە بۆئەم فەرمودەیە بكات و وای لێك بداتەوە كە فەرمودەكە لەهەموو بارو دۆخەكاندا پەیوەگیر (مولزەم)نیە. ئیبن خەلدون دەڵێت: (هەریەكە لەفەرمانەكانی شەرع، پێویستە مەبەست و ئامانجێكی هەبێت، لەپێناوی ئەو ئامانجەدا دادەنرێت، ئینجا ئەگەر بێت وبەدوای مەبەست وئامانجی شەرع دابگەرێن لەبەمەرج گرتنی ڕەگەزی قورەیشی "بۆخەلافەت"، ئەوا مەبەستەكە تەنها بریتی نیە لەپیرۆز ڕاگرتن وتەبەروك كردن بەپەیوەست بوون بەپێغەمبەرەوە، وەك وابلاوە، هەرچەندە ئەو تەبەركەش دەستەبەر دەبێت لەو مەرج دانانەدا، وەڵ وەك من ئاگادارم تەبەرك كردن بەشێك نیە لەمەرامەكانی شەرع، كەواتە پێویستە بەرژەوەندیەك لە بەمەرج گرتنی ڕەچەڵەك دا لەئارادابێت... بۆیە كاتێ لەم مەسەلەیە سەرنج دەدەین، تەنها لەبەرچاو گرتنی "دەمارگیری" دەبینین، بەهۆی ئەم دەمار گیریەوە پارێزگاری و داخوازی كردن دێتە دەست، لەولاشەوە ناكۆكی ودووبەرەكی ناهێڵێت ئەگەر دەمارگیریەكە بۆخاوەنی پۆستەكە "خەلیفە —وەرگێر" بێتەدی، ئیدی بەوهۆیەوە خەڵكی یەك دەنگ و بێ جیاوازی دەبن... دەربڕینی وەرگێڕ) (٤)لەم گوتەیەوە هۆكاری جیاوازی نێوان (ئیبن خەلدون) وشەرعناسەكانی تر لەڕوی لۆژیكەوە ڕون دەبێتەوە... شەرعناسەكانی تر لەبەر پیرۆزی و تەبەرك ڕەچەڵەكی قورەیشیی یان داناوە لەمەسەلەی خەلافەت دا، بەوپێ یەی كەپێغەمبەرلە هۆزی قورەیش بوە...بەڵام ئیبن خەلدون پێی وایە ناكرێت تەبەرك بە یەكێك لەمەرامە

شەرعیەکان لەقەڵەم بدرێ، بەڵکو پێویستە لەپشتی هەر بڕیارێکی شەرعیەوە بەرژەوەندیەکی کۆمەڵایەتی هەبێت کەئەو بڕیارە شەرعیەی لەپێناودا دراوە... ئیبن خەلدون بڕوای وایە بۆیە فەرمانی داوە بەوەی خەلافەت لەقورەیش دەرنەچێت.چونکە لەوسەردەمەدا قورەیش خاوەنی دەمارگیری هەرەگەورە بووە لەنیوە دورگەی عەرەبدا، بەجۆرێ عەرەب دانیان دەنا بەو ڕاستیەداو بەهۆیەوە ئۆقرەیان دەگرت، ئەگەر بهاتباو پێغەمبەر فەرمانی بدایە کەخەلافەت لە (جگە قورەیش)دا دابنێ ئەوا یەك دەنگی عەرەب تێك دەچوو، نەتەوەی ئیسلامیش پەرتەوازەودەوڵەتی ئیسلام لاواز دەبوو. (٥)

لەم ڕوەوە ئیبن خەلدون دەگاتە بەرەنجامێکی واکە ناکۆکە لەگەڵ ئەوبەرەنجامەدا کە کۆدەنگی شەرعناسەکانی لەسەرە، بەرەنجامەکەی لەمەڕئیبن خەلدونیش ئەمەیە: دەگونجێت خەلافەت لەنێو قورەیش دەربچێت ئەگەر هاتوو قورەیش لاواز بوو یاخود دەمارگیریەکەی کۆنی نەمایەوە... ئەمەش یانی خەلافەت لەناو قورەیش دا دەمێنێتەوە تائەوکاتەی ئەو هۆکارەبەرقەرار بێت کە لەسەر بنەمای وی خەلافەت دراوەتە قورەیش... هەرکاتێکیش ئەو هۆکارە (واتە بوونی دەمارگیری- وەرگێڕ) گوازرایەوە بۆ گەلێکی تر یاخود بۆهۆزێکی تر، ئەوا خەلافەتیش لەگەڵی دا دەگوێزرێتەوە بۆئەو هۆزە یاخود بۆئەو نەتەوەیە.

ئیبن خەلدون بیروڕێی گشتی خۆی سەبارەت بەخەلافەت، ڕادەگەیەنێت ودەڵێت: (لەڕاستی دا کەسێ کاروباری نەتەوەیەك یان نەوەیەك دەگرێتە دەست کەزاڵ بوبێت بەسەریاندا) (٦)ئەم ڕایەش، بیروباوەڕێکی بوێرانەیەو بۆیەکەمجاریشە لەئیسلامدا ڕادەگەیەنرێت، ئیدی نازانین چۆن چۆنی شەرعناسەکان لەناقاریدا بێدەنگ بوون... ئەوەتا ئیبن خەلدون ئەوە بەمەرج دەگرێ لەخەلیفەدا کەهێندەی هێز هەبێت بتوانێ بەزۆری شمشێر زاڵ بێت بەسەر خەلکی دا... لەلای ئیبن خەلدون زاڵ دەستی لەگرنگترین مەرجەکانی خەلافەتە، ئەمەش بۆئەوەیە خەلیفە بتوانێ بەزۆری هێز نەتەوە یەك بخات

وبەرتەوازەییان لێ قەدەغە بکات... لەم سۆنگەیەشەوە ئیبن خەلدون شتێ باس دەکات کەسەرجەم ئەو ڕاو بۆچونە ئایدلیستیانە پوچەڵ دەکاتەوە کەشەرعناسەکان باسی دەکەن سەبارەت بەخەسڵەتەکانی خەلیفەو توانستە زانستی وڕەوشتی یەکانی... وەك ئەوەی بڵێت: چ سودێکی هەیە گەر خەلیفە لەخودی خۆی دا پیاوچاك بێت، ئەگەر کەسێکی لاواز بێت ودەمارگیری یەکی وای لەدەوردا نەبێت کەبتوانێ بەهۆیەوە بەسەر خەڵکی دازاڵ بێت وبەزۆری هێز خۆی بسەپێنێت.

## سەبارەت بەمەهدی :

موسوڵمانان، بەجیاوازی پێرومەزەبەکانیانەوە، بڕوایان هەیە بەوەی کەپێویستە (مەهدی)لەئاخرزەماندا دەربکەوێت، تاکو زەوی پڕبکات لەدادپەروەری وەك چۆن پڕکراوە لەستەم کاری... هەرچەندە پێڕە ئیسلامیەکان یەکڕانین سەبارەت بەکەسایەتی مەهدی ومەرجەکانی بەدەرکەوتنی، تەنها لەوەدا نەبێت کەسەرجەمیان یەکڕان لەسەر ئەوەی کە (عەلەوی)یەولە وەچەی (فاتیمەی کچی محەممەد)ەو خودا بەڵێنی بەدەرکەوتنی داوە تاکو لەسەردەستی داناینی ئیسلام سەربکەوێت ودادپەروەری دەربکەوێت وبەرقەرار بێت.

فەرمودە گەڵێ زۆر، بەموتەواتری گێڕدراونەتەوە لەپێغەمبەرەوە سەبارەت بەمەهدی، سویگی لەوبارەیەوە پارچە هەڵبەستێکی داناوە وتیای دا دەڵێت:

**ومارواة عددجم يجب احالة اجتماعهم على الكذب (٧)**

واتە: هەرچی فەرمودەیەك لەلایەن ژمارەیەکی زۆرەوە گێڕدرابێتەوە وڕیوایەت کرابێ، پێویستە ئەوە بەدور بگێرێت کەئەو ژمارە زۆرە لەسەر درۆ کۆ بوبێتنەوە)

خەریکە ئیبن خەلدون تاکە کەس بێ لەنێو شەرعناسەکان دا، لەپوچەڵ کردنەوەی ئەو فەرمودانەو گرنگی پێ نەدانیان دا، لە (مقدمە)کەشی دا بەشێکی درێژی تەرخانکردوە بۆئەم باسەو تیای دا هەوڵی داوە (سەنەد)ی ئەو فەرمودانە لاواز بکات وئەوە دەربخات کەمەحاڵە (مەهدی)بەپێی ئەو مەرج وشێوازانە دەربکەوێت کەئەو فەرمودانە باسی لێوە دەکەن.

لەم ڕووەوە هەندێ لەدانەرو نوسەران وەڵامی ئیبن خەلدون یان داوەتەوە، یەکێك لەوانە (ابو الگیب کوڕی ابی احمدی حوسەیتی)یە، نوسراوێکی نوسیوە بەناوی (الاذاعة لماكان وما يكون بين يدی الساعة)، لەونوسراوەدا باسی لەوتەو بیروڕاکانی ئیبن خەلدون کردوەو بەهەڵەو ناتەواوی داونەتە قەڵەم، گوایە ئەو بیروڕایانە هیچ پەیوەندیەکیان بە لێکۆڵینەوەو کنەکاری (فەرمودە ناسیی — وەرگێڕ) یەوە نیە، لەمەشەوە گەشتۆتە ئەو سەرەنجامەی کە مەهدی لەئاخر زەمان دا هەربە دەردەکەوێت ونکولی کردنیش لەم مەسەلەیە بوێریەکی گەورەو پێ هەڵخلیسکاندنێکی زەبەلاحە. (٨) لەدیمەشقیش بەم دواییانە کتێبێ بڵاو بویەوە کەهی نوسەرێ بوو بەناوی (ئەحمەد کوڕی محەمەد صدیق)، کتێبەکەی ناونابوو (ابراز الوهم المكنون من كلام ابن خلدون) یاخود (المرشد المبدی لفساد طعن ابن خلدون فی احادیث المهدی). نوسەر دەڵێت: ئیبن خەلدون سەنەدی ئەو فەرمودانەی لاواز کردوە کەلەبارەی (مەهدی)یەوە گێڕدراونەتەوە جگە لەکەمێکی ئەو فەرمودانە نەبێت، کەواتە چی بکەین لەوفەرمودەکەمانەی تر کەسەنەدەکانیانی لاواز نەکردوە؟ ئایا وازیان لێ بهێنین؟ نوسەر بەم پێودانگە دەگاتە ئەو بەرەنجامەی کەئەو کەمە فەرمودەیەئیبن خەلدون بەبەهێزی داونەتە قەڵەم پێویستە دەستیان پێوە بگیرێت سەرەڕێی کەم بونیشیان... هەروەها نوسەر دەپرسێت: ئیبن خەلدون چۆن ڕێگەی بەخۆی دا لەهەندێ بەشی تری (مقدمە)کەی دا پشت بەفەرمودەی لاواز ببەستێ، لەکاتێکدا فەرمودەکانی تایبەت بەباس و خواسی مەهدی فەرامۆش دەکات، وهەندێ لەو فەرمودانە بە گوێرەی دان پێدانانی خۆشیی فەرمودەی بەهێزن؟ (٩).

وادیارە (ئەحمەد کوڕیمحەمەد)لەم ڕوەوە لەدۆڵێکدایەو ئیبن خەلدونیش لەدۆڵێکی تردایە، بەدەربڕینێکی تر : هەریەك لەو دووکەسە لەسەر ڕێچکەو ڕێبازێکی لێك جیاواز ڕێ دەکەن... (ئەحمەد کوڕی محەمەد)لەبیر کردنەوەی دا لەسەر ڕێڕەوی ئەو فەرمودە ناسانە ڕێ دەکات کەجگەلە (سەنەد)هیچی دیکەی

نێو فەرمودە یان بەلاوە گرنگ نیە، ئەگەر گێڕەرەوەی فەرمودەکان متمانەدارو ڕاستگۆ بن ئەوا فەرمودەکە (صحیح)ەو هیچ تەم ومژێکی لەدەورنیە، ئیدی ئەوەیان بەلاوە گرنگ نیە کەئایا ئەو فەرمودیە پێچەوانەی سروشتی کۆمەلگەیە یاخود گونجاوە لەتەکی دا... وەلێ ئیبن خەلدون لەسەر ڕێڕەوێکی ترە، ئەم ئەوەندەی بایەخ بەگونجانی فەرمودەکە دەدات لەگەڵ پێداویستی یەکانی کۆبونەوەی مرۆڤایی دا، ئەو ئەوەندەی بایەخ نادات بە (سەنەد)ی فەرمودەکە، ئەمەش بەگوێرەی ئەو پرەنیسپەی کەئیبن خەلدون بانگەشەی بۆدەکات، ئەو پرەنیسپەی کەدەڵێت: (کەمجاردەبینرێ مەسەلەیەکی شەرعی پێچەوانەبێت لەگەڵ پرسێکی وجودی دا)هەر لەبەر ئەوەیە کەدەبینین ئیبن خەلدون لەبەر ڕۆشنایی ئەم پرەنیسپەدا فەرمودەکان وەردەگرێ، یانی لەوانەیە فەرمودەیەك لای فەرمودەناس و شەرعناسەکان لاواز بێت کەچی لای ئیبن خەلدون بەهێز تربێت، هەروەها فەرمودەیەك لای ئەوان بەهێز بێت، بەلام لای ئەم لاواز بێت.

شەرعناسەکان بڕوایان وایە خودا توانای هەیە مەهدی بەدەربخات وئەو تواناو دەستەڵاتەیشی پێ ببەخشێت کەئیسلام سەربخات ودادگەریش بەرپا بکات، چونکە هیچ شتێ نیە لەبەردەم دەستەلاتی خوادا ئەستەم بێت...ئینجا مادەم خودا بەڵێنی داوە بەدەرکەوتنی مەهدی لەئاخرزەمان دائەوا هەرچۆن بێ هەردەبێ بەڵێنەکەی خۆی بەدی بێنێت.

ئیبن خەلدونیش لەگەڵ ئەو شەرعناسانەدا دان بەوەدا دەنێت کەخودا توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە، بەلام لەوەدا لەگەڵیاندا ناکۆکە، کەئەم پێی وایە خودا مەسەلەکان بەگوێرەی نەریت (عادە)بەڕێوە دەبات... (١٠)ئەمەش یانی، بەڕێی ئیبن خەلدون خودا هیچ شتێ ناکات بەگوێرەی داخوازی سروشتی شتەکان نەبێت...بەو پێ یەش ناگونجێت (مەهدی)لەناکاوو بەوجۆرە لەناخافڵی دا دەربکەوێت و (مەهدویەت)ی خۆی ئاشکرا بکات و پاشان سەربکەوێت بەسەر

دەوڵەتانی سەردەمەكەی دا تەنها بەهێزی خودا... (١١) ئەگەر ڕێگەش خۆش بكرێت بۆ پیاویَ بەوكارانە هەستێ، ئەوا پێویستە ئەو پیاوە خاوەنی دەمارگیریەكی بەهێز بێت كەئەو دەمارگیریە هاوكاری بكات ویارمەتی بدات بۆ قەلاچۆكردنی دوژمنەكانی وسەركەوتن بەسەریاندا...ئەوەتا دەبینین، بۆنمونە پێغەمبەران كەخودا هەڵیان دەبژێرێت ونیگایان بۆ دەنێرێت ورەوانەیان دەكات بۆ بلاوكردنەوەی پەیامەكەی بەنێو خەلكیدا، دەبینین ئەو پێغەمبەرانەش بەگوێرەی ڕێساكانی نێو ئەو كۆمەلگەیە بەئەركی سەرشانیان سەبارەت بەپەیام وبانگەوازەكەیان هەڵدەستن كەتیای دا دەژین، ئەوانیش وەك هەرمرۆڤێكی تر پشت بەدەمارگیری وشوێن كەوتە جیاوازەكان دەبەستن... (١٢)ئیبن خەلدون دەڵێت: (ڕاستی یەك كەپێویستە لەكنت سەلێنراو بێت، ئەوەیە كەهیچ بانگەوازێكی ئاینی یاخود پادشایەتی تەواو وتۆكمە نابێت مەگەر بەبونی دركێكی دەمارگیری كەبتوانێ پشتی بانگەوازەكە بگرێت و بەرگری لیَ بكات... (١٣)

## گوێڕایەڵیی سوڵتان :

شەرعناسەکان ئەهلی سوننە لەسەردەمە پاشینەکانیاندا، خەریکە یەکڕابن لەسەر پێویستی گوێڕایەڵی کردنی سوڵتان وقەدەغەکردنی دەرچون لەفەرمانی سوڵتان، هەرچەندە سوڵتان کەسێکی ستەم کارو فاسقیش بێت... یەکێ لەو شەرعناسانە لەهەڵبەستێکی فیقهی دا دەڵێت:

**وطاعة من الیة الامر فالزم وان کانوا بغاة فاجرینا (١٤)**

یانی : (گوێڕایەڵی کردنی وەلی ئەمر "دەستەڵات دارو سوڵتان - وەرگێڕ" پەیوەگیرە، بائەو دەستەڵات دارانە سەرکەش و تاوانبارانی ناومانیش بن).

فەرموده گەلێ زۆرو زەوەندیش گێڕدراونەتەوە کە سەرجەمیان سەرکۆنەو سەرزەنشتی دەرچون لەفەرمانی سوڵتان دەکەن وبەیاخی بون لەفەرمانی خوداو پەرتەوازەکردنی یەك دەنگی نەتەوەی لەقەڵەم دەدەن... (١٥)وادیارە هەندێ لەپێشەوایانی ئیسلام لەچاخی یەکەمیندا پەیگیری تەواوەتی ئەم فەرمودانە نەبوون... هەندێ لەوپێشەوایانە شۆڕشکردنیان بەسەر دەستەڵات داری ستەم کاردا بەباشتر دەزانی، بەگوێرەی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر کە دەفەرمێت: (نابێ گوێڕایەڵی وەدی هێنراوێ بکرێ لەسەر پێچی کردنی وەدی هێنەردا "کەخودایە —وەرگێڕ" هەروەها پشتیان بەو پرەنیسپەیئیسلام دەبەست کەناسراوە بە (فەرمان کردن بەچاکەو ڕێ گرتن لەخراپە)

ئەم پرەنیسپە لەسەرەتای ئیسلام دا کارگەریەکی گەورەی هەبوو، چونکە موسوڵمان هەستی بەوە دەکرد کەپێویستە لەسەری هەرگا توانای هەبوو خەبات بکات، دژبە خراپە وگەندەڵیەی کەلەسەر دەستی فەرمان ڕەوایان دا بەدەربکەوێت... شۆڕشگێڕان پرەنیسپی (فەرمان دان بەچاکەو ڕێ گرتن لەخراپە)یان کردبوە بەڵگەو داردەستی خۆیان لەساتەوەختی شۆڕشیان دا دژبەسوڵتان... لەم ڕووەوە زۆرێك لەپێشەوایانی شەرعیش پشتگیری یان دەکردن.

زانراوەکە (ئەبو حەنیفە)یەکێك بوە لەوانەی کە شۆڕشکردنیان لەدژی دەستەڵاتداری ستەم کار پێ باش بوە، دەگێڕنەوە لەکاتی شۆڕشکردنی (زەیدی کوڕی عەلی) بەسەر خەلیفەی ئەمەوی (هشام کوڕی عبدللك) دا، ئەبو حەنیفە دەربارەی ئەو شۆڕشە دەیگوت: (دەرچونی زەید لەدژی هشام -وەرگێڕ)هاوشانی دەرچونی پێغەمبەرە لە ڕۆژی بەدردا " دژبەکافرانی قورەیش -وەرگێڕ " (١٦)هەرلەم بارەیەوە (زەمەخشەری)دەگێڕێتەوە ودەڵێت: (ئەبو حەنیفە بەنهێنی فەتوای دەدا بەپێویستی پالپشتی کردن وسەرخستی زەیدیکوڕی عەلی وبردنی ماڵ ودارایی بۆی وچونە ڕیزەکانی ئەوەوە، دژبەو دزە زاڵ دەستەی ناو نرابوو خەلیفە یاخود پێشەوا) (١٧)جگەلەوەش چەندین ڕیوایەتی ترهەن کەئەم گێڕانەوەیە پشت ڕاست دەکەنەوە... شیاوی باسە، شوێن کەوتوانی (ئەبو حەنیفە)بڕوایان بەم گێڕانەوە نەکرد، بەبڕوای ئەوان گوایە (سەنەد)ەکانیان لاوازە، تەنانەت هەندێکیان دەڵێن: ئەو ڕیوایەتانە درۆو هەڵبەستراون ودراونەتە پاڵ ئەبو حەنیفە، بەڵگە شیان بۆئەم بڕوایەیان ئەوەیە کەشەرعناسەکانی مەزەبی حەنەفی کۆکن لەسەر نادروستی دەرچون لەفەرمانی سوڵتان... (١٨)هەرچۆن بێ، ئێمە دەتوانین بگەینە ئەو بەرەنجامەی کەدەرچون لەدژی سوڵتانی ستەم کار، تاڕادەیەك شیاو بوەلەسەرەتای ئیسلامدا... لەبەر ئەمەیە کەدەبینین ئەو سەردەمە سەرەتاییانە لێوان بوون لە شۆڕش وبانگەوازی جودا جودا... وەلێ ئەم شۆڕشانە پەیتاپەیتا وبەتێ پەڕینی ڕۆژگار کەم بونەوە، تاکار گەشتە ئەوەی شەرعناسەکان کۆدەنگ ببن لەسەر پێویستی گوێ ڕایەڵی کردنی دەستەڵات دار، هەرچەندە ستەم کار یاخود فاسقیش بێت.

لێرەدا ئیبن خەلدون دێت وڕایەك پێشکەش دەکات کەپێچەوانەی هەمووانە... ئەم پێی وایە مەسەلەکە بەتەنهامەسەلەی حەرامی وحەڵاڵێتی نیە... بەڵکو پرسێکی واقعی کۆمەڵایەتی یەو هاوپەیوەندە بە مەسەلەی دەمارگیریەوە...واتە هەرکەس خاوەنی دەمارگیری وتوانایەکی تەواو بوو

کەبتوانێ شۆڕش بکات وزاڵ بێت بەسەرسوڵتان دا ئەوا دروستە لەدژی سوڵتان دەرچێ... دەنا هەرکەس لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە لاواز بێت ودەمارگیری وتوانایەکی تەواوی نەبێت کەلەکاتی دەرچون وشۆڕش کردنەکەی داپاڵپشتی بێت، ئەوە باشترە لەماڵی خۆی دا کڕبێت ودورکەوێتەوە لەئاژاوە نانەوەو دروست کردنی ئاشوبەو خوێن ڕشتن.

ئیبن خەلدون لەم ڕووەوە دەڵێت: (زۆرێك لەوانەی کاڵای پەرستش وگرتنی ڕێگەی دینداری یان بەباڵادا بڕاوە، ڕودەکەنە هەستان و ڕاپەڕین لەدژی میرو دەستەڵات دارە بەدڕەفتارەکان و بانگەشەی گۆڕینی و بەرگرتن لە خراپەو، فەرمان کردن بەچاکە دەکەن... بەو هیوایەی لەسەر ئەو کارەیان لەلایەن خواوە پاداشت بدرێنەوە، ئیدی شوێنکەوتوانیان زۆر دەبن لەچینی ئاژاوەچی وخەڵکە غەوغاییەکان، بەوهۆیەشەوە خۆیان دوچاری لەناو چون دەکەن، زۆربەیان بەسزاباری لەو ڕێگەیەدا لەنێو دەچن نەك بەپاداشت داری !! چونکە خوای گەورە ئەوەی لەسەر ئەمان نەنوسیوە، بەڵکو لەکاتێکدا فەرمانی پێدا وەکە توانای هەبێت، پێغەمبەر (د.خ)دەفەرمێت: (هەرکەس لەئێوە خراپەیەکی بینی بابەدەستی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی بابەزمانی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی بابەدڵی بیگۆڕێت).

ئینجا حاڵ وباڵی پادشاو دەوڵەتەکانیش بەهێزو بنچ داکوتاوەو، هیچ شتێ ئەو حاڵ و باڵە ناڵەرزێنێت، داواکاری و پێداگریەکی بەهێزنەبێت، کەدەمارگیری وهێزو تیرەکانی لەپشتەوە بێ، وەك لەپێشەوە باسمان کرد.

## ئیبن خەلدون ودەمارگیری:

لەماوەی ڕابردودا بایەخی دەمارگیریمان لای ئیبن خەلدون زانی... دەمارگیری لای ویەمەرجێکی بنەڕەتیە بۆ دامەزراندنی دەوڵەت ودروست کردنی خەلافەت وسەرهەڵدانی مەهدی بەگریمانی ڕاستی ودروستی ئەو فەرمودانەی کەلەبارەی سەرهەڵدانیەوە باسکراون.

ئیبن خەلدون پێی وایە دەمارگیری لەگرنگترین ئەو ڕێسا کۆمەڵایەتیانەیە کەپێویستە هەرخاوەن شەریعەت یاخود هەربانگەوازکارێکی ئاینی پەیڕەوی لێ بکات، هەرکاتێ دەمارگیری پوچەڵ بێتەوە، شەریعەتەکانیش (یاساکانیش) پوچەڵ دەبنەوە. (٢٠)لەم ڕووەوە گرفتێکی مەزن ڕوبەڕی ئیبن خەلدون دەبێتەوە، گرفتەکەش ئەوەیەکە شەرعی ئیسلامی سەرزەنشتی دەمارگیری کردوەو نەهی لێکردوەو بەیەکێك لەخەسڵەتەکانی نەفامی داوەتە قەڵەم (٢١)... کەواتە ئیتر چۆن ڕەوایە بۆ ئیبن خەلدون کەدەمارگیری بکاتە بناغەی شەریعەتەکان، لەکاتێکدا دەمارگیری لەشەریعەتی ئیسلامدا سەرزەنشت کراوە ونەهی لێکراوە؟.

بۆچارەسەرکردنی ئەم گرفتەئیبن خەلدون پەنا دەباتە بەرلۆژیکە (مادی)یەکەی، ئەو لۆژیکەی کەگرنگی دەدات بەنێوەڕۆکی مەسەلەکان و وێنە هزریە ئەبستراکتیکیەکانیان فەرامۆش دەکات... بەڕێی ئیبن خەلدون، دەمارگیریش وهەموو بارودۆخەکانی دونیاش ناکرێ بڕیاری گشتی ونەبستراکتیکی یان بەسەردا بدەین وناوەڕۆکە واقعی یەکانیان فەرامۆش بکەین... ئیبن خەلدون لەم ڕووەوە دەمارگیری بەپادشایەتی وئارەزو وتوڕەیی دەرچوێنی... ئەوەتا هەریەك لەو مەسەلانە بگری شەرع نەهی لێکردون وسەرزەنشتی کردون، کەچی هەریەکێ لەومەسەلانە بگری پێداویستی ژیانی مرۆڤن... مرۆڤ بەبێ هەوەس (ئارەزوو)بون ومانەوەی مسۆگەر نابێ... ئینجا شەرع بۆیە نەهی لە (هەوەس) کردوە تاکو بەرگری لەوەی خەڵکی ئەو هەوەسە

بەئاقاری نادروست دا بەکار بێنن... بەڵام بەکار هێنانی بەشێوەیەکی دروست، ئەمەیان چاکەو شەرع هاندەری زۆر بەکار هێنانیەتی... دەکرێ هەمان قسەش سەبارەت بەدەمارگیری بگوترێ... چونکە زۆرجار دەمارگیری دەبێتە هۆکاری بۆسەرخستنی ئاین و بەرقەرار کردنی هەق، پێغەمبەریش پشتی بەدەمار گیری بەستوە لەپاراستن وسەرخستنی ئیسلام دا. بۆیە ناکرێ دەمارگیری بە ناپەسەندو سەرزەنشت کراو بزانرێ لەحاڵێکدا نەبێت کەلە خراپەو پەرت کردنی کۆدەنگی‌ئەتەوەدا بەکار بهێنرێت. (٢٢)

## کۆچ ودەشتەکی بوون:

کۆچ ودەشتەکی بوون، دووزاراوەی هاودژن و لەسەرەتای ئیسلام دا کاریگەری گەورەیان هەبوو... کۆچ یانی ئەوەی هۆزو کەس وکاس وکاریخۆی بەجێ بهێڵێت وپەیوەندی بکات بەبانگەوازی ئیسلامیەوە و شان بەشانی تێکۆشەر (مجاهد)ە کان لەپێناوی داخەبات بکات... هەرچی دەشتەکی بونیشە بەمانای ئەوە دێت کەسێك هەربە (ئەعرابی) یاخود دەشتەکی بونی خۆیەوە بمێنێتەوە، لەگەڵ هۆزەکەیدا لەبیابان نیشتەجی بێت وهەرلەگەڵ هۆزە کەیشی دا بەدووی لەوەرگادا بچێت ولەهەمان پێناویش دا بجەنگێن.

کۆی شەرعناسەکان لەسەر ئەو بڕوایەن کەکۆچ کردن بەرلەڕزگار کردنی مەککە لەسەر هەموو موسوڵمانێك (واجب) بووە... چونکە ئەوکاتە پێویست بوو هەموو موسوڵمانێك پەیوەندی بەپێغەمبەر وهاوەڵانیەوە بکات لە (مەدینە)داو، شان بەشانی ئەوان لەدژی کافران (جیهاد)بکات... هەرلەبەر ئەم هۆکارەش مەدینە ناونرا (دار الهجره= خانەی کۆچ)... کاتێکیش (مەککە)ڕزگار کراو خەڵکی پۆل پۆل هاتنە نێو ئاینی خواوە، کۆچکردن هەمان گرنگی جارانی نەما" دەربڕینی وەرگێر" بەگوێرەی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر کەدەفەرمێت (لاهجره بعد الفتح =لەدوای فەتح "ڕزگارکردنی مەککە"کۆچ کردن نیە).

شیاوی باسە، ئەمەویەکان لەسەردەمی دەوڵەتەکەی خۆیاندا بەچاوی ڕێزو (بریایی)یەوە سەیری کۆچیان دەکرد، دەشتەکی بونیان بەناتەواوی دەبینی لەئاین وبڕوای هەربیاوێك دا... بەڵام "خانەیکۆچ" لە (مەدینە)وە گوازرایەوە بۆ (شام)یان بۆهەرجێگەیەکی ترکەمۆڵگەیلەشکرو سوپاکانی خۆیانی لێ بوو... ئەمەویەکان لەوسەردەمەدا خەڵکیان پۆلاندبوو بۆ دوو گروپ: (کۆچبەر)و (دەشتەکی)... دەڵێن گوایە جارێکیان (حەججاج)ستایشی خۆی لەدێڕە هەڵبەستێکدا کردوەو تیای دا گوتویەتی : کەئەو (کۆچ بەرو دەشتەکی نیە)!.

وادیارە (وەهابی)یەکانیش لەم ڕۆژگارەی ئێمەدا، لەم ڕووەوە شوێن پێی ئەمەویەکانیان هەڵگرتوە، ئەوەتا لەساڵی (١٩١١)دوە دەستیان کردۆتە وازهێنان

لەنیشتە جێ بونی نێو (چادر-دەوار)وڕویان کردۆتە نیشتە جێ بون لەشوێنی سەقامگیردا کەلە (قوڕ)دروست کراون وبە (هجر)ناوزەد کراون... ئینجا هۆزەکانی (نەجد)یش یەك چاوی لەوی دیکەکرد لەوازهێنان لەژیانی دەشتەکێتی و، ئەو ژیانەیان بە (نەفامی)دایەقەڵەم، دانیشتوانی (هجر)یش بە (اخوان)ناوبانگیان دەرکرد.

هەرچۆن بێت، فەرمودەیەك لە (صحیح)ی بوخاری داهاتوە، کەلەم ڕووەوە بایەخێکی گەورەی هەیە...پوختەی فەرمودەکەش ئەوەیە کەهاوەڵێکی پێغەمبەر (د.خ) کەناوی (سلمەکوڕی ئەوکەع) دەبێ لەسەردەمی (حەججاج)دا ئەیەوێت بگەڕێتەوە بۆ ژیانی دەشتەکێتی... (حەججاج) پێی دەڵێت: (هەڵگەڕاویتەوەدو بویتەوە بەدەشتەکی؟) سلمەلە وەڵامیدا دەڵێت: (نەخێر، بەڵام پێغەمبەر (د.خ)ڕێگەی پێداوم ژیانی دەشتەکێتی هەڵبژێرم). شەرعناسەکان ئەم فەرمودەیەیان کردۆتە بەڵگەلەسەر ئەوەی گەڕانەوەی موسوڵمان بۆژیانی نێو بیابان وەك هەڵگەڕانەوە (لەئاین —وەرگێڕ)وایە... وەك باسمان کرد شەرعناسەکان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی لەدوای ڕزگارکردنی مەککەوە گرنگی خۆی لەدەست داوەو کۆتایی هاتوە، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەباشی نازانن موسوڵمان لەدوای کۆچ کردنی دووبارە بگەڕێتەوە بۆژیانی بیابان... یانی گەڕانەوە بۆژیانی نێو بیابان لەدیدی ئەوان دا وەك گەڕانەوە وایە بۆنەفامی وئەو خەسڵەتە ناپەسەندانەی دیکەی وەك دەمارگیری کەئیسلام قەدەغەی کردون وبەرگیری لێکردون.

لێرەدا ئیبن خەلدون دێت وچارەسەری بابەتی (کۆچ)و (دەشتەکی بون)دەکات بەجۆرێ کە پێچەوانەیە بەچارەسەری کۆی شەرعناسەکان... ئەم وەکو شەرعناسەکان پێی وانیە دەشتەکێتی وخەسڵەتەکانی ناپەسەندن، بەڵکو بەپێچەوانەوە، پێی وایە دەشتەکێتی نزیك ترەلە خەسڵەتەکانی (ئاین وچاکە)وە، وەك لەشارستانیەت... چونکە شارستانیەکان بەهۆی سەرقاڵ بونیانەوە بەهۆکارەنی چێژوەرگرتن و نەریتەکانی تەرەف ودنیا خۆری وهەوەس

بازیەوە ئاخ ودەرونیان بەزۆرێك لەئاكارە ناپەسەندو سەرزەنشت كراوەكان پلۆخ دەبێت ورێگەكانی چاكەیان لێ دوور دەكەوێتەوە، تەنانەت لەئاكارو گوفتاریان دا شەرم وئابڕویان لێ بزر دەبێت "دەربڕینی وەرگێڕ". هەرچی دەشتەكیەكانیشە، هەرچەندە هەندێ خەسڵەتی سەرزەنشت كراوو ناپەسەندیان تێدایە بەڵام هێشتر ناگەنە ئەو پلەو ڕادەیەی كەشارسانیەت پێی گەشتوون...بەو پێیەش ئەمان لەسروشتی زگماكیەوە نێزیك ترن ولەو خراپیانەش دوورترن كە بەدەرونەوە دەلكێن، هەروەها بۆچارەسەر كردنیش ئاسان ترن. (٢٤)

ئیبن خەلدون وای دەبینێ كە (كۆچ)لەخودی خۆیدا شتێكی ستایش كراو وچاك نیە، ئەمە گەرچاو بپۆشرێت لەوئامانجەی كەلەپێناوی داكۆچەكە دەگرێ... بەڵكو كاتێ كۆچ چاك وستایش كراوە كەلەپێناوی سەرخستن وپاراستنی (دین)دابێت، وەلێ گەرلەپێناوی ئامانجێكی تردا بێت ئەوا ڕەنگە خراپ وسەرزەنشت كراوبێ بەگوێرەی خراپی ئەو ئامانجەی كەلەپێناوی دا كۆچەكە بەرپاكراوە " دەربڕینی وەرگێڕ". (٢٥)جگەلەوەش "كۆچ" لەكاتێكدا كەئیسلام لاواز بوو تەنها لەپێناوی پشتگیری كردنی پێغەمبەر (د.خ)وسەرخستنی دا لەشەرع دا واجب كرا.

لەسەرەتاشەوە تەنها لەسەر خەڵكی (مەككە)واجب بوو "ئەمەش چونكە خەڵكی مەككەبەڕادەیەك پشكیان لەدەمارگیری پێغەمبەردا بەدەردەكەوێ، كەهیچكام لەدەشتەكیەكانی تری دانیشتوی بیابان بەوڕادیە پشكیان لەو دەمارگیریە بەرناكەوێ) (٢٦)ئیبن خەلدون بەم قسەیە دەیەوێت بڵێت: شەرع نەهاتوە بەشێوەیەكی گشتی وڕەهاو تەواوەتی نەی لە (دەشتەكی بوون)بكات، هیچ شتێكیشی تێدا نیە كەسەرزەنشتی دەشتەكێتی بكات... بەڵكو تەنها ئەوەندەهەیە كەلەكاتێك لەكاتەكاندا ولەبەر چەند هۆیەك سەرزەنشتی دەشتەكێتی كردوە، ئینجا ناگونجێت ئەم نەهی كردنە هەروەكو خۆی بمێنێتەوە لەكاتێكدا هۆكارەكانی نەی كردنەكە لەئارادا نەمێنن.

## ڕێی ئیبن خەلدون سەبارەت بەکشت وکاڵ :

کشت وکاڵ لەئیسلام دا ستایش کراوەو بەشتێکی باش وبەکەڵك لەقەڵەم دراوە. پێغەمبەر (د.خ)لەچەند فەمودەیەکدا ستایشی کردوەو هانی خەڵکی داوە بۆ کشت وکاڵ کردن، لەیەکێك لەوفەرمودانە دا، پێغەمبەر (د.خ)کشت وکاڵی بەباشترین کەسابەت داناوە، ئەوەتا دەفەرمێت: (باشترین کەسب کشت وکاڵە، چونکە پیشەی ئادەمی باوکتانە) (٢٧). شیاوی ئاماژە پێدانیشە کەزۆرێك لەهاوەڵان، ئەخاسمە پشتیوانەکانی خەڵکی مەدینە، ئەهلی کشت وکاڵ وبێستان کردن بوون... پێغەمبەرو خەلیفە ڕاشیدەکانی، هەندێ جار زەوی هەندێ لەموسوڵمانیان بڕداوەو تەرخانیان کردوە بۆ بەکارهێنانی لەکشت وکاڵ دا... عەلی کوڕی ئەبی تالب بەرلەوەی ببێتە خەلیفە وەك کرێکار لە بێستان دا کاری دەکردو، دواتر وەك خاوەن بێستان کاری دەکرد.

هەنگامێ دێینەسەر ئیبن خەلدون، دەبینین سەبارەت بەکشت وکاڵ ڕایەکی هەیەکەلە لێ کەم کرنەوەو سەرزەنشت کردن خاڵی نیە، ئەو ڕێی وایە کشت وکاڵ پیشەی کەسانی لاوازو ئەوانەیەکە هەمیشەداوای بێ وەیی دەکەن و دەبێتە هۆی ئەوەی خاوەنانی پیشەکە بەرەو سەرشۆڕی وئەو ئەریت خوانە بچن کەدەبنە پاشگیری سەرشۆڕی (دەبڕینی وەگێڕ) (٢٨)بۆ پشت گیری کردنی ئەوڕایەشی فەرمودەیەك دێنێتەوە کەلە (صحیحی بوخاری) داهاتوەو دەڵێت: (پێغەمبەر چوەیەکێك لەماڵەکانی پشتیوانەکان لەمەدینەداو (شفرەی گاسن)ێکی تێدا بینی، فەرمووی: ئەوە "واتە ئەو شفرەی گاسنە" نەهاتۆتە نێو خانەی هۆزێکەوە، ئیلا سەرشۆڕی لەگەڵیدا چوەتە نێو ئەو هۆزەوە) (٢٩).

سەیرلەوەدایە ئیبن خەلدون هەموو ئەو فەرمودانە لەیاد دەکات کەلەبارەی ستایش کردنی کشت وکاڵەوە هاتوون، کەچی دێت ئەم تاکە فەرمودەیە ئاماژە پێ دەدات کەوادەردەکەوێ سەرزەنشتی کشت وکاڵی تێدا بێت... وادیارە ئەم

فەرمودەیە، یەکێکە لەوفەرمودانەی کەواتاکانیان لەلای شەرعناس و فەرمودەناسەکان تێکەڵ بوەو ڕون نیە، تەنانەت هەندێ لەو فەرمودەناس و شەرعناسانە سەبارەت بەوفەرمودەیە ڕایان وایە کەلەهەڵە بەدەرنیە. (٣٠)ڕەنگە هۆکاری سەرلێتێکچونیان سەبارەت بەم فەرمودەیە ئەوەبێت کەناتوانن تێ بگەن لەوەی چۆن چۆنی پێغەمبەر لەم فەرمودەیەدا سەرزەنشتی کشت وکاڵی کردوە، لەکاتێکدا لەهەندێ فەرمودەی تردا ستایشی کردوە، ئینجا ناتوانن لەوە تێ بگەن کەچۆن دووشتی هاودژ لەنێو بونیادی یەك شت داکۆدەبنەوە؟.

وەکو پێشتریش ئاماژەمان پێدا، ئیبن خەلدون گوێ نادات بەوەی زۆرێك لەفەرمودەکان فەرامۆش بکات، ئەگەر هەستی کرد ئەو فەرمودانە لەگەڵ لۆژیکی تێورە کۆمەڵایەتیەکەی دا وێك نایەنەوە. لەولاتریش یەك فەرمودە دێنێت و سەرنجی بەسەردا چڕدەکاتەوە ئەگەر ئەوتاقە فەرمودەیە لەگەڵ تێورەکەی خۆی دا بگونجێت.

ئیبن خەلدوندان بەوەدا دەنێت کە کشت وکاڵ خۆراکی پێویست بۆ مرۆڤ بەرهەم دێنێت، و هەرگیزاو هەرگیز مرۆڤ ناتوانێ دەست بەرداری کشت وکاڵ بێت، جگەلەوە دێرین ترین پیشەو بەکەڵك ترینیشیانە بۆمرۆڤ. (٣١)بەڵام سەرباری ئەوەش پێی وایە ئەو پیشەیە دەبێتە هۆی مل کەچ پێکردنی خاوەنەکانی بۆسەر شۆڕی وخوگرتن بەفرۆفێڵەوە... ئەو پێی وایە مادەم کشاوەرز وجوتیارەکان دەکەونە ژێر ستەمی دەوڵەتەوە، باجی پێ دەدەن ومل کەچی ستەمی باجگرەکانی دەوڵەت دەبنەوە، کەواتە هەردەبێ خەسڵەتە دزێوەکان تیایاندا گەشەبکات... ڕەنگە لێرەدا کەسێك بپرسێت: ئەی ئیبن خەلدون سەبارەت بەزۆرێك لەو هاوەڵانە چی دەڵێت کەسەباری ئەوەی جوتیار بوون کەچی لەهەمووان زیاتر سەربەرزو شکۆمەند بوون؟.

گومانم وایە ئیبن خەلدون هەوڵی داوە بەشێوەیەکی ناڕاستەو خۆ لەیەکێك لەبەشەکانی (مقدمە)داوەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە... لەو بەشەدا ئاماژەی بەوە

داوەکەمەرج نیە سەرشۆڕی ببێتە کاڵای باڵای ئەوانەی جوتیارن وکشت وکاڵ دەکەن پیشە، مەگەر لەکاتێکدا کەپادشایەکی ستەم کاری سەرسەخت بەسەر خەڵکیدا زاڵ دەبێت. (٣٢)ئەم قسەیەش ئەوە دەگەیەنێت کەنەبونی پادشایەکی ستەم کاریبەوشێوەیە وادەکات کشت وکاڵیش نەبێتەمایەی سەرشۆڕی، وەك لەسەردەمی پێغەمبەرو خەلیفەکانی راشیدین دا دەردەکەوێ... ئەوەی لەم بەرەنجام گیریەی ئێمەدا پشتگیریمان لێ دەکات، ئەوەیەکە ئیبن خەلدون ئەو باجەی جوتیارەکان دەیدەنە دەوڵەت بە (زەکات)ی لێکچواندوە... موسوڵمانەکان لەسەرەتادا بەویست وئارەزوی خۆیان زەکاتیان دەبەخشی وبەواجبیان دادەنا، بەڵام لەدوای دەرکەوتنی پادشاستەم کارەکان، بەزۆرەملێ ولەژێرگوشاردا زەکاتیان دەدا... لەفەرمودەیەکیش دا کە ئیبن خەلدون بۆمانی دەگوازێتەوە هاتوەو دەفەرموێت: (قیامەت هەڵناسێ هەتاکو زەکات دەبێتەتۆبزی) (٣٣)

پوختەی قسانیش ئەوەیە، ئیبن خەلدون وەك هەموو مەسەلەکانی ترسەرنجی کشت وکاڵیش دەدات، یانی وەك هەرشتێکی ترکشت وکاڵ لەخودی خۆیدا خراپ یان چاك نیە، بەڵکو چاك وخراپی کشت وکاڵیش بەگوێرەی ئەوبارو دۆخە واقیعیە دەردەکەوێت کەدەوری کشت وکاڵ دەدەن وبەرەنجامی کۆمەڵایەتیان لێ دەکەوێتەوە.

لێرەدا ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیەکە ئیبن خەلدون کشت وکاڵیشی لەریزی پیشەدەشتەکیەکاندا پۆلاندوە، ئەمەش بۆچونێکە زانستی کۆمەڵناسی نوێ لەگەڵی دا کۆك نیە، چونکە کشت وکاڵ لەسروشتی شارستانیەت وسەقامگیری یەوە نزیکترە، وەك لەسروشتی کۆچەری بون ودەشتەکێتی یەوە... وەلێ ڕەنگە هۆکارێ کەپاڵی بە ئیبن خەلدونەوە ناوە تاناوارایەی لا گەڵاڵەبێت. ئەوەیەلەو کاتەدا کشت وکاڵ لە (مەغریب)دا بارێکی ناهەموارو ناسەقامگیری هەبوو، بەهۆی هێرش وداگیرکاریەکانی (بنی هیلال)و (بنی سلیم)ەوە کەهەڵیان

کوتابویە سەر ولاَتانی‌مەغریب "ی عەرەبی -وەرگێڕ" وەك لەبەشێکی داهاتو تردا دەبینین.

دەگونجێت بگوترێت ئیبن خەلدون کشت وکاڵی بەبارێکی مام ناوەندی داناوە لەنێوان دەشتەکێتی وشارستانێتی دا، ئەوەتا لەڕووی ئەوەوە کە مرۆڤ پێیەوە سەرقاڵ دەبێت لەشارستانیەت دەچێت، لەلایەکی ترەوە تەنها ئەو لاوازە دەشتەکیانە کشت وکاڵکردن وەك پیشەیەك قبوڵ دەکەن کەهەمیشە بەدوای بێ وەیی دا دەگەڕێن "دەربڕینی وەرگێڕ" (٢٤)هەرچی کەسانی بەهێزو تواناو خاوەن دەمارگیریەکانی نێو دەشتەکیەکانن، ئەو پیشەیە وەرناگرن چونکە پیشەکە وادەخوازێ مرۆڤ باج و سەرانە بدات وسەرشۆڕبێت، شارستانیە موتریفەکانیش ئەو پیشەیە قبوڵ ناکەن چونکە بەشایستەی خۆیانی نازانن... بەو جۆرەش کشاوەرزی کەکۆنترین پیشەیەو سودبەخش ترین پیشەیشە بۆمرۆڤ بۆتە پیشەی مرۆڤە لاوازو بێ تواناکان.

## دركاندنێك :

ئێمەلەنمایش كردنی بۆچونەكانی ئیبن خەلدوندا، چ لەم بەشەدا یاخود لەبەشەكانی دیكەدا، مەبەستمان ئەوەنیە كەپشتگیری بكەین یاخود بڕوامان بەڕاستی ودروستی ئەو بۆچونانە هەبێت... چونكە ناگونجێت بەڕادەیەك زیادەڕەوی بكەین لەبەرز ڕاگرتنی ئیبن خەلدوندا كەهەموو بۆچونەكانی بەڕاست ودروست و بێكەم وكووڕی بزانین.

لەڕاستی دائیبن خەلدونیش، وەك هەموو بلیمەت و بیرمەندەمەزنەكانی دیكە، هەندێ جار ڕاستی دەپێكێت و هەندێ جاری دیكەش هەڵە دەكات... تاهەنوكەش لەجیهاندا بیرمەندێ وەدەرنەكەوتوە بتوانێ تیۆرێك بێنێتە كایەوە كەڕاستی یەكی ڕەهای هەبێ !.

بەڵكو ئێمە لەنمایش كردنی بۆچونەكانی ئیبن خەلدوندا، مەبەستمانە ئەو جیاوازیە ئاشكرابكەین كەلەڕوی لۆژیكی یەوە لەنێوان ئەو و هەریەك لەشەرعناس وفەیلەسوفەكانی تردا هەیە... ئیدی بەلامانەوە گرنگ نیە ڕایەك لەڕاكانی ئیبن خەلدون ڕاستە یاخود هەڵەیە... تەنها ئەوەمان بەلاوە گرنگە ڕەوتە لۆژیكی یەكەی بدۆزینەوەو، لەوەتێ بگەین ئایائیبن خەلدون لەڕاكانیدا لەسەر بنەمای یەكێكەوزمی بەڕێوە ڕۆشتوە یاخود لەسەر بناغەیەكی مادی.

# پەراوێزەکانی بەشی پێنجەم

١) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربى)، ل ٥٢٠ — ٥٢١.

2) Karl. Mannhem ،Ideology & Utopia ،London ،L.H ، p237 – 280.

٣) على بن محمد الماوردى، الأحكام السلطانية، قاهيره ١٩٦٠، ل ٦.

٤) مقدمه ابن خلدون (تحقيق وافى)ل ٥٢٤- ٥٢٥.،

٥) ه س، ل ٥٢٥.

٦) ه س، ل ٥٢٧.

٧) احمد امين مهدى والمهدويه، قاهيره ١٩٥١، ١٠٨.

٨) ه س، ل ١٠٩ — ١١٠.

٩) احمد بن محمد بن الصديق، ابراز الوهم المكنون، دمشق ١٣٤٧ ك.

١٠) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربى)، ل ٤٦٩.

١١) ه س، ل ٧٥٥.

١٢) ه س، ل٤٦٩.

١٣) ه س، ل ٧٥٥.

١٤) عبد القادر المغربى، الأخلاق و الواجبات، قاهيره ١٣٤٧ ك، ل ١٦٩. ز

١٥) ابو يوسف يعقوب بن ابراهيم، كتاب الخراج، قاهيره ١٣٤٦ ك، ل ١٠ — ١٦.

١٦) محمد ابو زهره، ابو حنيفه، قاهيره (١٩٥٥)، ل٣٦.

١٧) احمد امين، ضحى الأسلام، قاهيره ١٩٤٣، ج ٣، ل ٢٤٧.

١٨) محمد رضا الشبيبى، مؤرخ العراق ابن الفوگى، بغداد ١٩٥٠، ل ١١١ -١١٢.

١٩) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربى)، ل ٤٦٩.

٢٠) ه س، ل ٥٤٠.

٢١) احمد امين، فجر الأسلام، قاهيره، ١٩٤٥، ل ٦٩ -٨٣.

٢٢) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربى)، ل ٥٣٨ — ٥٤٠.

٢٣) حافظ وهبة، جزيره العرب فى قرن العشرين، قاهيره، ١٩٤٦، ل ٢٢٧ — ٢٧٧.

٢٤) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربى)، ل ٤١٤ — ٤١٥.

٢٥) هـ س، ل ٥٣٩.

٢٦) هـ س، ل ٤١٥.

٢٧) عبد القادر المغربى، الأخلاق والواجبات، ل ٨٤.

٢٨) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربى)، ل ٤٤٣، ٩١٤.

٢٩) هـ س، ل ٤٤٣.

٣٠) طه حسين، فلسفة ابن خلدون الأجتماعية، ل ١٥٢.

٣١) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربى)، ل ٩٣٢.

٣٢) هـ س، ل ٩١٥.

٣٣) هـ س، ل ٩١٥.

٣٤) هـ س، ل٩١٤.

## دەروازەی دووەم

## بەشی شەشەم

## نهێنی بازدانەکەی خەلدون (١)

لەماوەی ڕابردودا باسمان لەوبازدانە فیکریەکرد کە ئیبن خەلدون هێنایە کایەوە، زانیمان کەبەهۆی ئەو بازدانەوە، بویە یەکەمین هزرڤان لەجیهاندا کەتوانی لەچوارچێوەی لۆژیکی فۆرمیی کۆن تێ پەرێ وهەوڵ بدات بەگوێرەی لۆژیکێکی مادی نوێ لەکۆمەڵگە بکۆڵێتەوە... هەنوکەش گەرەکمانە لەدوی ئەو هۆکارگەلە بچین کەزەمینە سازی یان کرد بۆ ئیبن خەلدون وهاندەری بوون، تابتوانێ ئەوبازە بوێرانە بهاوێ.

لەڕاستی دا ئێمە لەم بابەتەدا بەرەو ڕوی نهێنی یەکی تەم مژدار دەبینەوە. چونکە ئەو پیاوە تیۆرێکی کۆمەلایەتی مەزنی ئەفراندوە کەچەند سەدەیەك پێشی سەردەمەکەی خۆی کەوتوە... جارێ ئێمە نکولی ناکەین لەوەی زانایانی کۆمەڵناسی نوێ لەزۆربەی ڕاوبۆچونەکانیاندا کەوتونە پێش ئیبن خەلدونەوە و لەویش لەبەرترن و بەسەریدا هەیانە، بەلام نابێ ئەوەشمان لەیاد بچێ کەئەمە دوای ئەوە دەست ئەوزانایانە کەوتوە، کەبیری کۆمەلایەتی بۆماوەیەکی دوورودرێژو ئەوەلەدوای ئەوە گەشەی کردوەو بەرەو پێش چوە تاکو بەدەستی ئەم زانایانەگەشتوە... بەلام ئیبن خەلدون لەکاتێکدا تیورەکەیی هێنایەکایەوە کەبیری کۆمەلایەتی قۆناغێکی ئاوالەپێشکەوتن وپێگەشتن وگەشەسەندنی بەخۆیەوە نەدی بوو.

لەبەر ئەوە ئێمە پێویستمان بەوەیە لەدوی ئەو نهێنی یەشاردراوەیە بگەڕێین کەلەپشتی ئەم بازدانە هزریە سەیرەی ئیبن خەلدونەوە ڕاوەستاوە.

## ڕەوتی باو:

هزرڤانان لەكۆندا (تەنانەت تائەمڕۆ كەش زۆرێكیان هەروان) هیچ نهێنی یەك لەوبازدانە فیكریەدا نابینین كەئیبن خەلدون هێنایە كایەوەو هەستیش ناكەن بەوەی كەناتاجێك هەیە بەشرۆڤە كردنی ئەوبازدانە... ئەوان بڕوایان وایە گەشتن بەزانیاری وزانینی ڕاست لەهەربوارێكدا مەسەلەیەكە (نارەزوی ساغ)لەسەری هێنراوەو دروست كراوە... بەڕێی ئەوان ئەقڵ دەتوانێت ڕاستی لەشتەكاندا بدۆزێتەوە، مادەم لەبیركردنەوەی دا بەگوێرەی پێوانە گەڵ ڕاست ودروست ڕێ بكات... هەرگا، هەڵەیشی كرد لەدۆزینەوەی ڕاستی دا، ئەمە دەگەڕێتەوە بۆئەو هۆكارە دەرەكیانەی كەهەندێ جار دێنە ڕێی ئەقڵ ولەمپەر دەخەنە بەردەم بیركردنەوەی وتێڕوانینی بۆ هەقیقەت تێكدەدەن و ناوەژوی دەكەنەوە.

یانی (بەڕێی ئەو بیرمەندانە) دۆزینەوەی هەقیقەت لەلایەن ئەقڵەوە شتێكی سادەو ساكارەوهیچ سەیر نیە، بەڵكو سەیر لەوەدایەكە ئەقڵ دەستەوسان بێت لەوەی ڕاستی بدۆزێتەوە... شیاوی ئاماژە پێدانە، ئەم ڕایە ئێستاكە بەلای زانستی كۆمەڵناسی نوێ وەپەسەند نیە... ڕەوتی زانستی ئەمڕۆكە بەلای ئەوە دایە كەبڵێت، هەربەرهەمێكی فیكری، ئیدی چ ڕاست ودروست بێ یاخود هەڵە وناتەواو بێ، پێویستە هۆكارگەلێ دەرەكی (Extra- theoretic)لەپشتی یەوە ڕابوەستن وهاوكاری بكەن بۆ وەدەركەوتن. (٢) بۆڕون كردنەوەی ئەم پەیڤە دەڵێم ! ئێمە ناگونجێت بۆشرۆڤە كردن ولێكدانەوەی بازدانەكەی ئیبن خەلدون تەنها هۆكارەكەی بگەڕێنینەوەبۆ زیرەكی ئەو، یاخود بۆ بیركردنەوەی ساغ و تەندروستی وی... هەرچەندە ملە جەڕێ ناكەین لەوەی ئیبن خەلدون هزرڤانێكی زیرەك ولەمۆدێلی یەكەم بوو، وەلێ تەنها ئەوە بەس نیە بۆ لێكدانەوەی هێنانە كایەی بیردۆزێكی مەزنی سۆسیۆلۆژی... لەڕاستی دا چاخە كۆن وناوەڕاستەكان، زۆرێك هزرڤان و بیرمەندیان پێگەیاند كەلەڕووی زیرەكی و

بیرکردنەوەی ساغ و تەندروستەوە شانیان دەدا لەشانی ئیبن خەلدون، تەنانەت لەوانەیە هەندێکیان لەویش بالاَ تربوبن. کەواتە بۆچی ئیبن خەلدون تاك دەکەینەوە لەنێویاندا بەو بازدانە ناوازەیە لەبیرکردنەوەی کۆمەلاَیەتی دا؟ گرفتەکە لەوە گەورەترە کەتەنها بەفاکتەری فیکری لێك بدرێتەوە... بەلکو هەردەبی سەرباری ئەوەش فاکتەری دیکەی نافیکری لەپشتەوە بێ.

هەندێ خەلك هەولْ دەدەن بازدانەکەی لەمەڕ ئیبن خەلدون بەوە لێك بدەنەوە کەدەلێن: ئەو کەسێکی بلیمەت بووە... واتێبینی دەگرێ (بلیمەتێتی) لای ئەو جۆرە خەلکە بوەتە (کلیلێکی ئەفسوناوی) وگوایە دەتوانن هەر ئەفراندنێکی مەزنی پێ لێك بدەنەوە. هەرگا، کەسێك ببینن کەلەخەلکی دیکە جیاوازترە لەڕوی دەست کەوتە فیکریەکانەوە دەلێن ئەو کەسێکی بلیمەتە، وتەنها بەو قسەیە دەست کۆتا دەکەن... ئیدی ئەوە لەبیردەکەن کەخودی بلیمەتێتی نهێنی یەکی تەم ومژدارە وپێویستە لێك بدرێتەوە، ئەوا ئەلەو باردا وەك ئەو کەسەوان کەنادیاریێ بەنادیارێکی ترلێك دەدەنەوە.

لەڕاستی دا بلیمەتێتی چ نیە، جگەلەدیاردەیەکی دەرونی- کۆمەلاَیەتی. کەواتە ناگونجێت هەربەخۆیی ولەبۆشاییەوە سەرهەلبدات، بەلکو هەردەبی ئەمیش وەکو دیاردە دەرونی کۆمەلاَیەتیەکانی تر. بەرەنجامی کۆمەلێ هۆکاری دەرەکی بێت وئەوهۆکارانە یارمەتی بدەن بۆوەی لەمرۆڤێکدا بەدەربکەوێت ولەهەندێ مرۆڤی تردا بەدەرنەکەوێت. بالەڕوی بیرکردنەوەو زیرەکیشەوە وەك ئەو وابن.

## لێکدانەوەی دکتۆر تەها حسەین :

پێم وایە دکتۆر تەها حسەین یەکەمین کەس بوە کەبیری چوە بۆلای نارێکی وناتەواوی ئەو ڕایەلەلێکدانەوەی بازدانەکەی ئیبن خەلدون دا... ئەو دەڵێت: (پێویستە نەگەینە ئەو بەرەنجامەی کەئیبن خەلدون سیاسەتە کۆمەلایەتیەکەی لەنەبونەوە هەلگواستوەیاخود بلیمەتێتی ناناسایی وەك نیگا بۆی ناردوە... ئینجا ئەگەر قەیمیەکان رێ یان لەفەلسەفەیەکی کۆمەلایەتی ئاوها نەکەوتبێ ئەوا هۆکاری ئەم ئاشنانەبونە دەگەڕێتەوە بۆناتەواوی زانیاری گشتی وان سەبارەت بەدروست کراوان... چونکە پێویست بەئاگادار بون لەزانیاری بەجۆراو جۆرەکان وڕاوەستان و هەلوێستە بەجۆرێکی فراوانتر دەکات لەو شێوازەی قەیمیەکان پێی ئاشنا بوون، هەلوێستە لەسەر تێورە مێژویی وجوگرافیەکان کەخوێندراون و لەسەر شێوازی ئینسکلۆپیدیا دانراون، تاکو بتوانرێ پشت بەهەندێ لەوتێ بینی یە زۆرو زەوەندانە ببسترێ لەسەر دانانی فەلسەفەیەکی گشتی سەبارەت بەکۆمەلگەی مرۆڤ) (٣)پوختەی بۆچونەکەی (دکتۆر تەها حسەین)ئەوەیە: ئەگەر بهاتباو ئیبن خەلدون لەسەردەمێکدا بژیایە بەرلەوسەردەمەی کەتێیدا دەژیا، ئەوا نەی دەتوانی بیردۆزە کۆمەلایەتیەکەی دابهێنێ... واتە ئیبن خەلدون بۆیە توانیویەتی ئەو بیردۆزە دابهێنێ چونکە لەسەردەمێکدا ژیاوە کەسەرەتای دەرکەوتنی ئینسکلۆپیدیا گەلێ قەبەو فرە بەرگ بووە، ئەم ئینسکلۆپیدیایانەش هەموو ئەو زانیاریانەیان تێدا کۆکرابویەوە کەلەو ڕۆژگارەدا مرۆڤ پێیان ئاشنا بوو، ئینجا ئەگەری ئەوەش زۆرە ئەو ئینسکلۆپیدیایانە هاوکارو یارمەتی دەری بووبن لەفراوان کردنی بیرۆکە جەوهەریەکەی دا. (٤)

ڕەنگە ئێمەلەتەك ئەم بۆچونەی (دکتۆرتەها حسەین) داناکۆك بین، وەلێ لەگەلٚ ئەوەشدا ملەجەرێ ناکەین لەوەی کەرەوتێکی زانستی ڕاستیشی تێدایە...

ئەوەتا دکتۆر لەلێکدانەوەی بازەکەی ئیبن خەلدوندا تەنهابەوەندە کومسایی نادات کەئیبن خەلدون بلیمەت بووە، بەڵکو هەوڵ دەدات هۆکارە دەرەکیەکانی پشتی ئەو بازدانە بدۆزێتەوە کەئەو بەسەر هەڵدانی ئینسکلۆپیدیاکانی ناودەبات، ڕەنگە ئەم هۆکارەش یەکێك بێت لەڕاستی هۆکارەکان، بەڵام هەرچۆن بێت بیرگردنەوەی ئیبن خەلدون لەکاریگەری ئەو هۆکارە بەدەرنیە.

لەدوای (دکتۆر تەها حسەین)هەندێ توێژەری دیکە بەدەرگەوتن وهەوڵ یان داوە بەدوی ئەو هۆکارە دەرەکیانەدا بگەڕێن کەبونەتە یارمەتی دەری ئیبن خەلدون بۆ داهێنانی بیردۆزە کۆمەڵایەتیەکەی... ئێمەلە ماوەی دادێ نمونەی هەندێ لەبۆچونەکانی ئەوانیش باس دەکەین، لەتەك برێ ڕەخنەکاری دا.

## لێکدانەوەی مامۆستا شمدت:

مامۆستا (ناسانیل شمدت)لەپەرتوکەکەی دا سەبارەت بەئیبن خەلدون ڕایەکی پێشکەش کردوە کەلە چەند ڕویەکەوە لەبۆچونەکەی (دکتۆر تەها حسەین)دەچێت، ئەو بازەکەی ئیبن خەلدون بەسەر هەڵدانی ئینسکلۆپیدیاکان لێك نەداوەتەوە، بەڵکو بەگوێرەی هەمە چەشنێتی ئەو ئەزمونە کۆمەڵایەتیانە لێکی دەداتەوە کە ئیبن خەلدون لەژیانی دا پیایاندا تێ پەڕیوە... ئەو لەمەڕ گەشتەکانی ئیبن خەلدون دەڵێت : کۆمەڵە گەشتێکی بەرهەم دار بوون، چونکەئیبن خەلدونیان گەیاندە نێو کوخی دڕەندەکان وکۆشکی پادشاکان، گەیاندیانە نێو سەردابە تاریکەکان لەگەڵ تاوانبارەکاندا، تاکو بەبەرزترین هۆبەکانی دادوەری دەگات... هەرئەو گەشتانە ئیبن خەلدونیان کردە هاوەڵی نەخوێندەوارەکان وهاونشینی زاناکان، گەیاندیانە کەلەپورەکانی ڕابردوو چالاکیەکانی هەنوکە... پەلکێشیان کرد بەرەو بێ بەش بون ونازار، تابەخۆش گوزەرانی و گوشادی دەگات... بەکورتی ئەو گەشتانە دەستی ئیبن خەلدونیان گرت بەرەو قوڵاییەکان، کەلەوێندەر ڕۆح واتاکانی ژیان دەدۆزرێتەوە. (٥)

ئەم ڕایەی (شمدت)لەڕاستی وپێکان خاڵی نیە... چونکە بێگومان ئەو ئەزمون و ئاگاییە دەوڵەمەندەی کەئیبن خەلدون پیادا تێ پەڕی کاریگەری گاڵتەپێ نەکراوی هەبوو لەبازدانە فیکریەکەی دا. بەڵام دەتوانم سەبارەت بەم ڕایەش هەمان ئەو قسەیە بکەم کەدەربارەی بۆچونەکەی (دکتۆر تەها حسەین)کردم، واتە دەکرێ بێژین ئەم هۆکارەش تاکە هۆکارێکە لەنێو ڕستێ هۆکاری تردا... لەڕاستیش دا تیۆرەکەی ئیبن خەلدون مەزنترە لەوەی کەتەنها بەهەمە چێشنێتی ئەزمونە کۆمەڵایەتیەکان شرۆڤە بکرێت، ئەو پرسیارەش کەدەکرێ لەم ڕودوە ئاراستە بکرێ ئەمەیە: ئایائیبن خەلدون تاکە کەسێك بووە

کەخاوەنی ئەو ئەزموونە کۆمەڵایەتیە بوبێت، ئایا لەمێژوی مرۆڤ دا هزرڤانی دیکە بەدەر نەکەوتوون کەلەو زیاتر گەڕیدەییان کردبێ لەسەرزەوی داو بەشێوەیەکی فولترێش پەیوەست بوبن بەجیاکاریەکانی ژیانەوە؟. کاتێك لەگەڕان وگەشتەکانی هەریەك لە (هیرۆدتس یان ئیبن بەتوتە یان مارکۆپۆلۆ یاخود مەسعودی یان... هەریەکێکی ترلەوانەی بەناسۆکانی سەرزەوی دا گەڕاون) دەکۆڵیتەوە، هەست دەکەین لەچاو ئەو گەشتانەدا، گەڕانەکانی ئیبن خەلدون گرنگی یەکی وەها گەورەیان نیە... جاکەواتە بۆچی ئەو کەسانە بەرهەمی وەکو ئیبن خەلدون یان بەرهەم نەهێنا؟.

## لێکدانەوەی گۆتیە:

مێژونوسی فەرەنسی "گۆتیە" پەرتوکێکی هەیە بەناوی (ڕابردوی ئەفریقای باکور)... لەپەرتوکەکەدا "گۆتیە" لێکدانەوەیەکی سەیر دەکات بۆبازدانە فیکریەکەی ئیبن خەلدون، پوختەی لێکدانەوەکەیشی ئەوەیە کەپێی وایە ئیبن خەلدون تیۆرەکە داهێنەرەکەی خۆی

لە" پریشکێك "ە کەوە، هەلگواستوە کەلەئەوروپاوە ولەڕێگەی ئەندەلوسەوە بۆی هاتوە.

(گۆتیە)وای بۆدەچێ کەبیرکردنەوەی داهێنەرانە لەتایبەتمەندیەکانی ئەقلیەتی ئەوروپای خۆرئاوایە. ئەقلیەتی ئیسلامیش لەم ڕووەوە دەستەوسانە. بۆیە پێویستە گریمانەی ئەوە دابنێین کەپریشکێك لەڕاچەنینی ئەوروپی ئەو چوارچێوە تۆکمەیەی بەزاندوە کەبەدەوری ڕۆژهەڵاتی ئیسلامیدایەو گەشتۆتە نێو (گیان وهەناوی ئیبن خەلدونی ڕۆژهەڵاتی) (٦)من ئاتاجم بەوەنیە ئەو بۆچونەی "گۆتیە" پوچەڵ بکەمەوە. چونکە لەڕاستی دا ئەوڕایە بەخۆی خۆی پوچەڵ دەکاتەوە... بەتایبەت گەر بزانین ڕێنیسانس و ڕاچەنینی ئەوروپی یەك سەدەلەدوای ئیبن خەلدون دەستی پێ کردوە. سەرباری ئەوەش، ڕێنیسانس لەپاش بەدەرکەوتن و گەشەکردنیشی نەیتوانی هزرڤانێکی مەزنی کۆمەڵناس لەهاوشێوەی ئیبن خەلدون بەرهەم بێنێت... مەگەر "میکیافیلی" لێ بەدەر بکەین، کەئەویش بەچەند قۆناغێك لەخوار ئیبن خەلدونە وەیە وەك لەپێشەکی ئەم کتێبەشدا باسمان لێوەکرد... دەشزانین کەهەموو بیرکردنەوەی ئەوروپی، لەوساتەوە کەلەسەدەی حەفتەمی بەرلەزایندا خونچەکانی لەوڵاتی ئیغریقیدا پشکوتون، تاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەیەمیتی زاینی، تیۆریکی کۆمەڵایەتی بەرهەم نەهێنا کەشان بدات لەشانی بیردۆزەکەی ئیبن خەلدون لەڕوی واقیعبینی و ڕەسەنێتی یەوە.

## لێکدانەوەی ئیف لاکۆست:

مامۆستا (ئیف لاکۆست)لەبارەی ئیبن خەلدونەوە، پەرتوکێکی هەیە و، هەوڵی داوە لەو پەرتوکەدا بەجۆرێ وێنای ئیبن خەلدون بکات و بازدانەکەی لێك بداتەوە کەلەکۆمیدیا خاڵی نیە... ئەو وادەبینێ: ئیبن خەلدون دەرەبەگ وخاوەنی زەوی وزار بووە، لەمەغریب دا ژیاوە لەسەردەمێکدا کەسیستەمی دەرەبەگایەتی لەدەرەوەی شارەکاندا لەو وڵاتەدا زۆر بەهێز بووە، هەرلەو کاتەدا ململانێی نێوان چینی دەرەبەگ وچینی بۆر ژوازی مۆرکی بنەڕەتی کۆمەڵگە بووە (لاکۆست)دەڵێ : ئیبن خەلدون لەنوسینەکانی دا دەربڕی لەخواست وتەماحە سیاسیەکانی چینەکەی خۆی کردوە، هەرئەمەشە وای لێکردوە لەسەرەتای "مقدمە" کەی دا ستایشی ئەوسەرۆك هۆزانە بکات کەوەکو خۆی دەرەبەگ بوون، لەولاشەوە سەرکۆنەی بازرگانان وئەوخاوەن پیشانە بکات کەبەرژەوەندیەکانیان ناکۆك بون لەگەڵ بەرژەوەنیەکانی چینەکەی خۆی دا. (٧)

بڕوام وایە ئەم بۆچونەی (لاکۆست)گرنگە، شایستەی ئەوەیە هەڵوێستەی لەبەرانبەردا بکەین وکەمێك بەوردی تاوتوێ وشەن وکەوی بکەین... چونکە تاکە ڕایەکە لەو جۆرە کەوای دادەنێ هاندەری ئیبن خەلدون بۆ دانانی تێورە کۆمەڵایەتیەکەی لەسەر بنەمایەکی ئابوری چینایەتی ڕاوەستاوە... بەڵام پێم وایەو ئەو بەڵگانەی کەلەم ڕایەی دا پشتی پێ بەستون بەڕادەیەك بەهێزنین کەوامان لێ بکات پشتگیریەکی تەواو لەبۆچونەکەی بکەین. ئەو یەکەمجاردەڵێت: ئیبن خەلدون زەوی وزارێکی فراوانی هەبوو لەنزیکی غەرناتەو تونس دا... ئەم وتەیەش هیچ پاساوێکی نیە لەژیاننامەی ئیبن خەلدوندا، نەئەوەی کەخۆی بۆمان دەگێڕێتەوەو نەئەوەش کە هاودەمەکانی بۆمان باس دەکەن... بۆنمونە لەکاتێکدا لەتونس دەژیاوە، ئەمان بیستوە کەبۆ گوزەرانی پشتی بەباجی ئەو زەوییانە بەستبێ کەگوایە لەوێندەر خاوەنیان بوە!. لەپەرتوکی (التعریف)داکەئیبن خەلدون لەبارەی ژیاننامەی خۆیەوە دایناوە باسی ئەوە

دەكات كە هەندێ لەباب و باپیرانی چەند پارچە زەویەكیان دەست كەوتوە لەكاتێكدا پەیوەندییان كردوەبە خزمەتی پادشاكانەوە لەتونس دا، بەلاّم ناگونجێ ئەمە بەدەرەبەگایەتی لەقەڵەم بدرێ بەو واتایەی كەلەو سەردەمەدا ئەروپا پێی ئاشنا بوو... چونكە بارودۆخی سیاسی لەتونس داو، لەوڵاتانی مەغریبی عەرەبیش دا بەشێوەیەكی گشتی، هێندە سەقامگیر نەبوو لەوكاتەدا كەیاریدەدەربێ بۆئەوەی خاوەندارێتی زەوی وزار بۆماوەیی بێت لەخێزاندا وەك لەئەوروپادا باو بوو، تەنانەت زۆرجارو بەگوێرەی ئارەزوی پادشاكان وئاڵ وگۆڕەكانی سیاسەت خاوەندارێتی زەویەكانیش دەستا ودەستی دەكرد.

ئیبن خەلدون لەكتێبی (التعریف)دا باسی ئەوەمان بۆدەكات كەلەكاتێكدا چوەتە (غەرناتە)و لەدەستەلاّت دارەكانی ئەوێ نزیك كەوتۆتەوە، سوڵتان گوندێكی لەزەویەكانی ناوچەی (مەرەجی غەرناتە)پێ داوە... بەلاّم تێبنی دەكرێ لەدوای ئەوەیئیبن خەلدون شاری (غەرناتە)ی بۆدواجار بەجێ هێلاّ بەهۆی ناكۆكی لەنێوان خۆیی و (ئیبن خەتیب) ی وەزیردا. ئیدی خاوەندارێتی ئەو گوندەش لەدەستی ئەودا نەمایەوە. بەڵكو گومان وایە درابێ بەكەسێكی تر.

(لاكۆست)دەڵێت: لەسەردەمی ئیبن خەلدوندا هۆزەكان دوو جۆر بوون: یەكەمیان لەهۆزە سەرەتاییەكان دەچوون لەڕووی یەكسانی نێوان تاكەكانی هۆزەكەو هەروەها نەبوو سەرۆكایەتیەكی زاڵ دەست بەسەریان دا... جۆری دووەمیشیان ئەوهۆزانە بوون كە مل كەچی سیستەمی دەرەبەگایەتی بوون، دیارە لەوسیستەمەش دا، سەرۆك شوێن كەوتەكانیشی دەچەوسێنێتەوەو بەسەریشیاندا زاڵ دەبێ.

(لاكۆست)دەگاتە ئەو بەرەنجامەیكە ئیبن خەلدون لە (مقدمە)كی دا باسی لەم جۆری دوەمەی هۆزەكان كردوە... (لاكۆست)لەم بەرەنجام گیریەشی دا پشت بەدەستەواژەیەك دەبەستێ كەلە (مقدمە)دا سەبارەت بە (دەمارگیری)هاتوون و ئەمیش هاتوە بەپێچەوانەی خواستی ئیبن خەلدونەوە دەستەواژەكەی شیی كردۆتەوە... دەستەواژەكە دەڵێت: ئەو مەبەستەی كەدەمارگیری بەرەوڕوی دەچێ

بریتی یەلە پادشایەتی. ئادەمیزادەکانیش بەسروشتی خۆیان لەهەموو گرد بونەوەیەکیان دا ئاتاجیان بەسەرپەرشتی کارودەستەڵاتداریێ هەیە لەنێوایاندا بێت، ئەوکەسەش پێویستە دەستەڵاتی بەسەریاندا هەبێت وبەهۆی دەمارگیریەکەوە بەسەریاندا زاڵ بێت، وەگەرنا تواناداری وی تەواوو تۆکمە نابێت، ئەوزاڵ دەستیەش بریتی یە لەپادشایەتی، دیارە ئەو مەسەلەیەش لەسەرۆکایەتی پترە... چونکە سەرۆکایەتی پلەیەکی بەرزە وخاوەنەکەی شوێن کەوتوی هەیە، لەبڕیارەکانیشی دا تۆبزی کاری نیە لەبەرانبەر دەست و پێوەندەکەی دا... بەڵام پادشایەتی بریتی یەلە زاڵ دەست بون و حوکم کردن بەزۆرکاری... خاوەنی دەمارگیریش لەکاتێکدا گەشتە ئەو پلەبەرزەو شوێن کەوتەی هەبوو بن و ڕێگەی دۆزیەوە بەرەو زاڵ دەستی وتۆبزی کاری، ئەوا هەرگیز دەست بەرداری نابێت، چونکە ئەوە پێویستە بۆ دەرون... توانا داریشی تۆکمە وتەواوی نابێت بەبێ دەمارگیریەك خۆی تیای دا شوێنکەوتوی هەبێت... کەواتە زاڵ بوونی پادشایەتی ئامانج ومەبەستی دەمارگیریە... ئەگەر بەهۆی ئەو دەمارگیریەشەوە زاڵ بوونی خۆی مسۆگەر کردبەسەر قەومەکەی خۆیدا، ئەوا پەل دەهاوێ بۆ زاڵ بون بەسەر دەمارگیریەکی تردا (دەمارگیری هۆزێکی تر)واتە هەرکە خاوەن دەسەڵاتی نێو قەومێ دەستەڵاتی بەسەر قەومەکەی خۆیدا پەیدا کرد، ئیدی پەل دەهاوێ بۆ زاڵ بوون بەسەر قەومێکی تردا —وەرگێڕ) (٩)

گومانم وایە ئیبن خەلدون لەوپەیڤەدا مەبەستی ئەوەنەبوە جیاکاری بکات لەنێوان هۆزە سەرەتایی وهۆزە دەرەبەگیەکاندا، بەڵکو مەبەستی لەوە بوە جیاوازی بکات لەنێوان سەرخێڵێکی دەشتەکی و پادشایەتی شارستانی دا... ئەوی یەکەمیان کەبریتی یەلەسەر خێڵ، شوێن کەوتەی هەن و ڕۆڵەکانی هۆزەکەی بەئارەزوی خۆیان لەدەوری کۆدەبنەوە... هەرچی دوەمیشە کەبریتی یەلەپادشا، ئەم زاڵ دەستەو خواست وئارەزووەکانی خۆی لەڕێگەی چەوساندنەوەدو تۆبزی کاریەوە بەسەر ژێردەستەکانی دا دەسەپێنێت. ئینجائیبن خەلدون بۆیە باس لەوجیاکاریە دەکات تاکو یەکێك لەجیاوازیەکانی نێوان کۆمەڵگەی بیابان و

کۆمەلگەی شارستان ڕون بکاتەوە... کەچی وادیارە (لاکۆست)کاتێ وشەی (الملك)ی خوێندۆتەوە لەوودەربڕینەدا وای زانیوە مەبەستی ئیبن خەلدون لەو وشەیە ئەو سەرۆك دەرەبەگەیە کەخاوەنداری زەوی دەکات... بەلآم لای ئیبن خەلدون ئەو وشەیە مەبەست لێی (پادشا)یە، کە ئەویش سەرۆکی دەوڵەتەو لەکاروبارەکانی دا تۆبزی بەکار دەهێنێت... ئیدی جیاوازی گەورەی نێوان ئەو دوو واتایەش ئاشکرایە وشاردراوەنیە.

بەهەرحاڵ، ئێمەنکولی ناکەین لەوەی جۆرە دەرەبەگایەتیەك هەبوبێت لەو کۆمەلگەیەدا کەئیبن خەلدون تیای دادەژیا... ئیبن خەلدون بەخۆیشی لەمێژوەکەیدا باسی ئەوەمان بۆدەکات کەپادشاکان هەندێ جار گوندو لادێ یان دەبەخشیە سەرخێل ودەمڕاستەکان لەپێناوی قایل کردنیاندا یاخود وەك پاداشت لەپێناوی کارێکدا کەئەوان پێی هەستاون... (لاکۆست) باشی کردوە کەبایەخی داوە بەم لایەنەی کۆمەلگەی مەغریبی کەتوێژەرانی دیکە فەرامۆشیان کردوە... لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە هاوڕانین لەگەڵ (لاکۆست)دالەسەر ئەو ڕایەی کەدەڵێت ئیبن خەلدون بۆیە تێورەکەی دارشتوە تاکو دەربڕلەتەماح و خواستەکانی چینی دەرەبەگ بکات. هەرکەسیش بەوردی (مقدمە)کەی ئیبن خەلدون بخوێنێتەوە شتێکی تێدا نابینێ پشتگیری ئەو ڕایە بکات... وادیارە (لاکۆست)بەجۆرێکی ڕوکەشانە هەندێ لەو دەربڕین و دەستەواژانەی خوێندۆتەوە کەلە (مقدمە)دا هاتون، سەرباری ئەوەش هاتوە شرۆڤەی ئەوودەربڕینانەی کردوە لەبەر ڕۆشنایی ئەو لێکۆلینەوەدا کەخۆی لەبارەی دێرۆکی دەرەبەگایەتی لەئەوروپادا ئەنجامی داون... پێویستە لەم ڕوەوە ئاماژەبدەینە ئەو ڕاستی یەیکەجیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان مێژووی ئەوروپاو مێژووی مەغریب دا... لەڕوی ڕەوتی زانستیشەوە ڕەوانیە بەرەنجامگیری لەسەر مێژووی کۆمەلگەیەك بکەین ودواتر هەوڵ بدەین هەمان بەرەنجامگیری بسەپێنین بەسەر دێرۆکی کۆمەلگەیەکی تردا، بەچاو پۆشین لەوجیاوازیانەی کەلەنێوان هەردوکۆمەلگەکەدا هەیە.

## لێکدانەوەی بۆتۆل :

دکتۆر (گاستۆن بۆتۆل)یەکێکە لەزانا کۆمەڵناسە فەرەنسی یەکان، ئەم زانایە سەرسامەبەئیبن خەلدون ولەهەندێ لەدانراوەکۆمەڵایەتیەکانی خۆیدا ئاماژەی داوە بە بۆچونەکانی ئیبن خەلدون. لەساڵی (١٩٣٠)دا پەڕاوێکی سەربەخۆی لەبارەی ئیبن خەلدونەوە دەکرد بەناوی (ئیبن خەلدون : فەلسەفە کۆمەڵایەتیەکەی)ئەم پەرتوکە لەلایەن مامۆستا (عادل زعیتر)ەوە کرایە عەرەبی.

ئەم پەرتوکەی (بۆتۆل)سەبارەت بەبازدانەکەی ئیبن خەلدون ڕایەگی تێدایە، بەلای منەوە ئەو ڕایە باشترین بۆچونە کەتائێستاکە بۆ شیکردنەوەی بازدانە فیکریەکەی ئیبن خەلدون پێشکەش کرابێ، تایبەتمەندی بۆتۆل ئەوەیە کەهەوڵی داوە لەنێوان ئەوبارودۆخە کۆمەڵایەتیەدا کەئیبن خەلدون تیای دا دەژیا، ئەوپاڵنەرە بدۆزێتەوە کەهانی داوە بۆ نوسینی (مقدمە).

هەرلەبەر ئەوە دەتوانین ئەو ڕەوتەی بۆتۆل لەم ڕووەوە لەسەری ڕۆشتوە، بەنێزیك ترین ڕەوت لەقەڵەم لەوەی کەئەمرۆ بە (کۆمەڵایەتی بونی زانیاری)ناوزەد دەگرێت.

پوختەی بۆچونەکەی بۆتۆل ئەمەیە: ئەو کۆمەڵگەیەی ئیبن خەلدون تیای دا دەژیا دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی تێدا زەق بوو، کەم جار ئەو دیاردەیە بەزەقی لەکۆمەڵگەیەکی دیکەدا دیتراوە، دیاردەکەش بریتی یەلەجیابونەوە یەکی ئاشکرا لەنێوان ئەو پەڕی دەشتەکێتی و ئەوپەڕی شارستانێتی دا (١٠)... ئەم جیابونەوە ئاشکرایە بویە هۆی سەرهەڵدانی بێ شیرازەیی و پاشاگەردانیەکی توندوتیژی سیاسی... ئەم بێ شیرازە ییەش وایکرد دەوڵەت و میرنشینەکان زوو بەزوو بەدوای یەکدا دەربکەون و بپوکێنەوە، لەژێر کاریگەری ئەو هێرش و شاڵاوانەدا کەلەلایەن دەشتەکیە دڕندەکانەوە دەکرانە سەر میرنشین و دەوڵەتەکان... ئیبن

خەلدون لەنێوان ئەم بارو دۆخەدا دەژیا وەهەوڵی دا میرنشینو دەستەڵاتێکی تایبەت بەخۆی دابمەزرێنێ. بۆیە چوەنێو بگرەو بەردەی سیاسەتەوەو بەشداری کرد لەپلان گێڕی وتاڵ و گۆڕەکانی دا... لەدوایدا بۆی دەرکەوت کەلەو ئارەزوەی دا سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا. بۆیە دەستی کردە وردبونەوە لە هۆکاری شکست هێنانەکەی. ئەمەش پەلکێشی کرد بۆئەوەی لەخۆی بپرسێت : دەوڵەت چۆن دادەمەزرێت؟ بنەڕەتی ماڵە پادشاکان چی یە؟ بنەماڵەی پاشازادە چۆن بنیات دەنرێ؟. (١١)

بۆتۆل دەڵێت: ئەم بێنەو بەردەو بێ شیرازەییە مەترسی دارەی بیست ساڵی خایاندو، بویە هۆی بەهەمیشەیی ماندوکردنی ئیبن خەلدون، بۆیەچویە نێو قەلایەکی بچکۆلە لەتەنیشتی (تیارت) دوە وچوار ساڵی ڕەبەق خۆی سەرقاڵ کرد بەلێکۆڵینەوەوە... هەرلەوێ دا بەشێکی گەورەی مێژودگشتی یەگەی ومقدمەشی دانا... بەشێکی زۆری (ئەودانراوەش)لەئەنجامی بیرکردنەوەو فێر بونەوە بوو لەوشکستەی دوچاری ببوو) (١٢)

(بۆتۆل)جگەلەوە، پێی وایەئیبن خەلدون خاوەنی زیرەکی یەکی ئاسایی وسادەنەبوە، بەڵکو بلیمەت بوە... تایبەتمەندی کەسی بلیمەتیش ئەوەیە کەلەبەرانبەری ئەومەسەلە ئاساییانەدا کەکەسانی ئاسایی هەستی پێ ناکەن، دوچاری سەرسام بون وپرسیار گردن دەبێت... نمونەی ئیبن خەلدون لەو ڕودوە وەك (نیوتن) وایەکە لەئەنجامی کەوتنەخوارەوەی سێفێکەوە لەتەنیشتی دا، یاسامەزنەکانی دۆزیەوە. (١٣)

## لێکدانەوەی ساطع الحصری :

مامۆستا (ساطع الحصری) لەوڕوەوە ڕایەکی هەیە کەدەکرێت بەتەواوکەری بۆچونەکەی (بۆتۆل)ی لەقەڵەم بدەین، لەهەندێ ڕویشەوە لەبۆچونەکەی ئەو بێ بایەخ ترنیە... پوختەی بۆچونەکەی (حەصری)ئەمەیە: ئیبن خەلدون لەئامێزی خێزانێکدا پێگەیشت کەگەردوخولیان بوو لەنێوان باسکداری زانستی و باسکداری سوڵتانی ودەستەڵاتداری دا... ئەم ژینگە خێزانیەش وای کرد دوو هەست و خواستی بەهێزلە ئیبن خەلدون داسەرهەڵبدات: حەزکردن لەدەستەڵات وپلەو پایە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە حەزکردن لەخوێندن وزانیاری.

(حەصری)دەڵێت: هەریەکە لەو دووخولیایە ڕەگ وریشەی قوڵ وکاریگەری توندو سەختیان هەبوو لەنێوان دڵ ودەرونی ئیبن خەلدون دا.

بۆماوەیەکی دورو درێژیش ململانێ یان بوو بۆزاڵ بوو بەسەر ناخ و دەرونی دا، هەندێ جار یەکەمیان سەردەکەوت بەسەر دوەمداو، هەندێ جاری دیکەش دووەم زاڵ دەبوو بەسەریەکەمدا، وەلێ ئەم زاڵ بونانە یەکلاکەرەوە نەبوون، بەڵکو هەریەك لەو دوو هەستە بەدرێژایی ژیانی ئیبن خەلدون کاریگەری یان لەسەر دادەنا، بەبێ ئەوەی هیچکامیان بتوانێ بەتەواوەتی ئەوی دیکەیان لەنێو بەرێت... ئەم کێشمە کێشمە ماوەیەکی دورودرێژ یەکبینە بوو، لەنێوان هەڵکێشان و داکێشان دا مابویەوە، تالەکۆتایی دا ئیبن خەلدون توانی گۆشەگیری هەڵبژێرێت ولەژیانی نێو خێڵەکی دابڕێت و، دووربکەوێتەوە لەشانۆکانی سیاسەت... لەقەڵای (ئیبن سەلامە)دا لیێ کرکەوت... دەتوانین بڵێین : لەبەر ئەوە، هەردوو خواستە ئاماژە پێکراوەکە، توانیان ئیبن خەلدون هان بدەن بۆ نوسینی (مقدمە)... حەزیپلەو پایە باڵیان پێوەنا بۆئەوەی خۆی وەرداتە نێو جەنجاڵیەکانی ژیانی سیاسەتەوە، لەولایشەوە خۆشویستنی توێژینەوەو زانست هانیان دا بۆئەوەی لەلاپەڕەکانی ئەو ژیانەورد بێتەوەو سەرنج بدات، سەرنج دانێکی تیۆری، بۆئەوە نا، بنەماو پرەنسیپی کردەیی بۆحوکم داری وسیاسەت کردنی لێ بەرهەم بێنێ، بەڵکو بۆئەوەی هەندێ پرەنسیپی گشتی لێ هەڵبچێنێ کەهاوکارو یارمەتی دەربێن بۆ ئەفراندنی زانستێکی نوێ، کەزانستی کۆمەڵناسی یە) (١٤)

## ڕێچكەی لێكدانەوە :

بەم ئەندازەیە كومسایی دەدەین، لەپێشكەش كردنی ئەو ڕاو بۆچوونانەیكەتوێژەران لەلێكدانەوەی بازدانە فیكریەكەی ئیبن خەلدوندا ئاماژەیان پێداوە... گومانیشی تێدا نیە ڕاوبۆچونی دیكەش لەگۆڕێدان كەتوێژەرانی تر هەرلەم بارەیەوە پێشكەشیان كردوە. بەلأم تێبینی دەكەین هەموو ئەو ڕایانە، هەریەكە پێداگری لەسەر تاكە هۆكارێك دەكەن لەلێكدانەوەی بازدانەفیكریەكەدا.

ئەو ڕێچكەیەی ئێمە لەلێكدانەوەكەمان دا دەیگرینە بەر لەوانی تر جیاوازە، ئێمە بڕوامان وایە ناگریَ ئەو بازدانەبەرەنجامی تاكە هۆكارێك بێت، گەروابێت ئەوا ڕو بەڕوی گرفتێك دەبینەوە هەرگیز چارەسەرەكەی هاسان نیە، گرفتەكەش ئەوەیە هەریەك لەو هۆكارانە بەجیاكاریگەری یان لەسەر كۆمەلێ هزرڤان داناوە، ئینجا كەوابێ چۆن ئیبن خەلدون لەنێو هەموو ئەو بیرمەندانەدا (كەئەو هۆكارە تایبەتە كاری تێكردون –وەرگێڕ)تاك بویەوە وتوانی ئەو بازدانە مەزنە بێنێتە كایەوە؟... بەلكو هەردەبێ هۆكار گەلێجۆراو جۆر لەسەر ئیبن خەلدون بەشێوەیەكی تایبەتی كۆبوبێتنەوەو، وایان لێكردبێ لەڕوی بیركردنەوەیەوە تایبەتمەندی هەبێت لەبیرمەندەكانی دیكە.

شیاوی ئاماژەپێدانە، ڕێچكەی لێكدانەوەی یەك دندەیی (لێكدانەوە بەگوێرەی یەك هۆكار -وەرگێڕ)تەنها لەم بوارەدا بەكار هێنانی كورت هەڵنەهێنراوە، بەلكو خەریكە دەبێتە حاڵەتێكی گشتی و خەلكی لەزۆربەی كاروبارەكاندا بەكاری دێنن... هەركە بۆنمونە ڕوداوێك دەبینین. ئیدی هەوڵ دەدەن بەگوێرەی فاكتەرێكی دیاری كراو لێكدانەوەی بۆبكەن، بەجۆرێ جگەلەو فاكتەرە، هیچ جۆرەپاڵنەرێكی تر لەپشتی ڕوداوەكەوە نابینن... لەبەر ئەوەیە

دەبینین لەزۆربەی جار دەمەقالە دەکەن وناکۆك دەبن، چونکە هەرگروپێکیان بگریت تەنها پێداگری لەسەر ئەو هۆکارە دەکات کەخۆی دەی بینێت و بڕوای پێیهەیە، هەرلایەکیشیان بگری پێیان وایە خۆی لەسەر هەقەو لەڕاکەی دا ڕاستی پێکاوە. زۆربەی جار دەمبەدەمەکەیان درێژە دەکێشێ بەبێ ئەوەی بگەنە کۆتاییەگی یەکلاکەرەوە، دەنا ئەگەر بەوردی لێخوێندنەوە بکەن بۆ هەموو ڕەگەزەکانی ڕوداوەکە، ئەوا بۆیان ڕوون دەبێتەوە کەتاڕادەیەك هەموو گروپەکان ڕاستی یان پێکاوە و ڕووداوەکەش بەرەنجامی کۆبونەوەی هۆکارە جۆربەجۆرەکانە تیایدا.

بۆڕون بونەوەی ئەو گوتەیە نمونە بەڕووداوێکی سادە دێنینەوە کەماوەیەکی دورنیە لە بەغدا ڕووی داوە، پوختەی ڕووداوەکەش ئەوەیە: کابرایەك لەیەکێك لەچاخانەکانی بەغدا دادەنیشێت، شاگردی چاخانەکە بەلای دا گوزەردەکات و بەبێ ئاگایی چەند دڵۆپێ چایی لەدەستی شاگردەکەوە دەپژێت و بەرجل وپۆشاکی کابرا دەکەوێت، کابرا زۆر توڕەدەبێت، پاش بگرە وبەردە، وهەندێ شەڕە جنێو، پیاوەکە خەنجەرەکەی لەبەرگەمەری دەردێنێت وشاگردەکە خەڵتانی خوێن دەکات.

خەلکی لەم ڕوداوە زۆر سەریان سوڕماو دەستیان کردە مشت ومڕ و مقۆ مقۆ و دەیان پرسی: چۆن دەگونجێت چەند دڵۆپەچایەك ببێتە هۆی ئەوکارە تۆقێنەرو دزێوە؟ ئیدی هەرگروپێکی ئەو خەڵکە لێکدانەوەیەکیان بۆ ئەوڕوداوە دەکرد کەبەلای خۆیانەوە ماقوڵ بوو، لەکۆتایش دا دەمبەدەمەکەیان بەرەنجامێکی یەکلاکەرەوەی لێ نەدەکەوتەوە. لەڕاستیش دا چەند دڵۆپێکی چایی بەتەنها بەس نیە بۆئەوەی ببێتە هۆی کرداری کوشتن، چونکە لەخودی خۆی دا ئەو هۆکارە گەڵێ بێ ئەرزش وپوچە، بەڵام لەکاتێکدا گرنگی یەکی زۆر پەیدا دەکات، کەلەگەڵ ئەو هۆکارانەی تردا کۆی دەکەینەوە کەکاریگەری یان لەسەر دەرونی ئەو پیاوە داناوە لەکاتێکدا پرکێشی کردوە بۆ کوشتنی شاگردەکە.

ڕەنگە ئەوپیاوە بەرلەوەی هاتبێ بۆنەوچاخانەیە، شەڕێکی گەورەی کردبێ لەگەڵ هاوسەرەکەیدایاخود لەگەڵ دایکی دا لەماڵەوە، کاتێکیش هاتۆتە سەرجادە لوتی تەقیوە بەلوتی یەکێك لەوکەسانەوە کەقەرزیان پێداوەو هەندێ جنێوی مزری ناراستەکراوە (دەربڕینی وەرگێڕ)، پاش کەمێکی ترلەوانەیە هەواڵێکی ناخۆش وبێزارکەری پێ گەشتبێ و بەتەواوی توڕەی کردبێ، لەوانەیە بەرلەوەی هاتبێتە نێو چاخانەکەوە هەموو ئەو هۆکارانەو هۆکاری تریش لەسەر دڵ و دەرونی ئەو پیاوە کۆبوبێتنەوە، لەناوا پارێکیش دا، خرۆشاندنێکی کەم، بەسە بۆنەوەی بتەقێتەوەو خنجێرەکەی هەڵکێشێت.

لەوبارەش دا کابرا ناتوانێ خنجێرەکەی بخاتەوە نێو کێلانەکەی، بەبێ ئەوەی خوێنێکی پێ ڕشتبێ، چونکە دەترسێ لەوەی ئامادەبوان بەترسنۆکی لەقەڵەم بدەن، کەواتە ناچارە ئەبێ خنجێرەکەی لەورگی شاگردەکەدا نقوم بکات، ڕێکەوت و چارەنوسی خراپیشی وادێنەوە خنجێرەکە بەر جێگەیەکی کوشندەی شاگردەکە دەکەوێت.

بەونمونە سادەیە، دەتوانین پەی بەرین بەوەی چۆن چۆنی هۆکارە جیا جیاکان کۆدەبنەوەو لەنێوانی خۆیاندا کارلێك دەکەن وڕوداوێکی دیاریکراویان لێ پەیدا دەبێت. لەڕاستیش دا هەموو ڕوداوەگەورەکانی مێژوو، لەم ڕووەوە هیچ جیاوازیەکیان نیە لەو ڕوداوەی کەلەچاخانەیەکی بەغدادا ڕوی دا... چونکە ئەو ڕوداوەگەورانەش هۆکار گەلێ جۆراو جۆر لەبەرهەم هێنانیان دا کۆدەبنەوە، دواتر پاڵنەرێکی بێبایەخ دێتەکایەوە، واتە ئەوڕوداوە دێتەئارا کەمێژوو نوسەکان بە (هۆکاری ڕاستەو خۆ)ناوزەدی دەکەن و، ئەو ڕوداوە وەك پزیسك بۆباروت وایە، یاخود وەك ئەو دەرزیە وایەکە دەچێت بەدومەڵێك داو دەی تەقێنێت (دەربڕینی وەرگێڕ). ئینجا بەهۆی ئەو هۆکارە ڕاستەو خۆیەوە، ڕوداوە مەزنەکە وەکوتەقینەوە دێتە پێشەوە. (١٥)

دەکرێت بڵێین : ئەو بیردۆزە بەناوبانگانەش کەداهێنەرە مەزنەکان هێناویانەتە کایەوە، هیچ نین جگەلەرِوداوێکی بەم شێوەیە... کەسێ رِوکەشانە سەرنج بدات وادەزانێ بیردۆزە بەناوبانگەکە لەهزری داهێنەرەکەی دا لەئەنجامی بیرکردنەوەی ئەبستراکتدا گەلاڵە بوە.بەلاّم گەربێت ولەناخی ئەو داهێنەرە بکۆڵینەوە لەماوەکانی پێش ئەفراندنی بیردۆزەکەی دا، دەبینین وەکو گۆرِەپانێکی جەنجاڵ وابوەو هۆکار گەلێجۆراوجۆر تیای دا کارلێکیان کردوە... لەئامادەباشی و چاوەروانی هاندەرێکی گچکە، یاخود هۆکارێکی راستەو خۆدا بوە، تاکو لەسەرەرِێگەی ئەفراندندا بەشێوەیەکی کت وپر بکەوێتە جوڵەو دەرپەرِێ.

بەبۆچونی من، ئیبن خەلدون لەکاتێکدا بیردۆزە کۆمەڵایەتیەمەزنەکەیی داهێناوە، لەم رێسایە ڕیزپەرِنەبوە... کەواتە هەڵە دەکەین ئەگەر لەلێکدانەوەی بازدانەکەی دا چاو ببرِێتە تاکە هۆکارێك و پێداگری لەسەر بکەین وکومسایی پێ بدەین... لەبەشەکانی داهاتوشدا راستی ئەم پەیڤە بەشێوەیەکی بەردرێژتر دەبینین.

## پەراوێزەکانی بەشی شەشەم

١) لەبەر ڕەچاو کردنی ئاسانی دەربڕین لە زمانی کوردی دا هەندێ دەسکاری ئەو ناونیشانەم کرد لەڕووی فۆرمی ووشەکانەوە، لەگەڵ ڕەچاوکردنی مانەوەی دەقاو دەقی ماناکان.... وەرگێڕ.

2) Ourvitch & Moore ،Twentieth Century Sociology، (N.Y.1954) ،p 371.

٣) طه حسين، فلسفة ابن خلدون الأجتماعية، ل ٥٦.

٤) ه س، ل ٥٦ — ٧٥.

5) N. Schmidt ،Ibn khaldun، (N.Y.1930) ،P.41.

٦) لەم سەرچاوەیەوە گواستراوەتەوە: ئیف لاکوست، ابن خلدون، واضع علم ومقرر استقلال، (ترجمه زهير فتح الله)، بيروت ١٩٥٨، ل ٩٩.

٧) ه س، ل ٣١، ٧٤.

٨) عبدالرحمن بن خلدون، التعريف بأبن خلدون ورحلته غربا وشرقا، (قاهيره ١٩٥١)، ل ٨٥.

٩) بنوارە: مقدمه ابن خلدون، (گبعه لجنه البيان العربى)، ل ٤٣٩ — ٤٤٠، هەروەها : لاكوست، ابن خلدون، ه س، ل ٦٤.

١٠) گاستۆن بۆتۆل، ابن خلدون، فلسفته الأجتماعية، (ترجمه عادل زعيتر)، قاهيره (١٩٥٥)، ل ٤٠.

١١) ه س، ل ١٥.

١٢) ه س، ل ١٨.

١٣) ه س، ل ٣٧.

١٤) ساطع الحصرى، دراسات عن مقدمه ابن خلدون، ل ٤٩ — ٥١.

١٥) بۆ ڕون بونەوەی مەبەست دەکرێ داگیر کردنی ولاتی جەزائیر لەلایەن فەرەنسیەکانەوە بەنمونە وەربگرین، فەرەنسیەکان لەوکاتەدا کەدەیانویست جەزائیر داگیربکەن دەستیان کردە بیانوو گرتن بەدای (دەستەلاتداری ئەو دەمەی جەزائیر بە دای ناودێر دەکرا)پەیوەندیەکانیان گەشتە سنوری بچڕان، کەچی هاتن ڕوداوێکی بێ ئەرزشی وەکو (ڕووداوی باوەشێنەکە)یان کردە دەست پێچکە بۆداگیرکردنی جەزائیر. ڕوداوی باوەشێنەکە، بریتی بوو لەو ڕوداوە ناسراوەی کەلەسالی (١٨٢٧زاینی)دا لەنێوان (دای)و کۆنسولی فەرەنسی (دۆفال)دا ڕویدا. ئەوە بوو دای بە باوەشێنەکەی دۆفالی کردە دەردوە.فەرەنسیەکان ئەم ڕوداوەیان کردەبیانویەك بۆ داگیرکردنی جەزائیر لە (٥/ ٧ / ١٨٣٠)دا... بۆ زیاتر شارەزایی بنوارەکتێبی: جەزائیر : دوێنێ و ئەمڕۆ و تیشکێك لەسەر قەسابخانەکان، نوسینی وەرگێڕی ئەم پەرتوکە، چاپی ١٩٩٨ سلێمانی... وەرگێڕ.

# بەشی حەوتەم

## هۆکارە هەمەچەشنـــەکان

لەم بەشەدا باس لەو فاکتەرە هەمە چەشنانە دەکەین کەپشکداربوون لەپێکهێنانی بیردۆزەکەی ئیبن خەلدوندا، هەرچەندە پێویستە هەرلەسەرەتاوە ئاماژە بدەین بەوەی کەئێمە پڕوپاگەندەی ئەوەناکەین گوایە توانیبێتمان هەموو ئەو هۆکارانە بەوردەکاریەکانیەوە بتوێژینەوە، چونکە ئەمەیان مەسەلەیەکە ئێمە ومانان وزەو بڕستی ئەوەمان نیە، تەنانەت ڕەنگە هەندێ هۆکارمان لەبیر چوبێت وپێدەچێت لەوهۆکارانەش گرنگترین کەئێمە ئاماژەمان پێداون... یاخود تێبینی دەکرێ هەندێ لەو هۆکارانەی ئاماژەیان پێ دەدەین لەبەردا توێژەرانی دیکەش باسیان لێوە کردون... وەلێ ئێمە لەڕونکردنەوەی ئەوکاریگەریەداکەلەسەر ئیبن خەلدونیداناوە لەو توێژەرانە جیادەبینەوە. ئێمە (وەك لەبەشی ڕابردوشدا گوتمان)هیچ کاریگەریەك بۆتاکە هۆکارێك نابینین لە پێکهێنانی تیۆرێك دا، ئەگەر ئەو هۆکارە لەگەڵ تۆقێ هۆکاری دیکەدا کارلێك نەکات.

### هۆکاری یەکەم:

کاتێ ژیاننامەی (ئیبن خەلدون)دەخوێنینەوە، بەگوێرەی ئەوەی خۆی لەکتێبی (التعریف)دانوسیویەتی، بەئاشکرا هەست دەکەین ئەو پیاوە لەژێرکاریگەری دوو حەزونەزعەی بەهێز وهاودژ دابوە: ئەو دووهەستەش وەك مامۆستا (ساتع الحصری)دەڵێت بریتی بوون لە: ئارەزوکردنیپلەو پایەو دەستەڵات لەلایەکەوە، هەروەها ئارەزوکردنیخوێندن و زانیاریش لەلایەکی ترەوە. (١)ئیبن خەلدون

لەدەست پێکی ژیانی داوەك قوتابیەکانی فیقهی هاوچەرخی خۆی دەستی کردە خوێندنی (فیقه وزانستەکانی تری تایبەت بەفیقه)، کەس وکارەکەی واچاوەڕوانیان دەکرد وەك هاوڕێ کانی لەئەنجامی خوێندنەکەی دا شەرعناس (فقیه)ێکی لێ دەرچێت... بەڵام ئەوە بوو هەرکە خەریك بوو تەمەنی بگاتە هەژدەساڵان، چوە بواری ڕاژەی میریەوەو وەك نوسەرێکی سادەدامەزرا، دواتر پەیتا پەیتا کەوتە نێو بگردو بەردەی سیاسەتەوەو پادشا لەدوای پادشا هاتن وچوون وئەم هەر لەخزمەت کردندا بوو"دەربڕینی وەرگێڕ".

تاکو جارێکیان گەشتە بەرزترین پۆستی دەوڵەت کەبریتی بوولە (پۆستی حجابە)ی میری دەڤەری (بجایە)... وەلێ لەم کاتەشدا هەرنەی دەتوانی دەست بەرداری هەستی دوەمی نێو ناخی بێت، واتە هەستی حەزکردن لەخوێندن وزانیاری...ئەوەتا خۆی باسی ئەوکاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە لەپۆستی (حجابە)دا بوە و دەلێ سەرلەبەیانی لەخزمەتی پادشادا بوە دواتر چوە بۆ مزگەوتی (ئەلقەسەبە)وبەدرێژایی ڕۆژ سەرقاڵی وانە وتنەوەبوە. (٢)ئینجا بەڕاستی شتێکی سەیرە، شالیارێك ببینین سەرلەبەیانی لەخزمەتی پادشادابێت لەنێو کۆشك داو، دوانیوەڕۆشی بە وانە وتنەوەوە لەمزگەوتدا بەسەر بەرێ.

لەم ژیاننامە دوالیزمییەی (ئیبن خەلدون) دا شتێکی دیکە هەست پێ دەکەین، ئەوشتەش ئەوەیە هەرکاتێ خەریك بوە ماوەیەك بەسیاسەتەوە سەرقاڵ بێت وتیای دا ڕۆبچێت دەست بەجێ هەوڵی داوە لێی دورکەوێتەوەو خووبدات بەخوێندن وزانیاری وەرگرتن، پاشان دەگەڕایەوەوسەربەزمی سیاسەت ودوبارە وازی لێ دەهێنایەوە... من ئەو جارانەم ژماردوەکەئیبن خەلدون ئەکارەی بەوشێوەیەکردوە، بینیم دەگاتە نزیکەی حەوت جار. کەواتە ئەوە چ مانایەکی هەیە؟ مانای ئەوەیە ئیبن خەلدون ئالودەی ململانێ یەکی دەرونی قوڵ بوەو نەی توانیوە لێی دەرباز بێت... ئەو هەرکام لەسیاسەت و زانستیشی پێ خۆش بوو، لەهەرکامیاندا چێژێکی تایبەتی دەبینی، بۆیە هەرکات بۆماوەیەك سەرقاڵی

یەکێك لەو دوو حەزدی بوبێت، هەستی بەرەولای حەزەکەی تریان پەلکێشی کردووەو ناچار گەڕاوەتەوە سەری.

بۆوەی لەو ململانێ دەرونیەی نێو ناخی (ئیبن خەلدون)تێ بگەین، پێویستە لەوجیاوازی و ناکۆکیە بکۆڵینەوەکەلەو سەردەمەدا لەنێوان (زانست)و (سیاسەت)دا هەبوو... ڕەنگە ئێمە جیاوازی بەو شێوەیە لەم سەردەمەماندا لەنێوان ئەو دووەدا نەبینین.

چونکە هەنوکە (زانست وسیاسەت)لەسەر بنەمای یەك لۆژیك ڕێ دەکەن... پیاو کاتێ لەئەرکێکی زانستی یەوە دەگوێزرێتەوە بۆلەئەستۆ گرتنی ئەرکێکی ڕامیاری یاخود ئیداری، جیاوازی یەکی گەورەبەدی ناکات، بەڵکو هەوڵ دەدات ئەوەی خوێندویەتی، لەو بوارە نوێ یەدا پراکتیزەی بکات کەبۆی گوازراوەتەوە. ئێمە ڕاستی ئەم قسەیەمان لەزۆرێك لەوماموٚستایانەدا بەدی کردووەکە دەوڵەت لە وڵاتە شارستانی و باڵاکاندا بۆهەندێ ئەرکی گەورە پشتیان پێ دەبەستێ. وەلێ لەسەردەمیئیبن خەلدوندا مەسەلەکەتەواو پێچەوانە بووە... لەبەشەکانی ڕابردوی ئەم پەرتوکەدا بۆمان ڕوون بویەوە کەچۆن زانست لەکۆن دا لەسەربنەماوڕێساکانی لۆژیکی فۆرمی ڕێی دەکرد، هەمیشە سەرقاڵی کۆبەرەنجامە ئەقڵی یەکان بوو، بڕیارەکانی لەوکۆبەرەنجامە ئەبستراکتیکی یانەوە هەڵدەگۆزی... کەچی هەرلەو سەردەمەدا سیاسەت لەسەر بنەمای لۆژیکێکی دیکە بەڕێوە دەچوو.

ئیبن خەلدون خۆیشیلەبەشێکی (مقدمە)کەی دا کەناوی ناوە (سەبارەت بەوەی زانایانی نێو ئادەمیزاد دورترین کەسانێکن لەسیاسەت و ڕێبازەکانیەوە)ئامازەی بەوڕاستی یە کردوە...ئەو بەم شێوەیە مەرامەکەی خۆی شرۆڤە دەکات ودەڵێت: (زاناکان مەسەلەکان بەگوێردی ئەو پێوانەکاریە فیقهەیە دەپێون کەخۆیان لەسەری ڕاهاتون، هەندێ کۆبەرەنجامی گشتی یان لەمێشکی خۆیاندا دابڕیوە کەبەهیچ جۆرێ لەتەك بویەردا وێك نایەنەوە. بۆیە بەزۆری

دەگەونە هەڵەوە کاتێ سەرنجی سیاسەت بدەن... سیاسەت پێویستی بەڕەچاوکردنی واقیع هەیە، ئاتاجی بەوەیە هەرشتێ بەگوێرەی خۆی و بەپێی گونجان سەرنجی لێ بدرێ وبڕیاری لەبارەوە بدرێ، دیارە ئەمەش پێچەوانەی ئەوەیە کەزاناکان دەیکەن)"دەربڕینی وەرگێڕ" (٣)ئەگەری ئەو زۆرە ئیبن خەلدون ئەوجیاکاریەی نێوان لۆژیکی سیاسەت ولۆژیکی زانستی لەو ئەزمونە تایبەتەوە هێنابێ کەلە هەرتکە بوارەکەدا هەیبوو... ئینجا دوریش نیە گەر دوچاری ململانێی دەرونی بوبێت بەهۆی ئەوەوەکە حەزی لەهەردوو بوارەکە کردوە.

## هۆکاری دووەم:

ئیبن خەلدون سەر بەبنەماڵەیەکی عەرەبی دێرین و خاوەن مێژوی ناسراوە... بنەماڵەکەی لەگەڵ عەرەبە فەتح کارەکان دا لەسەدەی یەکەمی کۆچیدا هاتونەتە ئەندەلوس، لەسەدەی چوارەمی زاینی دا پیاوێکی ئەو بنەماڵەیە کەناوی (کریب)دەبێ و یەکێك دەبێ لەرێش سپی یەکانی بنەماڵەکە، دەتوانێ دەست بەسەر (اشبیلیە)دابگرێت وکۆشکێکی تێدا بنیات بنێت. کاتێکیش هۆزی (عباد)فەرمانداری (اشبیلیە)یان گرتە دەست لەسەدەی پێنجەم دا، هەندێ کەس لەهۆزی خەلدون پۆستی وەزاری یان گرتەدەست...کەلە سەدەی حەوتەمیش دا دیانەکان لەشارەکە نێزیك بونەوە، بنەماڵەی خەلدون بەرەو ئەفریقا ئاوارەبون ولەوێ پێوەندی یان کردبە کۆشکی (بنی حفص)ەوە لەتونس دا. (٤)شتێ کەلەو بنەماڵەیەدا سەرنج ڕادەکێشێت ئەوەیە، لەکاتێکدا کەسانێکی لەبواری سیاسەتدا بەرهەم دەهێنا، لەهەمان کاتدا کەسانێکی لەبواری زانستیش دا بەرهەم دەهێنا... ئیبن حەییان لەوەسفی ئەوبنەماڵەیەدا دەڵێت: (لەنێوان سەرداریێتی سوڵتانی و سەرداریێتی زانستی دا گەردو خولیان بوو "دەربڕینی وەرگێڕ). (٥)

ئەم گەردو خولەشیان بەتایبەت لەو ڕۆژگارەدا تێدا ڕەنگ دەداتەوە کەدەکەوێتە پێش لەدایك بوونی ئیبن خەلدونی هاوڕێمانەوە، باپیری ئیبن خەلدون کەسێکی سیاسەت مەدار بوەو پۆستێکی باڵایشی بەدەستەوە بووە لەدەوڵەتی تونس دا، دواتر ولەکۆتا ڕۆژگارەکانی تەمەنی داوازی لەسیاسەت هێنا و دەستی گردە پابەند بوون بەکۆڕو جڤاتەکانی شەرعناسی بەناو بانگ (ئەبی عەبدوڵای زوبەیدی)یەوە. کاتێکیش باپیرە مرد، کوڕەکەی (کەباوکی (ئیبن خەلدون)دەکات "وەرگێڕ" لەنێو کۆڕو حوجرەکەی (ئەبی عەبدوڵا)دا پێگەیشت، شەرعناسێکی لێ دەرچوو لەنێو زانستە شەرعیەکاندا ڕۆ چوو بوو... ئیبن خەلدون لەوەسفی بابی دا دەڵێت: (لەڕێگەی شمشێرو خزمەتگوزاری، لایدا بۆڕێگەی زانیاری و پەیوەستەگی) (٦)

بابیشی بەو (تاعون)ە گەورەیە مرد کەلەو ڕۆژگارەدا دنیای گرتبویەوە. هەربەو پەتایە، زۆرێك لەمامۆستاو کەس وکاری (ئیبن خەلدون)مردن، لەئەنجامدا (ئیبن خەلدون)تاك بویەوە وتەمەنیشی لەوکاتەدا هێشتر هەژدە ساڵان بوو، لەئاکامدا ویستی پەیوەندی بکات بەدەوڵەتەکەی (بنی مرین)دوە لەمەغریبی دوور. وەلێ محەمەدی براگەورەی، ڕێگری ئەوکارەی لێکرد. (٧)ئەم برایە وەکو باوکی خۆی لەسیاسەت بەدوردەگرت، جگەلەو، ئیبن خەلدون برایەکی دیکەی هەبوو ناوی (یەحیا)بوو، ئەم برایەی سەری لەسیاسەت گردنەوە فاڵ بوو، جارێکیشیان پلەی وەزارەتی وەرگرت. (٨)

لەمەوە بۆمان ڕون دەبێتەوە کە (ئیبن خەلدون) لەنێو بنەماڵەیەکدا پێگەشتوە، کەهەم سەریان لەسیاسەت دەرچوەو هەم سەریشیان لەزانیاری دەرچوە (دەربڕینی وەرگێڕ)... کەواتە مامۆستا (ساتع الحصری)ڕاستی گوتوە کەدەڵێت: ئیبن خەلدون ئەم دوو حەزو خولیایەی لەباوان وبنەماڵەکەیەوە بۆماوەتەوە. (٩)هەرلەم دوو خولیایەشەوە ئەو ململانێ قوڵە دەرونیە پەیدا بو

کەوەك لەبەردا دیتمان، هەندێ جار ئاوقەی (ئیبن خەلدون) دەبوو، ژیانی لێ تاڵ دەکردو بیرکردنەوەش لێ دەشێواند.

## هۆکاری سێ یەم:

نەژادی بنەماڵەی (خەلدون)دەگەڕێتەوە سەرکابرایەکی سەحابی کەناوی (وائیل کوڕی حجر)ە، ئەم (وائیله)خەلکیدەقەری (حەزرەمۆت)ە و لەدوای ڕزگار کردنی مەککە نێرداراوە تەلای پێغەمبەر (د.خ)وئەویش ڕێزی لێگرت، دواتر معاویەی کوڕی ئەبو سوفیانی لەگەڵدا نارد تاکو بچێتە (حەزرەمۆت)وپێکەوە ئەرکی فێرکردنی قورئان و بلأوکردنەوەی ئیسلام لەئەستۆ بگرن، وادیارە ئەم هاوڕێ یەتیەی (وائیل ومعاویه)تاکو کۆتایی بەردەوام بووە. وائیل تاکو سەردەمی خەلافەتەکەی معاویه ژیاو یەکێك بوو لەوکەسەناسراوانەی کەدڵسۆزو دەمارگیر بوون بۆمعاویە... کاتێکیش ڕوداوە بەناوبانگەکەی (حجری کوڕی عدی)ڕوی دا، وائیل یەکێك بوو لەوانەی شان بەشانی معاویه بەشدار بوون لەو ڕوداوەدا.

جێی خۆیەتی لێرەدا بەکورتی باسێکی ئەم ڕوداوەی (حجر)بکەین... حجر یەکێك بوو لەپێرەوکارانی عەلی لەدژی معاویە.لەپاش مردنی عەلیش لەسەرهەمان ڕێباز مایەوە تائەوە بوو لەگەڵ (زیاد)ی فەرمانداری (معاویه)لەسەر (کوفە)دا پێك هەڵپڕژان... زیاد زۆر لێی تورە بوو، بەکۆت گراوی لەگەڵ گروپێکدا ڕەوانەی لای معاویەی کردن لەشام، ئەوکۆمەڵە کۆت کراوە لەژێر چاودێری وپاسەوانی دوو پیاودا ڕەوانە کران، کەیەکێکیان ئەم (وائیل)ەی باپیری بنەماڵەی خەلدونیەکان بوو... لەنزیك شامدا، حجر وهاوڕێکانی کوژران لەدوای ئەوەی سەرپشك کران لەنێوان جنێودان بەعەلی کوڕی ئەبی تالب وکوشتن دا... ئەم کێشەیە دەنگۆیەکی بەرفراوانی هەبوولەنێو موسوڵمانانی ئەو دەمەدا، عائیشەخان وزۆرێك لەشەرعناس وپێشەواکانی دین بەهۆی ئەو کێشەیەوە ئازاریان چەشت، لەدوایش دابویە یەکێك لەوخراپەکاریانەی معاویە کەلێبوردنی بۆنەبوو. (١٠)

ئێمە بەدوری ناگرین ئەو کێشەیە لەهزری ئیبن خەلدوندا چەردەیەك سەرسامی بەجێ هێشتبێ، تەنانەت لەمێژووەکەی دا لەو کێشەیەی کۆڵیوەتەوەو لەوبارەیەوە نوسیویەتی... کاتێ ئەو نوسینەی ئیبن خەلدون دەخوێنینەوە، دەبینین هەوڵ دەدات بەهەڵەکار وێنای (حجر)بکات و (زیادو معاویە)ش بەوەپێناس بکات گوایە لەکردەوەکەیاندا ڕاستی پێکاوە.

ئیبن خەلدونیش وەك هەرکەسێکی تر لەڕۆڵەی بنەماڵە دێرینەکان لەوسەردەمەدا، ناتوانێت لەدەمارگیری بۆکەلەپوری بنەماڵەکەی و باب وباپیرانی کەم تازۆرێ خۆی داڕنێ... ئەو هەست بکات یاخود هەست نەکات، هەرپەیوەستە بەوەی مێژو لەبارەی دێرۆکی باب وباپیرانیەوە دەیگوازێتەوە... زۆر گرانیشە لەسەری گەر نکولی بکات لەو مێژوە، ئیدی مێژووەکە باش بێت یان خراپ، بەڵام لەلایەکی دیکەشەوە، ئیبن خەلدون شەرعناسێکی بەدینەو پێویستە بچێتە ژێر کاریگەری ئەو ئاراستەکاریانەوە کەئاین نیگا بەخشیانە، وەك دەست گرتن بەنمونە باڵاکان و دورکەوتنەوەو دەست کۆتاکردن لەکوشتن و دەست درێژی کردنی بەناهەق.

لێرەدا ئەوەی شیاوی ئاماژەپێدانە، ئەوەیەکێشەکەی (حجری کوڕی عدی)بەتەنهاو بەدابڕاوی لەو بارودۆخە کۆمەڵایەتیەی کەدەوری دابوو سەیرناگرێت... بەڵکو لەڕاستی دا ڕووداوێکە لەو ڕوداوانەی کەشان بەشانی ململانێ کەی نێوان عەلی و معاویە هاتنە ئاراوە... دیارە ئەو کێشەو ململانێ یەش کاریگەریەکی گەورەی دانالەسەر بیرکردنەوەی ئیسلامی، بەجۆرێ تائەمڕۆکەش ئەو کاریگەریە ئامادەگی هەیە... هەرچی عەلی بوو، نمایش کاری پەیگریەکی تەواو بوو بەنمونە ئاینی یەکانەوە بەچاو پۆشین لەو فرۆفێڵ بازی و مل کەچ بازیەی کەسیاسەت ئەیخوازێ... معاویەش تەواو پێچەوانە بوو... ئەمەش دیارترین هۆکاری شکست هێنانی عەلی و سەرکەوتنی معاویە بوو (١١)کەواتە لەهەمبەری ئەو هاوکێشەیەدا هزرڤانانی موسوڵمان ئەبێ چ بکەن؟؟

ئەوان دەبینن ئایدیالیستی بونیی ئاینی خاوەنەکەی بەرەو شکست پەلکێش دەکات، لەبەرانبەریش دا واقیع بینی یەکی سیاسیش خاوەنەکەی بەرەو سەرکەوتن دەبات... بەشێوەیەکی گشتی گرفتی ئیسلامیش لەوەدایە کەلەهەمان کاتدا ئاینیشەو دەوڵەتیشە.

ئێمە لەکاتێکدا (مقدمە)کەی ئیبن خەلدون دەخوێنینەوە، هەوڵ وکۆششێکی یەکبینەی تێدا دەبینین بۆچارەسەرکردنی ئەو گرفتە... تێبینی دەکەین لەکاتی ئەم هەوڵدانەی دا، لەلایەکەوە نەیتوانیوە ئەوە لەیاد بکات کەخۆی شەرعناسێکە، یاخود لەلایەکی تردوە، ئەوە لەیاد بکات کەپیاوی دەوڵەتەو لەبنەماڵەیەکیشە کەڕاژەی معاویەو دەوڵەتی ئەمەوی کردوە.

## هۆکاری چوارەم :

لەپەرتوکی (التعریف)دا ئیبن خەلدون باس لەو زاناو وێژەوانانە دەکات کەلە سەرەتای تەمەنیەوە لەلایان قوتابی بوە، لەو باسکردنەوە ئەوە دەخوێنینەوە کەلە نێو ئەوماموٚستا یانەدا دووکەس کاریگەریان لەسەر داناوە، (یەکەمیان عەبدول موهەیمەن ودوەمیشیان محەمەد کوڕی ئیبراهیمی ئابیلی)ن(١٢)

کاتێکیش لەژیانی ئەو دوو پیاوە دەکۆڵینەوە، دەبینین زۆر پێچەوانە بوون بەیەکتری وهەریەکەیان لەسەر مۆدێلێکی جیاواز بوون... ئەوەتا (عەبدول موهەیمن) وەکوئیبن خەلدون خۆی باسی دەکات، پێشەوای فەرمودە ناسەکان بوە لەمەغریب دا... ئیبن خەلدون ماوەیەك لەگەڵ ئەو پیاوەدا بودو چ وەك گوێ لێ بون وچ وەك لێ وەرگرتن، پەرتوکەگەورەکانی وەکو (صحاح الست)وپەرتوکی ()لموتا)و... هتدی لێ وەرگرتوە. (١٣)

(ئابیلی)ش... ئیبن خەلدون بە (پیری زانستە ئەقلیەکان)ناوی دەبات..... ئیبن خەلدون لەمەوە لۆژیك و هونەرەکانی فەلسەفەی وەرگرتوە، لەڕاستیش دا ئەم پیاوە خاوەنی کەسایەتیەکی نامۆو تەم ومژدارە، بۆیە پێویستە لەسەرمان

لەئاقاریدا کەمێ هەڵوێسته بکەین ولەدوی هەندێ لەخەسڵەتەخەفەکانی نێو کەسایەتی ئەو پیاوە بگەڕێین وڕادەی ئەو کاریگەریە پەی پێ بەرین کەلەسەر ئیبن خەلدونی داناوە.

مامۆستا (ژاك بیرك)دەڵێت: ئەم ئابیلیە ڕوخسارێکی نامۆیە، مامۆستایەکی گەڕیدەیە کەهەرجار ناجارێك ئاماژەیەکی (شزوزی فیکری)نیشان دەدات کەبریتی یەلە قوڵ بونەوە لەژمێرەو شەرع وهەروەها لەکۆشش کاری سۆفیش دا... لەهەمان کاتیشدا نەزعەیەکی ئەقڵی ئازادیشی هەبوە لەشۆڕش کردنیدا دژبەو مل کەج بوونە فیکریەی کەلەو سەردەمەدا لەناو دامەزراوە زانستی یەکاندا باوو بڵاو بوو، ئەوێ دەمێ پەڕاوگەلێ سەبارەت بە لێکدانەوەو شرۆڤەو پەراوێزدانان کەڵەکە ببوون، وەك خۆراکی بۆگەن کردوو بوون دژبە بیر. (١٤)ئەوەی لەم پیاوە نامۆدا سەرنج ڕادەکێشێت، ئەوەیەکەسەرقاڵی زانستە ئەقڵیەکان بوو لەکاتێکدا شەپۆلێکی دژبەو زانستانە لەمەغریب دازاڵ بوو، تەنانەت خەڵکی ئەو زانستانەیان بەزەندەقیەت داوەنا وەك لەبەشێکی داهاتو تردا باسی دەکەین... جگەلەوەش شتێکی تر کەپتر تەم ومژ لە دەوری ئەم پیاوە دروست دەکات، ئەوەیە کەپەیوەندی بەشیعەوە هەبووە، ئەم پیاوە بوو مەغریبی یەکانی ناساند بە (خواجە نصرالدینی توسی)فەیلەسوفی ناسراوی شیعە لەڕۆژ هەڵات دا.

وادیارە ئابیلی خاوەنی نەزعەیەکی شیعەگەرا بووە، بەڵام ئەو هەستەی دەشاردەوەو توقیەی دەکرد بەگوێرەی ڕێچکەی (توقیە)ی شیعەکان، ئەوەی ئەم بۆچونەش پشت ڕاست دەکاتەوە، چیرۆکێکە کەئیبن خەلدون لەپەرتوکی (التعریف)داسەبارەت بەمامۆستاکەی دەیگێڕێتەوە.

پوختەی بەسەرهاتەکەش بەم شێوەیە : لەو ڕۆژگارەدا ڕێبەرێکی عەلەوی خەڵکی کەربەلا هاتۆتە مەغریب بەمەبەستی بڵاوکردنەوەی پروپاگەندە بۆخۆی لەو دەڤەرەدا. ئابیلی پێوەندی بەو کابرایەوە کردو خووی بەهاورێ یەتی

کردنیەوە گرت. کاتێکیش ڕێبەرە عەلەویەکە لە (مەغریب) بێ ئومێد دەبێت ودەیەوێت بگەڕێتەوە بۆکەربەلا، ئابیلی یەکێك دەبێت لە دەست وپێوەندوهەڤاڵەکانی.

ئابیلی باسی ئەوە بۆ ئیبن خەلدونی قوتابیی دەگێڕێتەوە کەچی بەسەرهاتوە لەکاتێکدا سواری دەریا بوەلە تونسەوە بۆ ئەسکەندەریە بەهاوڕێیەتی کابرا عەلەویەکە... ئابیلی بەم جۆرە باسی سەفەرەکەی دەکات : بەشەودا زۆر شەیتانی دەبوم، بۆیە زۆرم شەرم دەکرد لە هاوڕێ عەلەویەکەم لەبەرانبەر ئەو هەموو خۆشتنەدا. برادەرەکان ئامۆژگاری یان کردم کافور بخۆمەوە... هەروەها باسی ئەوە دەکات کەگوایە کافورەکەی خواردۆتەوەو بەو هۆیەشەوە ئەقڵی تێکچوە... ئابیلی لەگەشتەکەی دا لەگەڵ عەلەوی دا بەردەوام بوەو بەمیسردا تێ پەڕیوەو دواتر فەرزی حەجی بەجێ هێناوە، دواتر دەچێتە کەربەلا. کاتێکیش دەیەوێت بگەڕێتەوە بۆمەغریب، عەلەوی هەندێ لەهاوڕێ و شوێنکەوتوەکانی خۆی لەگەڵدا دەنێرێت تاکو بیپارێزن و لەڕێگەدا هاوڕێ یەتی بکەن تاکو دەیگەڕێننەوە شوێنی مەبەست... ئابیلی دەڵێت لەوگەشتەی دا لەڕوی زانیاریەوە سودی وەرنەگرتوە، بەهۆی ئەو تێکچونە ئەقڵیەی کەدووچاری ببوو. (١٥)

ئەگەری ئەوە زۆرە (ئابیلی)لەکاتی گەشتەکەی دا ئەقڵی دووچاری تێکچون نەبوبێت، بەڵکو چیرۆکی (کافور)ەکەی بۆیە دروست کردوەو بڵاوی کردۆتەوە لەنێو قوتابیەکانیدا تاکو شتێکی نێو دەرونی خۆیی پێ پەردەپۆش بکات... خەریکە متمانەی تەواوبکەم بەوەی (ئابیلی)سودێکی زۆری وەرگرتوە لە هاوڕێ یەتی کردنی (عەلەوی)، هەندێ لەوزانستە ئەقڵیانەی لێ وەرگرتوەکە ئەو دەم، تەنها لای شیعە دەست دەکەوتن... ئاشکرایە شیعە بەشێوەیەکی گشتی ئامەزۆی ئەو زانستانەن ولەخەباتی ڕامیاریشیاندا ئەو جۆرە زانستە وەکار دەبەن. (١٦)

ئەگەر (ئابیلی)هیچ سودێکی وەرنەگرتوە لەگەشتەکەی دا، وەك خۆی دەڵێت، ئەی چۆن ئاشنا بوە بەفەلسەفەکەی (توسی)کە خەڵکی مەغریب هیچیان لەوبارەوە نەدەزانی؟ شیاوی ئاماژەپێدانە، (ئیبن خەلدون)لەسەردەستی (ئابیلی)مامۆستای دا، ئەو ڕەخنانەی خوێندەوەکە (توسی) ئاراستەی پەرتوکی (المحصل)ی (فخرالدینی ڕازی)کردوە. دواتریش ئیبن خەلدون پەرتوکێکی بچکۆلەی نوسیوەو پەرتوکی (المحصل)ی تێدا کورت کردۆتەوەو ناوی ناوە (لباب المحصل)، لەوپەرتوکەدا تەبەنی هەموو ڕەخنەکانی (توسی) کردوە. (١٧)

هەرچۆن بێت، ئابیلی لەپاش گەڕانەوەی بۆ مەغریب بویە کەسایەتیەکی هەڵکەوتووی فیکری، لە تێکچونە ئەقڵیەکەشی چاك بویەوە !. هاتە تونس ولەوێ لای باوکی ئیبن خەلدون بویە میوان ولەلای مایەوە... ئیتر ئیبن خەلدون وکۆمەڵێ لەخەڵکی تونس، هۆگری کۆڕو جفاتەکانی (ئابیلی)بوون، سێ ساڵی ڕەبەق لەگەڵی دا سەرقاڵی خوێندەواری بوو... (ئیبن خەلدون)لەو ڕوەوە دەڵێت: (هەردوو ئەصڵەکەو، لۆژیك و، هونەرەکانی دیکەی دانایی وفێرکاریم لەو وەرگرت....) (١٨)گومانی تێدا نیە کەئابیلی کاریگەری هەرەگەورەی هەبوە لەسەر بیرکردنەوەی (ئیبن خەلدون).

(دکتۆر محەمەد فەرید غازی)دەڵێت: (بەوجۆرە ئابیلی تۆوی ئەو شۆڕشەی لەناوەزی ئیبن خەلدونی خوێندکاری دا چاند، کەدواتر مەنهەجیەتێکی نوێی بۆ ئێمەبەرهەم هێنا) (١٩) هەروەها (حەصری)ش دەڵێت: ئیبن خەلدون پتر لەکەسانی تر ستایشی ئابیلی وفەزڵی ئابیلی دەکات بەسەر خۆیەوە، هەروەها دەشڵێت ئابیلی گەواهی دەرکەوتەیی بۆ داوەلەو زانیاریانەدا، گومانیشی تێدا نیە ئەمەش مانای ئەوەیە ئیبن خەلدون ئارەزوی لەبیرکردنەوەی لۆژیکی بوە، هەروەها مانایەکی دیکەشی بریتی یە لەوەی، ئەوزانستە ئەقڵیانەی کەلای ئابیلی خوێندوونی یارمەتی یەکی باشیان داوە بۆ بەهێزبون وگەشەکردنی ئەو ئارەزوە،

ئاسەوارەکانی ئەو ئارەزووەش زۆر بەڕونی لەزۆرێك بەشی (مقدمە)دا بەدەردەکەوێت. (٢٠)

وام دێ بەخەیاڵ دا، ئەوکاریگەریەی ئابیلی لەسەر (ئیبن خەلدون)ی داناوە، لە هەندێ ڕودوە لەو کاریگەریە دەچێت کەلەسەردەمی نوێ دا (جەمالەدینی ئەفغانی)لەسەر (محەمەدعبدە)دایناوە... جێی سەرنجە، (ئەفغانی)ش وەکو (ئابیلی)خاوەنی کەسایەتیەکی تەم ومژدارەو خەڵکی لەئاقار هەقیقەت و سەرەتای پێگەشتنی ئەمیش دا ناکۆکن. هەندێك بڕوایان وایە ئەفغانی لەڕاستیدا ئەفغانی نیە، بەڵکوئێرانیەو خەڵکی (ئەسەدئاباد)ی نزیکی (هەمەدان)ە، خوێندنی زانستەکانیشی لەشاری نەجەف بوە (٢١). بەوەش ناسراوە کەزۆر قوڵ بوەتەوە لەزانستە ئەقڵیە کۆنەکاندا... بەهەرحاڵ، دەگونجێت بێژین، هەرمامۆستایەکی وەکو (ئابیلی) یاخود (ئەفغانی)بگری، دەتوانێت گۆشە نیگایەکی نوێ سەبارەت بەژیان بەقوتابیەکەی نیشان بدات و، وای لێ بکات بەجۆرێکی جیاواز لەو جۆرەی خەڵکی لەژینگە دابڕاوەکەیان دا لەسەری ڕاهاتون، لەمەسەلەکان تێ بگات.

لەبەردا گوتمان ئیبن خەلدون زانستەئاینی و ئەقڵیەکانی پێکەوە خوێندوە، بۆیە لێرەدا شتێکی باشە گەر ڕێی (دکتۆر موحسین مهدی) بگوازینەوە، سەبارەت بەو کاریگەریەی کەهەردوو جۆرە زانستەکە لەسەر بیرکردنەوەی‌ئیبن خەلدونیان ناوە. دکتۆر مەهدی دەڵێت: سروشتی ئەو وانە ئاینی وفەلسەفیانەی ئیبن خەلدون لەسەردەمی لاوێتی دا خوێندونی ئەوە دەسەلمێنێت کەئیبن خەلدون بەرانبەرکێی گرفتی هەردگەوردی نێو بیرکردنەوەی ئیسلامی پێ دەکرد... ئەو گرفتەی‌کەبەهۆی ناکۆکی نێوان ڕەوتی سونی وڕەوتی فەلسەفیەوە لەلێکۆڵینەوەی مرۆڤ و کۆمەڵگەدا سەرهەڵئەدات.... ڕاستی کۆتایی لای ئەهلی سوننەئەو ڕاستیەیە کەلەرێگەی قورئان و فەرمودە وکۆدەنگی زانایانەوە بۆیان دێ، دیارە لەنێو ئەوهەقیقەتەشدا شەریعەت

لەسەروی ئەقڵەوەیە. وەلێ لای فەیلەسوفەکان مەسەلەکە بەپێچەوانەوەیە، ئەمان لەهەموو زانستە کردەیی و تیۆریەکانیشدا لەبەرێتی دەدەنە ئەقڵ... ئینجا بەئاشکرا ئەم ناکۆکی و نەگونجانەی نێوان سوننەت و فەلسەفە لەژیانیئیبن خەلدوندا دەبینین.... هتد) (٢٢).

## هۆکاری پێنجەم:

لەماوەی ڕابردودا باسمان لەو هۆکارانە کرد کەکاریگەریان لەسەر ئیبن خەلدون داناوەو پەیوەست بوون بەکەسایەتی وبنەماڵەو مامۆستاکانی ئیبن خەلدونەوە.

هەنوکەش دەمانەوێت باس لەو هۆکارانە بکەین کەپەیوەستن بەو کۆمەڵگەیەوە کەتیای دا ژیاوەو بریتی یە لەکۆمەڵگەی مەغریبی. لەبەردا باسمان لەئابیلی کرد، کەیەکێك بوو لەمامۆستاکانی (ئیبن خەلدون) و گەشتینە ئەوڕایەی لەبارەی ئەو پیاوەوە بڵێین: کابرایەکی شیعە بوو بەڵام خۆی حەشاردەدا (واتە توقیەی دەکرد-وەرگێڕ).

واباشە لێرەشدا ئاماژەبدەین بەوەی کۆمەڵگەی مەغریبی ئالودەی چەردەیەك لەململانێی تایفەگەری نێوان شیعەو سوننە ببوو. بەڵام ئەو ئالودە بوونە، بەو ئەندازەیە نەبوو کەلە ڕۆژهەڵات دەبینرا... چونکە لایکەس شاردراوە نیە ئەو ململانێ یە لەڕۆژهەڵاتدا سەری هەڵداو دواتر بەڕادەیەك گەورە بوو کەکاری کردە سەر لایەنە کۆمەڵایەتی و فیکریەکان. هەرچی ڕۆژئاوا(ی عەرەبی —وەرگێڕ)شە، ئەوا لەچوار چێوەیەکی بەرتەسك ولەماوەی کورت کورتدا چوەتە ژێرکاریگەری ئەو ململانێ تایفەگەریەوە، تێ بینی دەگرێ ئەو ململانێ تایفەگەریەی لەڕۆژهەڵاتدا سەری هەڵدا، زۆرینەی کات لەدەوری بەرێزتر دانانی عەلی و ئەبوبەکر یان عەلی وعومەر دەسوڕایەوە، بەڵام کێشەی بەبەرێزتردانان لەنێوان عەلی ومعاویە بەدەگمەن نەبێ لەوێندەر بایەخی پێ نەدەدرا. بەوپێ یەی کەبەهیچ شێوەیەك ناگونجێت معاویە بەراورد بکرێت

بەعەلی... هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆکاریگەری دەوڵەتی عەباسی لەڕۆژهەلات دا... ئاشکرایە ئەو دەوڵەتە لەسەر پاشماوەی دەوڵەتی ئەمەوی دروست ببوو، هەموو هەوڵێکی عەباسیەکانیش بۆ سەرزەنشت کردنی ئەمەویەکان و دابەزاندنی پلەو پایەیان بوو، ئینجا مێژووەوان و فەرمووودەناسەکانیش کەوتنە ژێر ئەوکاریگەریەوە. (٢٣). بۆیە لاپەڕەی کتێبەکانیان پڕبوون لەخراپەکاری ئەمەویەکان بەشێوەیەکی گشتی و، خراپەکاریەکانی معاویە بەشێوەیەکی تایبەتی. فارسەکانیش باسکێکی گەورەیان هەبوو لەپشتگیری کردنی ئەم ڕەوتەدا، ئەوان زۆر ڕقیان لەئەمەویەکان بوو، بۆیە یارمەتی عەباسیەکانیاندا تاکو لەڕوی فیکری وسەربازی وڕامیاریەوە ئەمەویەکان لەنێو بەرن... ئینجا ئێمە کاتێ دەبینین زۆرینەی ئەو زاناو هزرڤانانەی لەڕۆژهەلاتدا بەدەرکەوتون بەڕەچەلەك فارس بوون (٢٤)، ئەوجابۆمان ڕوون دەبێتەوە کەناوبانگی ئەمەویەکان لەنێو خەلکی ئەو دەڤەرەدا گەشتۆتە چ ئاستێکی بەرەو خوار چوون (دەربڕینی وەرگێڕ).

وەلێ لەمەغریب دا مەسەلەکە بەپێچەوانەوەیە، هۆکارەکەیشی بۆئەوە دەگەڕێتەوە کەئەمەویەکان لەدوای دۆڕاندنیان لەڕۆژ هەلات دا توانیان دەوڵەتێکی گەشەسەندوو لەئەندەلوسدا دابمەزرێنن، ئەم دەوڵەتەش کاریگەریەکی گالتە پێنەکراوی هەبوو لەسەر ولآتانی مەغریب لەهەردوو ڕووی مەعنەوی و مادیەوە، توانی ڕکابەری هەژمونی عەباسیەکان بکات... کاتێکیش دەوڵەتی ئەمەویەکان لە

ئەندەلوسدا بەهۆی هێرشی گاورەکانەوە لاواز بوو، بنەماڵە زانستی وسیاسەکان لەئەندەلوسەوە دەستیان کرد بەکۆچ کردن ولەولآتانی مەغریبدا نیشتەجێ بوون... یەکێك لەوبنەمالآنەش بنەماڵەکەی ئیبن خەلدون بوو.... بۆیە هەردەبێ ئەو بنەمالآنە کاریگەریەکی زۆریان هەبوبێت لەسەر بارودۆخی فیکری لەوێندەر.

لەدەمێکدا هەژمونی ئەمەویەکان لەمەغریبدا گەشەی دەکرد، لەهەمان کاتدا هەژمونێکی دیکەش گەشەی دەکرد کە هاودژ بوو لەگەڵ ئەودا. ئەویش هەژمونی (عەلەوی یەکان)بووکە لەسەردەستی (ئەدرەسی یەکان) دا لە بیابان سەری هەڵداو دواتر لەسەردستی (فاتیمی یەکان)دا بەهێزو پتەو بوو. فاتیمیەکان لەم ڕووەوە گرنگیەکی تایبەتیان هەیە، ئەمان لەشیعە بونیان دا توندڕەو بوون، هەندێ لەتۆوی (شیعەچێتی)شیان لە وڵاتی تونس دا چاند... دواتر ڕویان کردە میسر، لەوێش کاریگەریەکی گاڵتە پێنەکراویان لەپرۆپاگەندەی شیعە گەرێتی دا هەبوو.

ئەوەی جێگەی سەرنجە ئەوەیەکە میسر بەرلەوەی فاتیمەکان فەتحی بکەن ئالودەی چەردەیەك لەململانێی تایفەگەری بوو، زۆرینەی جاریش کێشمە کێشمەکە لەسەر بەرێزترردانانی عەلی ومعاویە بوو... ئەوە بوو لەساڵی (٣٥٠)داو لەرۆژی عاشوردا، ئاژاوەیەك لەنێوان شیعەو سوننەدا بەرپابوو... ئینجارۆژی (عاشورا)لەم ڕووەوە گرنگە، چونکە عاشورانەو ڕۆژەیە کەتێیدا (حسەین)لەسەر دەستی سوپای ئەمەویدا کوژرا...سەرباز گەڵێ لەسودان وتورکەکان نوماییندەی سوننەکان بوون لەوئاشوبەدا... ئەو سەربازانە لەسەرەڕێگەکاندالەرێبوارانیان دەپرسی: خاڵی تۆکێ یە؟ جائەگەر بیگوتبا (معاویە)یە، ئەوا وازیان لێ دەهێنا، وەگەرنا ئەوا لێیان دەداو فەلاقەیان دەکرد... یەکێك لەوسودانیانە بەرێگەکاندا دەگەڕاو هاواری دەکرد: (معاویە خاڵی عەلیە)جەماوەریش لەدوایەوە ئەودروشمەیان دەگوتەوە...ئیدی ئەمە بویە دروشمی خەلکیمیسر، هەرکاتێك بیان ویستایەلەگەڵ شیعەدابجەنگێن ئەو دروشمەیان بەرزدەکردەوە. کاتێکیش فاتیمەکان هاتنە نێو میسرەوە، حکومەتەکە بویە حکومەتێکیشیعی، بارودۆخەکە پتر ئاڵۆزا، لەوکاتەدا جەماوەری ئەو وڵاتە لەئامادەباشی تەواودا بوون وبەسادەترین ئامازە هەمان دروشمەکەی جارانیان بەرزدەکردەوە، بەوجۆرەش ڕق وکینە دێرینەکان دەجۆشان وخەلکیلەدور کۆبونەوە.

ساڵی (٣٦١)وارێکەوت پیرێژنێکی کوێرکەلەشەقامەکاندا ئەو سرودەی دەگوت گیراو زیندانی کرا، خەڵکیبەو ڕوداوە شڵەژان وکۆبونەوەوهاواریان کرد: (معاویە خاڵی موسوڵمانان وخاڵی"عەلی " شە).بەو هۆیەشەوە حکومەت ئاگاداری نامەیەکی بڵاو کردەوەو هەڕەشەی سزای بەئازاری لێکردبون، پاشتریش پیرێژنەکەیان بەردا... ساڵی (٣٦٢ك)ش، کۆمەڵێ لە (سەیرەفە)سونیەکان شڵەژان وهاواریان کرد (معاویە خاڵی عەلی کوڕی ئەبی تالبە)ئەمەلەکاتێکدا سەیرەفە سونیەکان یەکێك بوون لەهەرە توخمە هێورە سیاسیەکان. (٢٥)

دەوروبەری ساڵی (٤٤٠)یش، لەتونس دائاژاوەیەکی تایفی ڕویدا کەلەهەندێ ڕوەوە لەوئاژاوەیە دەچوکەلە میسردا ڕوی دابوو، تەنهالەوڕووەوە لێك جیاواز بون کەئەمی تونس کێشمەکێشەکەی لەسەر بەرێزترداناں بوون لەنێوانعەلی لەلایەك وئەبوبەکرو عومەریش لەلایەکی ترەوە.وادیارە لەوڕۆژگارەداو لەدوای ڕوخانیدەوڵەتەکەیان لەئەندەلوس هەژمونی ئەمەویەکان لاوازبوە، وهەژمونی عەباسیەکان جێگەی گرتۆتەوە... پوختەی بەسەرهاتەکەش ئەوەیە، فەرمانداری فاتیمەکان لەسەر تونس (موعیز کوڕی باریس)، لەمەزەبی شیەە هەڵگەڕایەوەو چوەسەرمەزەبی سوننە، ئینجاهاواری لەئەبوبەکرو عومەرکردو، خەڵکەکە بەرەوشڵەژان ودەستیان کردە کوشتار کردنی شیعەو تاکارگەییە ئەوەی بانگخوازەکانیان کوشتن و خانوەکانیشیان ڕماندن، ئینجا موعیز هانای بردەبەر خەلیفەی عەباسی، هەروەها بەپداخی ڕەشی بڵاوکردەوە کەپەرچەی عەباسیەکان بوو، مستنصری خەلیفەیفاتیمی بەمە زۆر توڕە بوو، بۆیە وەزیرەکەی خۆی ناردەلای موعیزو هەڕەشەی شەڕو جەنگی لێکرد. (٢٦)بەرەنجامی ئەم هەڕەشەیەی فاتیمی یەکان ئەوە بوو هۆزە عەرەبیەکانی، وەك (بەنی هیلال) و (بەنیسەلیم)زۆرینەی وڵاتانیمەغریبیان داگیرکرد، وئەوکاولکاریە ترسێنەرەیان تێدا بڵاوکردەوە کەلەمێژوە وڵاتانی مەغریب دا بەناوبانگە.

دواتر لەوداگیرکاریەو هەندێ لەئاسەوارەکانی‌لەکۆمەلگەی مەغریبی دا دەکەین، لێرەداتەنها بەوەندە دەست هەڵدەگرین کەبڵێین ئەو داگیرکاریە کاریگەری‌خۆی هەبوو لەلاوازکردنی هەستی شیعە چێتی لەمەغریب وتەنانەت لەلەناوبردنی‌ئەوهەستەش دا. چونکەبەرلەورووداوە لەمەغریب داو لێرەولەوێ گروپی شیعەهەبون، لەشاری (صندفا)گروپێکی شیعی هەبون، شارێکیش لەسەر مەرزی تونس وجەزائیر هەبوو ناوی (نفتە)بوو، هەمووخەلکەکەی شیعەبوون، بۆیەناونرابوو (کوفەی بچوك)، بەلام لەدوای هەلگەڕانەوەکەی (موعیز)وداگیرکاری وشالاوی هۆزە عەرەبیەکان بۆسەرولاتانی (مەغریب)هەمووئەوگروپە شیعی یانە لەنێوچون وتوشی قڕان بوو. (٢٧)لێرەدا دەمانەوێت هەلوێستەبکەین وبپرسین: ئەو ڕوداوانەچ کاریگەریەکیان هەبولەسەر بیرکردنەوەی ئیبن خەلدون؟ ئێمە نکولی ناکەین لەوەی ئەوڕوداوانە ماوەیەکی دورودێژەبەرلەئیبن خەلدون ڕویان داوە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ناگونجێت ئەوڕوداوانە هەروابەمێژودا ڕۆشتبن وبەبێ ئەوەی هیچ هەندێ ئاسەواری‌فیکری بەجێ بێلن، لەنێو خەلکی مەغریب دابەشێوەیەکی گشتی و، لەئیبن خەلدونیشدا بەشێوەیەکی تایبەتی.

هیچ گومانێکم نیەلەوەی ئیبن خەلدون کەسێکی سوننی بوەوباوەڕێکی پتەویشی هەبوەبەسونێتی یەکەی... لەگەڵ ئەوەشدا من لەنێو دێڕەکانی (مقدمە)کەیدا خەریکە هەندێ لەئاسەوارەکانی شیعەچێتی ببینم... ڕەنگەئەمەشی بەشێوەیەك لەشێوەکان لە (ئابیلی)مامۆستایەوە پێی گەشتبێ... بەشێوەیەکی ڕونترئەو ئاسەوارەلەکاتێکدا تێبینی دەکەم، کەئیبن خەلدون دێت وبەردوانیەك دەنوسێت لەمەڕ ڕەچەلەکی (ئیدریسیەکان)... ئەوبەگەرمی پشتیوانی لەڕاستی ودروستی ئەو ڕەچەلەکە دەکات و، دواتربەم پەیڤانە کۆتایی بەپشتگیریەکەی دێنێت: (پاك ڕاگرتنی ئەهل وبەیت لەچەپەلیەکی وا لەپایەکانی بیروباوەڕی ئیماندارانە، چونکەخودای‌گەورە ئەهل وبەیتی پاك

گردۆتەوەو هەموو چەپەڵیەکی لێ بەدورگرتون. کەواتەنوێنەکەی ئیدریس پاکەولەهەموو چڵکێو پڵۆخیەك بەدورە بەبڕیاری قورئان، هەرکەسیش بڕوای پێچەوانە بێت ئەوا گوناهبارەولەودرگاو دەروازەی کوفرەوە چوەتە نێو دنیای کوفرەوە "دەربڕینی وەرگێڕ"، ئینجا من بۆیە زیادەڕەویم کردوە لەو وەڵامدانەوە یەدا تادەروازەکانی گومان دابخەم...هتد) (٢٨)

ئەوکەسەی ئەم پەیڤانەی ئیبن خەلدون بە دابڕاوی لەپەیڤەکانی تری دەخوێنێتەوە دەگاتە ئەو بڕوایەی کەئەوکەسەی نوسیویەتی یەکێکە لەدڵسۆز ترینی شیعەو دەمارگیرەکان بۆ ئەهل وبەیت...هەروەها لەکاتێکدا بەرگری لەڕەچەڵەکی فاتمیەکانیش دەکات، هەست بەهەمان بۆچون لەنێوپەیڤەکانیدا دەکەین. لەوڕووەوە دەڵێت: (هەروەها لەوهەواڵەلاوازانەی کەهەندێ لەمێژووەوانەکان سەبارەت بەعەبیدیەکان، خەلیفەکانی شیعە لەقەیرەوان وقاهیرە بۆی دەچن، بەوەی دایان دەبڕن لەئەهل وبەیت "سەلات وسەلامی خوایان لێ بێت" هەروا تەشەر دەدەن لەوەی نەژادیان بگەڕێتەوە سەر پێشەوا جەعفەری صادق...لەمەشدا پشت بەوفەرمودانە دەبەستن کەبڵاوازەکانی نێو خەلیفەکانی بەنی عەباس هەڵبەستراون....هتد) (٢٩)لێرەدا دەبینین ئیبن خەلدون لەکاتێکدا باس لەئەهل وبەیت دەکات دەستەواژەی (سەلات وسەلامی خوایان لێ بێت)بەکاردەهێنێت، ئەم دەربڕینەش بەدەگمەن دەبینرێت کەسێکی دیکەی غەیرەشیعەبەکاری بهێنێت لەکاتی باسکردنی ئەهل وبەیت دا... ئاشکرایە ئەهلی سوننە بەشێوەیەکی گشتی "سەلات وسەلام"تەنها لەسەر پێغەمبەر (د.خ)دەدەن. هەرگاباسی یەکێك لەپێشەوایان یاخود هاوەڵان بکەن دەستەواژەی (خوای لێ ڕازی بێت)بەکاردەهێنن.

سەیرلە ئیبن خەلدونداندانەوەیە بەپیرۆزیەوە لەهەندێ جێگەی (مقدمە)کەی دا باس لەئەهل وبەیت دەکات، کەچی لەهەندێ جێگەی دیکەی نێو (مقدمە)کەی دا بەسەرزەنشتێکی تاڕادەیەك زۆرەوە باسیان دەکات. ئەوەتا بۆنمونە لەبەشی "علم فقە" ی نێو مقدمەکەی دابەم جۆرەباس لە (اهل البیت)دەکات: (ئەهل وبەیت بەوەدا ڕیزپەڕ بون کەهەندێ ڕێچکەیان بۆخۆیان داهێناوەو فیقهێکیان بۆخۆیان هێناوەتە کایەوە کەهەندێ لەسەحابەکان بە"قدح" ە وەباس دەکەن، هەروەها بڕوایان وایە پێشەواکان بێ گوناهن وناکۆکی لەسەر قسەی ئەو پێشەوایانە هەڵدەگرن، دیارە هەموو ئەوانەش بنەمای پوچ وبێ ئەرزش ولاوازن) (٢٠)

وادیارە ئیبن خەلدون لەقۆناغێکی دەرونی وفیکری جیاوازدا بەشەکانی (مقدمە)کەیی نوسیوە، وەك هەریەکێك لەوهزرڤانە مەزنانەی کەدەکەونە ژێر کاریگەری هەست ونەزعەی پێچەوانەو هاودژەوە. بۆیە هەندێ جار، شوێنی نەزعەیەك دەکەون ولەهەندێ باری دیکەدا شوێنی نەزعەیەکی تردەکەون... ئینجا ئەگەر ئەو هزرڤانانە دۆگما بونایە بۆیەك نەزعەو جگەلەو بەنەزعەی دیکەی جیاواز ئاشنا نەبوبان ئەوا نەیان دەتوانی هیچ شتێکی نوێ دابهێنن.

## هۆکاری شەشەم:

لەماوەی ڕابردودا ئاماژەماندا بەشاڵاوی هۆزەعەرەبیەکان بۆسەر وڵاتانی مەغریب بەهۆی هەڵگەڕانەوەی فەرمانداری تونس لەخەلافەتی فاتمی... ئەم شاڵاوەش بایەخێکی گەورەی هەیەلە کۆمەڵگەی مەغریبی دا، چونکە بویە هۆی بەرپابونی گۆڕانکاریەکی گەورە لەلایەنەکانی ئابوری ورمیاری وژیاریەوە، ئەم کاریگەریەش تاڕۆژگارەکانی ئیبن خەلدون بەئاشکرا دەبینرا، تەنانەت هەندێ لەتوێژەران پێیان وایە ئەوکاریگەریانە تائەمڕۆکەش بەردەوامن.

ئەوهۆزانە، کەلەبەنی هیلال وبەنی سەلیم بوون، لەسەرەتادا لەدورگەی عەرەبی داو لەسەر سروشتی زبرێتی ودەشتەکێتی دەژیان. کاتێکیش (قرمتی)یەکان لەدوورگەدا بەدەرکەوتن، ئەو هۆزانە پالّیان پێوەدان و بونە یارمەتی دەریان لەهێرش وپەلامارەکانیان دا بۆسەر ناوچەو دەڤەرەکانی دەوروبەر... لەسەردەمی (عەزیزی خەلیفەی فاتیمی)شدا، ئەوهۆزانە کۆچیان کرد بۆوولاتی میسرو لەناوچەی (صەعید)گیرسانەوە بەرانبەر بە دەریایسور. لەوێش دا هەرلەسەر سروشتی دەشتەکێتی وزبرێتی یان مانەوەو ڕێگەیان دەبڕی و خەلّکیان دەڕوتاندەوە.

کاتێك (موعیز کوڕی بادیس)لەتونس دالەخەلیفەی فاتمی هەلّگەڕایەوە، (مستنصر)ی فاتمی بیریلەوە کردەوە ئەو هۆزانە بکات بەکولکی (موعیز)دوە، تاکو لەلایەکەوە تۆلّەبکاتەوە، لەلایەکی تریشەوە میسر لەخراپەو تاوانکاریئەو هۆزانە دوور بخاتەوە... هێرشی ئەو هۆزانە لەناوەڕاستی سەدەی پێنجەمدا دەستی پێکردو، ژمارەی سەربازە کانیشیان خۆی دەدا لەچوار سەد هەزارکەس، ئیدی وەکو زریانێکی پڕچەپۆکان ڕویان لەوولاتانی مەغریب کردو هیچ شتێ بەری پێ نەدەگرتن وهیچ قەلایەك لەبەرانبەریاندا پارێزراو نەبوو... ئیدیهەرچی کەوتە ژێردەستیانەوە تالانیان کردو توانایان بەسەر هەرچی دا شکا خاپوریان کرد.

پاش ئەوەی لەمەغریب دا ئۆقرەیان گرت و، وەچەیان لێکەوتەوە، هەربەردەوام بون لەسەر نەریتی ڕێ بڕین وسەرانە سەندن، یارمەتی پادشاکانیان دەدا یەك لەدژی ئەوی تر، بەوەندەش دەستیان هەلّنەگرت کەلەدژی غەیری خۆیان بجەنگن، بەلّکو بەربونە شەڕکردن لەناو خۆشیاندا.پادشاکانیش بۆئەو کارە هانیان دەدان تاکوسەرقالّیان بکەن بەخۆیانەوە.

ولاتانی مەغریب بەرلەو شالاوەی ئەوان ئاوەدان وپڕلەفەڕبوون، بازرگانی و پیشەسازی تێیاندا گەشەی کردبوو.بەلام لەدوای ئەوشالاوەبوە سەرزەمینێکی

پڕلەكاول كاری و وێرانەیی. ئەو كاول كاریەش تاماوەیەكی دورودرێژ بەمەغریبەوە دیار بوو... بەڵگەش لەسەر ئەوقسەیە، ئەو گوتەیە كەگەڕیدەی تونسی (عەبدوڵای تیجانی)بۆمان دەگێڕێتەوە، كەلەسەرەتاكانی سەدەی هەشتەم دا بەتونس ولیبیادا گەڕاوە، ئەو لەبارەی شاری (صفاقس)ەوە، دەدۆێت ودەڵێت : لەبەر دا دارستانێكی زەیتونی تێدا بووكەبەژنی ئاڵاندبوو بە شوراكانی شارەكەدا، بەڵام (عربان)ەكان، ئەودارستانەیان وێران كردو ئێستاكەتەنها یەك درەختی تیادا نەماوەتەوە). (٣١)ڕەنگەلەم ڕودوە ئەم پرسیارە ڕوبەڕومان بێتەوە؛ ئەم وێرانكاریە سەرتاپاییە، چ كاریگەریەكی داناوەلەسەر هزری مەردوم لەوڵاتانی مەغریب دا؟ وادیارە خەلكی لەو ئاقارەدا بونەتە دووبەشەوە: هەرچی دانیشتوانی شارە، ئەوانەی كەلەو وێرانكاریە تاڵاوی هەرەزۆریان بەركەوتوە، ئەمانەبە چاوی ڕق و دوژمنایەتیەوە تەماشای هۆزە عەرەبیەكانیان دەكرد... ئەمەش مەسەلەیەكی ئاساییە، چونكە چاوەڕوانی ئەوە ناكرێت خەلكی شارەكان بەچاوێكی ترەوە سەیری ئەوانە بكەن كەوڵاتەكەیان وێران كردون و خراپەیان تێدا بڵاو كردۆتەوە.

هەرچی هۆزە عەرەبیەكانن، بەچاوێكی ترەوە سەیری مەسەلەكەیان دەكرد.ئەمان بەشێوەیەكی پڕلەشانازی و قارەمانێتی پەوەباسی شاڵاوە كانیان دەماودەم دەكرد. وادیارە هەربەو جۆرەش چیرۆكەكە گەشتۆتە میسرو، خەلكیش لەوێ دا، دەستیان كردوە بەزیادەڕەوی كردن لەگێڕانەوەی دا.لێرەوەش سەرگوزشتەی (ئەبی زەیدی هیلالی)بلاوەیكرد لەمیسردا... شیاوی باسكردنە ئیبن خەلدون لەمێژوەكەی دا ئاماژەی كردوە بەسەرگوزشتەی (ئەبی زەیدی هیلالی)بەگوێرەی گێڕانەوەی ئەو هۆزە عەرەبیانەی كەلەوكاتەدا هەبوون، ئەوهەروە ها دەڵێت : ئەو هۆزانە وەچە لەدوای وەچە ئەو سەرگوزشتە دەگێڕنەوە. (٣٢)لێرەدا هەقە بەدوی هەلوێستی ئیبن خەلدون بگەڕێین سەبارەت (بەوشاڵاوەو گۆڕانكاریەكانی دواتری –وەرگێڕ)ئەو لەلایەكەوە شارنشین بوو،

لەلایەکی دیکەشەوە پەیوەندیەکی باشیشی هەبو بە تیرەو هۆزە عەرەبیەکانەوە، زۆر جار پادشاکان دەیان نارده کن ئەو هۆزانە تاکو ڕایان کێشێت بەلای ئەو پادشایانەداو کاریگەریان لەسەر دانێت، کەدواتریش بارودۆخی سیاسی لێ بەرتەسك بویەوە پەنای بردەلای یەکێك لەو هۆزانە، ئەویش هۆزی (بەنی عریف) بوو، ئەم هۆزە ڕێزیان لێگرت، بۆماوەی چوار ساڵ لەگەڵ خانەوادەکەی دا میوانداریان کردن، لەفێڵ وتەڵەکەی دوژمنەکانی پاراستیان، بۆیە لەنێو ئامێزی ئەواندا ئەو ماوەیە بەئارامی ودڵنیایی ژیاو ئەم ئارامیەش یارمەتی دەری بوو بۆنوسینی (مقدمە)کەی. (٣٢)

گومانم وایە ئەو بەشانەی (مقدمە)کەتیایاندا سەرزەنشتی عەرەب کراوە، مەبەست لەو هۆزە دەشتەکیانەیە کە بونەتە چاوگی کاولکاری وگەندەڵی لەوڵاتانی مەغریب دا... بۆیە ئێمە بەدووری ناگرین، کەئیبن خەلدون لەکاتی سەرنج دانی لەو هۆزانە، لەبەرانبەر دوپاڵنەری هاودژدا ڕاوەستابێ: کەسەرنجی میوان پەزێری وجوانمەردی و ڕەوشت بەرزی داون، ئەمە پاڵی پێوە ناوە بۆئەوەی خۆشی بوێن وستایش یان بکات. کاتێکیش تەماشای ئەو ناوبانگەیانی کردووە کەلەوڵاتانی مەغریب دا بەوە ناسراون حەزیان لەتاڵان وبڕۆو دەست درێژی کردنە، ئەمەش هانی داوە بۆئەوەی ڕقی لێیان بێت وسەرزەنشتیان بکات، ڕەنگە هەرئەمەش ئیبن خەلدونی هاندابێت بڵێت: هەموو شتێ دووڕوی هەیە: لەڕویەکیانەوە باشەو لەڕووەکەی تریشەوە خراپە. لەوانەیە گونجاوبێت گەر لێرەدا، ئەو پەیڤەی (توینبی)بگوازمەوە، کەلەکاتێکدا باس لەئیبن خەلدون دەکات لەمیوان داری عەرەب دا دەڵێت: شتێکی خۆشە گەرتێبینی بکەین ئەو توێژینەوە قەشەنگەی ئیبن خەلدون سەبارەت بەفەلسەفەی مێژو لەدڕەندەیەتی عەرەبەکانەوە لەمەغریب دا وەری گرتوە، لەژێرسایەی پاسەوانێتی ئەوعەرەبانەدا نوسیویەتیەوە...تەنانەت وامان دێ بەبەر ئەندێشەدا کەئیبن خەلدون پاساوی داتاشیوە بۆئەوەی بەدەنگی بڵند لێکۆڵینەوەکەی نەخوێنێتەوە،

تاکو زیرەکەکانی نێو ئەو هۆزەی میوانداری یان کردووەگوێ بیستی نەبن، لەکاتێکدا توێژینەوەکە پێکهاتوە لەبریندارکردن و ناشیرین کردنێکی گەزندەی کردەوەکانی باپیرانیان) (٣٤)

## هۆکاری حەوتەم:

لەکاتێکدائیبن خەلدون تەمەنی گەشتە هەژدە ساڵ، بەڵایەکی گەورە بەرۆکی مەغریبی گرت، ئەوە بوو پەتای تاعون لەوێندەر بڵاو بویەوە، بەسەدان هەزار کەسی لەخەڵکی ئەو وڵاتە لەناوبرد، هەروەك چۆن لەئاسیاو ئەورووپادا ملیۆنەها کەسی لەدانیشتوانی سەزەوی کوشت. بەڕێی دکتۆر (محەمەد فەرید غازی)ئەم تاعونە لارەسەنگیەکی یەکلاکەرەوەی دروست کردلەهاوسەنگی نێوان دەشتەکێتی وشارستانێتی مەغریب دا، چونکە ئەوتاعونە خەڵکێکی زۆری لەشارەکاندا لەنێو برد، کەچی زیانێکی نەبوو بۆخەڵکی ناوچە شاخاوی یاخود بیابانیەکان. ئەمەش وایکرد دەشتەکیەکان لەڕوی ژمارەو هێزەوە بەسەر شارستانیەکاندا زاڵ بن و هۆزە دەشتەکیەکان ئەو شارانە داگیر بکەن کەشورای بەهێزو سەختیان هەبوو، ئەخاسمە کەئەو شارانە چۆڵ ببوون لەکەسانێك بەرگری یان لێ بکەن. (٣٥)

من پێم وایە ئەم تاعونەش هۆکارێکی نوێی خستە پاڵ ئەو پاشاگەردانیە رامیاریەی کەبەهۆی شاڵاوی هۆزە عەرەبیەکانەوە لەمەغریب دا دروست ببوو... لەڕاستیش دا ئێمە کاتێ لەبارودۆخی رامیاری دوای تاعونەکە دەکۆڵینەوە لەمەغریب دا، دەبینین لەسەر شێوازێکی زۆر نامۆ دەڕوات. لەدوای تاعون، میرنشین و دەوڵەتەکان زۆر بەخێرایی و لەماوەیەکی کورت دا دەردەکەوتن و دەڕوخان، پیلان وجەنگ و کودەتاکان بەردەوام بوون و نەدەبینرا پادشایەك ماوەیەکی درێژ لەسەر کورسی یەکەی نۆقرە بگرێت، تەنانەت زۆر جار کوڕ لەباوك وبرا لەبراو وەزیر لەئەمیرەکەی ناپاکی یان دەکرد. (٣٦)

هۆزوتیرە دەشتەکیەکانیش بەشداریەکی کارایان دەکرد لەو پلان وگودەتایانەدا، ڕەنگە ئەو هۆزانە لەگرنگترین هۆکارەکانی بارودۆخەکەش بوبن. ئیبن خەلدون لەبەشێکی (مقدمە)کەی دا ئاماژەی بۆئەوە کردوە، ئەم دیاردەیەشی بەزۆری هۆزەکان و فرەیی دەمارگیریەکان لەمەغریب دا لێك داوەتەوە، ئینجا لەو ڕوەوە مەغریب بەوڵاتانی ڕۆژهەڵات بەراورد دەکات. بەڕێی وی ڕۆژهەڵات ئۆقرە ترو ئارام ترە، دەوڵەتیش لەڕۆژهەڵاتدا تەمەنی درێژترەو بەتوانا تریشە لەوەی ڕژێمی گشتی سەقامگیری بکات. (٣٧)

لێرەدا ئەوەی شیاوی باسە، ئەوەیە ئیبن خەلدون لەکاتێکدا هاتە نێو سیاسەتەوە، سیاسەت لەو شپرزیەدا بوو... گرفتەکەیشی لەوەدابوو وەك شەرعناسێکی دۆگما نەهاتە نێو سیاسەتەوە، هەرچەندە چاوەڕوانی ئەوە لەئەوو کەسانی وەکو ئەودەگرا، بەڵکو وەك پیاوێکی هەلپەرست هاتە نێو سیاسەتەوە، پیاوێ کەلەدۆستایەتی کردنی دا بۆ شتێ ئۆقرەی نەدەگرت، وەك لەبەشێکی داهاتوتری ئەم پەرتوکەدا باسی لێوە دەکەین. بەوهۆیەشەوە، ئیبن خەلدون دوچاری سەریەشەی زۆر بوو، ناوبانگیشی لەمەغریب دا گەلێك دزێو بوو، تاکو وای لێ هات میرەکان بڕوایان پێی نەدەکرد.

ئیبن خەلدون ئارەزوی وابوو دەوڵەتێ یان میرنشینێکی بچکۆلە بۆخۆیی و بنەماکەی دابمەزرێنێت، تاکو ناوبانگ وشکۆی دێرینی بنەماڵەکەی بگەڕێنێتەوە، وادیارە لەکۆتایشدا خۆی بەشکست خواردویی دیوەتەوە، بۆیە دەستی کردۆتە سەرنج دان لەهۆکارەکانی شکستەکەی، دەشگونجێت بڵێین لەکاتی ئەم سەرنج دانەی دا، تیۆری دەمارگیری وبایەخی دەمارگیری لەدامەزراندنی دەوڵەت دادۆزیوەتە

ڕەنگە ئیبن خەلدون هەستی کردبێت، بۆیە لەژیانی ڕامیاری دا شکستی هێناوە، چونکە دەمارگیریەکی بەهێزی لەپشتەوە نەبوە، یانی تیرەیە یان گرۆهێکی بەهێزی نەبوە دەمارگیر بن بۆی ولە هەوڵەکانیدا پشتگیری بکەن...

بەڵێ، لەبەردا بنەماڵەیەکی گەورەو خاوەن دەمارگیری هەبوو، وەڵێ ئێستا زۆر لاوازە بەرادەیەك هیچ کەسێ ناوڕی لێ ناداتەوە. کەواتە پێویستە دان بەو بویەرەدا بنێت ووازلەسیاسەت بێنێت بۆخاوەنەکانی، ئیدی سەرقاڵی شتێ بێ گەتواناای بەسەری دابشکێت. خەریکە بەڕونی لەبەشێکی (مقدمە)دانەو ڕایە ببینین کە ئیبن خەلدون پێی گەشتوە، ئەوەتا دەبینین سەرکۆنەی ئەو کەسانە دەکات کەخاوەنی ڕەچەڵەکێکی دێرینن و شانازی ولوت بەرزی بەو ڕەچەڵەکەوە دەکەن و پشتی پێ دەبەستن، هەرچەندە ئەو دەمارگیریە بەهێزەشیان نەماوەتەوە کەلە ڕابردودا بویانە. وادیارە ئیبن خەلدون بەو گوتەیە سەرزەنشتی خۆیشی دەکات، بەوپێ یەی خۆیشی یەکێکە لەوکەسانەی بەرەچەڵەکیانەوە شانازی دەکەن... لەو ڕووەوە دەڵێت: (جاری واهەیە بنەماڵەیەك شەرەفی دەمارگیریەکیان هەیە، دواتر لەو دەمارگیریە دادەماڵرێن، تێکەڵاو بەتەمومژ دەبن، بەڵام لەنێو دڵیان دا چەردەیەك ڕاڕایی ئەو ڕەچەڵەکە دەمێنێتەوەدو هەرخۆیان بەگەورەی بنەماڵەکان وخاوەنی دەمارگیری دەزانن کەچی وایش نیە، چونکە دەمارگیری بەتەواوی لەدەست چوە، زۆرینەی خەڵکی شارەکان ئەوانەی لەبنەماڵەکانی عەرەب وعەجەم دا پێگەیشتون لەوجۆرە دولیەیان هەیە — دەربرینی وەرگێڕ) (٣٨) (مامۆستا بۆتۆل) ڕاستی پێکاوە لەوەدا تێ بینی ئەوەی کردوە، ژیانی ئیبن خەلدون لەدوای نوسینی (مقدمە)هێورتر بوە، زیاتریش سەرقاڵ بوە بەزانست و دورتریش بووە لەسیاسەتەوە، لەچاو کاتەکانی بەرلەنوسینی مقدمە. (٣٩)ئەو چوارساڵەی کەژیانی بەگۆشەگیری ولەنێو بیرکردنەوەدو نوسین دا بەسەر برد، وایان لێکرد خۆی بناسێت و تواناکانی خۆی بزانێت... ئەو سیاسەتمەدارە تەماحبازە نەبوو کەجاران لەسەر گوریس یاری دەکرد، بەڵکو زیاتر حەزی لەوە دەکرد لەسەر گردۆلکەیەك ڕاوەستێت و سەیری شانۆگەری ژیان بکات، بەبێ ئەوەی زۆر خۆی لەنێو ئەو شانۆگەریەدا نقوم بکات.

## هۆکاری هەشتەم :

هەنوکە دەگوازینەوە سەرکۆتایەمینی ئەو هۆکارانەی کە کاریگەریان داناوە لەسەر بیرکردنەوەی ئیبن خەلدون. ئەمیش هۆکارێکە پەیوەستە بەبارودۆخی گشتی شارستانیەتەوە لەئیسلام دا، دەکرێ بێژین سەدەی هەشتەم کەئیبن خەلدون تیایدا ژیاوە، یەکێکە لەخراپترین ئەو سەدانەی کەئیسلام پیایاندا گوزەری کردوە لەڕوی ڕامیاریەوە...

ئەم سەدەیە لەدوای ڕوخانی خەلافەتی عەباسی لەبەغداد لەسەردەستی مەغۆلە درندەکاندا دەستی پێکرد، هەرلەهەمان سەدەش دا (تەتەر)ەکان بەسەرکردایەتی (تەیموری لەنگ)ی خوێن ڕێژ، شاڵاویان کردە سەر وڵاتە ئیسلامیەکان لەڕۆژ هەڵات دا، جگە لەوەش، هەرئەم سەدەیە هەڵپەکردنی دیانەکانی بۆلەناوبردنی ئەو میرنشینە گچکەیە بەخۆوە بینی کەپاشماوەی ئیسلام بوو لەئەندەلوس دا.

ئەوێ دەمێ ئیسلام بەماوەیەك دا گوزەری کرد، کەوتبویە پاش ڕوخانی دەوڵەتی عەباسی و بەرلەسەرهەڵدانی دەوڵەتیعوسمانی، ئەمەش ماوەیەکە سەختە بەسەر موسوڵمانان دا گوزەر بکات بەبێ ئەوەی هەست بەڕەش بینی و بێ ئومێدیەکی زۆر بکەن، چونکە لەوسەردەمەدا ئەو دەوڵەتە مەزن وسەرکەوتوەیان لەدەست دابوو کەبەرەڤانی لەئاینەکەیان دەکردوو ناوی وانی لەنێونەتەوەکانی تردا بەرز کردبویەوە.

پێویستە هزرڤان و شەرعناسە موسوڵمانەکان سەرنج لەو بارو دۆخە بدەن ولەهۆکارەکانی بکۆڵنەوە. دەگونجێت بوترێت زۆرینەی ئەو بیرمەندو شەرعناسانە هۆکاری ئەو بارودۆخەیان بۆئەوە گەڕاندۆتەوە کەموسوڵمانان لەئاراستەکاریەکانی ئاینەکەیان و ڕێبازی پێغەمبەرەکەیان لایان داوە، خواش بەوە سزای داون کەکافرانی بەسەریاندا زاڵ کردوە.

یەکێك لەفەرموودە بەناوبانگەکانی پێغەمبەر (د.خ)ئەم فەرمودەیە: (بدأالاسلام غریبا وسیعود غریبا کما بدأ فطوبی للغرباء) وادیارە ئەم فەرمودەیە

ڕەواجی هەبوە لەوماوە تاریکەی مێژوی ئیسلام دا، بەتایبەت کەموسوڵمانان دیویانە بەڕاستی وێنای ئەو بارودۆخە دزێوەی دەکات کەتێی کەوتون.

یەکێك لەپەرتوکە پڕبایەخەکان کەلەوماوەیەدا نوسراون، پەرتوکێکی شەرعناسی بەناوبانگی ئەندەلوسیی (ئیبراهیم کوڕی موسای شاتبی)بووبە ناوی (الاعتصام)... شاتبی دەست پێکی ئەو پەرتوکەی کردۆتە لێکدانەوەیەکی وردی ئەو فەرمودەیە. لەمیانەی لێکدانەوەکەی دا دەڵێت: ئیسلام لەسەرەتادا بێ هێزو چەوساوە بوو، بەڵام دواتر سەرکەوت، بۆیە پێویستە سەرلەنوێ بگەڕێتەوە سەرباری نامۆییەکەی یەکەمجاری، چونکە ئەوە سوننەتی خوایە لەنێو هەموو نەتەوەکاندا، وەك پێغەمبەر (د.خ)ڕوودەکاتە نەتەوەکەی و دەفەرمێت: ((ئێوە بست بەبست وباسك بەباسك شوێنپێی نەتەوەکانی پێش خۆتان هەڵدەگرن، تەنانەت ئەگەر بچنە کونی کەمتیارەوە ئێوەش شوێنیان دەکەون)).

(شاتبی)هۆکاری سەرلەنوێ نامۆ بونەوەی ئیسلام دەگەڕێنێتەوە بۆدەرکەوتنی بیدعەو خراپە لەئیسلام دا، هەروەها بۆلادانی موسوڵمانان لەڕێڕەوی پێغەمبەر، هەق دۆستان لەنێو موسوڵمانان دا بونەتە کەمینە لەچاو باتڵ دۆستان، هەروەك ئەوانەی دەست دەگرن بەسوننەتەوە چەند کەسێکی نامۆو کەمن لەچاو حەشاماتێکی زۆری پێچەوانەکاری سوننەت.

ئەوەی جێگەی سەرنجە، ئەوەیە لە (دیمەشق)یش پەرتوکێکی دیکەبەدەرکەوت کەلەبارەی هەمان بابەتەوە یەوە لەکاتێکی نیزیك بەوی دیکەشدا دەرچوە، پەرتوکەکە لەنوسینی شەرعناس (ئیبن ڕەجەبی حەبنەلی) بەو بەناوی (غربە الاسلام)ەوە دایناوە، کاتێ بەراورد لەنێوان ئەو دوولێکۆڵینەوەیەدا دەکەین، وێکچونێکی سەیریان لەنێواندا دەبینین لەڕوی پێشەکی وبەرەنجامەکانیەوە، هەردوکیان دەڵێن: ئیسلام بەنامۆیی دەستی پێکردوەودووبارە نامۆش دەبێتەوە، هەردوکیان دەڵێن : ئەمەش ڕێڕەوی خوایە لەنێو هەموونەتەوەکاندا. (٤٠)

لەڕاستی دا دەرکەوتنی ئەو دولێکۆڵینەوەیە لەدوو کاتی لێك نزیك دا، یەکیان لەئەندەلوس و ئەوی دیکەیان لەشام، بەلگەیەلەسەر ئەوەی لەوکاتەداو لەنێو وڵاتە موسوڵمانەکاندا شەپۆلێکی بەربلاوی بێ ئومێدی باڵی کێشابوو، شیاوی باسە ئیبن خەلدونیش تاڕادەیەکی نێزیك هاوچەرخی شاتبی وحەنبەلی بوە. (٤١)ڕەنگە ئەویش بەشێوەیەك لەشێوەکان هاوبەشێتی ئەو دوانەی کردبی لەبێ ئومێدی بوونی دا بەرانبەر چارەنوسی ئیسلام. مامۆستا (بۆتۆل) بە (فەیلەسوفی سەردەمی داڕمان)پێناسەی ئیبن خەلدون دەکات وپێی وایە تێورەکەیشی ئاماژە بەخشی ڕەش بینی وخەمۆکیە، چونکە بەرەنجامی ئەزمونێکە لەو مێژوی داڕمانەی کەئیبن خەلدون لەناوەڕاستی دا ژیاوە، بەجۆرێ ئەگەر بەراورد بکرێ لەنێوان بیردۆزەکەی ئیبن خەلدون وبیردۆزی ئەوانەی لەوبەری دەریای ناوەڕاستەوەلەئەوروپاداو لەهەمان سەردەمدا ژیاون، جیاوازیەکی مەزن بەدی دەکرێ. چونکەلەو سەردەمەدا دێرۆکی ئیسلامی هەڵچونەکەی بەرەوسەر، کۆتایی هاتبو "دەربڕینی وەرگێڕ"، لەکاتێکدا مێژوی ئەوروپا پێی دەنایە سەردەمی ڕێنیسانسەوە. (٤٢)جۆرج ساتۆن دەڵێت: (مقدمە)کەی ئیبن خەلدون پەرتوکێکە خاوەن نەزعەی ڕەشنەنداز (ڕەش بینی- Melancholic). ئیبن خەلدون خۆیشی یەکێکە لەڕێبەرانیهەستی بێ ئومێدی... (٤٣)

(کرامر)لەکاتێکداهەوڵ دەدات ئیبن خەلدون بەراورد بکات بە (ئەبی عەلائی مەعەری)پێی وایە ئیبن خەلدون بێ ئومێدی کۆکردۆتەوە... سەبارەت بەجیاوازی نێوانیان دەڵێت: بێ ئومێدی ئیبن خەلدون بێ ئومێدی زانایەك بوە، بەڵام بێ ئومێدی (مەعەری)بێ ئومێدی هۆزانڤانێ بوە، سەرچاوەی ئەم سۆزەش لای هەردوو پیاوەکە، ئەو داڕمانە سەرتاپییە بووە کەدەوڵەتی عەرەبی دوچاری هاتبوو. (٤٤)وادیارە ئیبن خەلدونیش بەهەمان شێوەی هاوڕێکانی چوتە ژێرکاریگەری ئەو دۆخی نامۆییەوە کەلەسەردەمەکەی ئەودا بەسەر ئیسلام دا

هاتبوو. ئەوەتا لە (مقدمە)کەی دا بەراورد دەکات لەنێوان بارودۆخی موسوڵمانان لەسەرەتاداو، ئەو بارودۆخەشیان کەئەو سەردەمەدا تێی کەوتون... لەوبارەوە دەڵێت: موسوڵمانان لە سەرەتاوە سڵیان نەدەکردەوە لەوەی لەپێناوی چاکسازی ئاینەکەیاندا، دونیا لەخۆیان تێك بدەن. بەڵام لەم سەردەمەی دواییاندا، بەپێچەوانەوە رەێ دەکەن، بۆیە گوتەی هۆزانڤانەکەیان بەسەردا دەبڕێت کەدەڵێت :

**(نرقع دنيانا بتمزيق ديننا فلادينا يبقي ولامانرقع (٤٥)**

ئیبن خەلدون لەڕوپەکی ترەوە ناکۆکەلەگەڵ کۆدەنگی شەرعناسەکاندا، شەرعناسەکان بەشێوەیەکی گشتی بڕوایان وابوو دەگرێ ئیسلام لەو نامۆییەی رزگار بکرێت لەرێی گەڕانەوەوە بۆ سوننەتە یەکەمینەکانی پێغەمبەر... لەبەرئەوە شەرعناسەکان ئامۆژگاری وهات وهاواریان پەیڕەو دەکرد لەپێناوی هاندانی موسوڵماناندا بۆگەڕانەوە بەرەو سوننەت. هەرچی ئیبن خەلدونیشە، ئەم بڕوای وابوو، نامۆبونەوە کەی ئیسلام مەسەلەیەکی حەتمیە وبەم پێ یەش ئامۆژگاری و هات وهاوار هیچ کەڵکێکی نیە، موسوڵمانیش پێویستە مل کەچی بویەرەکە ببێت وخۆی بداتە دەم تەوژمەکەیەوە... (بۆتۆل) دەڵێت: (جەبریەت بەئاشکرا لەهەموولاپەڕەکانی مقدمەدا دیارە، ئەمەش ئاماژەبەخشی ئەوەیەکە ئیبن خەلدون لەهەر چرکەیەکدا گوتویەتی: ئەو رێڕەو رێسایانەی مێژو کە من دەربڕیان لێدەکەم، پەژارە بەخشن، بەڵام ئەوە ڕاستی یەکەی جیهانە) (٤٦)

دروستەئیبن خەلدون بە" رەش بینێکی واقیعی)" پێناسە بکرێت، بەمەش لەو رەش بینە ئایدیالیستی یانە جیادەبێتەوە کەخراپی بارودۆخەکە دەگێڕنەوە بۆ خراپی و نالەباری و رەوشت و ئاکاری خەڵکی... ئیبن خەلدون پێی وانیە خەڵکی هیچ دەستێکیان هەبێت لەتێکچونی بارودۆخەکەیاندا، بەڵکو لەدیدی وی دامرۆڤەکان ئامێرگەلیکی کەڕن وبەگوێرەی رێساکانی ئەوکۆمەڵگەیە دەجوڵێن

کەتیایدا دەژین... گەربێت وبەراورد بکەین لەنێوان ئیبن خەلدون و (ئیبن تەیمیە)داکەماوەیەکی نێزیك لەدوای ئەو ژیاوە، جیاوازیەکی ڕوون بەدی دەکەین... ئیبن تەیمیە زۆرینەی ڕۆژگارەکانی تەمەنی بەخەبات وئامۆژگاری کردنەوە بەسەربرد، چونکە ئەو بڕوایەکی پتەوی هەبوو بەوەی هۆکاری خراپەو گەندەڵی نێو موسوڵمانان دەگەڕێتەوە بۆ بڵاو بونەوەی (بیدعە)لەناویان دا، بۆیە داوای دەکرد وازلەو بیدعانە بهێنن وبگەڕێنەوە سەر سروشتی یەکەمینی ئیسلام، لەم پێناوەشدا بیدعە چیەکان بەرهەڵستی یان کردو زۆریان چەوساندەوە، بەڕادەیەك بەحەپس گراوی مرد. (٤٧)ئێمە بەتەواوی نازانین ئایا ڕێی ئیبن خەلدون چی بوە لەبارەی ئەو ڕەوتەی (ئیبن تەیمیە)وە... بەڵام گومانم وایە لەو ڕێبازە ڕازی نەبودو بەبێ هودەیشی زانیوە... پێم وایە سەرزەنشتی (ئیبن تەیمیە)دەکات ودەڵێت: (براکەم ! ئەوە چی یەخۆت بەشتێکەوە شەکەت دەکەیت کەهیج کەلکی نیە، ئەوەتا داوای چاکسازی کۆمەڵگا دەکەیت بێ ئەوەی ئاگاداریئەو یاسایانە بیت کەکۆمەڵگە لەسەری ڕێ دەکات).

یەك لەجیاکاریەکانی ئەو سەردەمە، ئەوەیە ئەو دوو پیاوەی تێدا بەدەرکەوت کەبەدوان لەمەزنە هزرڤانانی ئیسلام دێنە هەژماردن. هەر یەکێك لەودوانە لەنێو ژینگەیەکی فیهقی دۆگمادا پێگەیون، هەردوکیشیان بەشداری سیاسەتیان بەشێوەیەك لەشێوەکان کردوە... ئەوەندە هەیە، یەکێکیان لەسەر بنەمایەکی "ئایدیالیستی" بەشداری سیاسەتی کردوە، ئەوی دیکەشیان لەسەربنەمایەکی (واقیعی)... ئیبن تەیمیەلەڕێبازی سیاسی خۆیدا ئەوپەڕی ئایدیایی بوو، هەرگیز فرت وفێڵی نەدەکردو خۆی نەدەساچاند... بەڵام ئیبن خەلدون لەسیاسەت کردن دا هەلپەرست و دوو ڕوو بوو، هەمیشە لەگەڵ تەوژمەکەدا دەڕۆشت... بەرهەمی فیکری هەرکامیشیان گونجاو بوو لەگەڵ ڕێبازە سیاسیەکەیدا.

ئیبن خەلدون پێی وایە شتێکی بێ هودەیە، گەرکەسێك هەوڵ بدات و خەبات بکات لەپێناوی چاکسازیەکی کۆمەلایەتی یان رامیاری دا بەپێچەوانەی سروشتی کۆمەلگەوە. ئەم بۆچونەی ئیبن خەلدون لەیەشێکی (مقدمە)دا بەناشکرا دەردەکەوێت کەناوی ناوە (پیریکەدابەزیە سەردەولەت ئیدی بەرزنابێتەوە)لەوبەشەدا ئیبن خەلدون دەلێت: (ئەگەر پیرێتی لەدەولەت دا سروشتی بێت، ئەوا ڕودانەکەی وەك ڕودانی هەرمەسەلەیەکی سروشتی دەبێت، وەك پیربونی لەمەزاجە ناژەلیەکان و...پیرێتی لەنەخۆشینە درێژخایەنەکانەوچارەسەری ناگرێت ولەکۆڵ نابێتەوە. چونکە شتێکی سروشتیە. زۆرجار دەبێ کەسێك داروەدەستەکانی نێودەولەتێ کەناگاییەکیان لەسیاسەتدا هەیە، رادەچەنێ ودەبینێ نیشانەکانی پیرێتی دابەزیوەتەسەر دەولەتەکەیان، ئیدی واگومان دەبات کەلەتوانادا هەیە ئەو پیرێتیەی لەکۆڵ بکرێتەوە، بۆیە دەست بەهەولدان دەکات بۆ چاکسازی کردنی مەزاجی دەولەتەکە لەوپیربونە، واش دەزانێ بەهۆی کەمتەرخەمی ئەوانەی پێش خۆی ولەئەنجامی بێ ناگایی ئەوانەوە دەولەتەکە وای بەسەرهاتودو پیربوە، بەلام مەسەلەکە وانیە، بەلکو مەسەلەیەکی سروشتی یەبۆدەولەت، نەریت وڕاهاتنیش ڕێگرن لەبەردەمی دا، ڕاهاتن ونەریتیش پلەیەکی سروشتی ترن، بۆنمونە ئەگەر کەسێك ببینێت باوکیوکەس وکارەکەی بەزۆری ئاوریشم وسورمە دەپۆشن، لەچەك و پێداویستی یەکانیان دا زێڕ بەکار دەهێنن، خۆیان دوور دەگرن لەوەی لەجفات ونوێژەکاندا تێکەلاوی خەلکی بکەن، ئەوا ئەمیش ناتوانێت پێچەوانەی پێشینەکانی خۆی بێت وبەرەو زبری لەپۆشاك دا وتێکەلی کردن لەگەل خەلکی دا بچێت... هتد)(٤٨)

وادەردەکەوێ ئیبن خەلدون لەم جێگەیەدا وەك ئەوە وایە ڕەخنە لە (ئیبن تەیمیە)وهزرڤانە ئایدیاییەکانی وەك ئەو بگرێ، ئەوانەی هەوڵ دەدەن ڕیفۆرمی کۆمەلگەو دەولەت بکەن لەڕێگەی ڕیفۆرمی خوونەریتەکانەوە... خوو

نەریتەکانیش لەدیدی ئیبن خەلدونداوەك دیاردە سروشتیەکان وان، خەڵکی مل کەچیان دەبن، بەبێ ئەوەی بتوانن ئەو نەریتانە مل کەچ بکەن بۆ خۆیان، هەرکەسیش هەوڵ بدات چاکسازی لەنەریتەکانی خۆیدا بکات بەتاق وتەنها بەدورلەخەڵکی، ئەوا دەبێتە جێگەی ڕابواردن وگاڵتە پێکردنی خەڵکی، لەوانەشە مەسەلەکە بەرەنجامێکی پێچەوانەی هەبێت لەوەی خۆی دەیەوێت.

ڕەنگە لێرەدا کەسێك بپرسێت: ئەدی کاریگەری ئەو زینگە فیهقی یە دۆگمایە، کوێ وە چوو، کەئیبن خەلدون تیادا پێگەیشتبوو؟ ئیبن خەلدون چی کردوە لەوفەرمانانەی ئیسلام کەچاکسازی کردن بەگوێرەی تواناو گونجان پێویست دەکەن؟.

وام دێ بەخەیاڵ دا، ئیبن خەلدون، لەکاتێکدا ڕایەکەی پێشوی دەربڕیوە، ئەم پرسیارەی لەیاد نەکردوە، بەڵکو لەوانەیە ئەمە بوبێتە فاکتەری سەراسیمەیی وململانێ لەنێو ناخی دا.لە ڕاستیش دا ئیبن خەلدون بەتەواوی درگای کلۆم نەداوە لەڕووی هەر ڕیفۆرمێکی کۆمەڵایەتی دا. بەڵکە ڕێی وایە تاك لەتوانای دا هەیە هەندێ چاکسازی لەکۆمەڵگەکەی دا بکات، وەلێ لەم پێناوەدا پێویستە بەگوێرەی داخوازیەکانی سروشتی ئەو کۆمەڵگەیە بڕوات بەرێوە گەتیای دا دەژی... لەم بوارەدا ئیبن خەلدون ئەم بۆچونەی هێنایە کایەوە کەدەڵێت: (بانگەوازی ئاینی بەبێ دەمارگیری تەواو کامڵ نابێت)... ئەو لەئەنجامی ئەزمونی واقیعی نێو کۆمەڵگەکەیەوە ئەو بۆچونەی بەرهەم هێناوە بەتایبەت کەبینیویەتی ئەو کۆمەڵگەیەی خۆی تێیدا دەژی لەسەر بناغەی دەمارگیری ڕاوەستاوە. بۆ یەهەر کەسێك لەکاتی هەوڵە چاکسازیەکانیدا دەمارگیریەك لەپشتی یەوە نەبێت، پێویستە لەسەری لەگەڵ خەڵکەکەدا ڕێ بکات وخۆی بدات بەدەم تەوژمی ئەو خەڵکەوە، ئیتر بەرەوهەرلایەکی ڕابێچ دەکەن (گرنگ نیە —وەرگێڕ).

وادیارە، ئیبن خەلدون لەهەندێ دەربڕینی دا پێی وایە خودا کۆمەلگەی دروست کردووەو لەسەر ڕێسای دیاریکراویش وەڕێی خستوە، وەك چۆن سروشتی لەسەریاسای دیاری کراو وەڕێ خستوە، بەلام هەرگا ویستی دەتوانێت ئەو یاسایانە بەشێوەیەکی ڕادیکالی بگۆڕێت... هەرلەم سۆنگەیەشەوە خودا پێغەمبەرانی ڕەوانەکردووەو پشتیوانیشی لەئاسمانەوە لێکردون. ئەمەش یانی ڕێساکانی کۆمەلگە گۆڕانیان بەسەردا نایەت، تەنها لەسەردەستی ئەو پێغەمبەرانەدا نەبێت کەخودا ڕەوانەیان دەکات... کەسی ئاسادەش، نەکاری ئەوە گۆڕانکاری لەویاسانەدا بکات ونەتوانای ئەو گۆڕانکاریەشی هەیە. چونکە ئەم بەندەی خودایەو مل کەچی ویستی خودایەو پێویستە لەسەر قەزاو قەدەری خوداش ئارامگربێت... ئیبن خەلدون لەکۆتایی ئەو بەشەدا کەئاماژەمان پێکرد دەلێت: (ئەوە لەبەرچاو بگرەو نهێنی و حیکمەتی خوداش فەرامۆش مەکە لەتواناداری وی بەسەرهەر شتێك داکە قەدەری تێیدا هەبێت...) (٤٩)

## پەراوێزەکانی بەشی حەوتەم

١ ) ساطع الحصرى، دراسات عن مقدمة ابن خلدون، ل ٤٩-٥٢.

٢ ) علي عبد الواحد واڤي، ابن خلدون، مطبعة الرسالە، ل ٢٧.

٣ ) مقدمه ابن خلدون، (گبعه المكتبه التجاريه)ل ٥٤٢.

٤ ) طه حسين، فلسفه ابن خلدون الأجتماعية، ل ١٠.

٥ ) ابن خلدون، التعريف، ل ٥.

٦ )هـ س، ل ١٤.

٧ )هـ س، ل ٥٦.

٨ )محمد عبدالله عنان، ابن خلدون، حياته وتراثه الفكري، قاهيره ١٩٣٣، ل ١٧.

٩ )ساطع الحصري، دراسات عن مقدمه ابن خلدون، ل ٤٩.

١٠ ) محمد بن جرير الطبري، تاريخ الأمم والملوك، قاهيره ١٩٣٩، ج ٤، ل ١٨٧ — ٢٠٨.

١١ ) احمد أمين، ضحى الأسلام، قاهيره ١٩٣٨، ج ١، ل ٢٣ — ٢٤.

١٢ ) ساطع الحصري، دراسات عن مقدمة ابن خلدون، ل ٧١.

١٣ ) ابن خلدون، التعريف، ل ٢٠.

١٤ ) گۆڤارى الفكرى تونسى، مارس ١٩٦١، ل ٥٩.

١٥ ) ابن خلدون، التعريف، ل ٢٤ -٢٥.

١٦ ) عباس محمود العقاد، الشيخ الرئيس ابن سيناء، قاهيره ١٩٤٦، ل ٧-٨.

17) Muhsin Mahdi ،Ibn khaldun s philosophy of History p. 36.

١٨ ) ابن خلدون، التعريف، ل ٢٢.

١٩ ) گۆڤارى الفكرى تونسى، مارس ١٩٦١، ل ٥٩.

٢٠ ) ساطع الحصرى، دراسات عن مقدمة ابن خلدون، ل ٧١ -٧٢.

٢١) قدري قلعجي، جمال الدين الأفغاني، بيروت ١٩٥٢، ل ٢٣ — ٢٥.

22) Muhsin Mahdi ،op. cit ،p.36- 37.

٢٣) أحمد أمين، ضحى الأسلام، قاهيره ١٩٣٨، ج ٢، ل ٢٧ -٣٥.

٢٤) مقدمه ابن خلدون، (طبعة المكتبة التجارية)ل ٥٤٤.

٢٥) آدم متز، الحضارة الأسلامية في القرن الرابع الهجري، (وەرگێڕانی محمد عبد الهادی أبو ريده)، قاهيره ١٩٤٧، بەرگی ١، ل ٨٥-٨٦.

٢٦) محمد فهمي عبد اللطيف، ابو زيد الهلالي، قاهيره ١٩٤٦، ل ٢٣-٢٤.

٢٧) آدم متز، ھ س، بەرگی ١، ل ٨٧.

٢٨) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربي) ل ٢٤٧ — ٢٤٨.

٢٩) ھ س، ل ٢٣٩.

٣٠) ھ س، ل ١٠١٣.

٣١) گۆڤاری العربی كوديتی، ژماره ٣٣ ئاب ١٩٦١، ل ٤٤.

٣٢) محمد فهمی عبد اللطيف، ابو زيد الهلالی، قاهيره ١٩٤٦، ل ٦٣ -٦٤.

٣٣) ابن خلدون، التعريف، ل ٢٢٨.

34) Arnold Toynbee ،A Study of History ،London ، 1939 ،vol III ،p 321 -328.

٣٥) گۆڤاری فيكری تونسی،، مارس ١٩٦١، ل ٦١-٦٢.

٣٦) ساطع الحصري، دراسات عن مقدمه ابن خلدون، ل ٥٤- ٦٢.

٣٧) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربي) ل ٤٧٦.

٣٨) ھ س، ل ٤٣٢.

٣٩) گاستون بوتول، ابن خلدون، ل ١٩.

٤٠) ابن رجب الحنبلی، غربة الأسلام، تحقيق احمد الشرباصی، قاهيره ١٩٥٤.

٤١) شاتبی ساڵی ٧٩٠ ی كۆچی مردوه، حەنبەلیش ساڵی ٧٩٥ مردووه، ئيبن خەلدونیش ساڵی ٨٠٨ مردووه.

٤٢) گاستون بوتول، ابن خلدون، فلسفته الأجتماعية، ل ١٢٧.

43) Gorge Sarton ،Introduction To The History Of Science، (Baltimore 1927 - 1948)vol. III.1770.

٤٤) تەها حوسەین، فلسفه ابن خلدون الأجتماعية، ل ٢٣.

٤٥) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربي) ل ٥٤٧ -٥٤٨.

٤٦) گاستون بوتول، ابن خلدون، ل ١١٤.

٤٧) محمد ابو زهره، ابن تيميه، ل ٢٠٧- ٢٠٨.

٤٨) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربي) ل ٦٩٢ — ٦٩٣.

٤٩) هـ س، ل ٦٩٦.

# بەشی هەشتەم

## (ماشەی بیردۆزەکە)

لەبەشی ڕابردودا ئەو هۆکارە هەمەچەشنانەمان نمایش کرد، کەسەرجەمیان بەشدار بوون لەپێکهێنانی ئەقڵیەتی (ئیبن خەلدون) دا.تێبینی مان کرد هەریەك لەو هۆکارانە لەسەر چاوەی جیا جیاوە هاتونەتە سەر (ئیبن خەلدون)، وەك سەرچاوە گەلی دەرونی و کۆمەڵایەتی وژیاری... وەڵێ سەرجەمیان پەلکێشیان دەکرد بەرەو ورووژانی سەرسامی یاخود ململانێی دەرونی لەناخی دا... هەرئەمەش بوو وای لێکرد لەزۆرینەی هزرڤانی سەردەمەکەی خۆی جیاواز بێت.

ئێمە چاوڕوانی بیرکردنەوەیەکی داهێنەرانە لەمرۆڤێك ناکەین کەبەچاوی دڵنیایی وبێ سەراسیمەییەوە سەرەنجی مەسەلەکان دەدات، چونکە ئەوتەنها لەیەك لایەنەوە سەیری مەسەلەکان دەکات و، متمانەی تەواویشی هەیە بەڕاستی ودروستی ئەوەی دەی بینێت وهیچ گرفتێکی هزریشی نیە تاکو دوو دڵی بکات... وەڵێ کەسێکی سەراسیمە کەبارو دۆخەکە ناچاری دەکات لەگۆشەنیگای هاودژو جیا جیاوە سەیری مەسەلەکان بکات، هەمیشە سەرسام ودڕدۆنگەو نازانێت کام لایەنیان ڕاستە... بۆیە ناچار دەبێت بۆچارەسەرێك بگەڕێت تاکو چارەسەری دودڵیەکەی پێ بکات، ئینجا بۆی هەیە ئەو چارەسەرە بیگەیەنێتە بیرۆکەیەکی نوێ کەهەرگیز کەسانی متمانەدارو دڵنیا پێی ئاشنانین. قەدەر وای سازاند (ئیبن خەلدون)گوزەر بکات بەماوەیەك لەسەرسامی و دودڵی دا، دیارە ئەم گوزەر کردنەش لەژێر کاریگەری ئەو هۆکارە فرە چەشنانەدا بوو کەلەبەردا ئاماژەمان پێکردن... بۆیە دروستە بڵێین، لەئەنجامدا ئەقڵیەتی (ئیبن خەلدون)وەك ئەو

بۆمیە زەبەلاحەی لێهات کەمادەی تەقینەوەی زۆرو زەوەندی تێدا کۆدەبێتەوە، وچاوەڕوانی ماشە یەکی بچکۆلانە دەکات تاکو

بیتە قینێتەوە. (ئیبن خەلدون)مان بەو پیاوە بەغدادیە چواند، کەڕۆشتە قاوەخانەکەوە، لەسەرەتادا ئەو پیاوە هیچ نیازێکی نەبوو شاگردەکە بکوژێت، دواتر دەمبۆڵەیەکی چکۆلانە لەنێوانی ئەو وشاگردەکەدا ڕوی دا، ئەم دەمبۆڵە سادەیە وای کردلەو کابرایە تاکو بەشێوەیەکی کت وپڕو ئەستی پەلامار بدات و شاگردەکە بکوژێت... ئەم وێکچواندنەش سادەو ساکارەو ڕەنگە هەندێ لەو توێژەرانەی کەزۆر لەمەسەلەکەدا قوڵ بونەتەوە پێی قایل نەبن، وەڵ لەگەڵ ئەوەشدا من بەشتێکی گونجاوی دەزانم بۆ وێناکردنی بارودۆخی (ئیبن خەلدون) لەکاتێکدا سەرقاڵی نوسینی (مقدمە)بەناوبانگەکەی بوە.تێ بینی دەکرێ، (ئیبن خەلدون) لەکاتێکدا لەژیانی ڕامیاری دابڕاو لەنێو تیرەی (بنی عریف)دا لەبیابان گۆشەگیر بوو، نیازی نەبوو (مقدمە)بنوسێت، لەساتە وەختی گۆشەگیریەکەیشی دا ئەوەی بەئەندێشەدا نەهاتوە کەزانستێکی نوێ دادەمەزرێنێت. تەنانەت ئەو مێژوە گشتی یەش کەلە کۆتاییەکان (ی ژیانی —وەرگێڕ)نوسیبوی، ئەمیشی مەبەست نەبوو کەبەو شێوەیە بێت... بەڵکو لەسەرەتادا (ئیبن خەلدون) دەیویست مێژویەك بنوسێتەوە تەنهاتایبەت بێت بەوڵاتانی مەغریب (١)وەڵ کاتێ دەستی بەکارەکەی کرد، هەستی دەکردناتوانێ مێژوی وڵاتانی مەغریب بنوسێتەوە بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ کتێبەناودارەکانی مێزوو، وەك مێژووەکانی تەبەری ومەسعودی...هتد... ئەمەش بۆئەوەی بەوردی بکۆڵێتەوە لەرادەیپەیوەستەگی مێژوی مەغریب بەمێژوی نەتەوەکانی ترەوە بەشێوەیەکی گشتی، هەروەها بۆئەوەی لەو ڕۆڵەش بکۆڵێتەوە کەمەغریب لەدێرۆکی ئیسلامیدا گێڕاویەتی، بەشێوەیەکی تایبەتی.

وادیارە لەکاتێکدا ڕۆچوە بەنێو خوێندنەوەی ئەو پەڕاوانەدا هەندێ هەواڵی تێدا بینیون کەلێیان دڵنیا نەبوەو ئەقڵیشی تێبڕی وەها هەواڵێکی نەکردوەو پێ

پەسەند نەبوە. هەر ئەمەش هانی داوە (مقدمە)یەك بۆمێژووەکەی بنوسێت وتیای دا ئەو هۆکارە ڕون بکاتەوە کەوای لێکردوە ئەو هەواڵانە ڕەت بکاتەوە. (ئیبن خەلدون) دەڵێت : (کاتێ کتێبەکانی ئەو کۆمەڵەم خوێندوە، قوڵاییەکانی دوێنێ وئەمرۆم پشکنی، ئیدی چاوگی بەهرە لەخەوەنوچکەی بێ ئاگایی ونوستن ڕابوو) (٢) لەم پەرەگرافەدا (ئیبن خەلدون) بەڕاشکاوی ئاماژەدەدات بەوەی چاوگی بەهرەکانی لەکاتێ موتاڵاکردنی پەراوەکانی مێژودا وەئاگاهاتەوە، لێرەدا ئەم پرسیارە ڕوبەڕومان دەبێتەوە : ئایائیبن خەلدون لەکاتێ وەئاگا هاتنەوەو ڕابونی بەهرەکانی دا، نیازی بوو "مقدمە" کەی بەوەقەبارەیە بێت کەدواتر پێی گەیشت؟.

## زریانی ئەندێشە:

هەندێ بەلگە لەئارادان، دەیسەلمێنن (ئیبن خەلدون)مقدمەکەیی لەژێرکاریگەری لەناکاوی"زریانی ئەندێشە" دا نوسیوە. ئەو بۆخۆی دان بەوڕاستی یەدا دەنێت ودەیداتە پاڵ (نیگا)لەوبارەوە دەڵێت: (ئێمە خودا بەنیگا ئەوەی پێ بەخشین) (٣)سەرباری ئەوەش سەرسامی خۆی دەردەبڕێت بەو شێوازەی کەبیرۆکەکانی مقدمەی لەمێشکی دا گەلاڵە بووە، ئەوەتا دەڵێت : (چوارساڵی ڕەبەق خەریکی بووم، وازم لەهەموو سەرقاڵیەکان هێنابوو... مقدمەکەم بەجۆرێکی سەیر تەواوکرد، کەلەوخەلوەت وگۆشەگیریەدا ڕێنمونی کرام بەرەو ڕوی، ئیدی لێزمەی پەیف و واتاکان داباریبنە سەر هزر تاکو کەفەکەی لاکەوت و، بەرهەمەکانی هاتە دەست "دەربڕینی وەرگێڕ") (٤)پێم وایە، لەسەرەتادا (ئیبن خەلدون) ویستویەتی (مقدمە)کەی چەند لاپەڕەیەك بێت ودواتر دەست بکات بەنوسینی مێژووەکەی، بەڵام هێشتر لەنوسینی ئەو لاپەڕانە لێ نەبوبویەوە، تانەوە بوو بەهەرەکانی تەقینەوە، ئیدی جار لەدوای جار لێزمەی ئەندێشەی بەسەردا دادەباری... ئینجا بۆی ڕون بویەوە کەهێشتر بابەتی بەشێکی تەواو نەکردوە، دەروازەی بابەتی بەشێکی تری لەبەردەمدا والا دەبێت، هەرکە گەشتبێتە ئەو بڕوایەی کەوا لێکۆڵینەوەکەی تەواو کردوە، دەست بەجێ ناتەواویەکی دیکەی تێدا دۆزیوەتەوەو ناچار بوە لەگۆشەنیگایەکی دیکەشەوە سەبارەت بەومەسەلەیە لێکۆڵینەوە بکات.

بەلگەش لەسەر ئەم گوتەیە، ئەوەیە کەدەبینین لەڕوی پۆلاندن وڕێکخستنەوە لە (مقدمە)دا شپرزیەك هەیە، لەڕاستی دا ئەو کتێبە ڕێك نەکراوە بەگوێرەی ڕێسایەکی (ڕەنگ ڕێژکراوی داڕێژراوی —وەرگێڕ)پێش وەخت، زۆرجاریش دوبارەبونەوەو جیاوازی بێ پاساوی تێدا دەبینین، ئەمەش

بەلگەیە لەسەر ئەوەی (ئیبن خەلدون) بەپەلەو لەژێر کاریگەری (زریانی ئەندێشە) دائەوشتانەی نوسیوە. ئەگەر لەبەردا خۆی بۆئەو نوسینە ئامادەبکردایە، کاریگەری ئەو خۆئامادەکردنەمان لەنێو (مقدمە)داو لەڕوی ڕێکخستن وپۆلاندن (ی بابەتەکانیەوە –وەرگێڕ)دەبینی. ئەم مەسەلەیەش شتێکی ئاساییە لەزۆربەی ئەو پەرتوکانەدا کەلەژێرکاریگەری نیگای هەنوکەیی داو دورلە ئامادەباشی پێش وەخت دەنوسرێن، ڕەنگە ئەوپەرتوکانە داهێنەرانەش بن و ناوبانگێکی فرەش پەیدا بکەن لەنێو خەلکی دا، بەلام لەهەمان کاتیشداخالی نابن لەشپرزی وتێکەل وپێکەلی ودرێژدادڕی کەسەرجەم ئەوانەش لەجێی خۆیاندا نین.ئینجا دادگەریش نیە گەربێت و لەوسۆنگەوە سەرزەنشتی دانەربکەین. چونکە ئەگەر ئەودانەرە لەکاتی نوسین دا هەول بدات هەندێ ڕێك وبێکی ورێکخستن لەنوسینەکەی داپەیڕەو بکات ئەوا زۆرێکی نیگای داهێنەرانەو دەگمەن لەکیس دەچێت و، ڕەنگەبەو هۆیەشەوە پەرتوکەکە قەشەنگی خۆی لەدەست بدات.

دانەرانی نوێ، توانیویانە ئەوناتەواویە لەدانانی کتێب دابگوزەرێنین، ئەمان دێن وئەونیگا دەگمەنانە لەپەڕەکاغەزدا دەنوسنەوە، یانی خاوە خاوناکەن لەتۆمارکردنیان دا، بەلکو دەست بەجێ لەترسی لەبیرچونەوەیان لەپارچە کاغەزدا تۆماری دەکەن، دواتر ئەو زانیاریانەی بۆ زیاد دەکەن کەلە سەرچاوە جۆراو جۆرەکانی ترەوە دەستیان کەوتوە، دواتر کەهەستیان کردتاڕادەی کومسایی نوسیویانە، ئەوجا پەیکەرێ بۆبەش ودەروازەکانی پەرتوکەکەڕێك دەخەن، لەدوایدا دەست بەنوسین دەکەن، لەئەنجامیشدا کەپەڕاووکە دێتە بەرهەم، هەردوخەسلەتی قەشەنگی داهێنان وکوالێتی ڕێکخستنی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە.

وەلێ هەرچۆن بێت، ئەم شێوازە نوێ یە، قەیمیەکان پێی ئاشنا نەبوون، بۆیە بەدوریش دەزانرێ ئیبن خەلدون پێی ئاشنا بوبێت ولەکاتی نوسینی (مقدمە)دا پەیرەوی لێکردبێ. لەبەر ئەوە دەبینین (مقدمە)لەدۆخێکی شپرزی وادایە گەخوێنەری نوێ بەلایەوە پەسەند نیە. ئیبن خەلدون لەماوەیەکی زۆر کورت دا لەنوسینی (مقدمە)بویەوە، گەلە پێنج مانگ تێ پەڕی نەکردوە... (٥)ئەمەش جێگەی سەرنجە، چونکە بەڕاستی سەیرە لەماوەیەکی کورتی وادا کۆتایی بهێنرێ بەنوسینی پەرتوکێ کە بیرۆزێکی ئاوها گەورەی لەخۆ گرتبێ، ئەم قسەیەش تەنهانەوکەسانە لێی تێ دەگەن کەبەدەست دانانی پەرتوکەوە دەناڵێنن وئاشنان بەدەردە سەری وناڕەحەتیەکانی.

نکولی ناگەین لەوەی ئیبن خەلدون پتر لەجارێك بەسەر (مقدمە)دا چوەتەوەو پوختی کردوەو شتی تازەیشی خستۆتە سەر (٦)بەڵام وادەردەکەوێ نەی توانیبێ بارودۆخی شپرزی چاك بکات، تەنانەت ڕەنگە ڕاست بێ گەر بڵێین: بەو زیاد کردنانەی شپرزی و تێکەڵی و پێکەڵی زیاتری لەنێو (مقدمە)دا دروست کردوە.

ئەو بلیمەت بووە، هەرچۆنیش بێ کەسی بلیمەت مەعزورە !.

## نهێنی یەکی پەنامەکی :

مامۆستا (ساتع حەصری)وەسفی بارودرخی سایکۆلۆژی ئیبن خەلدون دەکات لەوکاتەدا (مقدمه)ی‌نوسیوە، دەڵێت: (من کاتێ بیردەکەمەوە لەوەی ئیبن خەلدون لەم ڕوەوە نوسیویەتی، دەگەمە بڕوایەکی تەواو بەوەی گەشتنی بەوکۆمەڵە ڕاوبۆچونە داهێنەر و زۆرانەی لەمقدمەدا نوسراون، لەڕێ "هەڵقوڵینی ناکاوی" بوە، لەدوای"گومان پێ بردنی ناوەکی" و"هەڵهاتنێکی ئەستی"... بەهەمان ئەو شێوەیەی کەزانایانی دەرونناسی لەژیانی ژمارەیەکی زۆری هزرڤان و هونەرمەندان ومێژوی ژمارەیەکی زۆر لەداهێنان ودۆزینەوە جیا جیاکاندا تێ بینی یان کردوە... ئەوجۆرە"هەڵقولینە لەناکاو" ەیکەهزرڤان پاڵ دەنێ بەرەو "سەرسام بون لەبەرەنجامەکانی بیرکردنەوەی خۆی" وهەندێ جار دەگاتە ئەو ڕادەیەی وەك "ڕاوبۆچونی نیگایی" سەرنجی بۆچونەکانی خۆی بدات، لە"توانایەکی دەرەوەی خود" ەوە دەردەچێت، وەك ئەوەی بەسەری دا خوێندرابێتەوە...) (٧)

من پشتگیری (حەصری)دەکەم لەوگوتەیەی دا، پێشم وایە ئیبن خەلدون لەکاتی سەرڤاڵ بونی لەناکاوی دا بەنوسینەوەی (مقدمه)وە، وەك ئەو داهێنەرە وابودکە بیرۆکەیەکی لەناکاو دێتە مێشکی یەوەو ئیدی سەرڤاڵ دەبێت بەداهێنانەکەیەوەو جاروباریش بەسەرسامیەوە لەخۆی دەپرسێت : بۆچی ئەو بیرۆکەیە لەبەردا نەهاتۆتە مێشکمەوە.جاری واهەبوە داهێنەرێك ماوەیەکی درێژ هەوڵی داوە ئامێرێك دروست بکات، بێ ئەوەی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت. بەردەوام بیرلەداهێنانەکەی دەکاتەوەو جارلەدوای جاریش تاقی کردنەوەکانی دوبارە دەکاتەوەو سەرجەمیشیان بێ سود دەبن، کەچی لەناکاودا، لەچرکەیەکی سەرسامی و بێ ئاگایی دا، دەبینین دەست بە هەڵبەزینەوەو هەڵقونین دەکات، کاتێ هەست دەکات کەچارەسەری پێویستی دۆزیوەتەوە... ئیدی بەو جۆرە

پەیکەری داهێنانەکەی بەڕونتر دێتە دەست. هزرڤانە مەزنەکانیش، ئەوانەی خاوەنی تیۆری زانستی بەناوبانگن شتی وایان بەسەر دێ. دەگێڕنەوە (ئەرخەمیدس)گیرۆدە بوو بەدەستی مەسەلەیەکی فیزیاییەوە، دواتر دەچێتە گەرماو، هێشتر خۆی لەنێو ئاوەکەدا نوقوم نەکردبوو، لەناکاو شیکاری مەسەلەکەی دۆزیەوە، بۆیە هەربەڕوتی لەگەرماو هاتە دەرێ و بەسەرشەقامەکاندا دەستی بەڕاکردن کردو هاواری دەکرد : "دۆزیمەوە". هەمان شێوە ڕوداویش دەگێڕنەوە لە"نیوتن" ەوە، ئەو پیاوەبلیمەتە مەزنە جارێکیان بەتەنیشتی دارسێوێکەوە دادەنیشێت وبەسەرسامیەوە دەڕوانێتە ئاسمان و بیردەکاتەو لەخۆی دەپرسێت : ئایا چۆن کەهکەشانەکان لەچوار چێوەی ڕێسایەکی نەگۆڕدا دەجولێن و لەوسایایەلانادەن؟! لەناکاو سێفێك لەتەنیشتی یەوە بەردەبێتەوە خوارێ، ئەم بەربونەوەیەش دەبێتە هاندەرێك بۆ نیوتن تاکو (تیۆری ڕاکێشانی زەوی) بدۆزێتەوە.

دکتۆر "هاردنج" لەپەرتوکەکەی دا "پەکالاکردنەوەی نیگا"، باسی زۆرێك لەهونەرمەندو هۆزانڤانمان بۆدەکات کەلەکاتی دانانی هەڵبەست یان پارچە هونەریە بەناوبانگەکانیان دا، .دەکەونە نێو بارێکی دەرونی لەناکاو، و نازانن لەکوێ وە ئەو بارە دەرونیە هاتۆتە سەریان، زۆر جاریش بەهرەکانیان بەجۆرێ زریان دەکات کەناتوانن تۆماریان بکەن بەهۆی خێرایی هەڵقوڵینی یەوە، لەهەمان کاتیشدا هەست دەکەن هێزێکی پەنامەکی لەدەرەوەی ویست وخواستی خۆیانەوە شتەکانیان بەسەردا دەسەپێنێت.... (٨) جێگەی ئاماژە پێدانە، هۆنەرە عەرەبەکان لەسەردەمی نەفامیەوە دەرکیان بەومەسەلەیە کردوە، وەڵێ داویانەتە پاڵ جنۆکەو شەیتانەکان، گوایە هەر هونەرێکیان شەیتانێکی تایبەت بەخۆی هەیەو هۆنراوەی فێردەکات، هەرکاتێ شەیتانەکەی لێ دوربکەوێتەوە، هەست دەکات ناتوانێ هۆنراوەی باش بهۆنێتەوە.

زانایانی دەرون ناس ئەم مەسەلەیە بەوە لێك دەدەنەوە، کە ئەفراندن دەگەڕێتەوە بۆکارایی ئەست لەزیهنی مرۆڤی داهێنەردا. چونکە ئەست هەموو ئەو زانیاری و بیرۆکەو ئەزمونانە زەخیرە دەکات کەدەگەنە زهینی مرۆڤ... کاتێکیش مرۆڤ دادەمێنێت بەدەستی گرفتێکی سەختەوە، هەوڵ دەدات بیرلەو گرفتە بکاتەوە تاکوبتوانێ چارەسەری بۆ بدۆزێتەوە، لەوکاتەدا بیرۆکە جۆراو جۆرە زەخیرەکراوەکانی نێونەست دەست بەکار لێك ومتروبەکردن دەکەن لەنێوان یەکتردا، لەناکاو وادەبێ دوو بیرۆکە یان زیاتر لەو بیرۆکە زەخیرە کراوانە پێکەوە گرێ دەدرێن، زۆر جاریش چارەسەری گرفتە سەختەکە لەو گرێ درانە دادەبێت...

وادەردەکەوێ ئیبن خەلدونیش لەکاتی داهێنانی بیردۆزە مەزنە کۆمەڵایەتیەکەی دا ناوا بارودۆخێکی دەرونی هەبوبێت، لەبەشی ڕابردوشدا دیتمان چۆن بیرۆکە جۆراو جۆرەکان دەبونە هۆی دروست بونی سەرسامی ودوڵی لەنێو ناخی دا... بیست ساڵی ڕەبەق بەدەستی ئەوسەرسامیەیەوە دەیناڵاند، لەو ماوەیەدا کەلەبگرە و بەردەی سیاسەت دا بوو، تێکەڵاوی خەڵکانێکی زۆریشی دەکرد.لەدوایدا هەلی ئەوەی دەست کەوت لەسیاسەت هەڵ بێت ولەژیانیش دابرێت، تاکو مێژویەك بۆنەو کۆمەڵگەیە بنوسێت کەتیای دا دوچاری سەرسامی ببوو. ئەوێ دەمێ، ئەستی ئیبن خەلدون لێوان بوو لەزانیاری وئەزمونی جۆراو جۆر، بۆیە هەردەبێ ئەو زانیاری و ئەزمونانە لەوێندەر ولەبەر ئەنجامی ئەو سەراسیمەییەدا کارلێك بکەن.

## هەڵەکانی مێژونوسان :

ئیبن خەلدون لەسەرەتای (مقدمە)دا ئاماژە بەو هەڵەو پەڵە زۆروزەوەندانە دەدات کەلەپەڕەکانی مێژودا دۆزیویەتیەوە... لەوبارەیەوە ئاوادەدوێت: ئەو هەڵەو ناتەواویانە قاچی زۆرێك لەمێژونوسەمتمانە دارەکانی تێدا خلیسکاوەو خەڵکی دیکەش ئەوانەی توانای بیتینیان لاوازە ولە"قیاس" بێ ئاگان، ئەو هەڵە وناتەواویانە لەومێژونوسانەوە دەگوازنەوە، بەو جۆرە هونەری مێژو بویە هونەرێکی تێکەڵ وپێکەڵ وئەوانەشی بەوزانستەوە سەرقاڵ دەبن کەسانێکی کەمن؟ (٩)

دواترئیبن خەلدون دەگاتە ئەو بڕوایەی کەمێژو پێویستی هەیە بە: زانیاری سەبارەت بەبنەماکانی سیاسەت وسروشتی بونەوەرەکان وجیاوازی نێوان نەتەوەو جێگەکان و خورەوشت و نەریت وگروهـ ورێبازو سەرجەم بارودۆخەکانی تر. هەروەها کۆنترۆڵ کردنی هەریەکەلە وانە لەئێستاداو بەراورد کردنی لەگەڵ ئەوانەی لەئێستادا نادیارن ودەرخستنی ڕادەی گونجاوی یاخود ناکۆکیان لەتەك یەکتری دا، ئینجالێك دانەوەی گونجاوەکانیش وناکۆکەکانیش، ڕاوەستان لەسەر بنەماکانی دەوڵەت وگروهەکان، وپرەنسیپەکانی دەرکەوتنیان، وهۆکارەکانی ڕودانیان، وپاڵنەرەکانیپێکهاتنیان، بارودۆخ وهەواڵی ئەوکەسانەی بەکارو بارەکانی (ئەودەوڵەت وگروهانە-وەرگێر)هەڵدەستن، تاکو هۆکارەکانی هەرڕوداوێکی لەلاگەڵاڵە بێت، ڕاوەستابێت لەسەر بنەمای هەموو هەواڵێك... لەکاتەشدا ئیتر هەواڵە گواستراوەکان لەبەرانبەر ئەوبنەماو پرەنسیپانەدا نمایش دەکات کەلای خۆی هەن، جائەگەر هەواڵەکان لەگەڵ ئەو بنەماو ڕێسایانەدا گونجان وناکۆك نەبون ئەوا ڕاست و دروستن، وەگەرنا (بەساختەیان دادەنێت و وازیان لێ دێنێت) (١٠)دەگونجێت بڵێین: دانانی پێوەر بۆ پوختەکردنی هەواڵەکان

لەئیسلام داشتێکی تازەنەبوە،، چونکە ئاشکرایە فەرمودە ناسەکان هەرلەسەرەتاوە سەرقاڵ بوون بەداناتی هەندێ بنەماوە بۆ جیاکردنەوەی فەرمودەی بەهێز لەفەرمودەی لاواز... وەلێ شێوازی ئەوان زیاتر پشتی بەسەرنج دان دەبەست لە" سەنەد" ی فەمودەکان، واتە سەرنجدان لەوزنجیرەکەسەی کەدەماو دەم فەرمودەکەیان گواستۆتەوە، ئینجا هەرفەرمودەیەك لەڕێگەیکۆمەڵێ کەسی بڕوابێکراو وڕاستگۆوە گێڕدرابێتەوە ئەوا دەستیان پێوە گرتوە، وەگەرنا ڕەتیان کردۆتەوە یاخود بەلاوازیان لەقەڵم داوە.

هەندێ لەمێژونوسەکانیش هەوڵ یان داوە لەپوختەکردنی هەواڵەکاندا پەیڕەوی لەو ڕێبازە بکەن. موعتەزیلە لەم ڕووەوە ڕێچکەیەکی دیکەیان گرتەبەر، ئەمان لەپوختە کردنی هەواڵ وفەرمودەکان دا، پەنایان بردە بەر مل کەچ پێ کردنی ئەو هەواڵ وفەرمودانە بۆئەقڵی ئەبستراکت ویاساکانی لۆژیکی فۆرمی...

دواتر ئیبن خەلدون هات وپێکەوە هەردوشێوازەکەی ڕەت کردەوە، ئەو لەلایەکەوە دەڵێت: ڕەنگە شێوازی فەرمودەناسەکان لەبواری هەواڵە شەرعیەکاندا ڕاست بێت، بەڵام لەبواری هەواڵە مێژوییەکاندا ڕاست دەرناچێت... (١١)لەلایەکی دیکەشەوە پێی وایە ڕاویەکان هەرچەندە ڕاست گۆبن لەگێڕانەوەی هەواڵەکاندا بەڵام دڕۆهەر یەخەیان پێ دەگرێ، بەجۆرێ کەخۆیان هەست ناکەن. ئەمەش لەنجامی لایەنگری کردنیان بۆڕاکان یاخود ڕێبازەکان، یان لەبەرەنجامی سەراسیمەیی وبێ ئاگابون لەمەبەستەکان و... هتد. (١٢)

هەروەها ئیبن خەلدون شێوازی موعتەزیلە ئەقڵانیەکانیش ڕەت دەکاتەوە، چونکە ناگونجێت ئەقڵی ئەبستراکت بکرێتە پێوەرێ بۆپوختەکردنی هەواڵەکان. چونکە توانایی ئەقڵی ڕەها لەبناغەوە جیاوازە لەتەك توانایی کۆمەڵایەتکواقعی دا. (١٣)

ئیبن خەلدون دەیەوێت بڵێت ئەو پێوەرە ڕاست و دروستەی کەدەکرێت هەواڵەکانی پێ پوختەو شەن وکەو بکرێت، بریتی یەلە تێگەشتن لەسروشتی

کۆمەڵگە. لێرەوەیەکەدەبینین ئیبن خەلدون کاتێ سەرقاڵی نوسینی مقدمە بوە، ویستویەتی سروشتی کۆمەڵگە ڕون بکاتەوە. وەك ئەوەی بیەوێت مێژونوسەکانی دوای خۆی هەواڵەکانیان لەبەرانبەر ئەو سروشتەدا ڕابوەستێنن، ئەگەر گونجان لەگەڵ سروشتەکەدا ئەوا وەری بگرن و، هەرهەواڵێکیش لەتەك سروشتی کۆمەڵگەدا ناسازبوو لاوەی بنێن "دەربڕینی وەرگێڕ".

پرسیارێ کەلێرەدا ڕوبەڕومان دەبێتەوە ئەمەیە: چی وایکردوە لەئیبن خەلدون کەقایل نەبێت لەهەواڵە کانی مێژوو؟ بۆچی بەتەنها ئەم لەنێو مێژونوسەکاندا تاك بویەوە بەهێنانەکایەی ئەم شێوازە نوێ یە بۆپوختەکردنی هەواڵەکان وشەن وکەوکردنیان؟. ئێمەدەزانین بەشێوەیەکی گشتی سروشتی مرۆڤ وایە ئەو هەواڵانە وەڕاست دەگێڕێ کەلەتەك خۆی دادەگونجێن وئەوانی دیکەی بەدرۆ دەخاتەوە، زۆر جار دەبینین پیاوێ کەبیرکردنەوەیەکی پێگەشتوشی هەیە، کەچی بڕوا بەهەواڵێکی لاواز یاخود هیچ وپوچ دەکات، وپیاشیی دا هەڵدەدات، وبەهەواڵێکی ڕاست ودروست وبێ تەم ومژی دەداتە قەڵەم، لەهەمان کاتدا هەواڵێکی دیکە بەدرۆدەخاتەوە کەبەوڕادەیە لاوازو هیچ وپوچ نیە.ئەوەی گوتمان بەشێوەیەکی تایبەت لەوهەواڵانەدا دەردەکەوێت کەتوخنی بەرژەوەندی یان سۆز یاخود بیروباوەڕە بۆماوەکانمان دەکەون، ئێمە ناتوانین سەرنجێکی بابەتانەی توندوتۆڵی لێ بدەین، بەڵکو وادەخوازێ کەم تازۆرێ دەمارگیریمان بۆی، یان لەدژی هەبێت. هەرئەمەش وای لێکردین پرسیار بکەین لەوپاڵنەردی کەپاڵی بەئیبن خەلدونەوە ناوە بۆئەوەی زۆرێك لەهەواڵەکانی مێژوو بەهەڵە لەقەڵەم بدات. تۆبڵێی ئەوهەواڵانە هەرلەڕاستی دا هەڵەو ناتەواو بن، یاخود ئیبن خەلدون وای بینیون چونکەلەگەڵ ئاخ و ئارەزوەپەنهانیەکانیدا نەگونجاون؟. ئیبن خەلدون لەلاپەڕە بەراییەکانی (مقدمە) کەی دا هەندێ لەو هەواڵانە نمایش دەکات کەبەرلەخۆی مێژونوسەکان گواستونیانەتەوە، ئینجا بەوردی دەست دەکات بەپوچەڵ کردنەوەیان وسەرجەمیان بەپێچەوانەی سروشتەکانی ئاوەدانی لەقەڵەم دەدات. وەڵێ ئێمە

لەكاتێكدا سەرنجی ئەو هەواڵانە دەدەین بەو ڕادەیە سوك و بێ ئەرزش نایان بینین كەئیبن خەلدون باسی لێوە دەكات. تەنانەت لەوانەشە لەدیدی ئێمەدا هەندێ لەو هەواڵانە ڕاست ودروست بن و شایستەی ئەو پوچەڵ كردنەوەیە نەبن كە ئیبن خەلدون بەوردی كاری لەسەر كردوە. سەرباری ئەوەش هەندێ لەو هەواڵانە دەگونجێن لەتەك لۆژیكی تیۆرە كۆمەڵایەتیەكەی خۆی دا !!.

دكتۆر تەها حسەین دەڵێت: ئیبن خەلدون هەمیشە ڕەچاوێكی وردی پراكتیزە كردنی شێوازەكەی خۆی ناكات، یان بەدەربرینێكی تر ناتوانێ بەرهەڵستی ئەو هۆكارە جیا جیایانە بكات كەكاریگەری لەسەر دادەنێن، زۆر جار دەكەوێتە ژێر كاریگەری ئاینەوە، دیارە كاریگەری ئاین لەسەر ئەو ڕۆحە زیاتر بووە لەكاریگەری پەروەردەو ژینگە، چونكە لەوسەردەمەدا ئەوكاریگەریە جێدەی فراوانتر پێ هێزی لەڕوی ئازادی و كراوەیی و لێبوردەییەوە گرتبوو...هەندێ جاری دیكەش ئیبن خەلدون دەكەوێتە ژێركاریگەری بەرژەوەندیشەخسی خۆیەوەو لەئەنجامدا لەڕێبازەكەی خۆی لادەدات. ئەولەژێر سایەی دەوڵەتی (موەحەدین)دا دەژیاو، هەوڵی دەدا ڕەزامەندی ئەوان بەدەست بێنێت، بەوەی بیسەلمێنێت ڕەچەڵەكی دامەزرێنەری دەوڵەتەكە دەگاتەوەیە پێغەمبەر"د.خ"...هەندێ جار ئیبن خەلدون ڕەخنەكەی ئاوێتەی سادەگۆییەكی وادەكات كەشایستەیپێكەنینە، بۆنمونە : ئەوە بەدرۆ دەخاتەوە كە (هارونە ڕەشید)ئارەقی خواردبێتەوە، چونكە زۆرلەخواترس بوەو ڕۆژانە سەد ڕكات نوێژی كردوە، لەبەر ئەوەش ساڵێ غەزای كردوەو ساڵێكیش حەجی كردوە) (١٤)

ئەم ڕەخنەیەی كە (دكتۆر تەها حسەین)ئاراستەی ئیبن خەلدونی دەكات لەڕاستی و دروستی خاڵی نیە.چونكە ئیبن خەلدون لەپوچەڵ كردنەوەی هەندێ هەواڵی مێژوی دا لەسەر ئەو ڕەوتە كۆمەڵایەتیەی ڕێی نەكردوە كەخۆی گەرەكی بوە مێژونوسانی ترلەسەری برۆن.

بۆ نمونەلەبارەی هارونە ڕەشیددوە دەڵێت: (حاشا، ئەمان زانیوە خراپەیەکی لێ وەشابێتەوە، ئەوەلەکوێ وئەو حاڵەی ڕەشید لەکوێ کەپۆستی خەلافەت دەیەوێت وەك ئاین داری ودادپەروەری...هتد) (١٥).

لێرەدا ئاوها دەڵێت، لەهەمان کاتدا لەجێگەیەکی تری (مقدمە)کەی دا دەڵێت : ئەوەی سێ یەمین لەهەردەوڵەتێك دا، سەردەمی دەشتەکێتی وزبرحاڵی لەبیردەکەن ولەنێو تەرەف دا ئائەوپەڕی سنور نفرۆدەبن... بەوەش دەبنە کۆڵ بەسەر دەوڵەتەکەوە، ودەچنەڕیزی ژن و منداڵانەوە... هتد) (١٦)لەکاتێك دا ئیبن خەلدون ئەم پەیڤەی‌نوسیوە، ئەوەی لەبیرکردوە کەدەکرێت پەیڤەکەبەسەر (هارونە ڕەشید)یش دا بشکێتەوە وپراکتیزە بکرێ. ئەو هارونە ڕەشیدەی کەئەو لەسەرەتای (مقدمە)کەی دا بەرەوانی لێ دەکات، چونکە (هارونە ڕەشید)وەچەی سێ یەمە لەنێو دەوڵەتی عەباسی دا.

هەرچۆن بێت، زۆربەی توێژەران لەسەر ئەوە کۆکن کە ئیبن خەلدون تێورە کۆمەڵایەتیەکەی خۆیی بەسەر ئەو هەڵانەدا پراکتیزە نەکردوە کەلە (تاریخ الکبیر) داهێناونی... بەڵکولەو مێژوەی دا جیاوازیەکی گەورەی لەتەك مێژو نوسەکانی تردا نیە. یەکێك لەتوێژەران ئاماژەی کردوە بۆ ئەوەی: ئیبن خەلدون بەوڕادەیەی لەتێورە کۆمەڵایەتیەکەی دا بەرزدەبێتەوە، دەبینین بەهەمان ئەندازە لەمێژوەکەی دا نزم دەبێتەوە... لەمیان دا لەدۆڵێکدایەو، لەویان دا لەشیوێکی تردایە.

لەودوە چیمان دێتە دەست؟ من پێم وایە ئیبن خەلدون مقدمەکەی لەپێناوی پوختەکردن وشەن وکەو کردنی هەواڵەکانی (ی مێژو-وەرگێڕ)دانەنوسیوە، وەك خۆی بانگەشەی بۆدەکات... بەڵکو لەژێرکاریگەری پاڵنەرێکی تەم ومژداری لەناگاودا نوسیویەتی، وەك ئەوەی لەوپاڵنەرەدا چارەسەرێکی بۆئەو سەراسیمەییە دێبیتەوە کەماوەیەکی دوورو درێژ زاڵ ببو بەسەر هزری دا.

## گۆڕانی ئیبن خەلدون:

لەبەردا ئاماژەمان بەوە کردکە ئیبن خەلدون لەدوای دەرچونی لەگۆشەگیریەکەی گۆڕانێکی گالتەپێ نەکراوی بەسەردا هاتبوو...ئەو لەپاش ئەوەیماوەیەکی زۆر هەلپەی بەدوای سیاسەت دا دەکردو ئەوماوەیەش (لەژیانی وی دا-وەرگێڕ)زۆرێك هەلپەرستی ونالّ وگۆڕی تێدا بوو، دەبینین لەدوای گۆشەگیریەکەی هەولّ دەدات کەم تا زۆرێ لەسیاسەت دورکەوێتەوە...ئەوە بوو گەڕایەوە بۆ تونس وسەری شۆڕکردەوە بەسەر لێکۆڵینەوەو وانەبێژی دا تاکو دانراوەکەیی تەواوکرد وپوختەیشی کرد، پاشان ڕونوسێکی لێ بەرزکردەوە بۆبەردەستی (سولتان ئەبی عەباس)، سولتانیش بەشێوەیەکی باش لێی وەرگرت وپەسەندی کرد. کاتێکیش ئیبن خەلدون هەستی بەوەکرد سولتان ئەیەوێت بیکاتەوەبە ڕەفیقی خۆی لەهەلّمەت وشالاّوەکانی دا وپەلکێشی بکاتەوە بۆئەو بوارانەی کەڕقی لێیان دەبێتەوە. بیرۆکەی (حەجکردن)هاتە مێشکیەوە تاوەك پاساوێك لەبەردەم سولتان دا بەکاری بهێنێت، بۆیە داوای لەسولتان کرد ڕێگەی بدات فەریزەی حەج بەجێ بهێنێت، بەردەوامیش داوای لێکرد تاکو سولتان مۆلّەتی دا. (۱۷)

وادیارە ئەوەندەی دەیویست لەوکەش هەوای سیاسەتەدوربکەوێتەوە کەتێیدا دەژیا "دەربڕینی وەرگێڕ" نیو ئەوەندە ئەی دەویست فەریزەی حەج بەجێ بێنێت. دواتر گەشتە میسر. لەوێندەر لەلایەکەوە بەدادوەریەوە سەرقالّ بوو، لەلایەکی ترەوە بەلێکۆڵینەوەو وانە بێژیەوە سەرقالّ بوو. هەرلەمیسردا ئیبن خەلدون هەندێ فراوان کاری وڕێك وپێك کردنی بەسەر (مقدمە)کەی دا هێنا. دەگونجێت بلّێین بەو هۆیەوە ئەزعەیەکی بەهێزی سۆفی گەری لەڕوخساری (مقدمە)دابەدەرکەوت (دەربڕینی وەرگێڕ). (۱۸)

(د.علی عبدالواحد وافی)دەلّێت: وادیارە ئیبن خەلدون ئەخۆشینەکۆنەکەی سەری پێ نابێتەوە، وسەری خورابێتەوە لەسەرە ڕۆییە سیاسیەکان، لەوکاتەدا کەلەدەرەوەی شوراکانی شامدا چاوی بە (تەیموری لەنگ)کەوتوە (۱۹) لە هەڤدیتنەکەیشی دا لەتەك (تەیموری لەنگ)دا هەمان ئەو شێوازە دوو ڕوانەی

خۆی پەیڕەوکرد کەجاران لەڕەفتارە ڕامیاریەکانیدا پەیڕەوی لێدەکرد –وەك لەبەشێکی تردا ڕوونی دەکەینەوە. کاتێکیش لەچاوپێکەوتنی (تەیموری لەنگ)دا سەرکەوتنی بەدەست هێناو هەندێ لەوەی دەیویست دەستگیری بوو، ئیتر هۆکارێکی دۆزیەوە بۆئەوەی لێی دووربکەوێتەوە، ئەوە بوو گەڕایەوە بۆمیسر بۆئەوەی درێژەبداتەوە بەلێکۆڵینەوەو وانەبێژی.

پوختەی قسان ئەوەیە: ئیبن خەلدون لەدوای نوسینی (مقدمە)بویە خاوەنی کەسایەتیەکی نوێ، ئەو کەلەڕابردودا دەیویست (میرنشینێکی نوێ)دابمەزرێنێت ئێستادەیەوێت (زانستێکی نوێ) دابمەزرێنێت.

## پاشەکشەو گەڕانەوە:

(توینبی)کەسایەتی داهێنەرو دروست کەر بەوە پێناسەدەکات کەلەکاتی دروست بوندا بەحاڵەتێکی سۆفی گەریتایبەت داگوزەردەکات، لەوماوەیەدا کەسەکە دادەبڕێت لەپەیوەندیە ئاساییەکانی ولەگەشێکی تردا کەپەیوەستە بەنهێنی بوونەوە، باڵادەکات و بەرزدەبێتەوە. (توینبی)پێی وایە ئەو ماوەیە لەدوای ئەوە دێت کە کەسایەتیەکە پاشەکشە لەکۆمەڵگە دەکات ولەمەردوم دادەبڕێت. لەمەش دا ئاڵ وگۆڕێکی گەورەی بەسەردا دێت، وای لێ دێت بەفۆرمێکی نوێ وەبگەڕێتەوە بۆنێو خەلکی... (توینبی) ئەم پرۆسەیە بەزاراوەی (پاشەکشە- گەڕانەوە = Return-Withdrawal)ناودەزەردەکات.

ئەوکەسایەتیە، جاری واهەیە هەر لەخۆیەوە ئەو کاردەکات وهەندێ جاری تریش لە ژێر فشاری بارودۆخەکانی دەوروبەریدا و بەناچاری لە کۆمەڵگە پاشەکشەدەکات. لەوکاتەشدا کەسایەتیەکە، وەك (توینبی)ئاماژەی پێ دەکات، هەلێکی باشی دەست دەکەوێت تاکو خۆی بۆ وێنەیەکی تر بگۆڕێت. هەر ئەم ئاڵ و گۆڕەش بەسەر زۆرێك لەو گەورە پیاوانەدا هاتووە کە توانیویانە ڕەوڕەوەی مێژوو بگۆڕن، وەك: (بوزا، کۆنفۆشیۆس، داود، صۆلۆن، قەیسەر، پۆلس، محەممەد، میکیاڤیلی، بوتروسی گەورە، کانت، گاریبالدی، هندنبرگ، لینین و...هتد) (٢٠)

شیاوی باسکردنە، (توینبی)لەڕیزی ئەوپیاوە گەورانەدا کە مل کەچی ڕێسای (پاشەکشە و گەڕانەوە)بوون، ئاماژە بەئیبن خەلدونیش دەدات. (توینبی)پێی وایە ئەو ماوەی دابڕان وگۆشەگیریەی ئیبن خەلدون لەناو هۆزە عەرەبیەکەدا بەسەری بردووە لە ڕووی بەهای داهێنەرانەیەوە لەو ماوەی دابڕانانە دەچێت کە ئەو گەورە پیاوانە پێیدا گوزەریان کردووە بەر لەوەی هەستن بە کارە مێژووییە گەورەکانیان، چونکە ئەمیش لەبەر ئەنجامی ئەوماوەیەدا کەبەگۆشەگیری بردیە سەر، گۆڕانێك بەسەر کەسێتی دا هات، وەك کەسێتی یەکێسیاسەتمەدار چوەنێو ئەوماوەیەودو کەهاتە دەرێ ببوە هزرڤانێکی سۆسیۆلۆژی.

## پیاوی مارگینالی:

لەهەندێ ڕووەوە ئەوە پێناسەیە بەسەر ئیبن خەلدون دا دەچەسپێت کەلە زانستی کۆمەڵناسیی نویێ دا بە (Marginal Man)ناو دەبرێت، پیاوی مارگینالیش. وەك مامۆستا (بارك)پێناسەی دەکات ئەو پیاوەیە کەقەدەر دەیخاتە نێوان دوو کۆمەڵگە یاخود دووکەلتوری هاودژەوە، بەوجۆرەش هزری وی وەك (کاسەیەکی کۆکەرەوە)ی لێ دێت وهەردوو کەلتورەکەی تێدا دەتوێتەوەو تێکەڵاو دەبن. (٢١)

ئاسایی، پیاوی مارگینالی (وەك مامۆستا ستۆنکۆست) ئاماژەی پێ دەدات لەژیانی دا بەسێ قۆناغ دا گوزەر دەکات، قۆناغەکانیش بەشێوەیەکی نزیك گراودیی ئەمانەن :

١) قۆناغی یەکەم، ئەو قۆناغەیە کەتیای دا ئەوکەسە هەست ناکات بەو هاودژیەی کەلە دەوری دایە، شتەکان وەك خۆی وەر دەگرێت وبەپێداویستی یەکی سروشتی بونیشیان لەقەڵەم دەدات، لەمەدا وەك هەر کەسێکی تری نێو خەڵکە ڕەشۆکیەکە وایە.

٢) دواتر قۆناغی دووەم دێتە پێشێ، لەم قۆناغەدا ناکۆکی وهاودژێتی یەکۆمەڵایەتی وکەلتوریەکان زاڵ دەبن بەسەر ئەو پیاوەدا، ئیدی لەقوڵاییەکانی ناخی دا قەیرانێك سەرهەڵدەدات و ئەو بەهایانەش کەلەسەریان پەروەردەبووە، دەست بەدارِمان و لێك ترازان دەکەن.

٣) لەکۆتایش دا قۆناغی سێ یەم دێتە پێشێ، لەم قۆناغەدا ئەو پیاوە هەوڵ دەدات شێوازێك بدۆزێتەوە بۆپێکەوە گونجاندنی فاکتەرە ناتەباو ناکۆکەکان لەنێو ناخی دا، لەمەشدا ڕەنگە سەرکەوتن بەدەست بێنێت وڕەنگە شکستیش بێنێت، زۆرجاریش ململانێ دەرونیەکە لەوەگەورەترە کەبەهرەکانی ئەوپیاوە بەرگەی بگرێت، بۆیە لەناکامدا کەسایەتی وی دەڕمێت. (٢٢)ئەمەش یانی، پیاوی مارگینالی، بۆی هەیە ململانێی دەرونی بیکاتە خاوەنی کەسایەتیەکی داهێنەر (دەربڕینی وەرگێڕ)... هەردووڕێگەکە لەبەردەمیدا

ئاوەڵاو کراوەن، ئینجا ئەو بەگوێرەی زیرەکی وبیرتیژی خۆی ڕێگەیەکیان پەیرەو دەکات، هەندێ خەڵکی هەن زیرەکی ولێهاتوی یان یارمەتی یان نادات لەبەردەم ململانێ دەرونیەکە دا خۆگربن و، ئەو ململانێ یەنەبێتە هۆی لێك ترازانی کەسایەتیان... ئەمەش ئاکام وسەرەنجامی زۆرێك لەوکەسانەیە کەقەدەر خزاندونیەتە نێو بگرەو بەردەیەکی ئایدۆلۆژی یان کۆمەڵایەتی وردوخاش کەرەوە، وبەو هۆیەشەوە بونەتە مرۆڤانێکی بی هودەگەراوهەموو پێوانەکانیان لێ بزربووە.

جۆرەخەڵکێکی دیکەش لەگۆڕێدان، ئەوانە لێهاتویوزیرەکی یەکی وایان هەیە، یارمەتی دەرەبۆئەوەی چارەسەرێك بدۆزنەوە بۆململانێ دەرونیەکەیان. بۆیەئەو چارەسەرە بۆخەڵکی دێنن و هەوڵ دەدەن چارەسەری کۆمەڵگە کەیانی پێ بکەن. -پێغەمبەران وریفۆرمیستەکان وپیاوە بلیمەتەکان لەم چەشنە بوون، گومانیشی تێدا نیە کە ئیبن خەلدونیش لەهەمان چەشن بووە.

## گرۆکی مەبەست:

ئەومەبەستەی کەدەمەوێت لەم بەشەوبەشەکەی پێشویشەوە پێی بگەم، ئەمەیە: ئەوبازە فیگریە گەورەیەی کەلای‌ئیبن خەلدون دیتمان، دەستکردی خۆی نەبوو. بەڵکو بەرەنجامی هۆکارگەلێ جۆراو جۆر بوو کەدەوریان دابوو، ببونەهۆی ململانێی دەرونی لەنێوناخیدا.

بەڕاستی هزرڤانی داهێنەر، یاخود هەربلیمەتێکی تر، بەخۆی ناتوانێ خۆی دروست بکات، بەڵکو ئەو دروستکراوی بارودۆخەکانی دەوروبەریەتی... مرۆڤانی سەرکەشی نێو خەڵك، پێیان وایەهەربەوەندەی بیانەوێت یان هەوڵی لەپێناودا بدەن، دەبنە کەسانێکی بلیمەت، وەك ئەوەی بڕوایان وابێ بلیمەتێتی مل کەچی ئەو ڕێسایەکە دەڵێت: (هەرکەس هەوڵ بدات دەستگیری‌دەکات، هەرکەسیش لەسەر ڕێگەکە بڕوات دەگاتە مەنزل).تەنانەت هەندێ خەڵك لەئەنجامی ئەو خەیاڵەدا، پێیان وایە ئەوەی ویستویانە دەستیان کەوتوە، بۆیە هەندێ بیرۆکەی بێ ئەرزش دێننە نێوخەڵکی وپێشیان وایە ئەو بیرۆکانە هەموو دونیا دەلەرزێنن. کەچی ڕۆژگار وەك ملیۆنەها خەڵکی تر بەسەر ئەوانیش دادەگوزەرێت، لەناکامیشدا دەمرن بەبێ ئەوەی ئاسەوارێکی شیاوی باسکردنیان لەدوا بەجێ مابێت.

گرفتی ئەوجۆرەکەسانە ئەوەیە لەدونیادا دڵنیان و بەدەست سەراسیمەیی ودودڵیەوە ئالودەنین، بەهەمان ئەوشێوەیە بیردەکەونەوە کەخەڵکی بیری پێ دەکەنەوە، دڵنیاشن لەڕاستی و دروستی بیرکردنەوە کەیان. بیرۆکەکان بەئامادەگراوی دەیان گاتێ وئەوانیش وەری دەگرن بەبێ ئەوەی لەوبیرۆکانەدا کێشەو ناکۆکیەك ببینن کەنیگەرانیان بکات وخەویان لێ بتارێنێ... بەم شادومانیە فیکریەش خۆشحاڵن. لەکاتێکیش دا حەزیان لەوەیە ببنە بلیمەت، نازانن بلیمەتێتی ئەو خۆشحاڵیەیان لێ بزردەکات کە تیای دا دەژین.

## پەراوێزەکانی بەشی هەشتەم

١) گاستۆن بۆتۆل، ابن خلدون، فلسفته الاجتماعیه، قاهیره ١٩٥٥، ل ٣١.
٢) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البیان العربي)، ل ٢١٢.
٣) هـ س، ل ٢٦٩.
٤) ابن خلدون، التعریف، ل ٢٢٠.
٥) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة المکتبة التجاریة)، ل ٥٨٨.
٦) ساتع حەسری، دراسات عن مقدمه ابن خلدون، ل ١١٩ -١٢٤.
٧) هـ س، ل ١١٨.

8) Tyrrell ,The Personality Of Man, (Pelican Book 1948) , p.30-41.

٩) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البیان العربي)، ل ٢٥١.
١٠) هـ س، ل ٢٥٢.
١١) هـ س، ل ٢٦٤- ٢٦٥.
١٢) هـ س، ل ٢٦١- ٢٦٢.
١٣) هـ س، ل ٥٠٥ — ٥٠٦.
١٤) تەها حسەین، فلسفه ابن خلدون الاجتماعیه، ل ٤٧ -٤٨.
١٥) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البیان العربي)ل ٢٢٣.
١٦) هـ س، ل ٤٨٦ — ٤٨٧.
١٧) علی عبدالواحد وافی، ابن خلدون، مطبعة الرسالة، ل ٥٣.
١٨) ساتع حەسری، دراسات عن مقدمه ابن خلدون، ل ١١٩ — ١٢٤.
١٩) علی عبدالواحد وافی، ابن خلدون، ل ٦٥.

20) Arnold Toynbee ,Op ,cit ,voll. III ,p. 248 – 382.
21) Stonquist ,The Marginal Man, (N.Y.1937) ,p.xv.
22) Ibid ,p. 123.

# بەشی نۆیەم

## (لەنێوان گشت و بەشەکان دا)

هەندێ لەڕەخنە گران هەوڵ دەدەن لەبەهای تیۆرەکەی (ئیبن خەولدون)کەم بکەنەوە، بەبیانوی ئەوەی گوایە ئەولەهەندێ بیرۆکەی پێشوترەوە بیردۆزەکەی خۆیی کۆکردۆتەوە... وادەردەکەوێ ئەو ڕەخنە گرانە ئەوە لەبیرمەندی داهێنەردا بەگریمانە دادەنێن کەلەنەبونەوە تێورە تازەکەی دروست بکات، بۆیە گەر وێك چون ببینن لەنێوان بیرۆکەکانی ئەم وهەندێ بیرۆکەی پێش ئەمدا ئەوا دەڵێن ئەم کابرایە هیچ شتێکی نوێی نەهێناودتە کایەوە.

بەڕاستی ئەم ڕایە، ڕایەکی سادەو هەرزەگۆیەو، لەچەمك وتێگەشتنی ڕەشۆکیەوە نزیکترە وەك لەچەمکی زانستی یەوە... چونکە لەدنیادا هیچ هزرڤانێکی داهێنەر نیە تیۆری تازە بێنێتە کایەوە بەبێ پشت بەستن بەهزرڤانانی پێش خۆی. بەلکو زۆرینەی جار ڕەگەزەکانی تیۆرەکەی لەپێشینانی وەردەگرێت، بەڵام لەنێوان ئەوڕەگەزانەدا پەیوەستەگیەك دروست دەکات، یاخود بەشێوەیەك دایان دەڕێژێتەوە کەلەبەردا خەلکی پێی ئاشنانەبوون... ئەمەش یانی داهێنان و ئەفراندنی ئەو کەسەلەنێو بەشەجیا جیاکانی تیۆرەکەدا دەرناکەوێت، بەوئەندازەیەی کەلەپێکەوە گرێ دانی ئەوبەشانە وپێکەوە گونجاندنیاندا دەدەکەوێت، ... تەنانەت ئەوزیادەکاری یەی کەسی داهێنەر لەم ڕوەوە پێشکەشی دەکات زۆر کەم تردەبێ بەبەراورد لەگەڵ ئەو بیرۆکانەدا کەلەنێو کەلەپوری ڕۆشنبیری دا پێشتر هەبوون، بەڵام سەرباری ئەوەش کەسی داهێنەر شەقاوێکی گەورە هزری مرۆ بەرەو پێشەوە دەبات وهەنگاوی پێ

هەڵدەگرێ، بەپێی ئەو پێکهێنانە نوێ یەی کەلە بیرۆکە باوەکاندا دروستی کردوە. (١)ئەم وتەیە بەسەر دۆزەرەوە (مخترع) یکدا دەچەسپێت وەك چۆن بەسەر هزرڤانێکی داهێنەریش دا دەچەسپێت و.هەموو ئەو شتە داهێنراوە سەرنج ڕاکێشانەی ئەمڕۆ دەیان بینین لەڕاستی دا هیچ نین جگەلەپێکەوە بەستن و پێکڤە گونجاندن لەنێوان چەند شتێك دا کەپێشتر دۆزراونەتەوەو هەبوون، لەگەڵ کەمێك زیادەکاری دا.بۆیە لەوانەیە کەسێکی ڕەشۆکی سەیری یەکێك لەو شتە داهێنراوانە بکات وبەسەرسامیەوە دەمی بکاتەوەو بڵێت : چەند گەورەیە ئەو ئەقڵەی ئەمەی دۆزیوەتەوە !.

ئیتر نازانێت ئەم داهێنراوە نوێ یەبەرەنجامی زنجیرەیەکی دورودرێژی ئاوەزە داهێنەرەکانە، سەرجەم ئەو ئەقڵانە بەشداری یان کردوە لەزەمینەسازی کردن دا بۆئەم داهێنانە تازەیە. دواتر داهێنەری کۆتایی دێت وبارو دۆخ یارمەتی دەدات تاکو ئەو زنجیرەیە تەواو بکات بەکردنی کارێکی یەکلایی کەرەوە.

## دانانەکەی ئیبن خەلدون:

(ئیبن خەلدون)دان بەوەدا دەنێت کەهەندێ لەو مەسەلانەی لە (مقدمە٩ کەی دا لێکۆڵینەوەی لەسەر کردون، بەشێوەیەکی سەرپێیی لەپەرتوك ودانراوەکانی زاناو فەیلەسوف وشەرعناسەکانی پێش خۆی دا ئاماژەیان پێ دراوە، بەلاّم شپرز وتێکەڵ وپێکەڵ بوون ومەبەست لەئاماژەدانیش بەو مەسەلانە باسکردنی خودی مەسەلەکان نەبوە... بەلاّم ئەم هاتوە ئەو مەسەلانەی کۆکردۆتەوەو کردوێتیە بنەڕەتی کارەتازەکەی. (٢)ڕەنگە ئەم دان پێدانانەی (ئیبن خەلدون) لەڕوی خۆبەکەم زانینەوە بێ، بەلاّم هەرچۆن بێت لەدیدی زانستی نوێ دا دان پێدانانێکی ڕاست ودروستە.

دەگونجێت بگوترێت : (ئیبن خەلدون) موتالاّی زۆرێك لەو پەرتوکانەی کردوە کەلەکتێبخانەکانی ئەو سەردەمەدا هەبوون، بەلاّم لەئەنجامی خوێندنەوەی ئەو پەرتوکانەوە بیرۆکەی جیاواز لەو بیرۆکانەی وەدەست دەهێنا کەهاوڕێ کانی وەدەستیان دەهێنا. ئەم لەدەلاقەو گۆشەنیگای جیاوازەوە سەرنجی لێ دەدا بەهۆی ئەو هۆکارە هەمە چەشنانەوە کەدەوریان تەنی بوو وسەراسیمەییان لەناخی دا دروست دەکرد... ئیدی لەنێو نەستی دا بیرۆکەکانی کارلێکیان دەکرد. تاکو دواجار شێوەی تیۆرێکی یەککرتوی تازە داڕێژراودا پەیوەست بوونەوە، ئەوەی لەم ڕودوە تێ بینی دەکرێ ئەوەیە، ئەوبیرۆکانەی کە (ئیبن خەلدون)لەکەسانی پێش خۆی وەری گرتبوون، لەلای ئەمیش بەهەمان مۆرکی یەکەم جاریانەوە دەرنەکەوتنەوە، بەلکو هەندێ ئاڵ وگۆڕی تێدا کردبوون تاکو لەگەڵ قاوغی تیۆرە تازەکەی دا بگونجێن. لەوانەیە ئێمە هەندێ وێکچون ببینین لەنێوان ئەو بیرۆکانەو بنەڕەتە کۆنەکانیان دا بەلاّم لێکچونێکی ڕواڵەتین ودەست بەجێ ولەگەڵ بەراوردێکی ورد دا لەئارادا نامێنن. (ئیبن

خەلدون) خاوەنی لۆژیکێکی تایبەت بەخۆیەتی. ئەم لۆژیکەش ڕێگە نادات بیرۆکە کۆنەکان بەسەری دارِەت ببن، بێ ئەوەی مۆرکێکی تایبەت بەخۆیان لەسەر دابنێت.

دەگونجێت لەم ڕووەوە (ئیبن خەلدون) بچوێنین بەو نوکتەبازەی کەلەمێشکی خۆی دا کۆمەڵێ نوکتەی زۆر کۆدەکاتەوە، بەلاّم لەکاتی گێرِانەوەدا ئەو نوکتانە بەجۆرێ دەگێڕێتەوە کەمۆرکی تایبەتی خۆییان لەسەر دادەنێت، بەجۆرە نوکتەکە وەك ئەوە وایە تازەبێت وخەلکیش بەگەرم وگوڕی بۆی پێ دەکەنن وەك ئەوەی پێشتر نەیان بیستبێت.

لەماوەی دادێ هەوڵ دەدەین نمایشی هەندێ لەوبیرکانە بکەین کەبەرلە (ئیبن خەلدون)زانرابوون، تاکوبزانین ئەم چۆنی چارەسەر کردون وچۆن چۆنی خستونیەتە نێو چوار چێوەی لۆژیکە نوێ یەکەیەوە.

## ئیبن خەلدون و قورئان:

بەرلەهەر شتێ تێبینی ئەوە دەکەین (ئیبن خەلدون) لەدانانی تیۆرەکەی دا سودێکی زۆری لەقورئان وەرگرتوە، نەخاسمە لەڕوی سەرزەنشت کردنی (تەرەف)و ڕون کردنەوەی کاریگەریەکانی لە لەناوبردنی نەتەوەکان دا...لەقورئان دا ئایەتگەلێ زۆرهاتون لەسەرزەنشت کردنی (تەرەف) داو دەکرێت لەسێ خاڵ دا کۆیان بکەینەوە :

١-قورئان پێناسەی موتریفەکان دەکات و بەهۆکاری لەنێو چونی کۆمەڵگەیان دەداتە قەڵەم، ئەوەتا دەفەرمێت : (واذا اردنا ان نهلك قرية امرنا مترفيها ففسقوا فيها فحق عليها القول فدمرناها تدميرا) (٣)

٢-هەروەها موتریفەکان بەوە دەناسێنێت کەبەرهەڵستی بانگەوازە ئاینیەکان دەکەن، لەم ڕوەشەوە دەفەرمێت : (ومارسلنا فى قرية من نذير الاقال مترفوها انا بما ارسلتم به كافرون) (٤)

٣-پاشان بەوە پێناسیان دەکات کەدەمار گیرن بۆ بیروباوەڕی باب وباپیرانیان "ئیدی بیروباوەڕەکان باش بن یان بەد" لەم بارەوە دەفەرمێت : (وكذالك مارسلنا من قبلك فى قرية من نذير الاقال مترفوها انا وجدنا اباءنا على امة وانا على اثارهم مقتدون.قال او لوجئتكم بأهدى مما وجدتم عليه اباءكم قالو انا بما ارسلتم به كافرون) (٥)

لەڕاستی دا ئێمە وێکچونێکی گەورە دەبینین لەنێوان ئەم چەمکە قورئانیانەو ئەو سەرزەنشتانەی ئیبن خەلدون لەمقدمەکەی دا لەبارەی تەرەف و موتریفەکانەوە هێناویەتی. بەڵام ئیبن خەلدون بابەتی تەرەفی لەو قاڵبە ئاینیەوە کەلەقورئان دا دەیبینین گۆڕیوە بۆ قاڵب و چوار چێوەیەکی کۆمەڵایەتی. قورئان بۆیە سەرزەنشتی تەرەفی کردوە تاکو خەڵکی وریا بکاتەوە

لەکاریگەریە خراپەکانی بۆ دونیاو دینی خەلکی. بەلام ئیبن خەلدون تەرەفی بەمەسەلەیەکی حەتمی کۆمەلایەتی لەقەلەم داوە، مەسەلەیەك کەهەردەبێ شارستانیەت تێی بکەوێت، خەلکیش لەکاتی شارستانی بونیان دا ناتوانن خۆیان لەو مەسەلەیە لادەن چونکە دەبێتە بەشێك لەنەریت وناکاریان.

وەك لەبەریشدا دیتمان، نەریتەکان لەدیدی ئیبن خەلدوندا داسەپاون.

ئیبن خەلدون بەشێوازێکی کۆمەلناسانەی قەشەنگ شرۆڤەی ئەوە دەکات کە چۆن تەرەف دەبێتە هۆی ئەوەی خاوەنەکانی ببنەهەلگری ناکاری دزێوی وەك درۆ وقومارکردن و چاوبەست ودەست برین و فروفێلّ ودزی وخراپە و سوو خۆری لەکرین وفرۆشتن دا... بەرێی وی ئەمە مەسەلەیەکی سروشتی ونەریتەکانی تەرەف (وەرازاوەیی لەخۆراك و پۆشاك وراخەرو قاپ وقاجاخ و کۆشك وتەلار —دەربرینی وەرگێر) دروستی دەکەن، ئیدی دەرونی مرۆڤیش بەهۆی ئەو نەریتانەوە هەرجارەو رەنگێ وەردەگرێت و سەقامگیری وەرناگرێ نەلە دنیای داو نەلەدینەکەیشی دا، چونکە ناچار دەبێ بەوەی هونەربازی بکات لەدەست خستنی بژێویدا، ئیتر لە رێگەی راستەوە بێت یاخود لەرێگەی ناراست وناشایستەوە. ئیدی خۆی یەکلایی دەکاتەوە بۆ بیرکردنەوە (لەچۆنێتی پەیدا کردنی بژێوی —وەرگێر) وکۆکردنەوەی فرت وفێلّ لەوپێناوەدا، لەوکاتەش دا، گوێ نادات بەو کردەوە پەسەندانەی کەیاسا ئاسمانیەکان فەرمانیان پێ داوە. (٦)

ئیبن خەلدون دەلێت : (یەك لەخراپەکانی شارستانیەت رۆچونە بەنێو ئارەزو بازی دا، لەئارەزوەکانی ورگ دا، بەدوای ئەمەدا ئارەزوەکانی داوێن بەهەموشێوەکانیەوە وەك زیناو نێر بازی پەیدا دەبن... واتێ دەگەم مەبەست لەئاوەدانی بریتی یەلە شارستانیەت وتەرەف، بۆیە هەرکە گەشتە دوا پلەی دەگۆرێت بەخراپەو گەندەلی وپیری بەرۆکی دەگرێت، وەك تەمەنی سروشتی گیانلەبەران) (٧)ئیبن خەلدون لەم روەوە شتێکی کۆمیدی باس دەکات، رەخنە لەبیرۆکەیەك دەگرێ کەلەسەر دەمی ئەودا باوبوە، خەلکی لەوسەردەمەدا دەیان

گوت: (هەرشارێك ئەمامی نارنجی تێدا زۆربێت ڕوو لەوێران بوونە)ئیبن خەلدون دەڵێت زۆرینەی خەڵکی خۆ بەدور دەگرن لەناشتنی نارنج چونکە گومانیان وایە ئەو ئەمانە وێرانەی بەدواوەیە. (دەربڕینی وەرگێڕ).

بەڕێی ئیبن خەلدون مەسەلەکە بەو مانایە نیە، بەڵکو لای وایە بێستان کردن ودروست کردنی ڕێڕەوی ئاو لەپاشهاتە و دەرهاویشتەکانی شارستانیەتن. نارنج وهاوشێوەکانیشی لەوبەروبومانەن کەنەتامیان هەیەو نەکەڵك. تەنها لەبەر شێوەکەشیان لەدێبەرەکاندا دەنێژرێن، خەڵکیش کاتێ ئەوە دەکەن کە هونەردۆزی بەکاردێنن لەتەرەف دا. ئالەم ڕەوەوەیە کەمەترسی لەناو چون و وێران بونی شارەکانی لێ دەکرێت.... هتد) (٨)

## ئیبن خەلدون وفارابی :

فارابی یەکێکە لەفەیلەسوفەمەزنەکانی ئیسلام، تەنانەت هەندێك بە گەورەترین فەیلەسوفیشی دادەنێن. لەبواری کۆمەڵناسی دا پەرتوکێکی داناوە بەناوی (اراء اهل المدینة الفاضلة) لەم پەرتوکەدا ڕێڕەوی ئەفلاتۆنی لە (الجمهوریە)دا گرتوە.

گومانم وایە ئیبن خەلدون ئەوپەرتوکەی فارابی دیوەو سودی لێ وەرگرتوە... بەلگەش لەم ڕووەوە ئەوەیە ئیبن خەلدون بەکۆمەڵە دێڕی لێکۆڵینەوەکەی لەمەڕ (ئاوەدانی مرۆیی) دەست پێ دەکات کەلێکچونێکی زۆریان لەنێواندایە لەگەڵ دەربڕینەکانی فارابی دا. هەردوکیان دەڵێن : هەرتاکە مرۆڤێ بگری، ناچارە بەوەی هاوکاری بکات لەتەك هاوڕەگەزەکانی دا، چونکە بەتەنها ناتوانێت پێداویستی یەکانی مانەوەی خۆی دابین ومسۆگەر بکات، لەگەڵ ئەوەشدا هەرلەسەرەتاوە جیاوازی لەنێوان ڕێبازی توێژینەوەی هەردوکیان دا بەدەر دەکەوێت.

لەدیدی فارابی دا خەلکی بۆیە هاوکاری یەکتردەکەن تاکو قورسایی ژیانیان تێ پەڕێنن وراپەڕێنن (دەربڕینی وەرگێڕ)، هەروەها بۆئە وەش بگەنە ئەو باری کامڵ بونەی کەسروشتی مرۆڤی لەپێناودا ڕاهێنراوە. بەڵام ئیبن خەلدونداں بەو کامڵ بونە نایەد پایەدا نانێت کە (فارابی) باسی لێوە دەکات. بەلکو بەڕێی ئەم خەلکی بۆیە هاوکاری یەکتر دەکەن تاکو لەلایەکەوە بژێوی دەست بخەن، لەلایەکی تردوە بۆئەوەی بتوانن بەرەڤانی لەخۆیان بکەن لەبەرانبەر ئەو ئاژەلانەدا کە تواناو هێزیان لەمرۆڤ زیاترە.

(ئیبن خەلدون) بۆپشتگیری بۆچونەکەی نمونە گەلێ لەژیانی واقیعی دێنێتەوە، بۆنمونە : نان پێویستی بەهاڕین وشێلان وبرژاندنێ زۆرهەیە،

هەریەکە لەو سێ کارەش پێویستیان بەدەفرو ئامێر هەیە، ئەو ئامێرانەش دیارە کەلەپیشەسازی جۆراو جۆری وەك ئاسنگەری ودارتاشی و فەخفورچێتی یەوە پەیدا دەبن... گەنمیش کەنانی لێ دروست دەکرێت پێویستی بەهەندێ کاری ترهەیە وەکو چاندن ودروێنەو... هتد)هەریەکە لەوکارانەش ئاتاجیان بەئامێری هەمە چەشن و پیشەسازی زۆر هەیە. ئەستەمیشە توانای تاکە کەسێك بەسەر بەشێك لەو ئاتاجانەدا یاخود بەسەر هەموو ئاتاجانەدا بشکێت... هەروەها لەمەڕ بەرگری لەخۆ کردنیش دەگونجێت هەمان شت بگوترێت، مرۆڤ لەبەرگری لەخۆکردنیشدا پێویستی دەبێت بەشمشێرو ڕم و سوپەر، ئەم شتانەش بەبەکارهێنانی ئامێرو پیشەسازی جۆراو جۆر نەبێت نایەنە دەست... (۹)تێ بینی دەکەین فارابی گرنگی نادات بەلایەنی مادی ژیانی مرۆڤ، تەنانەت پێ دەچێت بەهۆکارێکیشی زانیبێت بۆ گەیاندنی خەلکی بەلایەنە مەعنەویەکە. لایەنی مەعنەویش ئەو کاملْ بونە ڕەهایە کەشادومانی پێ دەستەبەر دەبێت. هەرلەدیدی فارابی دا شادومانی پەیوەستە بەباشترین هێزی مرۆڤەوە، ئەویش ئەو هێزە ژیرەیە کەبە کارو کۆششی بیرنەبێت دەستەبەر نابێت. (۱۰) (ئیبن خەلدون) لایەنی مادی لەگرد بونەوەی مرۆیی دا بەگرنگتر دەزانێت لەلایەنی مەعنەوی. پێشی وایە ئەو شادومانی وبەختەوەریەی لەفەراهەم بونی لایەنیمادیەوە بۆ مرۆڤ دێتەدی، گەورەترە لەوەی کەتەنها بەنقوم بوون لەنێو بیرکردنەوەی ئەبستراکتدا بۆمرۆڤ دەستەبەر دەبێ.

(ئیبن خەلدون) بەئاشکراش ڕێی دەگەیەنێت هەندێك لەو کەسانەی بیرکردنەوەی واقعی وکردەییان هەیە ڕەنگە بژێوی یان فەراهەم تربێ وبەختەوەر تریش بن لەوانەی ئەهلی ئیبستیمۆلۆژیاو لۆژیکن. بە ڕێی (ئیبن خەلدون) هەرئەمەشە وایکردوە ئەو گوتەیە لەنێو خەلکیدا بلاو بێتەوەکە دەلێت: (کەسێ کاملْ بێت لە زانیاری و زانین دا بێ بەخت وکەم شانسە)چونکە مرۆڤ تاکو زیاتر بزانێت وزانیاری زیاد بێت ئەوەندەش پشکی لەڕۆزی وخۆش

گوزەرانی کەمتر دەبێت، کەرۆزی وخۆش گوزەرانی هۆکاری بەختەوەرین. ئینجا (ئیبن خەلدون) لێرەدا مەبەستی لەزانین و زانیاری ئەو جۆرەیانە کە مرۆڤ دوور دەخاتەوە لەوەی لەژیانی واقعی تێ بگات وجاڵی بێت. (۱۱) بەشێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین : فارابی لەپێناوی مەرامێکی وەعزی دا کتێبەکەیی نوسیوە. ئەو دەیەوێت بۆ خەڵکی ڕون بکاتەوە کەچۆن کامڵی وبەختەوەری ڕەها دەستی خۆدەخەن، هەرلەبەر ئەوەش لەپەرتوکەکەی دا جیاوازی کردوە لەنێوان ڕاو بۆچونی خەڵکی (شارە بەرێزەکە) وڕاو بۆچونی خەڵکی شارە ناچیزەکانی تردا. جێگەی تێرامانیشە ئەولەکاتێکدا ئاماژە بەڕاو بۆچونی خەڵکی شارە ناچیزەکان دەکات، شیکارێکی کۆمەڵایەتیانەی وای بۆ دەکات کەلە واقیعبینی خاڵی نیە، وەك ئەوەی گەرەکی بوبێت وەصفی بارودۆخی خەڵی وئەونەریتانە بکات کەبەکردەوە لەژیانیان دا ڕەنگی داوەتەوە، بەڵام بۆیە پێناسی حاڵ و باڵیانی کردوە. تاکو سەرزەنشت وسەرکۆنە بکات وسەرەنجامە شومەکانی ئەونەریتانە لەسەر کۆمەڵگە ڕون بکاتەوە. ئالێرەش دایەکە تایبەت مەندێتی (ئیبن خەلدون) لەبەرانبەر (فارابی) دا دەردەکەوێت. (ئیبن خەلدون) مقدمەکەیی پڕکردەوە لەپێناسەکردن وباسکردنی حاڵ وباڵ و نەریتی خەڵکی، بەڵام وەك فارابی مەبەستی ئەوە نەبوە سەرکۆنەی ئەو نەریتانە بکات. بەڵکو مەبەستی ئەوە بوە بڵێت: لەوڕۆژەوە خودا مەردومی دروست کردوە تاکو ڕۆژی مردن وزیندو بونەوەشیان حاڵ وباڵیان ئاوهابوە. ئینجا خەڵکی ناتوانن لەئایندەدا بەشێوەیەك بن گەجیاوازبێ لەڕابردوو، ئەمەش سوننەتی خودایە لەنێو بەندەکانی دا، سونەتی خوداش گۆڕانی بۆنیە.

لەبەشێکی پێشو تردا ئاماژەمان بەو ڕایەی (فارابی)داگەتیای دا دەڵێت سەرۆك لەنێو کۆمەڵگەدا وەك دڵ وایە لەنێو جەستەدا، هەرگا سەرۆك گونجاو وچاك بوو، هەموو کۆمەڵگەکەش دەسوڵحێت وچاك دەبێت، ئەمەش مانای ئەوەیە، لەدیدی (فارابی)دا چاکسازی کۆمەڵگە زۆر ساناو ساکارە، چونکە بەپلەی

یەكەم پشت دەبەستێت بەهەڵبژاردنی سەرۆكێكی باش بۆ ئەوكۆمەڵگەیە، بەوەش خەڵكی بەختەوەر دەبن و بارودۆخەكانیان ڕێك وپێك و باش دەبێت. هەروەها (فارابی)بەدوورو درێژی باس لەو خەسڵەتەكاملانە دەكات كەپێویستە لەسەرۆك دا هەبن تاكو بەتەواوی چاك وگونجاو بێت... خەسڵەتەكانیش بریتین لەبێ وەیی ئەندامەكانی لەش و پاراوی تێگەشتن ولەبەرگردن وجوانی دەربڕین وحەزكردن لەفێر بون وكەمی ئارەزووەكان و ڕاستگۆیی و بڵند خۆگرتن لەسوكایەتی ودادخواهی ومیانەڕەوی... هتد.

فارابی لەكاتێكدا ئاماژە بەوهەموو خەسڵەتە دەدات لەخۆی ناپرسێت پیاوێكی والەكوێ هەیە كەئەو هەموو خەسڵەتەی تێدا كۆبوبێتەوە؟ ئینجا گریمان پیاوێكی وەها هەشبێت، خەڵكی چۆن ڕێیان لێی دەكەوێت و ڕێك دەكەون لەسەر ئەوەی بۆ سەرۆكایەتی كردنی خۆیان هەڵیبژێرن؟ تەنانەت ئەگەر ئەوەشیان كرد، چۆن ڕێگەیان دەدرێت ئەو پیاوە بەرزكەنەوە بۆ سەر سەكۆی فەرمان ڕەوایی لەكاتێكدا كۆمەڵێ پاشای زۆردار جڵەوی فەرمان ڕەوایی یان لەدەست دایەكە هەركەس ڕكابەریان بكات لەسەر فەرمان ڕەوایی دەیكوژن؟ فارابی بەوە دەست كۆتا دەكات كەسەرۆكێكی ئایدیای بێنێتە خەیاڵی خۆیەوە، ئیتر گوێ نادات بەواقعی ئەو كۆمەڵگەیەی كەتیای دا دەژی، یانی وەك ئەوكەسە بیردەكاتەوە كەلەنێو (قوللەیەكی عاجی) دا دەژی، واش گومان دەبات كە خەڵكی دەتوانن لەگەڵ دا لەنێو ئەو قوللەیەدا بژین. بێگومان ئەم جۆرە بیركردنەوەیە لەتەك لۆژیكەكەی (ئیبن خەلدون) دا ناگونجێت. ئیبن خەلدون نكوڵی ناكات لەبایەخی سەرۆك لەنێو كۆمەڵگەدا، هەروەها نكوڵی لەوەش ناكات كەكۆمەڵگە زۆرێك لەخەسڵەتەكانی خۆی لەسەرۆكەكەیەوە وەردەگرێت، ئیدی ئەو سەرۆكە باش بێت یان خراپ بێت، بەگوێرەی ئەو پەندەی كەدەڵێت: (خەڵكی لەسەر دینی پادشاكانیانن) (١٢)لەگەڵ ئەوەشدا (ئیبن خەلدون) پێی وایە سەرۆك بونەوەرێكی سەربەخۆ و دابڕاو نیە لەبارودۆخە كۆمەڵایەتیەكەی. بەڵكو بەڕێی

(ئیبن خەلدون) سەرۆك بەرهەمی ئەو قۆناغەیە کەدەوڵەت پیای دا گوزەر دەکات لەسورە بەرەو ژورو بەرەو خوارەکانیدا. هەرکات دەوڵەت لەسەرەتای گەشەو پەرەسەندنی دابێت، سەرۆکەکەی تاڕادەیەکی زۆر چاك و گونجاو دەبێت، ئیتر وەچە لەدوای وەچە، خەسڵەتەکانی سەرۆك دەست بەداڕمان دەکەن، ئەمەش بەگوێرەی پلەبەپلە نغرۆ بونی دەوڵەتەکە لەنێو تەرەف دا.

لەکاتێکدا بەراورد دەکەین لەنێوان چەمکی (سەرۆك چاك)لای (ئیبن خەلدون) لەگەڵ چەمکی (سەرۆکی بەڕێز)لای فارابی دا، پەی بەهەندێ نیشانەی جیاوازی لەنێوان لۆژیکی هەریەك لەودوو کەسەدا دەبەین. (ئیبن خەلدون) دەڵێت : ئەگەر لەزۆر ڕوەوە و لەنێو زۆر نەتەوەدا سەرنجی خاوەن دەمارگیریەکان و ئەوانە بدەین کەزاڵ دەستی یان دەست کەوتوە، دەبینین شانکە شانکە دەکەن لەچاکەدا ولەمیشەوە لەڕێزداری و چاو پۆشی کردن لەهەڵە، بەرگە گرتن لەبەرانبەر بێ تواناکان، ڕێز گرتن لەمیوان، بەئەمەکی بەرانبەر بەڵێن و پەیمان، خەرج کردنی ماڵ ودراو بۆ پاراستنی شەرەف، گەورە ڕاگرتنی شەریعەت... مل کەچ کردن بۆ هەق لەگەڵ ئەوکەسەدا کەبانگەشە بۆهەق دەکات، دادوەری بەرانبەر بێ دەست وبێ تواناکانی ناوخۆیان، خۆبەکەم گرتن لەبەرانبەر هەژارو نەداردا، گوێ شنەوتن بۆ سکاڵاو دادی هانا هێنەران، پەیڕەوی کردنی شەریعەت وپەرستشەکان وبەردەوام بون لەسەری ولەسەر هۆکارەکانیشی، خۆ دورگرتن لەناپاکی وفرو فێڵ و پەیمان شکاندن و... هتد... بەوەش تێ دەگەین کەخودا مۆڵەتی پادشایەتی کردنی پێداون وبۆی ناردون... هتد) (١٣) (دەربڕینی وەرگێڕ).

(ئیبن خەلدون) دەیەوێت بڵێت : مرۆڤ لەبیابان دا ناتوانێت ببێتە سەرۆك، مەگەر ئەو خەسڵەتە باشانە لەخۆی دا کۆبکاتەوە، چونکە بەوە

شوێنکەوتوانی زۆر دەبن و دەمارگیری بەهێز دەبێت و ڕێگەی پادشایەتی لەبەردەمدا ناوەلا دەبێت...دووبارە (ئیبن خەلدون) دەگەڕێتەوە سەر ڕایەکەی خۆی ودەڵێت : پادشایەتیەکە لەدوای ئەوەی دادەمەزرێت و دەبێتە بۆ ماوەیی (ویراسی)لەنێو وەچەکانیان دا، لەسەر هەرمان حاڵ وباڵ نامێنێتەوە، چونکە وەچەکان لەسەر تەرەف ونازو نیعمەت پێ دەگەن ونەوە فەرامۆش دەکەن کەبیابان چ خەسڵەتێکی پەسەندی هەبوە، ئیدی هێدی هێدی دەوڵەتەکە خواردەبێتەوە بەرەو لاوازی وبێ ئەرزشیی، تاکو دێر بێ یان زوو خودا فەرمانی دارمان و ڕوخانی بەسەردا دەدات. بەکورتی لەجیاوازی نێوان لۆژیکی فارابی ولۆژیکی (ئیبن خەلدون) دا دەکرێت بڵێین: یەکەمیان باس لە (چ پێویستە ببێت)دەکات، بەڵام دووەمیان باس لە (لەواقع دا چی هەیە)دەکات، بێگومان ئەو جیاوازیەش زۆر گەورەیە.

## ئیبن خەلدون و ئیبن سینا :

سیی ساڵ لەدوای مردنی (فارابی)، فەیلەسوفێکی دیکە لەئیسلامدا لەدایك بوو کەناو بانگ و شۆرەتی لە (فارابی) کەمتر نیە. ئەویش (ئەبو عەلی ئیبن سینا) یە. ئیبن سینا لەرێرەوی زانستی خۆی دا جیاوازە لە فارابی. فارابی ژیانی دونیا نەویستی و دورگەوتنەوە لەجەنجاڵیەگانی کۆمەڵگەی بەلاوە پەسەند بوو، وەلێ (ابن سینا)بەشداریەکی کارای دەکرد لەژیانی رامیاری و کۆمەلایەتی دا، ئاردەقی دەخواردەوەو لەگەڵ ئافرەتانیش دا رێی دەبوارد. ئیبن سینا واناسراوە کەیەکێك بوە لەمرۆڤە گەشبین و بەئومێدەکان، دیدو سەرنجی وی بەرانبەر بەگەردون لەسەر بنەمای بناغەیە بووکە دەڵێت : (لەتوانادا نیە لەمە قەشەنگتر بکرێت کەتائێستا کراوە). لەلای ئەو جیهان لەسەر باشترین شێوازی گونجاو "ممکن"ە، ئینجا گەر خراپەش لەجیهان دا هەبێت ئەوە ناگەرێتەوە بۆ ویستی خودا، بەڵکو دەگەرێتەوە بۆ بوونی مادە. خودا چاکەیەکی روتە وخراپەی لێ ناوەشێتەوە، هەندێ لەبونەوەرەکانیش چاکن ولەخراپە بەدورن وەك مەسەلە ئاسمانی و ئەقلی یەکان. بونێکی دیکە هەیەکە بریتی یە لەبونەوەری زەمینی، لەمیش دا چاکە بەسەر خراپەدا زاڵە، خراپەکەش لەپێناوی چاکەدایە، بۆیە پێویستە واز لە چاکەیەکی زۆر نەهێنرێ لەپێناوی خۆلادان لەخراپەیەکی کەمدا. (١٥)

پوختەی راکانی (ابن سینا)ئەمەیە: لەبنەرەت دا مەبەست لەئافەریدەکردنی جیهان چاکەو خێرە، خراپەش بەشێوەیەکی رەفتەنی تیای دا دروست دەبێت چونکە هەندێ جار بوونی (چاکە - خێر)وا پێویست دەکات خراپەیەك بێتەکایەوە (دەربرینی وەرگێر). بۆ نمونە: (ئاگر)سود بەخش نابێت مەگەر زیانی (سوتان)ی لەگەڵ دا پەیدا ببێت. هەوریش بۆیە زیانمان لێ ئەدات و

تیشکی خۆرمان لێ بزردەکات، بۆئەوەی سودێکی ترمان پێ بگەیەنێت کەبریتی بەلەباران وئاودانی کشتەکان، کەواتە ناتوانین تەسەوربکەین ئەو جیهانەی تیای دا دەژین چاکەیەکی ڕوتە یان کەمالێکی ڕوتە، چونکە ئەگەر ئاوا بوایە ئەم جیهانە مان نەدەبوو، بوارێکیشی تێدا نەدەبوو، نەبۆ (ممکن)ەکانی بوون ونەبۆ جیاوازی نێوان شتەکان. (١٦)

وادیارە بۆیە (ابن سینا) ئەم بۆ چونە گەشبینانەی هێناوەتە کایەوە تاکو جێگەی گرفتی (چاکەو خراپە)ی پێ بگرێتەوە کەلە دێر زەمانەوە مێشکی هزرڤانانی قاڵ کردبوو. شەهرستانی لەپەرتوکەکەی دا (الملل والنحل)، بەسەرهاتێکی کۆمیدی دەگێڕێتەوە بۆ وێناکردنی ئەو گرفتە، کورتەی چیرۆکەکەش ئاوهایە: ئیبلیس لای خودا نارەزایی دەربڕی و لێی پرسی : ئەی خودا تۆ ئاگادارو زانابوی بەرانبەر ئەو خراپەیەی کەلەمن دەوەشێتەوە، کەواتە بۆچی دروستت کردم وزاڵت کردم بەسەر بەندەکانت داو مردنی منیشت دواخست بۆ ڕۆژی بەری؟ خوداش لەوەڵامی ئەو پرسیارەدا گوتی: ئەی ئیبلیس ئەگەر تۆ ڕاستگۆ بویتایە لەوەدا کەبڕوات هەبێت بەوەی من پەروەردگاری تۆ وپەروەردگاری مەردومم، وشەی (بۆچی)ت لەبەرانبەرمدا ڕاست نەکردەوە، من خودام و هیچ پەرستراوێ نیە جگە لەخۆم، بەرپرس نیم لەوەی دەیکەم، بەلکو خەلگی بەرپرسیاری کردەوەکانیانن. (١٧)

شەهرستانی لە لێدوانی دا لەسەر ئەو بەسەرهاتە دەلێت: لەسەرەتای دروست بونی بونەوەرەوە، ئادەمیزاد بەهۆی وشەی (بۆچی)یەوە گومانیان بۆ دروست بوە. بەرێی شەهرستانی مرۆڤ نابێت ئەقڵ بکاتە دادوەر بەرانبەر مەسەلە خواییەکان دا، بەلکو هیچیشی لەسەر نیە جگە لەمل کەچ بون و بێدەنگ بوون. (١٨)

وام دێ بەخەیاڵ دا (ئیبن سینا) ڕازی نەبوە بەبێ دەنگی لەبەرانبەر گرفتی (خراپە)لەجیهان دا، بەلکو بەردەوام بیری لێکردۆتەوە تاکو گەشتۆتە ئەو ڕایەی

گەبلێت : خراپە هەردەبێ بونی هەبێ، لەبەر پێویستی یەك گەسروشتی (چاکە)دەیخوازێ... دواتریش (ئیبن خەلدون) هات وگەشتە ئەو ڕایەی گەلەکۆتایی دا (ابن سینا) پێی گەشتبوو، وەلێ (ئیبن خەلدون)ئەو ڕایەی لەبوارە متیافیزیکی یەکەیەوە گۆڕی بۆ بوارە کۆمەڵایەتیەکەی.

(ئیبن خەلدون) لەباسکردنی دەستەڵات داران وکاریگەریەکانیان دا لەسەر کۆمەڵگە ئەو ڕایە پێشکەش دەکات. ئەو دەڵێت بونی ئەو دەستەڵات دارانە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی پێویستە، چونکە ئەمانە لە ڕێگەی چەوساندنەوەو تۆبزی کاریەوە، خەڵکی والێ دەکەن، ژیانیان لێ دوربکەوێتەوە و سوودو کەڵکەکانیشیان لێ کۆببێتەوە، گەر ئەو دەستەڵات دارانەش نەبن خەڵکی پەرتەوازەو بێ شیرازە دەبن و نیوەیان نیوەکەی تریان دەخۆن. بەڵام ئەوان لەکاتێکدا بەتۆبزی خەڵك بۆ هاوکاری و کۆبونەوە ژێر بار دەخەن، لەهەمان کات دا بۆ خزمەتکردنی مەرامە تایبەتیەکانی خۆشیان ژێربایان دەخەن.

(بەڵام یەکەمیان مەبەست لەچاودێری خواییە، دوەمیشیان بەشێوەیەکی ڕەفتەنی تێ دەخزێ وەك هەموو ئەو خراپانەی دەچنە نێو قەزایی خواییەوە، چونکە بونی چاکەیەکی زۆر مسۆگەر نابێت بەبێ بەبونی خراپەیەکی کەم"من اجل الواد"، ئینجا چاکە زۆرە کە بەوە لەدەست دەرناچێت، بەڵکو دەکەوێتە سەرئەو چەردە خراپە کەمەی کەتیای دایە، ئەمەش مانای ئەوستەم کردنەیە گەلەجیهان دا ڕودەدات...). (١٩)

لێرەدا ئێمە تێبینی لێکچونێکی گەورە دەکەین لەنێوان دەربڕینەکانی (ئیبن خەلدون) و دەربڕینەکانی (ابن سینا)دا، بەڵام جیاوازی نێوانیان، وەك ئاماژەمان پێدا، بریتی یەلەوەی ابن سینا باس لەخراپە دەکات لەگەردون دا بەشێوەیەکی گشتی، بەڵام ئیبن خەلدون باس لەخراپە دەکات لەکۆمەڵگەدا ولەو ڕوەوە کە لەلایەن هەندێ لەتاکەکانی کۆمەڵگەوە ستەم لەهەندێکی تریان دەکرێت.

## ئیبن خەلدون وئیخوانو لسەفا:

ئیخوانولسەفا گروپێ هزرڤانن، ناویان یاخود کەسایەتیەکانیان بەشێوەیەکی ڕاست ودروست و دڵنیاکەرانە نازانرێت. هەرئەوەندە لەبارەیانەوە دەزانرێت کەگروپێکن سەربە (شیعەی ئیسماعیلیە)، لەسەدەی چوارەمی کۆچی دا ژیاون. هەندێ سپارەو نامیلکەیان نوسیوە کەزیاترلەئینسکلۆپیدیای ڕێك وپێك دەچن کەزانستەکانی ئەو سەردەمەیان لەخۆ گرتوە. (٢٠)تەنانەت هەندێك بەیەکەمین ئینسکلۆپیدیای لەقەلەم دەدەن لەجیهان دا.

سیپارەکانیان زۆرێك لەو بیرۆکانەیان لەخۆ گرتبوو کەپەیوەندییان بە پرسە کۆمەڵایەتیەکانەوە هەیە. یەك لەو بیرۆکانەش ئەو گوتەیان بوو کەدەڵێت: دەوڵەتیش تەمەنێکی هەیە، بەکۆتایی هاتنی تەمەنەکەی ئەویش کۆتایی دێت. بەڕێی ئەوان دەوڵەتێك نیە بۆهەتا هەتایە بمێنێتەوە.بەڵکو هەردەوڵەتێك بگری پێویستە لەپاش بڵند بوونی بەرەو خوار بێتەوە. یانی لەسەرەتادا بەچاپوکی وبەهێزی دەست پێ دەکات وداوتر هێدی هێدی بەرەو داڕمان و ناتەواوی دەچێت، بەدبەختی وسەرشۆڕیش ڕودەکاتە خەلکەکەی، ئینجا هەردەبیَ لەکۆتایشدا لەسنورێکدا ڕابوەستێت. (٢١)

تێ بینی دەکریَ ئیبن خەلدون لەمقدمەکەی دا ئاوا بیرۆکەیەکی باس کردوە، ئەو وەرزەکاتی ژیانی دەوڵەتی بەوەرزەکانی ژیانی مرۆڤ لێك چواندوە، کەبەنەوجەوانی و کامڵی وپیریتی دا تێ دەپەڕێ. وەلێ ئیبن خەلدون لەشیکردنەوەی ئەو دیاردەیە دالەگەڵ (ئیخوانو لسەفا)دا ناکۆك دەبێت، لێرەش دا جیاوازی هەرەگەورە بەدەردەکەوێت لەنێوان لۆژیکی (ئیخوانو لسەفا)ولۆژیکی ئیبن خەلدون دا.

(ئیخوانو لسەفا)هەوڵ دەدەن شیکردنەوەیەکی [illegible]زمی)بۆ دیاردەکە بکەن، ئەوان وای دەبینن دەوڵەتەکان بەسوڕ دێنەسەر زەوی وەك چۆن کەهکەشانەکان لەئاسمان دا دەسوڕێن، ئەمەش بەگوێرەی ڕێسایەکی گشتی کەهەمووگەردون دەگرێتەوە. لەو ڕوەوە دەڵێن: کات نیوەی ڕۆژێکی ڕوناکەو نیوەکەی دیکەی

شەوێکی تاریك ونوتەکە. هەرکات، نیوەی هاوینێکی گەرم وبەقرچەیەو نیوەکەی تری زستانێکی ساردو بەگڕێوەیە. ئەو دووەش بەدوای یەکدا دێن، هەرکات (چ شەوو ڕۆژو چ هاوین وزستان) کەیەکیان هات، ئەویان دەڕوات. بەو ئەندازەیەی یەکیان کەم بکات ئەوی دیکەیان زیاد دەکات. (٢٢)ئەوەی شیاوی ئاماژە پێدانە، ئەوەیە هەندێ هەن کەبەشێوەیەك لەشێوەکان پێشی (ئیخوانو لسەفا)کەوتون لەپێشکەش کردنی ئەم بیرۆکەیەدا. لەڕاستیش دا بیرۆکەیەکی کۆنەو کە چوار چێوەی ئەفسانە میللی یەکان دا لەنێو زۆربەی نەتەوەدێرینەکان دا لەعێراق وئێران ومیسرو هندو چین و... هتد دا پەیدا بووە، .هۆکاری پەیدابوونی ئەم بیرۆکەیەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، خەڵکی بەهیوا بوون ئەو بارودۆخی گەندەڵی و ستەمەی تیادا دەژیان بگۆڕێت، هیواو ئومێد بەگۆڕانی بارودۆخەکە پاڵی پێوە ناون بۆ چاوەڕوان کردنی سەردەمێکی تازە، وەك هاتنی ڕۆژ بەدوای شەودا و هاتنی هاوین بەدوای زستان دا. هەرلەم ئەفسانە یەوە بیرۆکەی (مەسیح)لای عیبریەکان، و بیرۆکەی (مەهدی) لای موسوڵمانەکان سەری هەڵداوە. لەپاشان دا (ئیخوانو لسەفا)هاتن و ئەوەیان کردە دروشمی خۆیان تاکو ئاماژە بدەنە شوێنکەوتوەکانیان بەوەی دەوڵەتی خێروچاکە، کەدەوڵەتی ئەوانە، بێگومان هەردەبێ بێت وسەرهەڵبدات.

(ئیخوانو لسەفا)دەوڵەتەکان بۆ دوو گروپ دەپۆلێنن، کەسێ یەمینی نیە، دەوڵەتی چاکەو دەوڵەتی خراپە، لەمەشدا لەسەر ڕێسای (نێوەندی بەرزەوەگراو)ڕێ دەگەن، کەدیارە ئەم ڕێسایەش یەکێکە لەیاساکانی لۆژیکی کۆن، وەك لەپێشەوە باسمان کرد، هەردەوڵەتێك بگری، لەدیدی ئەوان دا، هەرلەسەرەتایەوە یان چاکەکارە یاخود خراپەکارو شەڕانگێز. تا کۆتایش هەربەو جۆرە دەمێنێتەوە. مێژوش هیچ نیە جگەلەسوڕی بەدوای یەکدا هاتنی دەوڵەتانی چاکە کارو خراپە کار.

پێم وایە ئیبن خەلدون بیرۆکەکەی خۆیی لەمەڕ (سوڕی کۆمەڵایەتی لە (ئیخوانو لسەفا)وەرگرتووە، بەڵام بیرۆکەکەی پێش خستودو چەسپاندویەتی

لەگەڵ لۆژیکە تازەکەی دا.ئەو دان نانێت بە بوونی دوو جۆر دەوڵەتی تایبەتمەند ولێك جیاوازدا، بەڵکو بەرێی ئەو هەموو دەوڵەتەکان تارادەیەك لەیەك دەچن، هەردەوڵەتێ بگریت، سەرەتا بە (چاکە)دەست پێ دەکات وپاشان هێدی هێدی شۆڕدەبێتەوە بەرەو (خراپەو گەندەڵی).

ئیبن خەلدون بەشێوازی متیافیزیکی ئەو (ڕاستیە)لێك ناداتەوە وەك (ئیخوانو لسەفا)دەیان کرد، بەڵکو لێکدانەوەیەکی کۆمەڵناسیانەی بۆ دەکات. شۆڕ بونەوەی هەموو دەوڵەتەکان بەرەو گەندەڵی بەو (تەرەف)ەلێك دەداتەوە کەهامرایە لەگەڵ گەشەکردنی دەوڵەتەکەدا.چونکە لەگەڵ سەرهەڵدانی ئەو تەرەفەدا دەستەڵات دارەکان ئەو خەسلەتە بەهێزانە لەدەست دەدەن کەلە سەرەتاوە هەیانبووە، بۆیە هەم خۆشیان دادەڕوخێنن وهەم دەوڵەتەکەش لەگەڵیان دا دەڕوخێت. ئینجاکۆمەڵێ دەستەڵات داری نوێ و خاوەن خەسڵەتی بەهێز جێگەیان دەگرنەوە.

ئیبن خەلدون دەگێڕێتەوە، کەلەسەردەمی عومەری کوڕی خەتاب دا ئاگرلە (کوفە)بەربوە، خەڵکەکە داوای مۆڵەتیان لەعومەر کرد

تاکو ڕێگەیان پێ بدات شاری (کوفە)بەبەرد دروست بکەنەوە، عومەر لەوەڵامیان دا گوتی : (ا فعلوا ولایزیدن احد علی پلاپ ابیات، ولا تگاولو فی البنیان، والزموا السنه تلزمکم الدوله) (٢٣)وادیارە ئەم برگەی کۆتایی لە قسەکانی عومەردا، کاریگەریەکی گەورەی داناوە لەسەر بیرکردنەوەی ئیبن خەلدون. عومەر دەڵێت : (دەست بەسوننەتەوە بگرن دەوڵەت دەستتان پێوە دەگرێت (یانی پێتانەوە دەلکێت –وەرگێر). بۆیە ئیبن خەلدونیش دێت بۆ ئەوەی بڵێت : خەڵکی لەدوای ئەوەی توشی تەرەف دەبن ناتوانن دەست بەسوننەتەوە بگرن. بۆیە هەردەبێ لەکۆتایش دا دەوڵەتەکەیان لەدەست بچێت.

## ئیبن خەلدون وئەبو حەیان:

(ئەبو حەییانی تەوحیدی)یش یەکێك بو لەهزرڤانانی سەدەی چوارەم وخاوەنی ڕۆشنبیریەکی فراوان و میتۆدێکی درەوشاو بوو. لەزۆر بواردا نوسیویەتي وئێمە نامانەوێت لێرەدا توخنی ئەو نوسینانەی بکەوین.

بەڵام سەبارەت بە بابەتێك (ئەبوحەییان) نوسیویەتی بابەتەکەش پەیوەندیەکی هەیە بەتێورەکەی ئیبن خەلدون ەوە، ئەویش بریتی یە لەپرسی "شعوبیەت". هەرچی شعوبیەکانە زۆر تامەزرۆ بوون بۆ سەرکۆنە کردنی (دەشتەکێتی)ودارنینی لەهەر خەسڵەتێکی باش. مەبەستیشیان کەم کردنەوەی بەهای عەرەب بوو، ئەوان لایان وابوو (عەرەب ودەشتەکێتی)یەك شتن، هەر خەسڵەتێکیش بەسەر هەرکامیان دا ببرێت بەسەر ئەوی تریشیان دا دەچەسپێت وڕاست دەردەچێت.

لەسەردەمی ئەبو حەییان دا، کابرایەکی شعوبی وەدەرکەوت کەنازناوی (جیهانی)بوو.ئەم کابرایە کتێبێکی نوسی و تیای دا نەریتی دەشتەکیەکانی بەشێوەیەکی زۆر ناشیرین وقێزەون وێنا کردبوو. ئەبو حەییان لەڕوی دا قوت بویەوەو ڕەتی دایەوە. ئەم ستایشی نەریتی دەشتەکیەکانی دەکردو بەشێوەیەکی جوان وێنای دەکرد. لەم پێناوەشدا (ئەبو حەییان)بەراوردی دەکرد لەنێوان نەریتەکانی دەشتەکێتی وشارنشینی دا. لەبارەی شارستانیەکانەوە دەڵێت: (ناچیزەیی وفڕو فێڵ ودەست برین ولاوازێتی بەسەریان دا زاڵە، چونکە خولگەی کاروبارەکانیان لەسەرمامەڵەی خراپ و، درۆ کردن لەهەست دا، وبێ بەڵێنی دەڕوات بەڕێوە. بەڵام خودا لەم ڕودوە عەرەبی پیرۆز ڕاگرتودو بەتواناو دەستەڵاتی خۆی لەسەر شەرافەتمەندانە ترین نەریت ڕێی هێناون...) (٢٤)کاتێ ئەم پەیڤەی (ئەبو حەییان)دەخوێنینەوە، لێکچونێکی گەورە دەبینین لەنێوان ئەو پەیڤەو ئەو پێناسەیەدا کە ئیبن خەلدون بۆ شارستانێتی دەکات. بۆیە بەدوریشی ناگرم ئیبن خەلدون ئەو پەرتوکەی (ئەبو حەییان)ی خوێندبێتەوە، وکتێبەکەش کاریگەری لەسەر دانابێت. بەڵام لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین

کە ئیبن خەلدون لەباسکردنی خراپەکانی (شارستانێتی) دا تەنها مەبەستی سەرکۆنەکردن نەبووە. وەك ئەبو حەییان کردوێتی. بەڵکو بۆیە ئاماژەی پێ داوە تاکو باس لەلایەنە خراپەکەی شارستانێتیش بکات، لەهەمان کاتیشدا نکوڵی ناکات لەولایەنە باشەی کەتیای دایە. شارنشینەکان ئەهلی زانست و هونەرو پیشەسازین، وەك چۆن ئەهلی فڕو فێڵ ودرۆو ساختەچێتیشن "دەربڕینی وەرگێڕ". ئینجا ئیبن خەلدون بەم سەرنجە دووندەییەوە سەیری (دەشتەکێتی)دەکات. لەدیدی ئەمدا دەشتەکیەکان ئەهلی ئازایەتی و ڕاشکاوێتی و چەلەنگی وساف ڕەفتارین، وەك چۆن ئەفام وتالانچی وتێکدەریشن.

ئیبن خەلدون لەوەدا جیاوازە لە (ئەبو حەییان)، کەلەدیدی ئەم دا پێوەرێکی ڕەهابوونی نیە کەبەگوێرەی ئەو پێوەرە نەتەوەکان هەڵبسەنگێنرێن وپلەو شکۆمەندی یان بۆ دابنرێت. بۆی هەیە بەگوێرەی پێوەرێکی دیاری کراو نەتەوەیەك باش بێت، بەڵام ئەم نەتەوە باشە، هەر دەبێ بەگوێرەی پێوەرێکی تر خراپ بێت. جیاوازیش لەمەزەنەکردنی خەسڵەتی نەتەوەکان دا دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی پێوەرەکانی ئەوانەی سەرنجی نەتەوەکان دەدەن.

لەوانەیە لێرەدا کەسێك بپرسێت : ئایا ئیبن خەلدون کابرایەکی شعوبی بوە، وەك هەندێ لەتوێژەرە تازەکان ئاماژەی بۆدەکەن؟

ئێمە لەبەردا ئاماژەمان بەوە داگە ئیبن خەلدون عەرەبی بەنەتەوەیەك لەقەڵەم دەدا کەزۆر بەتوندوتیژی ڕۆچوون بەنێو ژیانی دەشتەکێتی دا. ئەم ڕایەشی لەئەنجامی سەرنجدان لەو هۆزە عەرەبیانەوە بۆدروست بوو، کەلەو کاتەدا لەڕۆژئاوای عەرەبیدا نیشتەجێ بون و لەسەرجەم هۆزەکانی تر زیاتر دەستیان بەخەسڵەتەکانی دەشتەکێتی یەوە گرتبوو. جێگەی نیگەرانیشە کەدەبینین ئەو توێژەرانە لەکاتی لێکۆڵینەوەی (مقدمە)کەی ئیبن خەلدوندا ئەو خاڵە فەرامۆش دەکەن.

ئەوان کاتێ دیویانە ئیبن خەلدون هەندێ خەسڵەتی بەد دەداتە پاڵ عەرەب، ئیتر وایان گومان بردوە کەئەویش پیاوێکی شعوبی وبەربەری بوەو ڕق و کینەی لەبەرانبەر عەرەب دا زۆر دەشتەکین ئەو خەسڵەتە بەدانەی داوەتە پاڵیان، بەڵام لەهەمان کاتیش دا بەهەمان پێودانگ کۆمەڵێ خەسڵەتی ستایش کراویشی داوەتەپاڵ ئەو خەسڵەتانەی کەدەشتەکیەکانی پێ دەناسرێت و بەگوێرەی تیۆرەکەی ئەم ستایش کراون. واتە ئەگەر تێکدەر بن ودووربن لە داخوازیەکانی زانست وپیشەسازیەوە، ئەوا لەڕویەکی ترەوە سروشت پاکترو چاکترو نێزیکتریشن لەڕۆحی ئاینەوە، وەك لەگەسانی تر. گرفتی ئەو توێژەرانە لەوە دایە کەلەبەر ڕۆشنایی لۆژیکەکۆنەکەیاندا لە ئیبن خەلدون دەکۆڵنەوە، ئەو لۆژیکەی کەتەنها لەیەك لایەنەوە سەرنجی مەسەلەکان دەدات، واتە لەو ڕەهایەوە کە هاودژبونی تێدا دروست نیە. بەڵام ئیبن خەلدون لەدوو لایەنی هاودژەوە سەرنجی مەسەلەکانی دەدا. لەدیدی ئەم دا ڕەنگە مەسەلەیەك لەڕویەکەوە باش بێت ولەڕویەکی دیکەوە خراپ بێت.

## ئیبن خەلدون وئیبن هەیسەم:

حەسەنی کوڕی هەیسەم یەکێکە لەبەناو بانگترین زانا سروشت ناسەکان لەئیسلام دا، تەنانەت یەکێك لەڕۆژ ئاواییەکان بە گەورەترین زانای سروشت ناسی لەقەڵەمداوە کەلەچاخەکانی ناوەڕاست دا بەدەرکەوتبێت (٢٥).

ئەم ناوبانگی بەلێکۆڵینەوەکانی لەبواری ڕۆشنایی ودیاردە بەرچاوەکان (بصریات)دەرکردبوو. لەم بوارەدا هاو شانە بەئیبن خەلدون لەبواری لێکۆڵینەوە کۆمەلایەتیەکان دا. ئێمە بەتەواوی دڵنیا نین لەوەی ئایائیبن خەلدون چاوی کەوتوە بەپەرتوکی (المناظر)ی (ئیبن هەیسەم)یان نە... وەلێ تێ بینی هەندێ لێکچون دەکەین لەنێوان هەندێ لەقسەکانی (ئیبن هەیسەم)وئیبن خەلدوندا. شیاوی باسە هەردوکیان بانگەشەدەکەن بۆ پەیڕەو کردنی لۆژیکی (مادی)لە لێکۆڵینەوەداو، لەبەرانبەریشدا ڕەخنە لە لۆژیکی (هەلگواستەکاری-فۆرمی)دەگرن.

(ئیبن هەیسەم) بڕوای وایە دیاردە سروشتی یەکان لەسەر یەك ڕژێم و سیستەم بەڕێوە دەچن ولەسەر یەك ستایلیش ڕوودانیان دووبارە دەبێتەوە. بۆ نمونە دەڵێت: ئەگەر دیتمان ڕۆشنایی (تیشك)درێژ دەبێتەوە یان دەشکێتەوە یاخود دەچەمێتەوە بەشێوەیەکی تایبەت، ئەوا پێویستە چاوەڕوان بکەین هەموو تیشکەکان لێرەو لەوێش ولەهەموو جێگەیەك و لەئێستاو داهاتوش و لەهەموو کاتێکیش داهەر وان. ئیبن هەیسەم بەم جۆرە میتۆدی خۆی لەلێکۆڵینەوەدا شی دەکاتەوە: (لێکۆڵینەوە بەسەرنج دان لە "موجودات" وتاوتوێ کردنی دۆخی شتەبەرچاوەکان و جیاکاری تایبەتمەندی "جزئیات"ە کانیان دەست پێ دەکەین... هەتا دەڵێت : پاشان لەلێکۆڵینەوەو پێودەرەکان دا پلە بەپلە

سەردەکەوین لەگەڵ ڕەخنەکردنی پێشەکیەکان وبەرئەنجامە پارێزراوو حازر بەدەستەکان دا"دەربڕینی وەرگێڕ"، ئامانجیشمان لەهەموو ئەوەی سەرنجی لێ دەدەین وتاوتوێی دەکەین، بەکارهێنانی دادگەریە نەك شوێن کەوتنی ئارەزوو. لەهەموو ئەوانەی دا کەتاوتوێی دەکەین و ڕەخنەی لێ دەگرین، داواکردنی هەق و ڕاستی یە نەك لاربونەوە بەلای ئارەزووەکان دا...) (٢٦)کاتێکیش دێینەسەر ئیبن خەلدون دەبینین ئەمیش وەکو (ئیبن هەیسەم)دان دەنێت بەبوونی کۆمەڵێ یاساو ڕێسای وێکچودا لەهەموو کات و ساتێك دا. ئەگەر (ئیبن هەیسەم)مەبەستی لێیان یاساکانی سروشت بێت ئەوا ئیبن خەلدون مەبەستی پێی یاساکانی کۆمەڵگەیە. کەئەو بە (العوارض الذاتیة)ناوزەدیان دەکات یان وەکو خۆی دەڵێت: (مایخلف المجتمع من العوارض لذاتة). (٢٧)ئیبن خەلدون دەڵێت: (الماضی اشبە بالاتی من الماء بالماء) لەبەرئەوەش ڕەخنە لەو مێژونوسانە دەگرێت کەئەم ڕێسایە فەرامۆش دەکەن، لەو ڕوەوە کە زیادە ڕۆیی دەکەن لەگواستنەوەی هەواڵ دا، ڕوداوی والەهەندێ لەنەتەوەکۆنەکانەوە دەگێڕنەوە کەناگونجێت ڕوداوی واله مرۆڤی وەك ئێمە ڕوبدات. (٢٨)بەڕێی وی، نەتەوە کۆنەکانیش، لەڕوداوە کۆمەڵایەتیەکانیاندا لەسەر هەمان ئەو ڕێسایانە ڕێ یان کردوە کەنەتەوەکانی ئێستا لەسەریان ڕێ دەکەن. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر بابای مێژوونوس کەپێوانەی نەبینراوەکانی بەبینراوەکان و بەسەر چوەکانیشی بە هەنوکەییەکان بکات. (٢٩)ئیبن خەلدون دەڵێت: زۆر جار مێژو نوس وڕاڤە کاران و پێشەوایان ڕوداو و بەسەرهاتی هەڵە دەگوازنەوە، چونکە پشتیان تەنها بەگواستنەوە بەستوە ئیدی "گواستنەوەکە – وەرگێڕ" لاواز بێت یاخود بەهێز، نەهاتون ئەو ڕوداوانە بخەنەوەسەر بنەڕەتەکانیان، بەڕوداوی هاوشێوەش نەیان پێواون، نەیان داون لەپێوەری دانایی وڕاوەستان لەسەر سروشتی بونەوەر،

نەهاتون سەرنج وبەرچاو ڕونیی چرکەنەوە لەنێو هەواڵەکان دا، بۆیە لەهەق لایان داوە وبەبیابانی وەهم و هەڵەکاریدا ئاوارە وسەرلێ شێواو بوون)٣٠(لێرەدا ئەوەی‌جێگەی سەرنجە، ئەوەیە ئیبن خەلدون لەکاتێکدا دان بەبوونی ئەو یاسایە دادەنێت لەپێوانە کردنی ڕوداوە نەبینراوەکان بەبینراوەکاندا. دەبینین دان بەبوونی ڕێسایەکی تردا دەنێت. کەوادیارە لەگەڵ یاساکەی تردا ناکۆك و هاودژە. دکتۆر تەها حسەین دەڵێت: ئیبن خەلدون لەکۆمەڵگەدا دوو ڕێسای دۆزیوە ئەوەکە هەمیشە هاودژن، دەگونجێت یەکەمیان بەیاسای (وێکچون)ناو بنێین و، ڕێسای دوەمیشیان بەیاسای (جیاواز بوون)ناوزەر بکەین. ئەگەر کۆمەڵگەکان لەهەندێ ڕووەوە لەیەك بچن، ئیدی ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە سەرجەمیان بەشێوەیەکی ڕەها وەك یەك وان و وێك دەچن. بەڵکو جیاوازی گەلێ لەنێوانیان دا هەیە کە پێویستە مێژو نوس تێ بینی یان بکات و ئاگای لەجیاوازیەکان بێت. (٣١)ئیبن خەلدون بەم تەرزە لەو مەسەلەیە دەدوێت: (ڕەنگە کەسێك هەواڵێکی زۆری پێشینان ببیستێت، ئیتر ئاوڕ ناداتەوە بەلای ئەو ئاڵ و گۆڕانەی کەبەسەر بارودۆخەکان دا هاتون دێت وئەو هەواڵە بەسەر ئەودی خۆی دەیزانێت دەچەسپێنێت وبەگوێرەی ئەوەی دیویەتی دەیپێوێت، دیارە جیاوازیش زۆرە لەنێوانیان دا، بۆیە دەکەوێتە نێوهەڵەوە) (٣٢)

لەم ڕودوە پوختەی بۆچونی ئیبن خەلدون ئەوەیە: کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کۆمەڵێ یاساو ڕێسای هەیە کەلەهەموو کات و شوێنێکدا لێك دەچن، وەك چۆن یاساکانی سروشت لێك دەچن، یەك لەو یاسایانەش ئەوەیە کۆمەڵگە دەگۆڕێت وبەرەو زووریان بەرەو ژێر هەڵدەگەڕێتەوە بەهۆی بەدوای یەك داهاتنی دەوڵەتەکانەوە (٣٣). لەبەر ئەوە ئیبن خەلدون بانگی (مێژونوسان) دەکات تاکو سەرنجی (مادی)ورد بدەن، لەکاتی بەراورد کردنی بارودۆخی کۆمەڵگە جیا

جیاکان دا. چونکە ناگونجێت کۆمەلگەیەك لەهەرەتی چالاکی وگەشە سەندنی دا بەراورد بکرێت بەبارودۆخی کۆمەلگەیەکی ترکە لەسەردەمی پیرێتی و دارمان دا بێت. بەبێ ئەوەی جیاوازی گەورەی نێوان ئەو دوو قۆناغە رەچاو بکرێت.

بەدەربرینێکی تر، ئیبن خەلدون دەیەوێت مێژونوسەکان، روداوە نادیارەکانی کۆمەلگە بەروداوە حازرەکان بپێون، لەهەمان کاتیشدا داوایان لێ دەکات دەرك بەجیاوازی نێوان ئەو قۆناغە کۆمەلایەتیانەش بکەن کەروداوەکان تیایاندا رودەدەن. بۆیە پێ دەچێت روداوێکی گەورە لەکۆمەلگەیەکی پێشکەوتودا روبدات، بەلام خەلکی بروای پێ ناکەن چونکە بەپێوەری ئەو کۆمەلگە داروخاوە دەی پێون کەتیای دا دەژین. (٢٤)

## ئیبن خەلدون وئیبن خەتیب:

(لسان الدین ئیبن خەتیب)هاوڕێی ئیبن خەلدون بوو، هەرتكەیان بە یەكتری سەرسام بوون، ئیبن خەتیب لەئەندەلوس دەژیا، وەزیری دوان لەپادشاكانی غەرناتە بوو، ویژەوانێكی ناودارو نوژداریكی بیر تیژ بوو، كتێبێكی بەنێوی (مقنعات السائل عن المرض الهائل)، لەم پەرتوكەدا باس لەو (تاعون)دەبەربلاوە دەكات كە بەرلەو سەردەمە بەسەر مەغریب و ئەو روپادا هات و ژمارەی قوربانیەكانیشی گەشتە بیست وپێنج ملیون كەس.

خەلكی لەوسەردەمەدا تاعونەكەیان بەوشێوەیە لێك دەدایەوە كە لەم ڕۆژگارەمان دا خەلكی ڕەشۆكی شتی پێ لێك دەدەنەوە، هەندێكیان دەیان گوت بەهۆی سەركەشی و یاخی بونی خەلكەوە خودا ئەو نەخۆشینەی بەسەریان دا زاڵ كردوە، هەندێكی تریان پێیان وابوو بەرئەنجامی بارودۆخی تایبەتی ئەستێرەكانە.

لەم نێوەندەدا (ئیبن خەتیب)هات و گوتی: تاعون وەك پەتا لەڕێگەی جل وبەرگ و قاپ و قاجاخ وشتی ترەوە بلاو دەبێتەوە، باشترین هۆكاریش بۆخۆ پاراستن لەو پەتایە، دوور كەوتنەوەیە لەوكەسانەی توشی بوون. جگەلەوەش ڕودەكاتە ئەو كەسانەی كەنكولی لە (پەتا)دەكەن و بەگوێرەی شەریعەت لەگەڵیان دا دەدوێت ودەڵێت : (بونی پەتا شتێكی سەلمێنراوە بە ئەزمون ولێكۆڵینەوەو هەواڵە ڕاست و متمانە دارەكانیش. ئایا ئێمە بەچاوی خۆمان نابینین ئەو كەسەی تێكەلاوی توش بوەكان ناكات و توخنیان ناكەوێت بەساغی وسەلامەتی دەمێنێتەوە، كەچی ئەوكەسەی تێكەلاویان دەكات نەخۆشینەكەی بۆ دەگوێزرێتەوە. ئینجا شەریعەت لەبارەی مەسەلە پزیشكی و ڕوداوە سروشتی

یەکانەوە نادوێت "ئەو ڕوداوانەی کەپێویستە مرۆڤەکان خۆیان لیَ ی بکۆڵنەوەو ئەقڵ و هەستەکانیان بەکار بێنن لەپێناوی ناسینیان دا "). (٢٥)

ئەگەری ئەوە زۆرە ئیبن خەلدون موتالأی ئەو پەرتوکەی (ئیبن خەتیب)یکردبێت، یاخود بەلایەنی کەمەوە لەڕێگەی پەیوەندی شەخسی یەوە بەدانەرەکەیەوە، کەوتبێتە ژێر کاریگەری هەندێك لەبۆچونەکانیەوە. هەرچۆن بێت، ئێمە ویکچونێکی گەورە بەدی دەکەین لەنێوان ئەو بۆچونانەو بیرۆکەکانی ئیبن خەلدوندا، نەخاسمە لەڕوی پەیوەندی شەریعەت بەپرسەنۆژداریەکانەوە.

ئیبن خەلدون لەبەشی (علم الطب)ی (مقدمە)کەی دا دەڵێت: (خودا پێغەمبەری بۆ ناروین تاکو یاساشەرعیەکانمان فێربکات، بۆئەوەی نەناردوە کە مەسەلە نۆژداریەکان یان هەر مەسەلەیەکی تری زانستیمان فێر بکات "کەواتە ناگونجێت هیچ شتێ لەو باس و خواسە پزیشکی یانەی کەلە فەرمودە (صحیح). کان دا هاتوون بەوە لێك بدرێنەوە کەمەشروعن، چونکە بەڵگەیەك نیە ئەوە بسەلێنێت، مەگەر بۆ بیرۆزێتی وڕاستگۆیی گرێ بەستی ئیمانی بەکار بهێنرێت، بەو جۆرە سودێکی گەورەی دەبێت، ئەمەش هیچ پەیوەندیەکی بەنۆژداری مەزاجیەوە نیە، بەڵکو یەکێکە لەکاریگەری وشوێنەوارەکانی وشەی ئیمانی، وەك لەمەسەلەی چارەسەرکردنی ژانەسك دابە هەنگوین دەبینرێت. خوداش ڕێنمونی کاردبەرەو ڕاستی و جگە لەویش خودایە ترینە) (٣٦)

لێرەدا ئیبن خەلدون وەکو (ئیبن خەتیب) هەوڵ دەدات پرسە نۆژداریەکان دووربخاتەوە لەئاین و شەریعەت بەلأم لەورووەوە، جیاوازی هەیە کە ئیبن خەلدونئدان بەکاریگەری (ئیحسانی ئیمانی)دا دەنێت لەچارەسەرکردنی نەخۆشیەکان دا. ئەوەتا بەڕونی ئاماژەدەدات بەوەی تەبەرك کردن بە (مەنسوراتی ئاینی) سودێکی سروشتی نیە، بەڵکو سودەکەی لەکاریگەری (وشەئیماتی)ە کەوەیە کە لەسەر دەرون پەیدا دەبێت.

ئیبن خەلدون بەوەندە دەست هەڵناگرێت، بەڵكو هەوڵ دەدات پرسەنۆژداریەکان دووربخاتەوە لەبواری سیحرو جادوبازی. ڕەخنەش لەبۆچونی (ئەبی عەبیدی بەکری)دەگرێت کەهاتوە بڵاوبونەوەی نەخۆشیەکان لەشاری (قابس)دا لەسەر بناغەیەکی جادویی لێك دەداتەوە.

بەکری لەپەرتوکەکەی دا (المسالك والممالك)دەڵێت : شاری قابس پێشتر نەخۆشینی کەمی تێدا بوو، دواتر چاڵێکی تێدا پەیدا بوو، لەناو ئەو چاڵەدا دەفرێکی مسی سەربەقوڕقوشم مۆرکراوی تیادا بەدەرکەوت، هەرکە سەرە قوڕقوشمینەکەی لابرا، دووکەڵێکی لێ بەرز بویەوە بەرەو هەوا، ئەمەش بویە سەرەتای نەخۆشین و پەتا لەشاری قابس دا. (٣٧)

(بەکری)بەم قسەیەی مەبەستی ئەوەیە بڵێت، دەفرەکە هەندێ تەلیسمی تێدا بوو کەشارەکەی دەپاراست لەنەخۆشین، بەڵام کاتێ سەرقاپەکەی لادرا، کاریگەریەکەی نەما.

ئیبن خەلدون ئەم لێکۆڵینەوەی بەکری بەدەستەواژەی (من مذاهب العامة ومباحثهم الركيكة) (٣٨)پێناسەدەکات، ئینجا لەبریتی ئەوەش، ئیبن خەلدون لێکدانەوە یەکی کۆمەڵایەتی دێنێتە ئاراوە. لەوبارەوە دەڵێت : بڵاوبونەوەی نەخۆشین "پەتا" لەشاری قابس دا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کەم و کورتیەی کە لەدانیشتوانەکەی دا ڕوی دابوو.

هۆکاری ئەمەیشی بەوە لێك دایەوە کەکەمی دانیشتوان وادەکات (هەوا)بوەستێت و بۆگەن بکات، بەوەش جەستەی خەڵك وئاژەڵانیش بۆگەن دەکات. بەڵام ئەگەر ژمارەی دانیشتوان زۆر بن و جمو جوڵیان لەناوشاردا زۆر بێت ئەوا (هەوا)کەش بەهۆی جمو جوڵی ئەوانەوە دەجوڵێت و لەباری ڕاوەستاوی و بۆگەن کردویی وگواستنەوەی نەخۆشین قوتار دەبێت. (٣٩)

ئێمە نکوڵی ناکەین لەو لاوازیە ئاشکرایەی لەنێو لێکدانەوەکەی ئیبن خەلدوندا هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەولاوازیەش دا لەوەدا لەلێکۆڵینەوەکەی

(یەكری)جیادەبێتەوە كەلێكدانەوەكەی ئیبن خەلدون خاوەنی لۆژیكێكی واقیعیە. بێگومان لێكدانەوەكەی ئیبن خەلدون هەوڵێكی سەرنەكەوتوو بوو، وەلێ هەرچۆن بێت هەوڵێكی (پێشكەوتنخوازانە)بوو، بەبەراورد لەگەڵ ئەو هەوڵانەی لەو سەردەمەدا باو بوون.

شتێكی دیكەش كەپەیوەندی بەم بابەتەوە هەیە، بریتی یە لەڕابۆچونی ئیبن خەلدون سەبارەت بەزۆریی (گەنز)ی شاردراوە لەژێر زەمینی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا. خەلكی لەو سەردەمەدا زۆری ئەو گەنزانە لەڕۆژ هەڵات دا وكەمی یان لەڕۆژ ئاوادا بەهۆكارگەلێ ئەستێرەیی یەوە دەبەستەوە. لێرەدا ئیبن خەلدون دێت و تێ بینی یەكی بەبێز پێشكەش دەكات، لەو ڕووەوە دەلێت: (ئەوان هۆكارێكی ئەستێرەیی پێ دەدەن. ماویانەو ئەوەی هۆكارێكی زەمینیشی بدەنە پاڵ، ئەو هۆكارە زەمینیەش بریتی یە لەزۆری ئاوەدانی و تایبەتمەندی ئەو ئاوەدانیەش بەزەوی و وڵاتەكانی ڕۆژهەلاتەوە. زۆری ئاوەدانیش دیارە بەسودە بۆ زۆر بوونی كەسابەت، بەهۆی زۆری ئەو كارو فرمانانەی كەئاوەدانی دەیسازێنێت. هەرلەبەر ئەوەشە ڕۆژهەلات لەنێو سەرزەمینەكانی تردا "دەربرینی وەرگێر" بەڕەفاهیەت و خۆش گوزەرانی تایبەتمەندە، ئەمە ناگەرێتەوە تەنها بۆ كاریگەریەكی ئەستێرەیی....هتد) (٤٠)

## ئیبن خەلدون و ئیبن عەرەبی :

قازی ئەبو بەکر ئیبن عەرەبی، یەکێکە لەشەرعناس ونوسەرە بەناوبانگەکانی ئەندەلوس، هەوڵ و داوێکی زۆری هەبووە بۆ بەرمڤانی کردن لەهۆزی ئومەییە، تەنانەت ڕەنگە یەکەمین کەسێك بێت لە ناو شەرعناسە موسوڵمانەکاندا کە بەتوندی بەرەو ئەو ڕێبازە ڕۆشتووەو بەڕاشکاویش ڕاوبۆچونی خۆی بۆخەڵکی ئاشکرا کردوە. ئیبن عەرەبی پەرتوکێکی نوسیوە بەنێوی (العواصم من القواصم) لەوپەرتوکەدا باس لەو ئاژاوەو ئاشوبانە دەکات کەلەسەرەتای سەردەمی ئیسلام دا ڕویان داوە و بەرگریەکی (زۆریش-وەرگێڕ)دەکات لەوانەی بەشداری ئاژاوەکانیان کردوە وەك بنەماڵەی ئومەییەو ئەوانی تریش. ئێمە گومانمان نیە لەوەی ئیبن خەلدون ئەو پەروتوکەی خوێندۆتەوە، پەرتوکەکە کاریگەریەکی زۆریشی لەسەر داناوە، بۆیە دەبینین هەمان ڕێبازی (ئیبن عەرەبی) دەگرێت لەکاتێك دا باس لەو ئاشوبانە دەکات لەنێو (مقدمه)کەی دا. (٤١)

(ئیبن عەرەبی)ڕایەکی بەناوبانگی هەیە سەبارەت بەشۆڕشەکەی (حسەین) بەسەر (یەزید)دا. ئەو دەڵێت: حسەین بەپێی شەرعی پێغەمبەری باپیری کوژراوە. ئەوەتا پێغەمبەر " بەگوێرەی گێڕانەوەی ئیبن عەرەبی" لەفەرمودەیەکی دا دەفەرمێت : (انه ستكون هنات وهنات، فمن اراد ان يعرف امر هذه الامة وهى جميع فاضربوه بالسيف كائنا من كان). بۆیە (ئیبن عەرەبی)لای وایە ئەو کەسانەی بەشداری یان کردوە لەکوشتنی (حسەین)دا بۆ گوێڕیەڵی کردنی ئەو فەرمانەی پێغەمبەر، ئەو کارەیان کردوە. چونکە ئەبوا (حسەین)لەماڵەکەی خۆیدا دانیشتایەو بۆ داواکردنی هەق ئەو شۆڕشەی بەرپا نەکردایە، چونکە شۆڕشەکەی ئاشوب و پەرتەوازەیی بەسەر ئیسلام دا هێنا. (٤٢)

سەیر لەوەدایە (ئیبن عەرەبی) لەکاتێکدا سەرکۆنەی دەرچونەکەی (حسەین)دەکات دژبە (یەزید)، دەبینین بەرگری دەکات لەو کەسانەی دەرچون لەفەرمانی (عەلی کوڕی ئەبی تالب)لەسەردەمی خەلافەتەکەی دا. تەنانەت هەوڵ دەدات بەهۆکاری جودا جودا پاساویان بۆ بێنێتەوە، هەرچەندە دانیش بەوەدا دەنێت کە ئەوکەسانە لەسەرەتاوە بەیعەتیشیان بە (عەلی)دابوو. لەو ڕووەوە دەڵێت: (پێ دەچێت لەپێناوی شتێکدا دەرچوبن بۆلادانی عەلی کەدواتر بۆیان دروست بوە... تادەڵێت : پێ دەچێت بۆ ئەوەش دەرچوبن تاکو لەبکوژانی عوسمانی تۆڵە بکەنەوە. پێ دەچێت بۆیە دەرچوبن تاکو تایفەو هۆزە موسوڵمانەکان کۆبکەنەوەو بیان گێڕنەوە بۆ ژێر سایەی یاسا، بۆ ئەوەی شپرزە نەبن و کوشتاری یەکتری نەکەن، هەرئەمەش ڕاستە نەك شتی تر... هەواڵە هەرەڕاستەکانیش "کەبەئێمە گەشتون" داکۆکی لەو ڕاستی یەدەکەن) (٤٢) دەتوانین بڵێین (ئیبن عەرەبی) ئەو پەندەی بەسەردا دەبرێت کەدەڵێت: (هاوین و زستانی لەسەریەك بان کۆکردۆتەوە). (یان وەکو کورد دەڵێت: بانێکەو دووهەوا – وەرگێڕ)چونکە دەبینین لەبارەی (حسەینەوە) دەڵێت: ئومەتی پەرتەوازە کردوە کاتێ لەدژی یەزید ڕاپەڕیوە. بەڵام لەبارەی ئەوانەوە کەدەرچون لەفەرمانی عەلی دەڵێت : ویستویانە ئومەت کۆ بکەنەوە!. وادیارە ئەو هۆیەی پاڵی بە (ئیبن عەرەبی) یەوە ناوە کە ئاوا ڕایەکی هەبێت، ئەوەیە کەخۆی یەکێکە لەبانگەشە کارانی هۆزی ئومەیەو دەمارگیر بوە بۆیان. کەسی دەمارگیریش دەکەوێتەنێو هەڵوێستی پێچەوانەوە لەپێناوی بەرگری کردن دا لەوەی کەدەمارگیرە بۆی، ئیدی بەخۆی بزانێت یاخود بەخۆی نەزانێت.

لێرەدا جیاوازی نێوان (ئیبن عەرەبی) و ئیبن خەلدون بەدەردەکەوێت. ئیبن خەلدون هەوڵ دەدات لەبارەی ئەو جۆرە گرفتانەوە هەڵوێستی ئەوکەسەی هەبێت کەلە دووگۆشەنیگاو دوولایەنەوە سەرنجی گرفت و مەسەلەکان دەدات.

بۆیە سەبارەت بەهەر لایەنێکەوە لەدیدی لایەن گرەکانی لایەنەکەوە بڕیار دەدات.

ئیبن خەلدون لەعەلیەوە دەگێڕێتەوە کەلەبارەی کوژراوەکانی (جمل وصفین)وەپرسیاری لێکراوە، کەئایا کوژراوەکانی هەردولایەنی شەڕەکەچۆنن؟. عەلی دەڵێت: (بەوکەسەی گیانمی بەدەستە، هیچکام لەوانە نامرێت ئەگەر دڵی پاکژ بێت، ئیلا دەچێتە بەهەشتەوە) (٤٤)ئیبن خەلدون لەگێڕانەوەی ئەم نمونەیەوە، دەیەوێت بڵێت : پێویستە بڕیار دان لەسەر ئەو کوژراوانە پشت ببەستێ بە پاکژی دڵ و بێ خەوشی مەبەستەکان. هەرکامیان لەداواکردنی هەق دا ڕاستگۆ و بێ خەوش بووبێت دەچێتە بەهەشت. بەچاو پۆشین لەوەی ڕاو گردەوەی هەرچۆن بووبێت. لەمەشدا جیاوازی نیە لەنێوان ئەو کەسانەی سەر بەم بوون یان ئەوانەی سەربەلایەنەکەی تر بوون. ئیبن خەلدون بەدەربڕینێك کۆتایی بەبۆچونەکەی دێنێت کەلە دەربڕینە بەناو بانگەکەی (مەدام شتایل) دەچێت کەدەڵێت : (ئەگەر هەموو شتێکم بزانیایە، ئەوا عوزرم بەهەموو مرۆڤێك دەدا) ئیبن خەلدونیش دەڵێت: (ئەگەر بەچاوی دادگەریەوە سەرنج بدەیت، عوزر بەهەموو خەلکی دەدەیت... (٤٥)

ئیبن خەلدون ئاماژە بەڕاکەی (ئیبن عەرەبی) دەدات لەبارەی دەرچونەکەی حسەینەوەو دەڵێت: (قازی ئەبو بەکر ئیبن عەرەبی کەوتۆتە هەڵەوە لەمەدا. بەوەی لەپەرتوکەکەی دا کەناوی ناوە (العواصم من القواصم) باس لەوە دەکات گوایە حسەین بەپێی شەرعەکەی باپیری کوژراوە، ئەمەش هەڵەیەکە، بێ ئاگایی وی لەمەرج وبەندو باوەکانی پێشەوای دادگەر ئەو هەڵەیەی بەسەردا هێناوە، ئەبێ کێ لەوسەردەمەی حسەین دا، لەحسەین دادگەر تربووبێت لەپێشەوایەتی کردن و دادگەرێتیشی دا) (٤٦)

## ئیبن خەلدون وغەزالی :

بەراستی ئاسەواری (غەزالی)لەسەر ئیبن خەلدون زۆر گەورەیە وناڕەحەتە توێژەر بتوانێت ئەو ئاسەوارە بنەبڕبکات ولاوەی بنێت. ڕەنگە ڕاستیش بێت گەربگوترێت ئیبن خەلدون ئەوەندەی لەژێرکاریگەری غەزالی دا بووە، لەژێر کاریگەری هیچکام لەهزرڤانانی ئیسلام دا نەبوە "دەربڕینی وەرگێڕ".

لەبەردا ئاماژەمان بەهەندێ لەو ڕاوبۆچونانە کرد کەئیبن خەلدون لە غەزالی وەری گرتبوون وهەوڵی دا بوو پەرەیان پێ بدات تاکو بیان گونجێنێت لەگەڵ لۆژیکەمادیەکەی خۆی دا.لێرەدا دەمانەوێت ئاماژە بەڕایەکی تربدەین کەپەیوەندی بەئاکاری کردەییەوە هەیە. غەزالی لەم ڕوەشەوە ڕەوتێکی پێچەوانە بەڕەوتی زۆرێك لەهزرڤانانی ئیسلامی هەیە. غەزالی پێی وایە ڕەوشت (ئاکار)یەکێکە لەمەسەلە ڕێژەیی و ئیعتیباریەکان، هیچ شتێکیشی تێدا نیە کەلەخودی خۆی دا باش یاخود خراپ بێت. مرۆڤ ڕاهاتوە لەسەر ئەوەی شتەکان بەجوان یاخود دزێو پێناسە بکات بەگوێرەی ڕادەی گونجانی شتەکە لەتەك ئامانجەکانی دا یان بەپێچەوانەوە.بەڕێی غەزالی مرۆڤ خۆپەسەندە وبەخۆیەوە سەرقاڵە، لەبەر ئەوەش بڕیاری چاك و خراپ بوون بەڕەهایی بەسەر شتەکاندا دەدات.

ئیدی ئاشزانێت کەگەسانی تر بەپێچەوانەی ئەمەوە بڕیار دەدەن.

جاگەر بێت وئێمە وازبێنین خەلکی بەئارەزوی خۆیان بڕیار لەسەر چاکەو خراپە بدەن، ئەوا پێوەرەکان بزر دەبن. کەواتە پێویستە خەلکی پشت بەشەرعێ ببەستن کەلە غەیبەوە بۆیان بێت ورێنمونی یان بکات کامە جوان و چاکە وکامەش خراپ و دزێوە) (٤٧)

غەزالی ئەم چەمك و تێگەشتنەی خۆی بەسەر ئارەزوو غەریزە مرۆییەکانی تریش دا دەچەسپێنێت، وەك حەز کردن لەسودە دنیاییەکان، شەهوەتبازی، توڕەیی... هتد). (٤٨)ئەم شتانە لەوانەن کە واعیزو شەرعناسەکان بەشێوەیەکی

ڕەها سەرکۆنەیان دەکردو خودی ئەوشتانەیان بەدزێو لەقەڵەم دەدا. بەڵام غەزالی وای دەبینێ هەریەك لەوشتانە بۆی هەیە باش یان خراپ بێت بەگوێرەی ئەو مەبەستەی کەلەپێناوی دا بەکار دەهێنرێت. جائەگەر مەبەست لەبەکار هێنانی گەشتن بێت بەئامانجی خراپ ئەوا دزێو دەبێت. وەك ئەوەی مرۆڤ لەپێناوی شتی ناڕەوا و پوچدا تورە ببێت، یاخود وەك ئەوەی ئارەزوی بۆ ژنێکی مەحرەم بچێت، یان حەزی لەپارەو پوڵ بێت تاکو لەڕێی شەیتاندا خەرجی بکات. بەڵام گەرمرۆڤ مەبەستی گەشتن بەئامانجی دروست و ڕێك و پێك بێت، ئەوا دەبێتە کردەوەیەکی باش و خوداش پاداشتی دەداتەوە لەسەری.

جێگەی سەرنجە کەدەبینین ئیبن خەلدون لەشەن وکەو کردنی مەسەلەی دەمارگیری دا بەتەواوی هەمان ڕێچکەی غەزالی پەیڕەو دەکات. ئەو پێی وایە شەرع کەسەرزەنشتی دەمارگیری کردوە، هەروەکو شەهوەتبازی و توڕەیی سەرزەنشتی کردوە، ئەمەش مانای ئەوەنیە کە وازی لێ بهێنرێت وبەتەواوی پوچەڵ بکرێتەوە. واتە وەکو چۆن شەهوەتبازی پێویستە بۆمانەوەی (جۆری مرۆڤ)، دەمارگیریش هەروەها بەڕێی ئیبن خەلدون پێویستە بۆ گرۆهی (موسوڵمانان —وەرگێڕ)وبەبونی دەمارگیری شەرعی خودا تەواو دادەمەزرێت. شەرعیش بۆیە سەرکۆنەی دەمارگیری کردوە بۆئەوەی قەدەغەی بکات مرۆڤ لەکاری پوچ و ناڕەوادا بەکاری بێنێت، هەرگا لەپێناوی هەق دا بەکار هێنرا، ئەوا شتێکی باش وسەرکۆنە نەکراو دەبێت. (٤٩)

ئیبن خەلدون هەوڵی داوە بۆچونەکەی غەزالی فراوان بکات، تاکو دیاردە کۆمەڵایەتیە جۆراو جۆرەکانی تریش بگرێتەوە. ئەم لەبابەتەکانی پادشایەتی وپلەو پایەو کۆچ و... هتدی کۆڵیوەتەوە بەهەمان ئەوستایلەی کەلە لێکۆڵینەوە لەبابەتی دەمارگیری دا پەیڕەوی کردوە —وەك لەبەشێکی پێشو تردا دیتمان — دەگونجێت بگوترێت، ئیبن خەلدون لەمەدا پەیڕەوی لەبنەمای (الغایە تبرر الوسیلە)دەکات، شاراوەش نیە کەلەم پەیڕەوکردنەیدا لە میکیافیللی نزیك دەبێتەوە.

## ئیبن خەلدون و تەرتوشی :

ئەبوبەكر محەممەد كوڕی محەممەد ئەندەلوسی تەرتوشی، یەكێك بوو لەشەرعناسەكانی سەدەی پێنجەمی كۆچی. كۆمەڵێ كتێبی نوسیوە، یەك لەو كتێبانەی ناوناوە" سراج الملوك". ئەم پەرتوكە بایەخێكی تایبەتی هەیە بۆئیبن خەلدون.

لەمیانەی باس كردنی ئەو كەسانەدا كەبەرلەخۆی لەو بابەتە دواون، ئیبن خەلدون بەتایبەت ئاماژە بەتەرتوشی وپەرتوكەكەی دەدات. لەو بارەیەوە دەڵێت: (قازی ئەبوبەكر تەرتوشیش لەكتێبی "سراج الملوك" دا توخنی ئەم بابەتە كەوتوە، بەش بەشی كردوە، بەشەكانیشی لەبەشەكانی ئەم پەرتوكەی ئێمە نزیك دەبێتەوە. ئەوەندەهەیە نەچوەتە كرۆكی بابەتەكەوەو بەڵگەكانی ڕون نەكردۆتەوە، تەنها بابەتەكە دەكاتە دەروازەو بەشی جودا جودا، ئینجا كۆمەڵێ فەرمودەو ئاساری زۆر دەگێڕێتەوە، پەندو وتەی زۆرێك لەدانایانی فارس وەك بوزگمەهرو موبزان و، دانایانی هیندو ئەوەی لەدانیاڵ هرمسەوە گێڕدراوەتەوە، دەگوازرێتەوە. ئیتر دەمامك لەڕوی بەدوادا چونەكەی لانابات، بەگوێرەی بەڵگەی سروشتی هیچ پەردەیەك "لەڕوی نهێنی مەسەلەكان —وەرگێڕ") لانادات، كارەكەی ئەو گواستنەوەو پێكهێنانێكە كەلەمەوعیزە دەچێت، وەك ئەوەی بەدەوری ئامانجەكەدا سوڕابێتەوە بەڵام نەی پێكابێت ومەرامەكەیی بەدەست نەهێنابێت... .) (٥٠)

پێم وایە ئەوەی ئیبن خەلدون لەبارەی پەرتوكەكەی تەرتوشی یەوە دەیڵێت پێناسەو وێنەیەكی ڕاستەقینەی ئەو كتێبەمان ناداتێ. چونكە پەرتوكەكە زۆر بەپێزەو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی دانەرەكەی چەندەی كۆشش كردوە "دەربڕینی وەرگێڕ". هەرلەو كتێبەدا زۆرێك لەبۆچونی قەیمیەكان دەبینین لەبارەی (دەوڵەت و ڕەعیەت)و (كاروبارە هاوپەیوەندیەكانی سیاسەت)ەوە. بەڵام تەرتوشی ڕێچكەیەكی وەعزی پوخت دەگرێتە بەرو باس

لەوە دەکات کەچ شتێ پێویستە لەسیاسەت کردندا هەبێت، نەك ئەوەی لەواقعی سیاسەت داچی هەیە.

دەگونجێت پەرتوکەکە بەنمونەیەکی ئەوشێوازە بیرکردنەوەیە دابنرێت کەبەسەرهزری قەیمیەکاندا زاڵ بووە لەبارەی ئەم جۆرە کاروبارانەوە.

هەرچۆنیش بێت، کتێبەکە بەیەکێك لەسەر چاوە گرنگەکانی ئیبن خەلدون دەژمێردرێت. کاتێ (مقدمە)کەی ئیبن خەلدون دەخوێنینەوە، لە زۆرێك لەبەشەکانی داناسەواری (تەرتوشی) دێتە بەرنیگامان. وادەردەکەوێت ئیبن خەلدون دەستی نەکردوە بەنوسینی (مقدمە) دوای ئەوە نەبێت کەزۆر بەوردی کتێبەکەی (تەرتوشی) خوێندۆتەوە. ئێمە بواری ئەوەمان نیە کەئەو زانیاری و بەسەرهاتانە بژمێرین کە لەمقدمەدا نوسراون و لەتەرتوشی یەوە گوازراونەتەوە. چونکە زۆر زۆرن. بەڵام پێویستە تێ بینی ئەوەش بکەین کە ئیبن خەلدون لەکاتێکدا ئەو زانیاری و بەسەر هاتانەی وەرگرتوە، لەچوار چێوە وەعزیەکانیان دەری هێناون و خستونیەتە چوار چێوەیەکی ترەوە کەبگونجێت لەگەڵ لۆژیکە واقعی یەکەی خۆی دا.

بۆ ڕون کردنەوەی ئەو قسەیە نمونەیەکی بچکۆلە دێنینەوە. تەرتوشی لەکتێبەکەی دابڕگەیەکی لەنێو وتارێکی وەعزی دا گواستۆتەوە وتیای دا هاتوە: (ایها الناس ان مابقی من الدنیا اشبه بما مضی من الماء بالماء)بێگومان مەبەستی لەو بڕگەیە ئاگادار کردنەوەی خەڵکی بوە لەوەی مردن وەك چۆن بەرۆکی بەپێشینان گرتوە ئاوا بەمانیشی دەگرێت، هەرجۆرە تەرەفێکیش هەرچەندە قەشەنگیش بێت هەر دەبێت لەنێو بچێت، وەك چۆن تەرەفەکانی پێشو لەنێو چوون. (٥١)ئیبن خەلدونیش لە (مقدمە)کەی دا ئاوا بڕگەیەکی هێناوە، وەك لەبەردا دیتمان، ئەم دەڵێت : (ان الماضی اشبه بالآتي من الماء بالماء). بەڵام مەبەستی لەهێنانەوەی ئەم بڕگەیە وەعزو ئاگادار کردنەوەی بێ ئاگایان نەبوە. بەڵکو مەبەستی لەوەیە ئاماژە بدات بەوەی کۆمەڵگە لەسەر کۆمەڵێ یاساو ڕێسای

سەقامگیرو نەگۆڕ دەڕوات بەڕێوە. جگەلەوە نمونەیەکی دیکەش هەیە کەدەکرێت لەم ڕووەوە ئاماژەی پێ بدەین. تەرتوشی لەیەکێك لەبەشەکانی کتێبەکەی دا هەندێ بەڵگەی هێناوەتەوە تاکو بیسەلمێنێت سوڵتان هەم سودی بۆ خەڵکی هەیەو هەم زیان، بەڵام سودەکانی زیاترە وەك لەزیانەکانی. سوڵتان وەك باران وایە کەلەلایەکەوە دەغڵ ئاو دەدات، کەچی لەلایەکی ترەوە ئازاری ڕێبوار دەدات یاخود خانوبەرە دەڕوخێنێت و لافاوی لێ بەیدا دەبێت و هەورەچەخماخە دادە بەزێنێت (٥٢).

تەرتوشی لەپێناوی ئەوەدا ئاماژە بەو نمونەیە دەدات تاکو بانگی خەڵکی بکات بۆ ئەوەی سوپاسی خودا بکەن و بڕوابێنن بەوەی خودا خێرو چاکەی بۆیان دەوێت. چۆن لەدیدی وی دا، سوڵتان حیکمەتێ گەورەی خودایە و خێرو بێرێکی فرەیشە بەسەر بەندەکانەوە. گەر سوڵتان نەبوبا، خەڵکی وەکو نەهەنگی دەریایان لێ دەهات و گەورەکانیان بچکۆلەکانیان لوش دەدا. چونکە مرۆ لەسەر ئەوە ڕاهاتوە کەداوا لەخەڵکی بکات دادگەر بن لەبەرانبەری دا، بەڵام خۆیی لەبەرانبەر خەڵکی دا، دادگەرنابێت. (٥٣)وادەردەکەوێت تەرتوشی ئەو بۆچونەی لەوفەلسەفەی (ابن سینا)دوە وەرگرتوە کەپێشتر ئاماژەمان پێکرد لەلێکدانەوەی بوونی خراپە لەگەردون دا. لەوێدا گوتمان ئیبن خەلدونیش ڕایەکی وای دەربڕیوە لەلێکدانەوەی بوونی ستەم لەکۆمەڵگەدا. ئیتر ئێمە نازانین ئایا ئیبن خەلدون ڕاستەو خۆ ئەو بۆچونەی لە (ابن سینا)وەرگرتوە یاخود لەڕێی تەرتوشی یەوە پێی گەشتوە. بەڵام زۆرینەی گومانی من بۆ ئەوە دەڕوات ئیبن خەلدون هەردوو بۆچونەکەی موتاڵاکردوە، بۆیەلەئەنجامیش دا ئەو بۆچونەی بەشێوەیەك هێناوەتەکایەوە کەهەندێ دەستەواژەو دەربڕینی تێدایە، هەندێ جارلەدەربڕینی یەکەمیان (ابن سینا-وەرگێڕ)دەچن و دەربڕینی واشی تێدایە کەلەدەربڕینەکانی دووەمیان (تەرتوشی –وەرگێڕ)دەچن. (٥٤)

شیاوی ئاماژە پێدانە، ئیبن خەلدون واژەی (سولتان)ی لەم بوارەدا بەکار نەهێناوە، وەك تەرتوشی بەکاری هێناوە. بەلکو لەبری ئەو وشەیە واژەی (دەستەلات -پلەو پایە) ی بەکار بردوە. وادەردەکەوێت ئیبن خەلدون لەم بەکار هێنانەی دا مەبەستی واتایەکی فراوانتر بوبێت لەوەی تەرتوش مەبەستی بوە.بەڕێی ئیبن خەلدون سودو زیان تەنها لەسەردەستی سولتانەکاندا پەیدا نابێت، بەلکو لەهەرچینێکی کۆمەلگەوە دەردەکەوێت کەلەچینێکی تر بالآتربێت. هەموو خاوەن پلەو پایەیەك سود بەخەلکی دەگەیەنێت و لەهەمان کاتیشدا زیان یان لێ دەدات. چونکە لەسەر کارو فرمان دایان دەنێت وڕێگە نادات ناکۆکی وپێکدا هەلپژان لەنێوانیان دا ڕوبدات. کەچی لەلایەکی تردەوە ژێرباریان دەخات وستەمیان لێ دەکات. (٥٥) بۆئەوەی تێ بگەین لەڕادەی ئەو کاریگەریەی کەتەرتوشی بە شێوەیەکی گشتی لەنێو بیرکردنەوەی ئیبن خەلدوندا دروستی کردوەو، جیاوازی نێوان لۆژیکی هەر دوکیشیان پەی پێ بەرین، ئەم نمونەیەی خوارەوە دێنینەوە:

تەرتوشی لەیەکێك لەبەشەکانی کتێبەکەی دا دەلێت: پێویستە لەسەر پادشا، زاناو پیاو چاکان بکاتە هاونشینی خۆی و لەکاروبارەکانی دا ڕاوێژیان پێ بکات ولەخەلکی دیکە جیایان بکاتەوە، چونکە بەوکارە لەلایەکەوە پشتیوانی لەپادشایەتیەکەی قایمتر دەکات، لەلایەکی تریشەوە دلی ڕەعیەتەکان بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت. زاناکان جێ نشینی پێغەمبەرانن، زانستیان لەوانەوە بۆماوەتەوە. مادەم پادشا لەملکی خوا دا تەسەڕوف دەکات و بەشەرعەکەی ئەویش حوکم دەکات، کەواتە پێویستە گوێ بۆ ئامۆژگاری زانایان بگریت. تەرتوشی بەم شێوەیە کۆتایی بە گوتەکەی دێنێت : ئەو پادشایە جێگەی سەرسامیە کەتوڕە دەبێت لەفەرمان بەرەکەی ئەگەر پێچەوانەی فەرمانەکانی بجولێتەوە، بەلآم ناترسێت لەتوڕەیی خودا لەکاتێکدا خۆی پێچەوانەی فەرمانەکانی خودا دەجولێتەوە. (٥٦)ئیبن خەلدون لە (مقدمە)کەی دا ڕەخنەیەکی توند لەم بۆچونەی تەرتوشی دەگرێت، هەرچەندە بەئاشکرا ئاماژە

بە ناوی (تەرتوشی) نادات، بەڵکو ئاماژە بەهەندێ لەدەربڕینەکانی دەدات و دواتر هەوڵ دەدات ڕەخنەیان لێ بگرێت وپوچەڵیان بکاتەوە.

ئیبن خەلدون دەڵێت: زاناکان جاران میراتگری پێغەمبەران بوون لەسەرەتای ئیسلام دا کەکردارەکانیان پڕاو پڕ گەنجا بوو لەگەڵ گوفتارەکانیان دا، ...وەلێ لەسەردەمە دواییەکانیان دا وایان لێهاتوە زۆر جار هیچ لەشەریعەت نازانن جگە هەندێ وتەو بۆچون لەبارەی پەرستشەکان و چۆنێتی بەرێ کردنی مامەڵەکانەوە. لەکردارەکانیان دابەکەمترین شێوە. (پابەند دەبن بەشەرعەوە-وەرگێڕ) (٥٧)

ئیبن خەلدون ئامۆژگاری پادشاکان دەکات کەئەو زانایانە نەهێننە ناو دەستەو کۆڕو کۆبونەوەکانی خۆیانەوە، لەڕوی جوانکاری نێو جڤاتەکانیان و وەرگرتنی حوکمی شەرعی و فەتواوە نەبێت. بەڵام لەکارو بارە سیاسیەکان دا زاناکان دورترینی خەڵکن لەتێ گەشتنی سیاسەتەوە.بەڕێی ئیبن خەلدون نابێت جگەلەوانەی خاوەنی دەمارگیرن کەسی دیکە بچێتە نێو بواری ڕاوێژکردنەوە. چونکە ئەوان ئەهلی (حەل وعەقد)ن لەدەوڵەت دا. زاناکان هیچ پەیوەندیەکیان بە حەل و عەقدەوە نیە (یان نابێ ببێ-وەرگێڕ).

ئەوان وەك هەر شارستانیەکی تر نغرۆ بوون لەنێو تەرەف دا و، بونەتە فەرمان بەری دەوڵەت و بەوەش بونەتە بار بەسەر دەوڵەتەوە. ئەوەندە هەیە ئیعتیار بۆ دانانیان لەدەوڵەت دا ڕێزدانانە بۆ ڕواڵەتی ئاین (٥٨)لێرەدا نمونەیەکی ئاشکرای جیاوازی دەبینین لەنێوان بیرکردنەوەی تەرتوشی و بیرکردنەوەی ئیبن خەلدوندا. هەرچی تەرتوشیە ئامۆژگاری پادشاکان دەکات تاکو شەرعناسەکان لەخۆیان نزیك بکەنەوەو پرس وڕاوێژیان پێ بکەن لەکاروبارە سیاسیەکانیان دا. وەلێ ئیبن خەلدون پادشاکان وریادەکاتەوە لەو هەنگاوە، چونکە بەبڕوای وی شەرع ناسەکان لەسیاسەت تێ ناگەن و ناشگونجێن بۆ ئەوەی لەبواری سیاسەت دا ڕاوێژیان پێ بکرێت، چونکە ئەوان ئەهلی قسەن نەك کردەوە. یان بەدەربڕینێکی تر: ئەوەی دەیڵێن نایکەنە کردار. ئیدی من نازانم شەرعناسەکان چۆن ئەم قسەی ئیبن خەلدون یان پێ قبوڵ کراوە؟.

## پێکهێنان وداڕشتنی داهێنەرانە:

بەم ڕادەیە دەست هەڵدەگرین لەبەراورد گردن لەنێوان بۆچونەکانی ئیبن خەلدون وبۆچونی هزرڤانانی پێش ئەو دا. ئەمەش بەو مانایە نایەت کەبەراورد گردن لەو سنورەدا کۆتایی دێت، یان ئیبن خەلدون سودی لەهزرڤانی دیکەوە وەرنەگرتوە جگەلەوانەی کەئێمە ناومان هێناون.لەڕاستی دا ئێمە بۆیە دەستمان لەبەراورد گردن هەڵگرت چونکە هەستمان بەدەستەوسانی گرد لەهەمبەر بەردەوام بوون تیای دا.دەنانەگەر ئێمە بمان توانیایە بەردەوام بین لەلێکۆڵینەوە لەنێو ئەودانراوانەدا کەپێش (ئیبن خەلدون) بەدەرکەوتوون، ئەوا بۆمان ڕوون دەبویەوە کەزۆرینەی بیرۆکەکانی (کەم تازۆرێك)لەو دانراوانەوە وەرگرتوە.

ئەمەش ڕەخنە نیە لەسەر (ئیبن خەلدون) یاخود کەم کردنەوەی مەزنێتی وبالآیی فیکری ئەو نیە.بەڵکو ئەو بۆیە ئەو بیرۆکانەی وەرگرتوە تاکو بتوانێت تێورەتازەکەی دابنێت. بەهەمان شێوەی ئەو داهێنەرەی کەلەداهێنراوە پێشوەکانەوە داهێنانە نوێ یەکەی دێنێتە کایەوە.

دەکرێت تێورەکەی (ئیبن خەلدون) بەو یەکەم فڕۆکەیە بچوێنین کەبرایان (ولیبرو ئورفیل رایت)دایان هێنا. ئێمە کاتێ سەرنجی ئەو فڕۆکەیە دەدەین خەریکە هیچی تێدا نەبینین جگەلەو بەشانەی کەپێشتر خەڵکی دایان هێناون، وەك هەردو باڵەکەی و بزوێنەری گازی و...هتد.

بەڵام دواتر ئەو دوبرایە هاتن وئەو بەشانەیان لەنێو یەك دەستگادا کۆکردەوە، دیارە پاش ئەوەی هەندێ گۆڕانکاری وبەرەپێدانیان بەسەریان دا هێنا. بەوەش توانیان ئەو فڕۆکەیە دروست بکەن کەهەموو جیهانی هەژاندو ڕەوتی ژیاری مرۆڤایەتیشی گۆڕی.

بێگومان برایانی (رایت)نەیان دەتوانی فڕۆکە دا بهێنن ئەگەر لەبەردا بزوێنەری غازی وبەشەکانی تر دانەهێنرابان. بەڵکو ئەمان داهێنانە مەزنەکەیان لەهەندێ داهێنراوی دیکەوە هێنایەکایەوە کەلەسەردەمی ئەواندا هەبوون.

ئەمەش یانی بەتەنها زیرەکی وبیرتیژی ئەوان بەس نەبوە بۆ داهێنانی فرۆکە. بەڵکو پێویست بوو داهێنەری تر هەبن ورێگە بۆداهێنانەکەی ئەمان خۆش بکەن وئەرکەکەیان بۆ ئاسان بکەن. ئەگەر بهاتباو ئەو دووبرایە بەرلەو سەردەمە بژیابان کەتیایدا ژیابوون، رەنگە چارەنوسی ئەمانیش هەمان چارەنوسیی خوالێخۆشبو عباسی کوری فیرناس بوایە. بۆمان هەیە دەربارەی (ئیبن خەلدون)یش هەروا بڵێین. ئەو پیاوەش فرۆکەیەکی فیکری مەزنی داهێنا. بەڵام نەی دەتوانی ئەو داهێنانە بگەیەنێتە ئەنجام ئەگەر کەسانێك بەرلەو ئاسان کاری وزەمینەسازی یان بۆ نەکردایە.

بەدەربڕینێکی دیکە، (ئیبن خەلدون) هیچ نەبوە جگەلەبەرەنجامی رۆشنبیریەکی گەورە کەبەرلەو گەشەی دەکرد. ئێمە نکولی ناکەین لەوەی کە (ئیبن خەلدون)توانی تیۆرەکەی بگەیەنێتە لوتکە، وەلێ ناکرێ لوتکەش لەبۆشایی دا هەڵواسرابێت، بەڵکو پێویستە پشت بەوە ببەستێ کەکەژێکی سەرکەش لەژێردایە.

بەدبەختی فیکری مرۆڤ وای هێنا، رۆشنبیری ئیسلامی لەدوای (ئیبن خەلدون) خامۆش بێت، ولەدوای وی کەسێك بەدەرنەکەوێت لوتکە بەرەو ژوورتر بەرێت.گەر بوار بدرایە ئەو رۆشنبیریە درێژەی بەگەشەکردنی بدایە، ئێستا حاڵێکی تری دەبوو، رەنگە لەو شێوازەی (ئیبن خەلدون)هزرڤانی دیکە بەدەربکەوتنایەو بیان توانیایە هزری مرۆڤ پێش بخەن ولەپێگەیاندنی ئەو هزرەدا بەشداری بکەن (وەرگێر).

ئێمە سەرسام نابین بەدەرکەوتنی هزرڤانێکی مەزنی وەکو (ئیبن خەلدون) لەقۆناغی کۆتایی گەشەسەندنی رۆشنبیری ئیسلامی دا.

ئێمە دیتمان چۆن جۆگەلەکانی فیکری پەیتا پەیتا کۆدەبونەوە، دواتر (ئیبن خەلدون) هاتوو بەئامادەیی لەبەردەستی خۆیدا بینینی.

ئەو هیچی لەسەر نەبوو، تەنها ئەوەندە نەبێت جۆگەلەکان بکات بەیەك تا تیۆرە مەزنەکەیی لێ پێك بێنێت. وەلێ ویستی خودا ڕێگەی نەدا ئەو بیردۆزە گەشەبکات، بەهۆی خامۆش وکپ بونەوەی ئەو کەلتورو ڕۆشنبیریەی کەلێیەوە هەڵقوڵابوو. بەو جۆرەش تیۆرەکە بەفەرامۆش کراوی لەسەر ڕەفەکاندا مایەوە، کەس پێی ئاشنا نەبوو جگەلە کۆمەڵێ کەسی کەم. وەك لەبەشێکی تردا ڕوونی دەکەینەوە.

## پەراوێزەکانی بەشی نــــۆیـــــەم

1) William Ogburn ،Social Chang، (N.Y. 1922)p.82-83.

٢) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ٢٦٧ — ٢٦٩.

٣) قورئان، سورەتی ئیسرا، ئایەتی : ١٦.

٤) قورئان، سورەتی سبا، ئایەتی: ٣٤.

٥) قورئان، سورەتی زەخرف، ئایەتی : ٢٢ — ٢٤.

٦) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ٨٧٦ — ٨٧٧.

٧) ھ س، ل ٨٧٩ — ٨٨٠.

٨) ھ س، ل ٨٧٨ — ٨٧٩.

٩) ھ س، ل ٢٧٢ — ٢٧٣.

١٠) على عبدالواحد وافى، فصول من آراء اهل المدينة الفاضلة، (قاهيره ١٩٦١)، ل ٢١.

١١) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ٩١٢.

١٢) ھ، س، ل ٢٥٣.

١٣) ھ، س، ل ٤٤٥ — ٤٤٦.

١٤) ھ، س، ل ٤٨٦ — ٤٨٧.

١٥) عثمان امين، شخصيات ومذاهب فلسفية، قاهيره ١٩٤٥، ل ٧٠.

١٦) عباس محمود العقاد، الشيخ الرئيس ابن سينا، قاهيره ١٩٤٦، ل ١٠١.

١٧) عبدالكريم الشهرستانى، الملل و النحل، ج ١، ل ٧ ـ٨.

١٨) ھ، س، ج ١، ل ١٠.

١٩) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ٩١٠.

٢٠) ت. ج. دى ور تاريخ الفقه في الاسلام، ترجمه محمد عبدالهادى، قاهيره ١٩٣٧، ل ٩٨. تێبینی : لەو ڕونوسە عەرەبیەی لەلای من بوو ناوی ئەم سەرچاوەیە

زۆر بە خراپی و ناڕونی لەسەر لاپەڕەکە چاپ ببوو، ئەگەر بەهەڵە نوسیبێتمەوە داوای لێبوردن لە خوێنەرانی بەڕێز دەکەم. وەرگێڕ.

٢١) رسائل اخوان الصفاء، قاهيره ١٩٢٨، ج ١، ل ١٣٠ — ١٣١.

٢٢) هـ، س، ج ١، ل ١٣١.

٢٣) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ٨٥٧.

٢٤) ابو حيان التوحيدى، الأمتاع والمؤانسة، قاهيره، ج١، ل ٨٢.

٢٥) قدري حافظ طوقان، الخالدون العرب، بيروت ١٩٤٨، ل ١١٨.

٢٦) جميل صليبا و كامل عياد، المنطق وطرائق العلم العامة، بيروت ١٩٤٨، ل ٨.

٢٧) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ١١٩.

٢٨) هـ، س، ل ٢٢٠.

٢٩) هـ، س، ل ٢١٩.

٣٠) هـ، س، ل ٢١٩.

٣١) تەها حسەین، فلسفه ابن خلدون الأجتماعية،، ل ٤٢ — ٤٦.

٣٢) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ٢٥٣ — ٢٥٤.

٣٣) هـ، س، ل ٢٥٣.

٣٤) هـ، س، ل ٤٩٦ — ٥٠٦.

٣٥) جميل صليبا و كامل عياد، المنطق وطرائق العلم العامة، ل ٦- ٧.

٣٦) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ١١٠.

٣٧) هـ، س، ل ٨٣٧.

٣٨) هـ، س، ل ٨٣٧ -٨٢٨.

٣٩) هـ، س، ل ٨٢٨.

٤٠) هـ، س، ل ٨٦٨.

٤١) هـ، س، ل ٥٥٤ — ٥٦٤.

٤٢) ابوبكر بن العربى، العواصم من القواصم، ل ٢٣٢.

٤٣) ه، س، ل ١٥١.

٤٤) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ٥٥٨.

٤٥) ه، س، ل ٥٥٩.

٤٦) ه، س، ل ٥٦٣.

٤٧) زكي مبارك، الأخلاق عند الغزالي، طبعة دارالكتاب العربي، ل ٩١ -٩٢.

٤٨) سليمان دنيا، الحقيقه عندالغزالي، طبعة دار احيائ الكتب العربية، ل ٢٢٠، ٤٥٦ -٤٥٧.

٤٩) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ٥٢٨ — ٥٢٩.

٥٠) ه، س، ل ٢٦٨ — ٢٦٩.

٥١) ابوبكر الطرطوشي، سراج الملوك، قاهيره ١٩٢٥، ل ٤٦.

٥٢) ه، س، ل ٨٩ -٩٠.

٥٣) ه، س، ل ٨٧.

٥٤) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ٩٠٩ -٩١٠.

٥٥) ه، س، ل ٩١٠.

٥٦) ابوبكر الطرطوشي، سراج الملوك، ل٩٧.

٥٧) مقدمه ابن خلدون (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ٥٣٧ -٥٧٥.

٥٨) ه، س، ل ٥٣٧ — ٥٧٥.

# بەشی دەیەم

## (ئیبن خەلدون و فەلسەفە)

لەبەشی پێشودا باسمان لەوە کرد کەچۆن (ئیبن خەلدون) تیۆرەکەی خۆی لەڕێی هزرڤانانی پێشو وەرگرتبوو. ئەو بیرمەندانەش جۆراو جۆر بوون، شەرعناس و سۆفی و فەیلەسوف و زانای فیزیایی و وێژەوان ومێژووەوانیان تێدا بوو.

لەم بەشەدا دەمانەوێت سەرنجمان چڕبکەینەوە لەسەرفەلسەفەورادەی کاریگەری فەلسەفە لەنێو بیرکردنەوەی (ئیبن خەلدون) دا.مەبەستیشمان لەفەلسەفە ئەو فەلسەفەوبیرەیەکە ڕەگ وریشەی خۆیلەفەلسەفەی ئیگریکی کۆنەوە وەرگرتبو، وەلەهەریەکە لە (کندی و ئیبن مسکویەو ئیبن سیناو ئیبن باجەو ئیبن توفەیل و ئیبن ڕوشد و....هتد)داخۆی دەبینییەوە.

لەئەنجامی گوزەر کردنمان دا بەنێو دنیای ئەم کتێبەدا بۆمان ڕون بویەوە کە، بیرکردنەوەی ئیسلامی لەسەر دووهێڵی دژبە یەك ڕێی کردوە، هێڵی یەکەمیان لەچوار چێوەی ئەو فەلسەفەیەدا بوو کەلەپێشەوە ئاماژەمان پێدا، هەرچی هێڵی دووەمیشە، پێچەوانەو نەیار بوو بەهێڵی یەکەم، ئەم هێڵی دووەمە لەهەریەکە لە (غەزالی وئیبن تەیمیەو...هتد)دا خۆی نمایش دەکرد. هەروەها ئێمە پێمان وابوو (ئیبن خەلدون) لەهێڵی دووەمەوە نزیك تر بوو وەك لەهێڵی یەکەمەوە، تەنانەت بەدرێژ بونەوەی ڕەوتی غەزالی و ئیبن تەیمیەدەژمێردرێت لەڕەخنەگرتنی فەلسەفەو لۆژیکی کۆن دا.

ئێمە کەئێستاکەپشت ڕاستی ئەولایەنە دەکەینەوە لەنێو بیرکردنەوەی (ئیبن خەلدون) دا، مەبەستمان لەوەنیە بڵێین بەڕەهایی (ئیبن خەلدون)

نەچوەتە ژێر کاریگەری ئەو بیرۆکانەی کەلەکتێبی فەیلەسوفەکان دا باس کراون. چونکە وەك لەم بەشەدا بەڕونی دەیبینین سودی لەوبیرۆکانەش وەرگرتوە وەك چۆن کەلکی لەڕاو بۆچونی کەسانی تریش وەرگرتوە.

لەم بەشەدا لەکاریگەری فەلسەفە دەکۆڵینەوە لەسەر بیرکردنەوەی (ئیبن خەلدون)لەیەك لایەنی دیاری کراوەوە، ئەو لایەنەش بریتی یەلە هەڵوێستی فەیلەسوفەکان بەرانبەر بەعامەی خەڵك (کەئێمە لەئێستابەدواوە وشەی جەماوەری بۆ بەکار دەهێنین –وەرگێڕ).

من پێم وایە ئەم لایەنە پەیوەندیەکی توندو تۆڵی هەیە بەبیرکردنەوەی (ئیبن خەلدون) ەوە. چونکە زۆرینەی جار جەماوەر تەوەری کۆمەڵگە پێك دەهێنێت.

هەرئەوانیش زۆرینەی ئەو دیاردە کۆمەڵایەتیانە بەرهەم دێنن کە (ئیبن خەلدون)گرنگی دەدات بەلێکۆڵینەوەیان. جائایا فەیلەسوفەکان چۆن لەجەماوەریان دەڕوانی؟وڕاوبۆچونی (ئیبن خەلدون) یش چی یەلەبارەیانەوە؟.

لەماوەی دا هاتودا هەوڵ دەدەین ئەدگارە سەرەکیەکانی هەڵوێستی فەیلەسوفەکان بەرانبەر بەجەماوەر نمایش بکەین، لەوساوەکە فەلسەفە لەسەردەستی (موعتەزیلە)بۆیەکەمین جار لەجیهانی ئیسلامی دابەدەرکەوت تائەو کاتەی لەسەر دەستی (ئیبن ڕوشد)دا کۆتایی پێ هێنرا.هەرچەندە ئێمە پروپاگەندەی ئەوە ناکەین ئەم نمایش کردنەمان نمایشکردنێکی گشتگیروتەواوە. بەڵام هەرچۆن بێت ڕێخۆشکردنێکەو لەوانەیە هەندێ سودیشی تێدا بێت لەڕونکردنەوەی هەندێ لەو ڕەگ و ڕیشە فیکریانەی کە (ئیبن خەلدون)تێورە کۆمەڵایەتیەمەزنەکەیی لێیانەوە وەرگرتوە.

## ڕاوبۆچونی موعتەزیلە سەبارەت بەجەماوەر:

دەکری موعتەزیلەکان بەفەیلەسوفانی بەرایی ئیسلام لەقەلەم بدرێن.ئەم پێرە هەرلەسەرەتای هاتنەناوەوەی فەلسەفەی ئیگریکی یەوە بۆ ناوجیهانی ئیسلام، ئەو فەلسەفەیان تەبەنی کرد. زۆریش دلگەرم بوون بۆی. لەبەر ئەو هۆیە موعتەزیلەکان بایەخێکی گەورەیان هەیە لەپەرەپێدانی فیکری ئیسلامی وهەمە چەشنەکردنی ئەو فیکرەیەدا.

موعتەزیلە لەهەمبەر جەماوەردا هەلوێستێکیان هەبوو کەلەسەرزەنشت وبەکەم سەیرکردنیان خالی نەبوو. ئەمەش نامۆنیە بەنیسبەت ئەوانەوە. چونکە جەماوەر بەشێوەیەکی گشتی تەسلیم بەهەر نەریت و بیروباوەڕێ دەبن کەلەباو باپیرەوە بۆیان بمێنێتەوە، ئیدی شتێکی ئاساییە کەموعتەزیلە ئەو هەستی خۆبەدەستەوەدان و تەسلیم بونەی کەلەجەماوەردا دەیان بینی بەسوك سەیربکەن.

موعتەزیلە خەلکانێکی ئەقلانین و ئاوەزو لۆژیك وەکار دەبەن لەکارو بارە ئاینی و دنیاییەکانیان دا.بۆیە دەبینین هەولیان داوە ریفۆرم لەبیروباوەڕی جەماوەردا بکەن لەڕێگەی بلاوکردنەوەی بیرکردنەوەی فەیلەسوفەوە لەنێو خەلکیدا. وەك لەماوەی داهاتوش دا دەی بینین ئەو هەولەیان سەریەشەی زۆری بۆدروست کردون. (سەمامەی کوڕی ئەشرەس)کەلەسەردەمی (مەئمون) دازیاوەو ڕێزو پلەی هەبودلای (مەئمون)لەهەموو موعتەزیلەکانی دیکە زیاتر جەماوەری بەکەم سەیر کردوە. جارێك لەمیانەی هاندانی مەئمون دا تاکو سوکایەتی بەجەماوەر بکات. دەلێت: (جەماوەر کێیە؟ دەی بەخوا ئەگەر کەسێکی گالۆك بەدەست بنێریت دەهەزار کەست لەوجەماوەرە بۆ دەداتە بەر. خوداش ئەو جەماوەرەی یەکسان کردوە بەچوارپێ، ئەوەتا دەفەرمێت: (ام تحسب ان اکثرهم یسمعون او یعقلون ان هم کالانعام بل هم اضل سبیلا...) (١)وادیارە ئەم (سەمامە)یە، دەستێکی بالای هەبوە لەڕاکێشانی (مەئمون)دا بەرەو ڕێبازی موعتەزیلە. هەرچەندە (مەئمون)لەڕۆژگارە یەکەمینەکانی دا بەوەناسرابوو کە

لایەنگری عەلەویەکانە، وەڵێ هێندی هێندی ڕوی کردە ڕێبازی موعتەزیلە. لەساڵی (٢١٢)شدا (مەئمون)بۆچونی (خەلقی قورئان)ی ئاشکرا کرد، ئەمەش بۆچونێك بوو، موعتەزیلەکان بڕوایان پێی هەبوو، بەپێچەوانەی (فەرمودە ناسەکانەوە)کەبڕوایان وابوو قورئان کۆنەو مەخلوق نیە.

لەساڵی (٢١٨)دا مەئمون فەرمانی دا لەمەسەلەی (خەلقی قورئان)داقازیەکان تاقی بکرێنەوە. بەو جۆرەش ئەو (تەنگانە- میحنەت)دبەناوبانگە دەستی پێکرد کەتیای دا ململانێ لەنێوان موعتەزیلەو فەرمودەناسەکاندا گەشتە ئەو پەڕی توندوتیژی. جەماوەریش لەم ململانێیەدا دژی موعتەزیلە، بوونە لایەنگری فەرمودەناسەکان. ئەو تەنگانەیە، ڕوداوێکی پڕبایەخەلەدێرۆکی فیکری ئیسلامیدا. ڕوداوەکە چواردە ساڵی ڕەبەقی خایاند، شەرع ناسەکان لەوماوەیەدا دوچاری چەندەهاجۆری بەلاّو چەوسانەوە بوون، پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)ڕابەری فەرمودەناسەکان بوو.پلەو پایەشی لەنێو دڵ و دەرونی جەماوەردا زیاتر دەبوو بەڕادەی ئەو ئازارو چەوساندنەوەیەی کەدووچاری دەبوو.هەندێ لەشەرعناسەکانی تریش بۆئەوەی پلەو پایەیان لەلای جەماوەر بڵند بێت، هەوڵیان دەدا چاولە پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل)بکەن. (٢)

ئەحمەدی کوڕی حەنبەل وئەو شەرعناسانەی تریش کەشوێنی کەوتبوون بڕوایان وابوو باس وخواسی تایبەت بە (خەلقی قورئان)نابێت دابەزێتە خوارێ بۆ نێو جەماوەر، چونکە جەماوەر ئەهلی سەرنج وڕامان نین. جائەگەر پێیان بێژین (قورئان مەخلوقە)ئەوا لەدەرونیان دا هیچ نامێنێتەوە جگەلە ناپیرۆزێتی (بەناپیرۆز سەیرکردنی قورئان —وەرگێر)ئەمەش دەبێتە هۆی لاوازی بیرو باوەر.کەواتە پێویستە ئەودەرگایە بەتەواوەتی دابخرێت، ئەمەش بۆ پاراستنی ئاینی جەماوەر، چونکە جەماوەر زۆرینەی ڕەهای ئومەتن. (٣)بەلاّم موعتەزیلە ڕایان وابوو، لەمێژە بیروباوەڕی جەماوەر بەهۆی ئەو ئەفسانەو خورافاتەوە

کەلەنێویاندا بڵاوە خراپ بووە.بیروباوەڕیشیان چاك ناکرێت بەوەنەبێت کەڕابهێنرێن لەسەر ئەوەی لەکاروبارە ئاینی یەکانیان دا سەرنجی ئەقڵانی بدەن. لەم پێناوەشدا موعتەزیلە مەسەلەی خەلقی قورئانیان کردبویە دروشم بەدەستیانەوە. ئەوان بەگوێرەی ئەو دروشمە شەرعناسەکانیان تاقی دەکردەوە، تاکو بۆیان دەربکەوێت کام لەوشەرعناسانە لەبیرکردنەوەی دا کەسێکی ڕەشۆکیەو کامیشیان ئەقڵانیە. حکومەتیش لەم ڕوەوە پشتگیری لێ دەکردن و سزای ئەوانەیشی دەدا کەناکۆك بون لەگەڵیان دا.

لەدوای مردنی مەئمونیش (تەنگانە)کە هەربەردەوام بوو، (موعتەسەم) و (واسق)یش لەسەر هەمان ڕەوتی ئەو ڕۆشتن بەڕێ دا.واتە (تەنگانە)کەکۆتایی نەهات تاکو (متەوەکیل)خەلافەتی گرتە دەست. مەسعودی دەڵێت: (کەخەلافەت درایە دەست متەوەکیل

، فەرمانی دا وازبهێنرێ لەدەمبەدەمەو مشت ومڕ، وازبهێنرێ لەو خووەی کەخەڵکی لەسەردەمی موعتەسەم و واسق دا لەسەری بوون، فەرمانی کرد خەڵکی پەیڕەوی‌لەتەقلید بکەن، فەرمانی دابەپیرانی فەرمودەناس تاکو لەپرۆسەی (تحديث)یان بەردەوام بن، پاڵپشتی لەسوننەت وجەماعەت بکەن) (٤)وادیارە سەردەمی (متوکل)بایەخێکی زۆری هەبووە لەدێرۆکی هزری ئیسلامیدا. دەگونجێت بگوترێ واژەی (ئەهلی سوننەت وجەماعەت)لەوسەردەمەدا لەناو خەڵکیدا سەری هەڵدا، واژەکەش بەواتای زۆرینەی هەرەزۆری ئەو موسوڵمانانە دێت کەپێیان باش بوو دەست بگرن بە سوننەتەوەو لایەنگری (جەماعەت)بکەن لەبریتی ناکۆکی وخۆخەریك کردن بەلۆژیککاریەوە. هەرلێرەکانەشەوە ئەو وتە بە نێو بانگە لەنێویاندا بڵاو بویەوە کەدەڵێت (من تمنطق فقد تزندق).

عێراق لەم سەردەمانەی دوایی داململانێ یەکی توندوتیژی نێوان شیعەو سوننەی بەخۆوە بینی.وادیارە ئەم ململانێ یەلەسەردەمی متوەکیل داشتێکی وانەبووە کەشیاوی باسکردن بێت، بەڵکو لەجیاتی داناکۆکی نێوان موعتەزیلەو

ئەهلی سوننە لەئارادا بوو.ئەم ململانێ یەش کاریگەریەکی گەورەی هەبوو لەسەر بیرکردنەوەی ئیسلامی. یەك لەو گروپانەی کەزیاترینی دلگەرمی وتوندوتیژی پێوە دەبینرا (حەنبەلیەکان)بوون.ئەم گروپە دەهاتن و دەچون و چەکی (سوننەت)یان بەدەستەوە گرتبوو، هێرشیان دەکردەسەر هەموو ئەوانەی لەبۆچونیان دا یا خود لەبیرو باروەڕیان دا پێچەوانەی ئەوان بوون. جاری واهەبوو مالآنیان بەرد باران دەکرد.ئیدی پاشاگەردانی وغەوغایەکی والەنێو کوچەو کۆلآنەکاندا بلآو بویەوە، کەلەهەندێ ڕوەوە لەوغەوغایە دەچووکەلە کۆتایی سالەکانی (١٩٥٨)و (١٩٥٩)دالەعێراق دا ڕووی دا.

موعتەزیلەکان لەم (هات وهەرایە-وەرگێڕ)پشکی هەرەگەورەیان بەرکەوت. خەلکی لەهەموو جێگەیەك ڕاوەدویان دەنان ودەیان چەوساندنەوە. هەر کەسێك ئەوەی لێ دەربکەوتایە کەلەسەر ڕێچکەی موعتەزیلەکانە، جەماوەری لێ دەئالۆزا، لەبەر ئەوە موعتەزیلەکان بیروڕاکانی خۆیان دەشاردەوەو پەیڕەوی (توقیە)یان دەکرد. تەنانەت هەندێکیان هەولیاندا خۆیان دەربازبکەن وبەرەو ولآتە دوورە دەستەکان هەلبێن. لەم بارەیەوە ڕوداوێکی کۆمیدی دەگێڕنەوە. ڕوداوەکەش بەم جۆرەیە) سیبویەیەکمیسری)بیروباوەڕی موعتەزیلەیی خۆی لەناو خەلکی دا ڕادەگەیاندو نەی دەشاریەوە. خەلکیش ئەمەیان لێ قبولّ دەکرد، چونکە بەوە ناسرابوو کەکابرایەکی شێتۆکەو ڕاڕایە. دەلێن جارێکیان دەچێتەبازاڕی (وراقین)لەناو خەلکەکەدا شێخێکی موعتەزیلەی تێدا دەبێت کەناوی ئەبو عومرانە. سیبویە هاواردەکات : (ئەم ولآتە ولآتی کوفرە، ئەوەتان بەسە کەلەم شارە گەورەیەدا کەسێکی تێدا نەماوە بلێت قورئان مەخلوقە، جگەلەمن وئەو شێخە، ئەبو عومران خوا بەرخورداری کات)ئەبو عومران لەترسان دا هەلدەستێتەوەو بەپێی پێخاوس ڕادەکات. تاکابرایەك نەعلەکەیی بۆ هێنایەوە. (٥)

## فەیلەسوفەمەزنەکان:

ئەوچەوساندنەوەیەی کە لەدوای (تەنگانە)بەناوبانگەکە بەرۆکی موعتەزیلەی گرت، بەردەوام چوارچێوەکەی فراوان دەبوو، تاکو کارگەییە ئەوەی هەموو جۆرە سەرنج دانێکی ئەقڵی وفەلسەفەیشی گرتەوە.هەرلەو ماوەیەدا کۆمەڵێ فەیلەسوفی مەزنی وەکو (کندی وفارابی وئیبن سیناو ئیبن مسکویە)بەدەرکەوتن.

دەگونجێت بێژین ئەو فەیلەسوفانە لەسەر داروپەردوی ڕوخاوی موعتەزیلەوە دروست بوون.بەڵام وایان بەباش زانی کە مۆدێلێکیتربن، بۆیە هەوڵیاندا دوور بکەونەوە لەتێکەڵاوی کردن لەگەڵ جەماوەرو پیاوانی ئاینی دا.

هەندێ لەمیرو موتریفەکانیش، فەیلەسوفەکانیان دەپاراست و (موچە)ی تایبەتیان پێ دەدان. ئەوکارەشیان لەڕوی شانازی وکەشخەکردنەوە دەکرد تاکو پێیان بگوترێت خاوەنی بیرکردنەوەی قوڵ و زیرەکی یەکی فراوانن. هەندێ لەدەوڵەمەندەکانیش پێداگری یان دەکرد لەسەر ئەوەی پەرتوکە فەلسەفیەکان بکڕن و نرخێکی زۆریشی بۆتەرخان بکەن.

هەرچی جەماوەریشە، وەك نەریتی هەمیشەییان بەجۆرێ سەیری فەلسەفەیان دەکرد، وەك ئەوەی هاو واتای زەندەقەبێت. ئینجا کاتێ بیان بینیایە میرێك یەکێك لەو فەیلەسوفانە لەخۆی نێزیك دەکاتەوە، ئەوا بەزەندەقیەت تاوانباریان دەکرد. شیاوی باسکردنە جەماوەر (علاءالدولة بن کاکویة)یان بەزەندەقیەت تۆمەتبار کرد، چونکە ئەو ئیبن سینای لەخۆی نێزیك کردەوەو گوێشی بۆڕادەدێرا. (٦)لەهەندێ باردا سوتاندنی کتێبە فەلسەفیەکان لەسەرشەقام و گۆڕەپانە گشتی یەکان دا ببویە باو. یەکێ لەڕاویەکان بۆمان

دەگێڕێتەوە كەجارێكیان بەبازرگانی ڕێی دەكەوێتە بەغداد. لەوێ دەبینێت كتێبە فەلسەفیەكان دەسوتێنن. لەنزیك ئەو شوێنەدا بڵند گۆیەك دروست كراوەو وتاربێژێكی تێدا دانیشتوە، تاكو سەرپەرشتی سوتاندنی كتێبەكان بكات. كابرای وتاربێژ دانە دانە كتێبەكانی بەدەستەوە دەگرت تاكو گەشتە سەركتێبی (الهیئە)ی (ابن هیثم)، ئاماژەی كرد بۆئەو بازنەیەی كەنیشانەیە بۆ (فلك)وگوتی: (هۆدەی الداهیە الدهیاو، والنازلە الصماو، والمصیبە العمیاو) ئینجا لاپەڕەكەی دڕاندو توڕی دایە نێو ئاگرەكەوە. (٧)

## شیعەی ئیسماعیلیە:

ماوەیەكی كەم لەدوای كۆتایی هاتنی (تەنگانەكە)گرۆهێكی سەیرونامۆ لەئیسلام دا دەركەوتن كەبریتی بوون لە شیعەی ئیسماعیلیە. ئەم گرۆهەبە چەند ناوێكی تردەوە ناسراون، وەك: (باتنیە، رافیزە، تەعلیمیە، سەبعیە... هتد). ئەم گرۆهە لەوەدا لەموعتەزیلە دەچن كەبیرو راكانیان لەسەر بتەمای فەلسەفەو سەرنجدانی ئەقڵی بینادەكەن. وەڵێ سەبارەت بەدیدو تێروانینیان لەجەماوەر لەگەڵ موعتەزیلەدا لێك جیابوون. ئێمە دیتمان چۆن موعتەزیلە هەوڵیان دەدا بیروباوەڕی جەماوەر راست بكەنەوە لەرێی راهێنانیانەوە لەسەر تێرامانی ئەقڵی. بەلام ئیسماعیلیەكان پەندیان لە (تەنكانەكە)وەرگرتبوو. تێ گەشتبوون لەوەی ناكرێت بەو رێگەیە ریفۆرم لەبیرو باروەڕی جەماوەردا بەرپابكرێت. بۆیە رێگەیەكی تریان دۆزیەوە، رێگەكەشیان خالّی نەبوو لەقوڵ بونەوە لەتێ گەشتنی واقعی كۆمەلایەتی دا.

ئیسماعیلیەكان پێیان وابوو، خەلكی لەرووی هێزی دەرونیان و ساغی بیركردنەوە یانەوە، دووبەشن : جەماوەرو بژاردە.بەتەنها گرۆهی بژاردە دەتوانن سەرنجی ئەقلی بدەن و پێویستیشە لەچاككردنی بیروباوەڕی جەماوەردا پشت بەوان ببەسترێت. هەرچی جەماوەریشە، هیچیان لەسەر نیە ئەوە نەبێت كەلەبژاردەوە (فێرببن)و بەبێ مشت و مڕ خۆیان بدەن بەدەم ئەو شتەوەكە بژاردە پێیانی دەڵێن. (٨)جگە لەوەش، ئیسماعیلیەكان، چینی بژاردەیان كردۆتە چەند پلەیەكەوە، بەم شێوەیە: لەسەروی هەمووچینەكانەوە پێشەوا هەیەكەموجتە هیدی هەرەگەورەیە، پێشەوا لەنێو خۆی دا هەقیقەتی شەریعەت وهەقیقەتی فەلسەفە كۆدەكاتەوە. لەدوای ئەمیشەوە پلەكانی تر یەك لەدوای یەك دێن. پلەو پایەی ئەمان لەپێشەواوە بەئەندازەی ئەوەیە كە ئەقڵیان چەندە

هێزی سەرنج دان وپێگەشتنی لەبیرکردنەوەدا تێدایە. ئەم چینە دەبنە ناوەند گیر لەنێوان پێشەواو جەماوەردا.

ئیسماعیلیەکان بڕوایان وایە، هەموو ئەوشەریعەتانەی کەپێغەمبەران هێناویانن دوولایەنیان هەیە (ڕواڵەتی)و (ناوەکی). بەشە ڕواڵەتەکەی بۆ چارەسەر کردنی دەرونە نەخۆشەکانی نێو جەماوەر. وەڵ لایەنە ناوەکیەکەی مەبەستی ڕاستەقینەی چاکسازی کۆمەڵایەتی شەریعەت لەخۆ دەگرێت، ئەویش نهێنی یەکە کەس لێی تێ ناگات جگەلە پێغەمبەران و فەیلەسوفان وئەوانەی خاوەنی ئاوەزێکی باڵان.

وادەردەکەوێت ئیسماعیلیەکان ویستویانە بەو شێوەیە چارەسەری ئەو گرفتە بکەن کەموعتەزیلەکان لەبەرانبەر جەماوەردا تێی کەوتبوون. لەبەر ئەوە ئیسماعیلیەکان سیستەمی ئاینی خۆیان لەسەر بناغەی چینایەتیەکی ئەقڵی دامەزراند. هەرچی شتێ بۆ چینێکی ئەقڵی دەست بدات بۆ چینەکانی تر دەست نادات و ناگونجێت، دەگرێت بگوترێ، لەوڕێکخستنەیان دا سەرکەوتنێکی گەورەیان بەدەست هێنا. یەکێکیش لەبەرئەنجامەکانی بریتی بوولەسەرهەڵدانی بزافی قەرمتیەکان و حەشاشیەکان. هەروەها سەرهەڵدانی دەوڵەتی فاتمیش کەماوەیەك لەسەر خەلافەت شانە خڕێی لەگەڵ دەوڵەتی عەباسی داکرد. شیاوی ئاماژە پێدانە، فەرمووەدەناسەکان جەنگێکی پروپاگەندەیی بەربڵاویان کردە سەرئیسماعیلیەکان وبەبێ باوەڕو زەندەقەش تۆمەتباریان کردن. تەنانەت نیازی لەناوبردنی (میللەی ئیسلامی)یان دایە پاڵیان. ئەمەش شتێکی سەیرو نامۆ نیە. چونکە شەرعناسەکان هەرلەسەردەمی ڕۆژگاری (تەنگانەکە)وە، ڕاهاتبوون لەسەر ئەوەی تۆمەتی زەندەقە بنوسێنن بەفەلسەفەوە لەهەموو ڕواڵەتەکانی دا. دوو هۆکاریش بونەیارمەتی دەری لکاندنی ئەوتۆمەتە بەڕێچکەی ئیسماعیلیەوە. هۆکارەکانیش ئەمانە بوون :

یەکەم: ئیسماعیلیەکان ڕێکخستنەکەی خۆیان بەشێوازێکی نهێنی ولەسەر هەمان ڕێچکەی ماسۆنیەتی نوێ بەڕێوە دەبرد. پەیڕەوی خۆیان بۆ هیچ کەس ئاشکرانەدەکرد مەگەرئەوکەسە بژاردانەی کەمتمانەیان پێیان هەبوو. ئەوانەی کەپلەی نزمیان هەبوو کەمێکیان لەووردەکاری پەیڕەوەکە دەزانی. لەبەرئەوە دژەکانیان توانیان گومان وتۆمەتیان لەدەور بوروژێنن، بەبێ ئەوەی ئەمان بتوانن ڕەدێکی ڕاشکاوانەو ڕوونی ئەوتۆمەتانە بدەنەوە.

دووە: دووەم هۆکاری یارمەتی دەر بۆ ڕەواج پەیدا کردنی تۆمەتەکانی دژبە ئیسماعیلیە. ئەوە بوو، ئەو گروپە لەدژی خەلافەتی عەباسی یەك لەدوای یەك شۆڕشیان دەکرد، تەنانەت پتر لەجارێك هەڕەشەیان لەسەر (بغداد)ی پایتەختی خەلافەت دروست کرد. بۆیە بەرژەوەندی خەلافەتی عەباسی وای دەخواست ئەو تۆمەتە لەناو خەلکیدا بلاو بکاتەوە. هەمیشە دوژمن تۆمەت لەسەر دوژمنەکەی دروست دەکات بۆ ئەوەی لاوازی بکات. لەڕاستیش دا ئەو تۆمەتە یارمەتی یەکی زۆری ئۆردوەکانی عەباسی دا لەقەلاچۆ کردن و کپ کردنەوەی شۆڕشەکانی گروپی ئیسماعیلیەدا.

جێگەی سەرنجە ئەو تۆمەتەی لەدەوری ڕێبازی ئیسماعیلیە دروست کرا تاکو ئەم سەردەمانەش بەسەر هزری زۆرێك لەخەلکی دا زالْ بوو.

تەنانەت زۆرێك لەڕۆژهەلاتناس و توێژەرە تازەکانیش ڕەچاوی ئەو تۆمەتانەیان کردووە.

## گورزەگەی غەزالی:

لەکۆتایش دا لەسەردەستی غەزالی دا گورزێکی کەمەرشکێن "دەربڕینی وەرگێڕ" لەفەلسەفە وەشێنرا. غەزالی خاوەنی پێنوسێکی بەبڕشت ومیتۆدێکی قەشەنگی نوسین بوو.ئەمەیشی بەکارهێنا لەهێرش کردنەسەر فەلسەفەو ڕون کردنەوەی پۆچێتی وناسازێتی وی لەتەك شەریعەت دا.لەم ڕوەشەوە بەجۆرێ جێ پەنجەی دیارە کەپێناچێت هیچ کەس لەئیسلامدا شان بدات لەشانی.

یەك لەو موفارەقانەی لەم ڕووەوە جێگەی سەرنجە، ئەوەیە تاچەندە فەلسەفە لەبەرانبەر شاڵاوەکانی غەزالی دا نووچی بدایە. بەوڕادەیەش لۆژیکی ئەرستۆیی سەردەکەوت وبازاڕی گەرم دەبوو لەنێو شەرعناس و پیاوانی ئاینی دا. هەرلەژێرکاریگەری غەزالیش دا ئەولۆژیکە بویە زانستێکی شەرعی کەپێویستە هەموو شەرعناسێك پێی ئاشنابێت، وەگەرنا متمانە بەزانیاریەکانی ناکرێت.

وەك لەبەشێکی پێشتردا ئاماژەمان پێدا، غەزالی ڕێی وابوو، مەنتیق شتێکی پێویستەو بەکەڵکە بۆ شەرعناسەکان، چونکە دەتوانن بەهۆی (مەنتیق)ە وە حوکمی شەرعی لەسەرچاوە ئاینی یەکانەوە هەڵبگوازن. شەرع کۆمەڵێ کۆبەرەنجامی گشتی هێناوە. ناگونجێت لۆژیك لەم بەرەنجامانەدا بخرێتەکار. بەڵکو دەبێ مشت ومرو گومان وەریان بگرین. بەکارهێنانی لۆژیك لەپاشدا دێت، بۆدەرهێنانی وردەمەسەلە لەنێو ئەوکۆبەرەنجامە گشتی یانەدا کەشەرع هێناونی.

لەدیدی غەزالی دا ناتەواوی فەلسەفە لەوەدایەکە لەهەموو کاروبارەکان دا لۆژیك وەکار دەبات. ئیدی جیاوازی ناکات لەنێوان ئەو کارو بارانەدا کەشەرع بڕیونیەتەوەو ئەوانەشی کەناوەزی مرۆڤێیان گەشتوە.هەرلەبەر ئەوەشە کەدەبینین زۆرجار بەپێچەوانەی شەریعەتەوە بەرەنجام بەدەستەوە دەدات "دەربڕینی وەرگێڕ". ئەمەش کوفرێکی ئاشکرایە، خواپەنامان بدات لێی. غەزالی

پێی وایە (نیگا)تاکەسەرچاوەیە بۆ گەشتن بەڕاستی. فەلسەفەش بۆی نیە لەو ڕووەوە ناکۆك بێت لەگەڵ نیگادا. نیگا لایخوداوەیەکە خۆی (علام الغیوب)ە.بەڵام فەلسەفە چ نیە، جگەلەهەندێ شتی پڕوپاڵانتە کەلەناوەز گەلێکی سنوردارەوە بەرهەم دەهێنرێت. ڕەنگە ئەقڵ بگونجێت بۆ کاروبارەکانی ئەم دنیاتەسك و تروسکە. وەڵێ بەبێ گومان ناگونجێت بۆ کاروبارەکانی گەردونی مەزن، ئەوگەردونەی کەجگەلەبەدی هێنەرەکەی کەسی تر بەتەواوی پێی ئاشنا نیە "دەربڕینی وەرگێڕ".

غەزالی یەکێك بوو لەدوژمنە سەرسەختەکانی ئیسماعیلیە، هێرشێکی توندو تیژی کردە سەر ئەورێبازە، وەك چۆن هێرشی کردەسەر فەیلەسوفەکان. سەرباری ئەوەش هێشتر وادەردەکەوێت کە لەڕووی پۆلاندنی خەلکەوە بۆ (جەماوەر)و (بژاردە)کەلکی لەئیسماعیلیەکان وەرگرتبێ. ئەوەندە نەبێت کەلەنێو چینی بژاردەدا، فەیلەسوفەکانی لابردوو، لەوجێگەیاندا پیرانی سۆفی گەری داناوە. لای غەزالی ئەو چینە، پلەیەکی بژاردەو تایبەتی نێو مەردومن و لەدوای پلەی پێغەمبەرانەوە دێن. چونکە ئەمانیش ڕاستەوخۆ لەڕێی (کەشفی سۆفی)یەوە هەقیقەت لەخواوە وەردەگرن. (٩)غەزالی لەدیدێکی تاڕادیەك نزیك لەدیدی ئیسماعیلیەکانەوە سەرنجی جەماوەر دەدات. ئەمیش پێی وایە پێویستە جەماوەر جگەلەگوێ ڕایەڵی و خۆبەدەستەوە دان هیچی دیکە لەکارو باری ئاینەکەیان شارەزانەبن. پێویستە هەقیقەت لەسەر چاودکانیەوە وەربگرن وبەبێ مشت ومڕ خۆیانی بەدەستەوە بدەن. بەو جۆرەش دنیاو دینیان باش دەبێت. (١٠)

## ئەقڵ لای سۆفی گەراکان :

دەتوانین بڵێین، ئەو گورزەی غەزالی وەشاندی، چەندە زیانی لەفەلسەفەدا، ئەوەندەش قازانجی بەڕێبازی سۆفیگەری گەیاند. ئەوە بوو لەدوای غەزالی تەسەوف دەستی بەنەشونماکرد لەئیسلام دا. خەڵکیش بەفراوانی دەهاتنە نێو ڕێبازەکەوە، یان ئارەزویان دەکردو پشتیوانیان لێ دەکرد.

سوڵتان و موتریفەکانیش پەیتا پەیتا تەکیەو خانەقایان بۆ سۆفی گەراکان دروست دەکرد لەهەموو کون و قوژبنێك دا، خواردەمەنی وپیتاکیان بۆ سازدەکردن و خۆیان لێ نزیك دەکردنەوەو داوای نزای سەرکەوتنیان بەسەر دوژمنەکانیاندا لێ دەکردن.

سۆفی گەراکانیش بەتێ پەڕینی ڕۆژگار زیادەڕەویی یان دەست پێکرد لە بەکەم سەیرکردنی ئەقڵ دا. تەنانەت ڕەنگە ڕاست بێت بگوترێت هەندێ لەسۆفی یەکان شێتی یان پێ باشتر بوو لەئەقڵ. ئیبن عەرەبی کەیەکێکە لەسۆفیەناودارەکان، شانازی بەوەوە دەکات کەپتر لەجارێك توشی شێتی بووە (١١).

بەڕێی ئەوان شێتی زیاتر مرۆڤ لەپەروەردگاریەوە نێزیك دەکاتەوە وەك لەتێڕامانی ئەقڵی. هەرلێرەوە خەڵکە ڕەشۆکیەکە وایان لێهات هەندێ لەشێتەکانیان بەپیرۆز دەزانی. هەموو نازارو بەدفەساڵیەکیشیان لێ قبوڵ دەکردن، چونکە بڕوایان وابووە ئەو شێتانە لای خودا خاوەنی کەرامەتن. سۆفیەکان میکانیزمی جۆراو جۆریان گرتە بەرلەپێناوی زاڵ بوون بەسەر ئەقڵ و خامۆش کردنی بیرکردنەوەدا بەمەبەستی گەشتن بە (کەشفی سۆفی). ئەم میکانیزم و شێوازانەش بونە جۆرێك لەپەرستش و لەکۆڕی زیکری تایبەت دا جێ بەجێ دەکرا.لەو کۆڕانەدا وشەی (ئەڵلا)بەجۆرێکی یەك لەدوای یەك دەڵێنەوە، ئینجا یاخود دەخولێنەوە یاخود سەمادەکەن بەدەوری کۆڕەکەدا، تاکو

لەهۆش خۆیان دەچن.بەوەش واهەست دەکەن کەلەخودا نێزیك کەوتونەتەوەو پەردەی غەیبیان بۆلادراوە.

سۆفیەکان (خەون)یش بەمیکانیزمێك لەمیکانیزمیەکانی (کەشف)لەقەڵم دەدەن. چونکە لەنێو خەونەکان دا "خەونی ڕاست" هەیەکە بەڕێی ئەوان پلەیەکە لەپلەکانی پێغەمبەرێتی. کەواتە لای ئەوان خەونەکان لەبەرترن بە (مەعریفە)لەو ئەندێشەو شتەپڕوپوچانەی کەئەقڵی سنوردار پێی دەگات... سۆفیەکان ئەو بیرو ڕایەی خۆیان لەدەستەواژەیەکدا کورت کردۆتەوە کەدەڵێن: (نوستن بێداریەو بێداریش نوستنە) (١٢)هەرچی مردنیشە بەلای ئەوانەوە ئەو نوستنە گەورەیەیە کە بێداری هەردگەورەی پێ دەستەبەر دەبێت، وەك لەفەرمودەکەدا هاتوە: (خەڵکی نوستون هەرکەمردن بێدار دەبنەوە).

هەندێ لەناودارانی سۆفیگەرا، پەرتوکەکانی خۆیان بەپشت بەستن بەو (کەشف)ە دەنوسی کەلەکاتی لەهۆش چونیان دا پێی دەگەشتن. وەك لەنوسینی کتێبی (الفتوحات الملکیە)دا (ئیبن عەرەبی)ئەو شێوازەی پەیڕەو کرد.ئیبن عەرەبی لەسەرەتای ئەو کتێبەدا باسی ئەوەمان بۆ دەکات کەچۆن لە (عالم المثل)دامحەمەدی بینیوە لەسەر کورسی یەك دانیشتوەو فریشتەکان دەوریان داوە، گوایە لەوکاتەدا فەرمانی لەپێغەمبەرەوە وەرگرتوە بۆ ئەوەی لەنێو نهێنی یە خواییەکان دا دەست بەلێکۆڵینەوە بکات !!.

## سیستەمی چینایەتی سۆفی گەراکان:

سۆفیەکان سیستەمێکی چینایەتی یان هەیە، لەوسیتەمی چینایەتیە دەچێت کە لای ئیسماعیلیەکان بینیمان. لای سۆفیەکان مەردوم لەڕوی نزیکیانەوە لەخواو ڕادەی ڕون بونەوەی غەیبەوە بۆیان چەند پلەیەکن. ئەوکەسەی کەلەپلەی بالآدایە سەربەستە لەوەدا کەچی دەکات و چی دەڵێت. تەنانەت مافی ئەوەشی هەیە پەیگیر نەبێت بەسروتە ئاینی یەکانەوە بەوشێوەیەی کەخەڵکی ڕەشۆکی پێیەوە پابەند دەبن. ئەوکەسەش کەلەپلەی خوارەودایە پێویستە لەشێخەکانی ئاینەکەی وەربگرێت و گوێ ڕایەڵی ڕەهای شێخەکانی بکات. چونکە ئەوان لەو باشتر لەهەقیقەتی ئاین شارەزان. ئیبن خەلدون بڕوای وایە، سۆفیەکان ئەم سیستەمەیان لەئیسماعیلیەکانەوە وەرگرتوە. لەو ڕووەوە دەڵێت: (لەنێو سۆفیەکاندا باس لەقوتب کراوە، کە بەمانای سەرداری خواناسان دێت، پێیان وایە هیچ کەس هاوتای پلەو پایە ئەو نابێت تائەو کاتەی خودا گیانی دەکێشێت. کەئەویش مرد، خودا کەسێکی ترلەخوداناسان دەکاتە جێگرو میراتگری. دیارە ڕافزیەکانیش هەمان شت دەڵێن سەبارەت بە میراتگرایەتی پێشەواکانیان. ئینجا سەرنج بدە چۆن سروشتی ئەو خەلکە (واتە سۆفی گەراکانی —وەرگێڕ)ئەو ڕایەی لەفیزیەکان دزیوە. دواتریش باس لەبەدوای یەکداهاتنی جێگەگرەوەکان دەکەن لەدوای (قوتب)ەکان، وەك هەمان ئەو ڕایەی کە شیعەکان لەمەڕ (نقباو)هەیانە!! تەنانەت لەکاتێکدا پۆشاکی (خوری)یان هەڵبژاردوە تاکو بیکەنە بنەڕەتی ڕێبازەکەیان، ئەو پۆشاکەیان کردۆتەماڵ بەسەر عەلیەوە... بەلآم عەلی ڕەزای خوای لێ بێت لەناو هاوەڵاندا تاك نەبوسیەوە بە شێوەجل و پۆشاکێ یان حاڵ و باڵێکی تایبەت... هەرچەندە

شیعەکان بەخەیاڵی خۆیان شت دەگوازنەوە سەبارەت وەی عەلی تایبەتمەندیەکی هەیە لەڕوی فەزڵەوە لەنێو هاوەڵانی تردا.

وا دەردەکەوێت سۆفی گەراکان لەعێراق دا، دوای بەدەرکەوتنی ئیسماعیلیەکان لەنێو شیعەداو، دوای دەرکەوتنی ڕاوبۆچونی ئیسماعیلیەکان لەبارەی (ئیمامەت)ەوە. ئەمانیش لەوڕاو بۆچونەوە بەراوردی نێوان (ڕواڵەت)و (ناوەڕۆك)یان هەلگواستووە.... تاکودەڵێت: ئینجا سەرنج بدەلەقسەی ئەو سۆفیانە وئەوەی کەکتێبەکانیان پێ لێوان لێوکردوە لەوشتانەی کەپێشینانی سۆفی گەر هیچ ڕایەکیان لەبارەوە نەداوە نەبەنەرێ و نەبەئەرێ. بەڵکو ئەو قسانەیان لەشیعەو ڕافیزەو ڕێبازەکانیانی شیعەوە وەرگرتوە... خوداش ڕێنمونی کارە بەرەو هەق) (١٢)

## فەلسەفە لەمەغریب دا:

یەك لەو دیاردانەی لەدێرۆکی فەلسەفەی ئیسلامدا جێگەی سەرنجە، ئەوەیە کە ڕۆژهەڵات لەدوای غەزالی فەیلەسوفی گەورەی تێدابەدەر نەکەوتوە. بەپێچەوانەی ئەمەیشەوە، ڕۆژئاوا (ی عەرەبی —وەرگێڕ)لەوکاتەدا سەرهەڵدانی گەورە فەیلەسوفانێکی وەکو (ئیبن باجەو ئیبن توفەیل و ئیبن ڕوشد)ی بەخۆوە دەبینی، ئەمەش پرسیکی سەیرەو پێویستی بەشیکار کردن ولێکدانەوە هەیە.ئاشکرایە خەڵکی ڕۆژئاوا زیاد لەبرا ڕۆژهەڵاتیەکانیان ڕقیان لەفەیلەسوف بوو، هەروەها لەمان زیاتریش بەهاوتای بێ بڕوایی وزەندەقیەتیان دەزانی. مەقری لەکتێبەکەی دا (نفح الطيب) سەبارەت بەخەڵکی ڕۆژئاوا دەڵێت: (هەموو زانستەکان لای ئەوان شانسیان هەیە جگەلەو فەلسەفەو ئەستێرەناسیی، ئەو زانستە لای بژاردەکانیان شانسێکی مەزنی هەیە، بەڵام لەترسی جەماوەر ناتوانن ئاشکرای بکەن "کەسەرقاڵی فەلسەفەن —وەرگێڕ). چونکە هەرئەوەندەی گوترا فلان کەس فەلسەفە دەخوێنێتەوە، یان لەبواری ئەستێرە ناسی دا کاردەکات، دەست بەجێ جەماوەر ناوی زەندیقی بەسەردا دەبڕن و هەناسەی لەبەر دەبڕن. ئەگەر پێی بخلیسکێ بەرەو گومانێك ئەوا جەماوەر بەردە بارانی دەکەن یاخود بەرلەوەی مەسەلەکەی بگاتەلای سوڵتان ئاوری تێ بەردەدەن. یاخود سوڵتان دەیکوژێت، بۆئەوەی خۆی لەجەماوەر نێزیك بکاتەوە. زۆرجاری وادەبێت پادشاکانیان فەرمان ئەدەن ئەگەر کتێبی لەوبابەتە هەبێ بسوتێنرێ. مەنسوری کوڕی ئەبی عامر لەسەرەتای دەرکەوتن و ڕاپەڕینی دا بەوجۆرە خۆی لەدڵی جەماوەر نێزیك کردەوە، هەرچەندە بەپەنامەکیش خۆی سەرقاڵی ئەو بوارە دەبوو...) (١٤)

دەگونجێت بڵێین، ئەو بارودۆخەی جەماوەرلەمەغریب دا هەیانبوو، وایکرد فەلسەفەی مەغریبی مۆرکێکی تایبەتی هەبێت. مامۆستا (ماکدۆناڵد)ئاماژە بەم ڕاستی یەدەدات و دەڵێت: (گرفتی فەیلەسوف لەوێندەر بریتی بوو لە چۆنێتی دەستکەوتنی پلەو پایە لەکۆمەڵگەیەکدا کەپێك هاتبوو لەکۆمەڵێ خەڵکی دەمارگیر دژبەفەلسەفە، ئینجا فەیلەسوف چۆن لەناوا کۆمەڵگەیەکدا دەتوانێت بیروڕاکانی پێشکەش بکات وژیانی خۆی بگونجێنێت...) (١٥)ئێمە دەتوانین پەی بەمۆرکی تایبەتی فەیلەسوفانی مەغریب بەرین لەمیانەی تێڕوانینی ئەوانەوە لەجەماوەر وهەروەها لەمیانەی زانینی چۆنێتی ڕەنگدانەوەی ئەو تێڕوانینەوە لەسەر فەلسەفەکەیان. ئەوان بەو تێڕوانینە یان لەفەیلەسوفە پێشینەکانی ڕۆژهەڵات جیاواز بوون. ئەوان ڕایەکیان سەبارەت بەجەماوەر هەیەکە لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە زۆر گرنگ و پڕبایەخە. بۆئەوەی بەباشی لەو تێڕوانینە شارەزابین، باپێشەکی ڕاوبۆچونی ئەوسێ فەیلەسوفە بپشکنین کەلە ڕۆژئاوادا بەناو بانگ بوون.

## ئیبن باجە:

یەکەمین فەیلەسوفی موسوڵمانی ڕۆژ هەڵاتی (ئیبن باجە)یە، هەندێ جاریش بە (ئیبن صائغ)ناودەبرێ. ئیبن باجە لەساڵی (٥٢٣)دا کۆچی دوایی کردوە.واتە نزیکە بیست وهەشت ساڵ لەدوای مردنی غەزالی. یەکێك لەبەپێز ترینی دانراوە فەلسەفەکانیشی کتێبێکە بەناوی (فی تدبیرالمتوحد)بەداخەوە ئەو کتێبە بزر بووە.بەڵام (موساناربونی)لەیەکێك لەکتێبە (عیبری)یەکانی دا هەڵسەنگاندنێکی پڕبەهای بۆ ئەو کتێبە کردوە، لەو ڕێی یەوە بوارمان بۆ ڕەخسا تاکو کەمێك زانیاری پەیدا کەین لەسەر هەندێ لەو ڕاو بۆ چونانەی لەکتێبەکەی (ئیبن باجە دا هاتوە – دەربڕینی وەرگێڕ) (١٦)فەلسەفەی ئەو کتێبە لەخولگەی بیرۆکەی (تەنها بونەوە –التوحد)دا دەسوڕێتەوە، یانی دورکەوتنەوە لەخەڵك ودابڕان لەهەبێنەتی کۆمەڵایەتی.

بەڕێی (ئیبن باجە)کۆمەڵگە زاڵ دەبێت بەسەر تاکدا و بەهرە ئەقڵیەکانی پەك دەخات و دەبێتە ڕێگری لەوەی پلەی کامڵێتی بەدەست بێنێت.هەمیشە کۆمەڵگە شەکەتە بەدەست نەریت و خوە دزێوەکان و جۆرەها نەزانینەوە کەفەیلەسوفیش ناتوانێ بگاتە چاکەو هەق، مەگەر تاك بێتەوەو لەوکۆمەڵگەیە دابڕێت و دوربکەوێتەوە کەپێك هاتوە لەخەڵکی نەفام و هیچ و پوچ.

(ئیبن باجە)پێی باشە فەیلەسوفەکان کۆمەڵگەیەکی تایبەت بەخۆیان پێکەوە بنێن و لەوکۆمەڵگەیەدا بەگوێرەی لۆژیك و بیرکردنەوەی ساغ بەڕێوە بچن.بەوەش لەوپەڕی چاکەو خۆشنودی دا دەژین. ئیدی لەو کۆمەڵگەیەش دا پێوستیان بەدادوەر یاخود پزیشك نابێت. چونکە ئەبێ سودی بوونی نۆژدارودادوەر چی بێت لەنێو خەڵکێکدا کەهەمویان لەش ساغ وچاکەویست و دادپەروەربن. (١٧).

بەم ڕایەی (ئیبن باجە)، ئەو بێ ئومێدیە دەرك پێ دەکەین کەفەیلەسوفانی ئیسلامی پێی گەشت بوون لەبەرانبەر جەماوەردا. لەدیدی فەلسەفەدا جەماوەر وایان لێ هاتبوو هەرگیز ئومێدی خێریان لێ نەکرێت. ئەو فەیلەسوفەش کەلەناویان دا دەژیبەهرە ئەقڵیەکانی لەکار دەکەون. چونکە ئەو داب ونەریتانەی کەبەسەریان دازاڵە وەك کۆت و پێوەندێ وان و پەکی مرۆڤ دەخەن لەوەی بگاتە کامڵی. مادەم داب و نەریتەکان پڕن لەنابوتی و ئارەزوی گومڕاکەرانە. بۆیە تاکو فەیلەسوف لێی دور بکەوێتەوە، بەو ئەندازەیە بیرکردنەوەی ساغ دەبێت و کاروبارەکانیشی چاك دەبن.

## ئیبن توفەیل:

لەدوای (ئیبن باجە)لەمەغریب دا فەیلەسوفێکی تر بەدەرکەوت کەلەڕوی ناوبانگەوە لەو کەمتر نەبوو. ئەویش (ئیبن توفەیل)بوو. لەبەناو بانگترینی دانراوە فەلسەفیەکانیشی کتێبی (حی بن یقظان)بوو. ئەم پەرتوکە وەرگێڕدرایە سەر زۆرێك لەزمانە ئەوروبیەکان و لەنێو نێوەندە فەلسەفیەکانی ئەوێدا پلەیەکی بڵندی هەبوو. لەو کتێبەدا (ئیبن توفەیل)هەوڵ دەدات ئەو تێوری (تاك بوونەوە)یە پەرەپێ بدات کەپێشینەکەی (فەیلەسوفەکەی بەرلەو- وەرگێڕ) هێنابویە ئاراوە. تێ بینی دەکرێ، ئەم سەرەڕێی بایەخ دانی بەم تێوری (تاك بونەوە) یە بەڵام ئارادەیەکیش هەق بەو فەیلەسوفە دەدات کەلەنێو جەماوەردا دەژی و هەوڵ دەدات بەگوێرەی ئەقڵیان چاکسازی یان تێدا بەرپا بکات. لێرەش دا دەبینین ئیبن توفەیل ڕایەکی مام ناوەندپەیڕەو دەکات، لەنێوان (ئیبن باجەو ئیبن ڕوشد)دا.

کتێبی (حی بن یقظان) چیرۆکی منداڵێکمان بۆ دەگێڕێتەوە کەلەدورگەیەکی دورەدەستدا پەروەردە دەبێت و، کەژاڵێك شیری دەداتێ، کەژاڵەکە دوو بێچوەکەیی لەدەست چوە. (حی)لەوێندەر گەورە دەبێت و دەست دەکات بەبیرکردنەوە لەنهێنی یەکانی گەردون. لەپاشداو تەنها بەهۆی بیرکردنەوەوە، بیرکردنەوەیەك کەبڕوپاڵانتەکانی کۆمەڵگە پلۆخیان نەکردبوو. توانی بگاتە زانستی ڕاستەقینە. کاتێکیش (حی)بەوەی زانی کەئەو دوورگەی بەرانبەر بە دورگەکەی خۆیەتی پڕەلەخەڵك و، خەڵکەکەیشی لەنێوشەوەزەنگی نەفامی دان "دەربڕینی وەرگێڕ". عەزمی جەزم کرد بۆنەوەی بچێتە لایان وڕێنمونی یان بکات بەرەوهەقیقەت.

ئیبن توفەیل دەڵێت: کاتێ (حی بن یقظان) چوە دوورگەکەوەو دەستی کردە بانگ کردنی خەڵکەکەی بەرەو هەقیقەت. دەرکی بەوە کردکەئەو خەڵکە ناتوانن لەقسەکانی تێ بگەن. ئەوانیش وەك جەماوەرێکی تر وان لەدونیادا،

ناتوانن لەهیچ تێ بگەن جگەلەو نمونە بەرجەستانەی کەنەقڵیان وەری دەگرت. لێرەدا (حی)دەرکی بەراستی ئەو شێوازە کرد کە محەمەد (د.خ)پەیرەوی دەکرد، بەوەی نمونەی بەرهەستی بۆ خەلکی دەهێنایەوە. هەروەها هەستی کرد ئەمیش گەر بیەوێت لەگەڵ خەلکیدا بژی پێویستە پەیرەوی لەو شێوازەی پێغەمبەر (د.خ)بکات. ئەگەرنا باشترە بگەرێتەوە بۆ دوورگەکەی خۆی و بەتەنها بژی. ئەوە بوو (حی) لەکۆتایی دا گەرایەوە بۆ دوورگەکەی خۆی. (١٨)

لەم چیرۆکەدا (ئیبن توفەیل)مەبەستی یەتی پێمان بڵێت، بۆخۆشگوزەرانی وگەشتن بەکاملێتی ژیانی (تەنهایی)باشترە لەتێکەلاوی خەڵك. بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ناکرێت وازلە جەماوەر بهێنرێت بەبێ رێنمونی کردنیان. هەرلەبەر ئەوەش پێغەمبەران نێردراون تاکو بەو شێوەیە رێنمونی خەلکی بکەن کەخۆیان لێی تێ دەگەن.

## ئیبن ڕوشد:

ئیبن ڕوشد کۆتایەمین ومەزنترین فەیلەسوفی مەغریبە. بەئیبن ڕوشد کۆتایی بەزنجیرەی ئەو فەیلەسوفە موسوڵمانانە هات کەفەلسفەکەی خۆیان لەکەلە پوری ئیگریکی یەوە وەردەگرت. لەنێوان ئیبن ڕوشد و ئیبن توفەیل دا خۆشەویستی هەبوو. ئیبن توفەیل ئەوی بەمیر (ئەبی یەعقوبی موەحیدی) ناساندو ئەوەبوو لەلای میر پلەوپایەوپارێزراوی دەست کەوت.

ئیبن ڕوشد لەتێڕامانی دا بۆجەماوەر، جیاوازە لەئیبن باجە وئیبن توفەیل. ئەم بۆچونەکەی ئەوانی سەبارەت بەتاك بونەوە لاپەسەند نیە. بەڵکو وای بەباش دەزانێت لەپێناوی ڕیفۆرم کردنی خەڵکی دا، فەیلەسوف لەناو خەڵکیدا بژی.

ئەڵبەتە دان بەوەدا دەنێت کەجیاوازیەکی گەورە هەیە لەنێوان بیرکردنەوەی جەماوەرو بیرکردنەوەی فەیلەسوفە کاندا. بەڵام وای بەباش دەزانێت فەیلەسوفەکان کەمێك لەو پلە بڵندەیان بێنە خوارێ بۆ ئەوەی بەگوێرەی تێگەشتنی خەڵکی ڕێنمونی یان بکەن. ئیبن ڕوشد لەم بۆچونەی دا پشت ئەستورە بەفەرمودەیەکی (عەلی کوڕی ئەبی تالب)کەدەڵێت: (بەگوێرەی ئەقڵی خەڵکی، لەگەڵیان دابدوێن). (١٩)

ئیبن ڕوشد پێی وایە هەڵەیەکی گەورەیە ئەگەر فەیلەسوف بۆچونە فەلسەفیەکانی بۆ جەماوەر ئاشکرا بکات، بەڵکو پێویستە (میریی)بەدانانی سزا ڕێگەلەفەیلەسوفەکان بگرێ لەوەی ڕاکانیان بۆخەڵکی ئاشکرا بکەن. چونکە جەماوەر (خەڵکی ڕەشۆکی) وەکو نەخۆشێ وان. هیچ وەخت لەبەرژەوەندی نەخۆشیش دانیە کەهەمان خۆراکی کەسێکی ساغڵەمی بدرێتێ. چونکە ئەو خۆراکە وەك ژەهری کوشندەی لێ دێت بۆی. بەڕێی ئیبن ڕوشد، تەنهاو تەنها

ئاین سودی هەیە بۆ جەماوەر. پێغەمبەرانیش سروشتی جەماوەریان باش ناسیوە بۆیە کۆمەڵە یاساو شەریعەتێکیان بۆ هێناون کەلەگەڵیاندا بگونجێت. هەر فەیلە سوفێکیش بیەوێت چاکسازی لەنێو جەماوەردا بکات.پێویستە لەگەڵیان دا پێڕەوی لەهەمان ئەو شێوازەی پێغەمبەران بکات. هەرچی بیرە فەلسەفیەکانیشی یەتی، پێویستە هەڵی بگرێت بۆ خۆی وتەنها بۆ فەیلەسوفەکانی ئاشکرا بکات. ئیبن ڕوشد بەتیۆرەکەی سابارەت بە (ڕاڤەکاری-تأویل)ناوبانگی دەرکرد. ئەو دەڵێت فەلسەفەو ئاین هەردوکیان هەقن، کەواتە لەگەڵ یەك ناکۆك نابن.چونکە هەق ناکۆك نیە لەگەڵ هەق دا.تەنها ئەوەندە هەیەکە ئاین ڕوو لەجەماوەر دەکات و فەلسەفە ڕوولە بژاردە دەکات. ئەگەرناکۆکیش لەنێوانیان دا بەدەرکەوت، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو شێوازەی کەهەرکامیان لە موخاتەبەکردنی بەرانبەرەکانیان دا پەیڕەوی دەکەن. ئینجا پێویستە لەسەر جەماوەر کەدەست بە (دەقی حەرفی)ئاینەوە بگرن و پێیەوە پابەندن، چونکە ئەوە گونجاوە لەگەڵ ئەقڵیان دا. بەڵام فەیلەسوفەکان پێویستە لەسەریان دەقە ئاینی یەکان ڕاڤە بکەن وماناو واتای فەلسەفی یان لێ دەربهێنن. بەو مەرجەی ئەو واتا فەلسەفیانەی دەری دێنن بشارنەوەو بۆ جەماوەری بڵاو نەکەنەوە.

ئیبن ڕوشد لەپێناسەی (ڕاڤەی –تەئویل) دا دەڵێت: بریتی یە لەدەرهێنانی واژە لەماناو دەلالەتی (ڕاستەقینە)وە بۆ ماناو دەلالەتی (مەجازی). جائەگەر لەقورئان دا، بۆ نمونە دەقێکمان بینی ناکۆك بێت لەگەڵ بەرەنجام گیریە فەلسەفیەکان دا، ئەوا پێویستە دەقەکە بخەینە سەر ئەوماناا مەجازیەی کەپێچەوانەیە بەمانا (حەرفی)یەی کەئاماژەو جەخەنکە. (٢٠) لێرەدا تێ بینی دەکەین، ئیبن ڕوشد تاك بونەوەی پێ پەسەند نیە بەو جۆرەی کە (ئیبن باجە)باس لێوە دەکات. ڕەنگە پەرەی بە (تاك بونەوە)دابێت تا ئەو ڕادەیەی مانای ئەوە بگەیەنێت کەفەیلەسوفەکان ڕاو بۆچونەکانیان بشارنەوەو تەنها

لەجڤاتە تایبەتیەکانی خۆیان دا ئەو ڕاو بۆچونانە ئاشکرا بکەن،وەلێ کەهاتنە نێو جەماوەر پێویستە خۆیان لەگەڵ بیرکردنەوەی جەماوەردا بگونجێنن.

بەڕێی (ئیبن ڕوشد)پێویستە لەنێو پانتایی بیرکردنەوەی فەیلەسوفدا بایەخ بەجەماوەر بدرێت، ئەو جەماوەر بەوە دادەنێت کەئەقڵیان نەخۆشە، دەی خۆ نابێت وازلە خەستەکان بهێنرێت تانەخۆشینەکە لەناویان دەبات. بەڵکو پێویستە بەو دەرمانە چارەسەر بکرێت کەبۆ نەخۆشینەکەیان گونجاوە. وادیارە (ئیبن ڕوشد)ئەم بیرۆکەیەی لە (ئیبن توفەیل)ەوە وەرگرتوەو دواتر پەرەی پێ داوە، وەك چۆن بیرۆکەی (تاك بونەوە)ی لەئیبن باجەوە وەرگرتوە.

ئەم ڕایەی ئیبن ڕوشد، چیرۆکە بەناوبانگەکەی (ڕوباری شێتی) مان وەبیر دێنێتەوە. بەگوێرەی ئەو چیرۆکە دەرمان کرایە نێو ڕوباری گوندێکەوە، ئاوی ڕوبارەکە وای لێهات هەرکەس لێی بخواردایەتەوە شێتی دەکرد.خەڵکی ئاواییەکە هەرهەموویان لێیان خواردەوە. تەنها پادشاکەیان نەبێت.

ئیدی خەڵکی گوندەکە کەوتنە چپە چپ گوایە پادشا شێت بوەو پێویستە لەسەرکار لابرێ. بۆیە پادشا ناچار بوبەوەی لە (ڕوباری شێتی)بخواتەوە، بۆ ئەوەی وەکو خەڵکەکە ژیر ببێت !! بەو جۆرە توانی پارێزگاری لەکورسی یەکەی بکات.

ئیبن ڕوشد گەرەکیەتی فەیلەسوفەکان خۆیان لەگەڵ بیرکردنەوەی جەماوەردا بگونجێنن، وەك چۆن پادشاکە خۆی گونجاند لەگەڵ شێتی دەست و پێوەندەکانی دا. ئەمەش درەوشانێکی فیکریە و بۆ یەکەمین جارە لەمێژوی فەلسەفەدا بەو ڕونیە تێبینی بکرێت. بۆیە خەریکە بەتەواوی بڕوابکەم بەوەی کەئەم پێڕەوە کاریگەریەکی گەورەی هەبوە لەسەر بیرکردنەوەی ئیبن خەلدون.

## ئیبن خەلدون وجەماوەر:

وەك لەبەشێکی پێشوتردا باسمان لێوە کرد. ئیبن خەلدون ئاگای لەفەلسەفەکەی ئیبن ڕوشد هەبوە. تەنانەت پێ دەچێ لەڕۆژگارەکانی لاوێتی دا پێیشی سەرسام بوبێت، بەبەڵگەی ئەوەی لەوکاتەدا پەرتوکێکی داناوەو ئەو فەلسەفەیەی تیادا کورت کردۆتەوە.

وام دێ بەخەیاڵ دا، ئیبن خەلدون لەکاتی خوێندنەوەی ئەو فەلسەفەیەدا ڕاوەستاوەو بیری کردۆتەوە.ڕەنگە لەخۆشیی پرسی بێت: ئەگەر جەماوەر نەخۆش بن و فەیلەسوفان ساغلەم بن بەگوتەی ئیبن ڕوشد، ئەدی ناکرێ مەسەلەکە هەلگێرینەوەو فەیلەسوفەکان بەنەخۆش و جەماوەر بەساغلەم لەقەڵەم بدەین؟

یاخود ئەگەر پێغەمبەران لەبیرکردنەوەیاندا خۆیان لەگەڵ جەماوەردا گونجاندبێ، ئایا ناکرێ ئێمەش خۆمانیان لەگەڵ دابگونجێنین. ئیبن خەلدون هەمان ڕێی غەزالی هەیە لەوەدا کەفەیلەسوفەکان لەئاین لایان داوەو پێچەوانەی یاسائاسمانیەکان بونەتەوە. پێدەچێ ئیبن خەلدون ڕاو بۆچونی هەریەك لەغەزالی وئیبن ڕوشدی کۆکردبێتەوەو بەهۆی هەر دوو ڕاکەوە گەشتبێتە ئەوقەناعەتەی کەبڵێت بیرکردنەوەی جەماوەر نێزیك ترەلەراستی یەوە، وەك لەبیرکردنەوەی فەیلەسوفەکان.

ئادەمیزاد بۆیە دەژی تاکو لەدنیاو قیامەتیش دا خۆش گوزەرانی و بەختیاری دەست خۆی بخات. بەڕێی ئیبن خەلدون لەهەردوو دونیاکەدا جەماوەرو خەڵکی ڕەشۆکی بەتواناترن لەفەیلەسوفەکان لەبەدەست هێنانی بەختیاری دا.ئەوەتا لەدنیادا لەتەك تەوژمی بویەرە کۆمەلایەتیەکەدا دەڕۆن بۆ هەرلایەکیان بەرێ. بەم هۆیەشەوە بژێوی و بەختیاری یان دەست دەکەوێت. پتر

لەوەی لۆژیك سازو فەیلەسوفەکان دەستیان دەکەوێت (٢١). لەقیامەتیش دا بەهەمان شێوە بەختەوەر دەبن چونکە دورکەوتونەتەوە لەو خلیسکان و لەنێو چونەی کەفەیلەسوفەکان تێی کەوتون "دەربڕینی وەرگێڕ".

ئیبن خەلدون لەبارەی ئەو کەسانەوە کەسەرقاڵن بەفەلسەفەوە دەڵێت: (دەبینیت ئەو کەسەیان کەکارامەیە تیایان دا سەری شۆڕکردۆتەوە بەسەر کتێبی شیفاو ئامازەکان وڕزگار بون وئەو کورت کردنەوانەی ئیبن ڕوشد بۆ (دەق)ی گردوەلەدانراوەکانی ئەرستۆو ئەوانی تردەوە. لاپەڕەکانی شپرز دەکات وبەڵگەکانی تۆکمە دەکات. بەوەش بەشێك لەخۆشنودی دەست دەکەوێت، ئیدی نازانێت کەلەهەمان کاتدا بەربەستەکانی بەختەوەری لەسەر خۆی زیاد کردوە.

لەم ڕوەشەوە پشت بەو گوتەیە دەبەستن کەلە ئەرستۆو فارابی وئیبن سیناوە دەیگێڕنەوە گوایە هەرکەس گەشتە دەرك کردن بەئەقڵێکی کاراوە و پەیوەست بوو پێیەوە ئەوا لەژیانی دا بەشیی خۆیی لەبەختەوەری دەست کەوتوە. بەڵام ئەو قسەیان کەدەڵێن ئەو شادومانیەی لەو دەرك پێکردنەوە دروست دەبێت گرۆکی بەختەوەریە قسەیەکی پوچە.... هتد) (٢٢)

## ئیبن خەلدون وپاساکۆمەلآیەتیەکان :

لەبەشێکی (مقدمە)دا باس لەبەسەر هاتێك کراوە کەزۆر لەچیرۆکی ڕوباری شێتی دەچێت کەئێمە لەبەردا ئاماژەمان پێدا. لەم بەشەدا ئیبن خەلدون ئاماژە بۆ نارێکی وناسازی هەندێ لەو خەڵکانە دەکات کەهەوڵ دەدەن پێچەوانەببنەوە لەگەڵ داب ونەریتە باوەکان دا، گوایە ئەو داب و نەریتانە بەچاك نازانن بۆیە دەست دەکەنە پێڕەوی کردن لەهەندێ نەریت و خوی تر کە خۆیان بەباشیان دەبینن. لەم کاتەدا خەڵك بەشێتیان قەڵەمداد دەکەن.ئەمەش ترسناکە بۆیان، چونکە لەوانەیە بەهۆی بەشێت لەقەڵەم دانیانەوە ئەو پلەو پایەو دەستەڵاتەی هەیانە لەکیس یان بچێت. (٢٢)

ڕەنگە هەر ئەمەش پاڵی بە ئیبن خەلدونەوە نابێ تاکو بگاتە ئەو بڕوایەی کەبڵێت کۆمەڵگە لەسەر کۆمەڵێ یاسای سەقامگیرو نەگۆڕ دەڕوات بەڕێوە.کۆمەڵگە پێك دێت لەجەماوەر. جەماوەریش بەهیچ جۆرێ گۆڕانکاری لەو نەریتانەدا قبوڵ ناکەن کەلەباوانیانەوە بۆیان دەمێنێتەوە. هەرگا کەسێك بێت وپێچەوانەی ئەو داب ونەریتانەیان بجوڵێتەوە، ئەوان لەدژی ڕادەوەستن وپیای دا هەڵدەشاخێن.بەم پێ یەش کۆمەڵگە مل کەچی بیرۆکە تاکەکەسی و ئارەزوە تایبەتەکانیان نابێت، بەڵکو لەسەر هەندێ ڕێچکەی حەتمی بەڕێوە دەچێت، ڕێچکەکانیش هەڵقوڵاوی نێو نەریتەکانی جەماوەرو میتۆدی بیرکردنەوەیانە.

د.عەلی عەبدوا واحد وافی دەڵێت: (بینین و تێڕامانە قوڵەکانی ئیبن خەلدون بۆکاروبارەکانی گردبونەوەی مرۆیی، ڕێنمونی یان کردوە بەردو ئەو بڕوایەی کەدیاردە کۆمەلآیەتیەکان لەدیاردە گەردونیەکانی تر ڕیزبەڕنین. بەڵکو

مەحکومن بەهەندێ یاسای سروشتی هاوشێوەی ئەو یاسایانەی کەدیاردە گەردونیەکانی تر بەڕێوە دەبن. وەك دیاردەکانی ژمارەو سروشت و کیمیاو ئاژەڵ وڕوەك)هەروەها دکتۆر وافی دەڵێت: (ئەم ڕاستی یەش بەرلەئیبن خەلدون بیرکردنەوەی کەسی پێڕانەگەشتوە. بەڵکو پێچەوانەکەی بەسەر بیرکردنەوەی هەمویاندا زاڵ بوو. ئەوان بڕوایان وابوو دیاردەکانی کۆمەڵایەتی وکۆمەڵ بونی مرۆڤ بەدەرە لەچوار چێوەی یاساکان و مل کەچە بۆ ئارەزووی سەرکردەکان و ئاراستەکاری ڕێبەران و یاساڕێژان و بانگەشەکارانی چاکسازی) (٢٤)

## ئیبن خەلدون وفەلسەفە:

مامۆستا (تیای)دەڵێت: ئیبن خەلدون فەیلەسوف بوو، سەر بەبنەماڵەی مەزنی فەیلەسوفەكانیش بوو.مادامیَ تونسی و لەبنەماڵەیەكی ئەندەلوسی بوە، ئەوا هیچ جێگەی سەرسوڕمان نیە كەلەبیركردنەوەی فەلسەفی دا درێژكراوەی بیركردنەوەی ئیبن ڕوشد بوبێت) (٢٥)ئەم بۆچونەی (تیای)لەورایەی دكتۆر (محسن مهدی)دەچێت كەلەبێشەكی ئەم كتێبەدا ئاماژەمان پێدا.پێویستە دووبارە بگەڕێینەوە سەرئەو بۆچونە تاكو لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی لەم بەشەدا هاتوە تاوتوێ‌و شەن وكەوی بكەین.

یەكەمجار دەمانەوێت بپرسین : (تیای)مەبەستی چی یە لەوەی كەدەڵێت ئیبن خەلدون فەیلەسوف و سەر بە بنەماڵەی مەزنی فەیلەسوفان بوە؟ئەگەر مەبەستی لەوە بێت ئیبن خەلدون لەداڕشتنی تیۆرەكەی دا لەسەر ئەو هێڵ و ئەوەرە ڕێی كردوە كەفەیلەسوفەكانی ئیگریكی ولەپاش ئەوانیش فەیلەسوفەكانی ئیسلام لەسەری دەڕۆشتن. ئەوا ئێمە هاوڕانین لەگەڵی دا.

بەڵێ، وەك لەبەریش دا ئاماژەمان پێدا، ئیبن خەلدون كەڵكی لەوبیرو بۆچونە جۆراو جۆرانە دیتوە كەلەپەڕاوی فەیلەسوفەكان دا بەر ئیگاكانی كەوتون. بەڵام سود لێ وەرگرتنەكەی، وەك سود وەرگرتنی وابوە لەبیروڕێی كەسانی تر.وەك سود وەرگرتنی وابوە لەنمونەو پەندە میللی یەكان. جیاوازی یەكی گەورە هەیە لەنێوان ئەوەدا بیرمەندێ لێرەو لەوێ ڕاو بۆچون وەرگرێت، لەگەوڵ ئەوەدا كەشوێنی ئەو لۆژیكە بكەوێت كەبەسەر ئەو بۆچونانەدا زاڵە.

ئیبن خەلدون بەتوندی ڕەخنەی لەو لۆژیكە گرتوە كەفەیلەسوفەكان لەسەری ڕۆشتون. لەم ڕووەوە لەسەر هەمان ئەو هێڵە ڕێی كردوە كەغەزالی و ئیبن ڕوشد لەسەری ڕۆشتوون. تێبینی ئەوەمان كرد چۆن غەزالی هەوڵی دا ئەو بوارە دیاری بكات كەدروستە لۆژیكی تیادا بەكار بهێنرێت، دوای ئەویش (ئیبن تەیمیە)هات و هەوڵی دا سەرلەنوێ سنور بەندی بكات. ئەوە بوو لەغەزالی زیاتر

چوار چێوەكەی بەرتەسك كردوە.ئینجا ئیبن خەلدون هات و بوارەكەی سنوردار تروتەسك تر كردەوە. بەڕێی ئیبن خەلدون، لۆژیكی كۆن بەسود نیە، تەنها لەچوار چێوەیەكی زۆر بەرتەسك دانەبێت. چوار چێوەكەش تایبەتە بەڕیز كردنی بەلگەكان. واتەتوێژەرێك ئاتاجی بەلۆژیك نیە لەدوای ئەوە نەبێت كەتەواو دەبێت لەلێكۆلینەوە. دوای تەواو بونی لەلێكۆلینەوە. ئەوجا لۆژیك بەكار دێنێ بەمەبەستنی پێشكەش كردنی بەلگەكانی بۆخەلكی بەشێوازێكی ڕێك و پێك. جگەلەو بوارەش ئیدی وەكار بردنی لۆژیك بەرەنجامی هەلەو پێچەوانەی لێ دەكەوێتەوە. لێرەوەیە كە دەبینین لۆژیككارەكان ناتوانن بگەنە بەرەنجامی ڕاست لە (مەسەلە خواییەكان وپرسە سیاسیەكان و...هتد)یشدا.

ئیبن خەلدون لە (مقدمە)كەی دا لەمەڕ ڕەخنە كردنی فەلسەفەو لۆژیكی كۆن دەلێت: (ئەو زانستە وەك من دیتومە. سەرباری ئەوەی پێچەوانەیە بەشەریعەتەكان، كەلكیشی نیە بۆ ئەو مەبەستەی بەدوای دا دەخولێنەوە. بەگوێرەی زانیاری ئێمە تەنیا یەك بەرهەمی هەیە، ئەویش بریتی یە لەتیژكردنەوەی هزر بۆ ڕێك كردنی بەلگەكان بەمەبەستی گەشتن بەمەلەكەی قەشەنگی ونیشانە پێكانی بەلگەكان. سیستەمی پێوانەكاریەكان وڕێك كردنیان بەشێوازی ڕێك وجوان بەگوێرەی ئەو مەرجانەیە كەئەوان لەپیشەسازیە لۆژیكیەكەیان دا دایان ناوەو زۆر جاریش لەزانستە "حكمیە" كانیان دا بەكاری دێنن...تاكو دەلێت: باهەركەسێك سەرنجی "ئەو زانستە –وەرگێڕ" دەدات، دوای ئەوە سەرنج بدات كەلێوان بوبێت لەزانستە شەرعیەكان و ئاگاداربون لەتەفسیرو فیقهـ. باهیچ كەسێك خۆی سەرقال نەكات بەو زانستەوە لەكاتێكدا كەخالی یە لەزانستەكانی (میللە=زانستەشەرعیەكان "وەرگێڕ")هەرخوداش ڕێنمونی كارەبەرەو ڕێگەی ڕاست و هەق. ئێمە ئەگەر ڕێنمونی خوا نەبێت ڕێ نابەینەوەسەر ڕێی ڕاست) (٢٦)

لەبەشێ تری (مقدمە)دا كەناوی ناوە (فی ان العلماو من بین البشر ابعد عن السیاسە ومزاھبھا) بەم جۆرە دەوێت: ئەوان ڕاھاتون لەسەر سەرنج دانی فیكری وقوڵ بونەوە بەسەرماناكانداو دابڕینیان لەشتە بەرھەستەكان وروت كردنەوەیان لەھزرداو كردنیان بەھەندێ مەسەلەی گشتی. تاكو بەگشتگیری حوكمیان بەسەردا بدرێت نەك بەھۆی تایبەتمەندی ھیچكام لەمادەو كەس ووەچەو نەتەوەو گرۆھێكی خەڵكەوە. دواتر ئەو حوكمە گشتگیرو كۆبەرەنجامانە پراكتیزە دەكەن بەسەر شتە دەرەكیەكان دا. حوكم وسەرنجەكانیان لەنێو ھزردایەو نایخەنە بواری بەراوردەوە (لەگەڵ مەسەلەدەرەكی و واقعی یەكان دا. وەرگێڕ) دوای ئەوە نەبێت كەتەواودەبن لەسەرنج دان و توێژینەوە... ئەو كەسەی خۆی بەسیاسەتەوە سەرقاڵ دەكات پێویستی بەرەچاو كردنی دیاردە دەرەكیەكان (واقیع یەكان) و ئەو بارەو دۆخانە ھەیە كەپێیەوە دەلكێن و دەبنەپاشگری. چونكە شتانێكی پەنھانین و بۆی ھەیە شتێكی تێدابێت ڕێ بگرێت لەوەی (واقعەكە)بلكێنرێت بەنمونەیەكەوە وپێچەوانەش بێت بەوكۆبەرەنجامەی كەھەوڵ دەدات بچەسپێنرێ بەسەری دا. ھیچ بارودۆخێكی ئاوەدانیش بەبارو دۆخێكی تر پێوانە ناكرێت. ئینجا زاناكان چونكە ڕاھاتون لەسەر گشتاندنی حوكمەكانیان و پێوانە كردنیھەندێ لەشتەكان لەسەر ھەندێكی تریان، ھەركات سەرنجی سیاسەت دەدەن لەنێو قاوغیتێڕوانین وجۆری بەڵگە ھاوەری خۆیان دا خاڵی دەكەنەوە. بەوجۆرەش دەكەونە ھەڵەوە...) (٢٧)

لەمەوە ڕون دەبێتەوەكەئیبن خەلدون ڕاشكاو بوە لەرەخنە كردنی لۆژیك و سنور بەند كردنی بوارەكەی دا بۆ سنورێكیبەرتەسك تر. بەمەش لەوفەیلەسوفانە جیادەبێتەوە كەلۆژیكیان بەڕێگەی ڕاستی بیركردنەوە دەزانی لەھەموو مەسەلە ئاینی ودونیاییەكانیش دا.

## ئایائیبن خەلدون فەیلەسوف بوو؟

شتێکی دیکەمان ماوە، ئەویش ئەم پرسیارەیە: ئایائیبن خەلدون فەیلەسوف بوو؟ بۆ وەلأم دانەوەی ئەو پرسیارە پێویستە مانای هەریەك لەفەلسەفەو فەیلەسوف دەست نیشان بکەین. خەلکی لەکۆن دا، و نەخاسمە لەئیسلامدا، ناوی فەیلەسوفیان بەسەر هیچ کەسێکدا نەدەبڕی مەگەر ئەوکەسە لەسەر ڕەوتی فەلسەفەی ئیگریکی بڕۆشتایەو لەقسەکانی دا.زاراوەی کلاسیکی یەکانی وەك (ئاوەزی کارا، هیولی، بون پێویست " واجب الوجود"، ...هتد)ىبەکار بهێنایە. ئەم زاراوانەش تەم ومژدار بوون وخەلکی ڕەشۆکی نەیان دەتوانی لێی تێ بگەن. ڕەنگە ئەوتەم ومژداریەش بۆ خۆی ئامانج بوبێ تاگو واهەست بکرێ ئەو کەسەی زاراوەکان لەزاری دێنەدەر لەنهێنی یەکانی گەردون دەکۆڵێتەوە. ئەو نهێنی یانەی کەخەلکی ڕەشۆکی لێیان حاڵی نابن. خەلکی لەکۆن دا ئاوها ڕێیان دەکرد.بۆیە کەسانێکی وەك فارابی ونیبن سیناو ئیبن ڕوشد لەنێویاندا بونە هەلگری نازناوی فەلسەفە (یان فەیلەسوف —وەرگێڕ).

هەرکات هزرڤانێك دەربکەوتایە وڕەخنەی لەو جۆرە فەلسەفەیە بگرتایە. خەلکی بەکەسێکی دەرەوەیبازنەی فەیلەسوفانیان دەژمارد. بڕوایان وابوو ئەگەر ئەوکەسە فەیلەسوف بوایە، لەسەر هەمان ئەو ڕەوتە دەڕۆشت کەفەیلەسوفەکانی ترلەسەری ڕۆشتوون.

لەڕاستی دا ڕەوتی نوێی پێناسەکردنی فەلسەفە جیاوازە لەو ڕەوتەکۆنە. دەکرێلەواتای تازەیدا "فەلسەفە" بەم جۆرە پێناسەبکەین: هەر هەوڵێکی ئەقلیە کەهزرڤانێك پێی هەڵدەستێ بۆ ڕاڤەکردن و لێك دانەوەی گەردون وجێگەی مرۆڤ تیای دا. (٢٨)بەم پێودانگەش دەکرێت نازناوی فەیلەسوف ببڕدرێت بەسەر ئەوکەسەدا کەڕەخنەی لەفەلسەفەی ئیگریکی گرتوە، وەك چۆن

دەگونجێت بەسەر ئەوکەسەش دا ببڕدرێت کەشوێنپێی ئەو فەلسەفەیەی هەڵگرتوە.چونکە هەموویان هەوڵیان داوە شرۆڤەی گەردون بکەن و جێگەی مرۆڤی تیادا دیاری بکەن. بەڵام ناکۆکی و جیاوازی ئەوان لەلۆژیك دا، مەسەلەیەکە پەیوەندی بەمیکانیزمی ڕاڤە کردنەوە هەیە. دەنا لەمەبەستەکەیان دا هەردوولایان یەکسانن. شیاوی ئاماژە پێدانە، هەندێ لەدانەرە تازەکان پێناسەی فەلسەفەیان فراوان کردوە، بەجۆرێ هەرمرۆڤێك کەلەم دنیایەدا دەژی بەفەیلەسوفی لەقەڵەم دەدەن. چونکە هەرمرۆڤێك بگری هەردەبێ بیرۆکەیەکی گشتی هەبێت وهەوڵ بدات بەگوێرەی ئەوبیرۆکەیە ناوەرۆکی گەردون شرۆڤە بکات وئەوەش لێك بداتەوە کەمرۆڤ لەبەرانبەری دا چۆن ڕێ دەکات. وەلێ بێگومان لەمەدا خەڵکی جیاوازن. هەیانە سادەو ساکارن وپێیان وایە گەردون لێوانەلە پەری و دێو، هەشیانە هزرڤانی قوڵ بوەوەن کەبەگوێرەی تازەترین چەمکی فەلسەفی یاخود تیۆری زانستی، ڕاڤەی گەردون دەکەن.

هەرچۆن بێت، ئێمە کاتێ لەبەر ڕۆشنایی پێناسەی تازەی فەلسەفەدا سەیری ئیبن خەلدون دەکەین هیچمان لەبەردەمدا نامێنێتەوە ئەوەنەبێت کەبەفەیلەسوفێکی پلەیەکی لەقەڵەم بدەین. چونکە ئەو لەداڕشتنی بیردۆزەکەی داسەبارەت بەگەردون و کۆمەڵگە پشتی بەسەرجەم ئەو زانست و فەلسەفانە بەستوەکەبیری مرۆڵەچاخەکانی پێشوتردا پێی گەشتبوو.هەندێ لەرۆژهەڵاتناسەکان ڕاهاتون لەسەر ئەوبڕوایەی کەدەڵێن فەلسەفەی ئیسلامی شوێنپێ هەڵگری فەلسەفەی ئیگریکبوە، و لەخودی خۆیدا شتێکی نوێی بەرهەم نەهێناوە. یەکێ لەوانەی بەم جۆرە بیردەکاتە (رینان)ی فەرەنسی یەکەلەوبارەیەوە دەڵێت: (فەلسەفەی ئیسلامی هیچ نیە جگەلەفەلسەفەی یۆنانی کۆن ئەوەندە هەیە بەپیتی عارەبی نوسراوەتەوە). وادەردەکەوێت (رینان)و هاوشێوە ڕۆژهەڵاتناسەکانی، فەلسەفە دەناخننە نێو ئەو چوار چێوە کلاسیکی

یەی کەخەلکی لەکۆن دا لەگەلی دا ڕاهاتبوون. ئێمەش کاتێ لەو چوار چێوە بەرتەسکەوە سەرنجی فەیلەسوفەکانی ئیسلام دەدەین خەریکە بچنە سەر ڕایەگەی (ڕینان). بەلام کاتێ لەڕوکارێکی گشتی یەوە سەرنجی دەدەین دەبینین نوێ بونەوەی هێناوەتە کایەوە.

لەئیسلامیش داکۆمەلێ فەیلەسوفی داهێنەربەدیار کەوتن کەلەڕوی قەشەنگی داهێنانەکانیانەوە هیچیان کەمتر نەبووەلەفەیلەسوفانی چاخی نوێ، ئەوەندە بەسە ناوی یەك کەسیان بێنین، ئەویش ئیبن خەلدونی هاوڕێمانە. ئەگەر لەنێو ژیاری ئیسلامی دا جگەلەو پیاوەکەسێکی تربەدەر نەکەوتبا، تەنها ئەو پیاوە بەس بوو بۆئەوەی ژیاری ئیسلامی شانازی پێوە بکات. ئیدی لەوە گەڕێ کەفەیلەسوفێکیش بێت و زانستێکی نوێی داهێنابێت. زانستێك بیری مرۆ نەی توانی پێی ڕابگات، مەگەر دوای پێشقە چونێکی خاوخلیچك نەبێت کەماوەی پێنج سەدەبەردەوام بوو.

## ترسی وی لەتۆمەتی فەلسەفە:

ئێمەلەبەشێکی پێشوی ئەم کتێبەدا باسمان لەوە کردکەئیبن خەلدون لەتافی لاوی‌دا فەلسەفەی کۆنی دەخوێند، لەو بوارەش دا چەندین کتێبی داناوە، یەك لەوانە سیپارەیە بوو لەلۆژیك دا، یەکێکی دیکە کورت کردنەوەی فەلسەفەکەی ئیبن ڕوشد بوو. هەروەها پەرتوکی (المحصل)ی‌فەخرەدینی ڕازیشی کورت کردۆتەوەو وەلام وەرەت دانەوەیەکی درێژی (نصیر الدین الطوسی)شی‌لەسەر نوسیوەتەوە. کەئەمی کۆتایی یەکێك بوە لەشوێنکەوتەکانی فەلسەفەی کۆن.

بەداخ وکەسەرەوە، سەرجەم ئەو پەرتوکانە بزر بون وتەنها ئەمی کۆتایی ماوەتەوە. ئێستاکەش لەکتێبخانەی (ئیسکۆریال)لەنزیك (مەدرید)پارێزراوە، کە بەدەستی ئیبن خەلدون خۆی نوسراوەتەوە. لەودەست نوسەدا دەبینین ئیبن خەلدون لەوەسفی (توسی)دا دەڵێت (پێشەوای مەزن). (٢٩)

سەیر لەوەدایە ئیبن خەلدون لەپەرتوکی (التعریف)ەکەی دا کەلەسەردەمی ژیانی خۆی دا وەرگێڕدراوە باسی لەو کتێبانە نەکردوە. ئەمە لەکاتێکدا شتانێکی باس کردوە کەزۆر کەم بایەخ ترن. کەواتە ئەبێ هۆکاری ئەمە چی بێت؟

وام دێ بەخەیاڵ دائیبن خەلدون بۆیە ئەو کتێبە فەلسەفیانەی خۆیی فەرامۆش کردوە تاخەلکی نەڵێن کابرایەکی فەیلەسوف و زەندیقە. تەنانەت کتێبی (التعریف)ی خستۆتە بەشی کۆتایی مێژووگشتی یەکەیەوە. ڕەنگە حەزیشی نەکردبێت خوێنەر ببینێت کتێبی لەبارەی فەلسەفەوە داناوە، لەکاتێکدا لەپێشەکی مێژووەکەی دا ڕەخنەیەکی توندوتیژی لەفەلسەفە گرتووە باسی لەوە کردوە کەفەلسەفە مرۆڤ بەرەو کوفر پەل کێش دەکات.

لەکتێبی (التعریف)دا ئیبن خەلدون باسێ زۆرمان بۆدەکات سەبارەت بەو وانە فەلسەفیانەی کەکاتی خۆی لەلای (ئابیلی)مامۆستای خوێندونی، شانازیشی پێوە کردوە.وادیارە بەم باسکردنەی ویستویەتی بەخەلکی بێژێت کەمن لەتافی

لاوی دا بەتێرو تەسەلی لەفەلسەفەم كۆڵیوەتەوە. یان وای دەربخات كەسودی لەفەلسەفە بینیوە بۆ تیژكردنەوەی هزرو ڕێك كردنی بەلگەكانی. بەڵام بڕوای نەكردوە بەو ڕاو بۆچونانەی كە لەفەلسەفەدان وپێچەوانەن بەشەریعەت. پوختەی بۆچونی ئیبن خەلدون سەبارەت بەفەلسەفە ئەوەیە كەهیچ بەرهەمێكی تێدا نیە جگەلەبەرهەمی تیژكردنەوەی هزر لەڕێك كردنی بەلگەكان دا.هەروەها ئامۆژگاری ئەوكەسانە دەكات كەئارەزوی تێڕامان لەفەلسەفە دەكەن، تاكو خۆبەدوربگرن لەخراپەكانی فەلسەفەو لەدوای تێر بون لەزانستە شەرعیەكان ئەوجالەفەلسەفە ڕابمێنن. وادەردەكەوێت ئیبن خەلدون بۆیە ئەم بۆچونەی دركاندوە تاكو ئاماژە بەخۆی بدات.وەك ئەوەی بێژێت من لەدوای تێربون لەزانستی شەرعی ئەوجا فەلسەفەم خوێندەوە. گوایە باشیەكانی فەلسەفەی وەرگرتوەو خراپەكانی وەلاناوە.

هەرچۆن بێت. ئیبن خەلدون دەترساو دەسڵەمایەوە لەوەی خەلكی بەفەیلەسوف تۆمەتباری بكەن.چونكە لەڕۆژگاری ژیانی وی دا ئەو تۆمەتە سزای لەدوا بوو. بۆئەوەی لەسەرەنجامی ئەو تۆمەتە تێ بگەین، واباشترە سەرنج بدەین بزانین لەكۆتایی تەمەنی دا (ئیبن ڕوشد)بەسەردا هات. ئەوەبوو لەتەك قوتابیەكانی دا بەتۆمەتی فەلسەفە چێتی حوكم دران و بڕیاری دورخستنەوەی خۆیان و سوتاندنی پەرتوكەكە كانیان دەرچوو.لەبەرەنجامی ئەوەشدا، ئەبو یوسفی مەنصور، پادشای موحەدینەكان لەو ڕۆژگارەدا، پەخشنامەیەكی بۆخەلكی بلاو كردەوەو تیای داخەلكی بەئاگا دێنێتەوە لەخۆ وەردان لەفەلسەفەو لە سزای توندیئاواكارێك هۆشیاریان دەكاتەوە. پەخشنامەكە دووردودرێژە ئێمە چەند دێرێكی كەمی لێ وەردەگرین، كەتیای دا هاتوە:

(ئێمەلەبەر خودا تەرێزمان لەوان (لەگرۆی فەیلەسوفەكان –وەرگێڕ)كرد، دەربەدەرمان كردن وەك چۆن دەبەنگان دەربەدەر دەكرێن.لەبەر خودا ئەوانمان بوغزاند، وەك چۆن لەبەر خوداش بڕوادارانمان خۆش دەوێت... تاكو دەڵێت:

وریابن لەو گرۆهەلەسەر ئیمانتان وەك چۆن وریان لەبەرانبەر ژاریٚ بچێتە نێو گیانتان. هەرکەس کتێبێکی ئەوانەی پێوە ببینریٚ، سزاکەی ئەو ئاگرەیە کەدارو دەستەکەیی پیٚ ئەشکەنجە دەدریٚت، سەرەنجامی دانەرو خوێنەرەکەیشی هەربەرەو ئاور دەبیٚ... هتد) (٢٠)ئەم پەخشنامەیە ئەو کەش و هەوا فیکریەمان بۆرون دەکاتەوە کەلەو سەردەمەدا بەسەر کۆمەڵگەی مەغریبی داولەبەرانبەر فەلسەفەدا زاڵ دەست بوو.هەروەها ئەو کۆتاییەشمان بۆ وێنا دەکات کەفەلسەفە لەمەغریب دابەتایبەت ولەئیسلامیش دابەگشتی، پێی گەشت.

## پادشای فەیلەسوف:

ئەفلاتۆن بڕوای وابوو، کۆمەڵگە چاکسازی ناکرێت و ناگاتە کامەرانی تەواو، مەگەر پادشایەکیفەیلەسوف جڵەوەکەی بگرێت. زۆرینەی فەیلەسوفە کۆنەکانیش هەمان ڕایان دووپات کردۆتەوە. ڕەنگە ویستبێتیان خۆیان ببنە دەستەڵات دار لەجێگەی ئەو پادشادا (نەفام و دەبەنگ)انە.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە ئیبن خەلدون ڕایەکی تەواو پێچەوانە بەو بۆچونەی هێنایە ئاراوە. ئەو بڕوای وایە یەکێك لەپێداویستی یەکانی بەزەیی هاتنەوە بە مسکێنان دا ئەوەیە دەستەڵات دار لەئاستی بیرکردنەوەی جەماوەرەکەدا بێت. ئیبن خەلدون دەڵێت ئەگەر دەستەڵات دار زۆر زیرەك بوو، ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی لەسەروی توانای بەردەستەکانەوە فەرمانیان بەسەردا بدات و شتانێکیان بەسەر دا بسەپێنێت کەلەتەك سروشتیان دا وێك نەیەتەوە. ئەمەش لەبەر (بیرتیژی ئەو وپەی بردنی بەپشتی ئەوەی ئەوان دەرکی پێ ناکەن..... (٣١)ئیبن خەلدون لەم بۆچونەی دا پشت بەو فەرمودەیە دەبەستێت کەدەفەرمێت: (سیروا علی سیر اضعفکم)وەڕێی لاوازترینتان دا ڕێ بکەن.هەروەها چیرۆکی لەسەر لابردنی (زیادی کوڕی ئەبو سوفیان)بەبەڵگە دێنێتەوە. ئەوەبوو کاتێ عومەری کوڕی خەتاب پۆستی والێتی عێراقی لەزیاد وەگرتەوە. زیاد پرسیاری لەهۆکاری لەکار لادانەکەیکرد: ئایا بەهۆی نەتوانایییەوە یە یاخود بەهۆی ناپاکیەوە؟ عومەر گوتی)لەبەر هیچکام لەودوانە نیە بەڵامێکم حەزناکەم فەزڵی ئەقڵت بدەم بەسەر خەڵك دا) (٣٢)ئەم ڕایەی ئیبن خەلدون هێناویەتیە کایەوە، لەهەندێ ڕووەوە لە (ورایە- وەرگێڕ)دەچێت کەدیموکراسیەتی نوێ بڕوای پێ یەتی؟چونکە هەڵبژاردن کەبەهۆیەوە دەستەڵات دار دەست نیشان دەکرێت، بەزۆری پشت بەوخەسڵەتانە

دەبەستێت کە پالێوراوێ لای جەماوەر خۆشەویست دەکەن. ئەمەش نزیکە لەچەمکی (ڕوباری شێتی)یەوە کەلەبەردا باسمان لێوەکرد. ئەگەر ژێردەستەکان شێت بوون پێویستە دەستەلات داریش وەکو ئەوان شێت بێت. ئەگەر وانەبێت ناتوانێت ئەوەی ئەوان دەیانەوێت وپێی شادومان دەبن بۆیان فەراهەم بێنێ.

ئیبن خەلدون دەڵێت: (بزانە! بەرژەوەندی ژێردەستان لەسوڵتان ودەستەلات داردا لەخودی دەستەلات دارەکەو جوانی ڕوخساری وباهوی دانیە... بەڵکو بەرژەوەندی ئەوان لەوەدایە کەسوڵتان بۆیانی ئیزافە دەکات... . (٢٣)

## پوختەگیریەکی کۆتایی گشتی:

کاتێ بەشێوەیەکی گشتی لەدیرۆکی هزری مرۆڤایەتی دەکۆڵینەوە، دووبازی سەرەکی تێدا دەبینین: یەکەمیان ئەوبازە فەلسەفیەیە کەئیغریقیەکۆنەکان هاوێشتیان.دووەمیان ئەو بازە زانستی یە مۆدێرنەیە کە گالیۆوبیکۆن دەستیان پێکردو دواتر ئەم کەلەپورە زەبەلاحە فیکریەی بۆ ئێمە بەرهەم هێنا. لەبەشەکانی پێشوی ئەم پەڕاوەدا دیتمان چۆن بازی ئیغریقی‌یەکان شۆڕشێ بوو بەسەر ئەو بیرکردنەوە ئەفسانەییەی کەبەسەر هزری خەڵك دا زاڵ بوو. وەلێ ئەم بازە، ناتەواویەکەی لەناوخۆی دا بوو.ناتەواویەکەیشی ئەوە بوو هزرەکانی ئاراستەکرد بەرەو شێوازێکی ئایدیایی بڵندوهیچ گوێی بەبویەری ژیان نەدەدا.

کەواتە بیری ئادەمیزاد پێویستی بە بازێکی ترهەبوو تاکوپاڵی پێوە بنێت بەرەو گرنگی دان بە (بویەر)لەبری بایەخ دان بەجیهانی ئایدیا. دەبوائەم بازەیان لەنێو کەلتوری ئیسلامی دا بهاتایەتە گۆڕێ، لەپاش ئەوەی لۆژیکی ئیگریکی لەنێو ئەو کەلتورەدا بڵاو بویەوە. ئێمە تێبینی نۆبەرەو ئاماژەکانی ئەو بازەمان کرد لە (جاحف وئیبن هەیسەم وغەزالی و ئیبن تەیمیە و...هتد)دا.

سەرجەم ئەو ئامازانەش بەشێوەیەکی ڕون لەلای ئیبن خەلدون کۆبونەوە.وەلێ کەلتوری ئیسلامی لەدوای ئیبن خەلدون لەگەشەو نەش ونما بەردەوام نەبوو.بۆیە بازدانەکەش لەو ئاستەناتەواوەدا ڕاوەستا.

لەوکاتەدا ئەوروپا جێنگڵی دەدا بۆئەوەی لەباری مت بون وخەوە قوڵەکەی وەئاگابێتەوە. تائەودەمەش ئەوروپا لەژێر کۆنترۆڵی ڕەوتی ئیغریقی دابوو.

لەبەرئەوە ڕێبەرانی ڕەوتی زانستی نوێ، پێویستیان بەوە بوو سەرلەنوێ خەبات بکەنەوە. هەرئەمەش وای لەئێمە کردوە وێکچونێکی گەورە بەدی بکەین

لەنێوان ئەدگارەکانی بازەفیکریەکەی ئەوان و ئەو (هەوڵانە —وەرگێڕ)ی‌کلای ڕێبەرەموسوڵمانەکان دیتمان.

لەڕاستی دائەو لێکچونەی ئێمە تێبینی دەکەین بۆ نمونە لەنێوان (غەزالی وکانت)دا یاخود لەنێوان (ئیبن تەیمیە وبیکۆن)دا یان لەنێوان (ئیبن خەلدون وزانایانی کۆمەڵناسی نوێ)دا. شتێك نیە لەڕیزی ڕێکەوتە دەگمەنەکان بژمێردرێت. بەڵکو یەکێك لەو ئاتاجانەیە کەسروشتی ئەو بازە خوازیاریەتی کەهەریەك لەوڕێبەرانە هەوڵیان داوە بیهاوێژن.

## پەراوێزەکانی بەشی دەیەم

١) احمد امين، ضحى الأسلام، قاهيره ١٩٤٣، ج ٣، ل ١٥٢.

٢) هـ، س، ج ٢، ل ١٨٨.

٣) هـ، س، ج ٢، ل ١٨٩.

٤) هـ، س، ج ٢، ل ١٩٩.

٥) هـ، س، ج ٢، ل ٢٠١.

٦) عباس محمود العقاد، الشيخ الرئيس ابن سينا، قاهيره ١٩٤٦، ل ١١.

٧) دى بور، تاريخ الفلسفة في الأسلام، قاهيره، ١٩٣٧، ل ١٩٤- ١٩٥.

8) A literary History of persian ،Browne. (Y. N 1902)p.p 1. 408.

٩) دى بور، تاريخ الفلسفة في الأسلام، ل ٢٢٨.

١٠) ابو حامد الغزالى، الجام العوام من علم الكلام، (گباعه المنيريه)ل ١٢- ١٣.

11) Margoliouth ،The Earth Development of Mohammedanism (N.Y.1914) ،P.176.

١٢) بنوارە پەرتوکی (خەونەکان لەنێوان زانست و بیروباوەڕدا) نوسینی نوسەری ئەم دێڕانە، ل ٢٥ – ٢٧. ئەو پەرتوکەش لەلایەن وەرگێڕی ئەم پەرتوکەوە کراوەتە کوردی....وەرگێڕ.

١٣) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربي)، ل ١٠٧٤ – ١٠٧٥.

١٤) عثمان امين، شخصيات ومذاهب فلسفية، قاهيره، ١٩٤٥، ل ٣٧٠.

15)Macdonald ،The Development of Muslim Theology. (N.Y1903)p.250.

١٦)محمد غلاب، الفلسفة الأسلامية في المغرب، قاهيره، ل ٨٢ -٩٢.

١٧) دى بور، تاريخ الفلسفة في الأسلام، ل ٢٦٧ – ٢٧٧.

١٨) هـ، س، ل ٢٥٠ – ٢٥١.

١٩)عبدالرحمن غنوم، ابن رشد بين الدين و الفلسفه، تەرابلوس، ل ٢٥.

٢٠) هـ، س، ل ٢٥.

٢١) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربي) ل ٩٠٨ — ٩٢١.

٢٢) مقدمه ابن خلدون، (طبعة المكتبة التجارية) ل ٥٨١.

٢٣) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربي) ل ٦٩٢ — ٦٩٣.

٢٤) هـ، س، ل ١١٨ — ١١٩.

٢٥) مجله الفكر التونسيه، مارس ١٩٦١، ل ٢.

٢٦) مقدمه ابن خلدون، (المطبعة الأدبية — بيروت) ل ٤٩٦.

٢٧)) مقدمه ابن خلدون، (طبعة المكتبة التجارية)ل ٥١٩.

28)Harold Titus ،Living Issuse in philosophy، (U.S.A 1946)P. 8.

٢٩) عبدالرحمن بدوى، مؤلفات ابن خلدون، ل ٦٧ -٧٠.

٣٠) محمد غلاب، الفلسفة الأسلامية في المغرب، ل ٦٣ - ٦٦.

٣١) مقدمه ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربي) ل ٥١٥.

٣٢)هـ، س، ل ٥١٥ — ٥١٦.

٣٣) هـ، س، ل ٥١٤.

# بەشی یازدەهەم

## (ئاکارو تیتور)

پاش ئەوەی لەڕوە جیاجیاکانەوە لەبارەی تیۆرەکەی ئیبن خەلدونەوە دواین. لەم کۆتاییەدا پێم باشە کەمێکیش لەبارەی ئاکاری شەخسی ئیبن خەلدون وپەیوەندی ئەو ئاکارەش بەتیۆرە کۆمەڵایەتیەکەیەوە بدوێین.

لەژیانی ئیبن خەلدوندا ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێت، نەخاسمە لەوماوەیەدا کەسەرقاڵ بوو بەسیاسەتەوە، ئەوەیە کەئەو ژیانەی خاڵی نەبوە لەخوڵقاندنی ناهەقی و دوڕویی و هەل پەرستی. ئەمەش مەسەلەیەکە خەریکە زۆرینەی توێژەران لەسەری کۆك وکۆبن. ئیبن خەلدون بەوە ناسراوە کەدۆستایەتی وی لەسەر شتێ سەقامگیر نەبوەو زۆر جاریش مەرامیی کردوە بۆ ئەوکەسەی کەچاوەڕوانی کردوە سودێکی لێوە دەست بکەوێت ولەبەرانبەر ئەو کەسەدا نیشانەگەلی دڵسۆزی وئامۆژگاری دەربڕیوە. کەچی هەرئەوەندەی ئەو کەسەی بەشکست خواردویی دیبێ، پشتی تێکردوەو ڕوی کردۆتە دوژمنەسەرکەوتوەکەی و دەستی کردۆتە مەرامی بۆ کردنی وەك چۆن لەبەردا بۆئەوەی تریشی کردبوو.

وادەردەکەوێ، زۆر زۆر حەزی بەپلەو پایەو دەستەڵات کردوە. تەنانەت گوێی نەداوە بەوەی لەپێناوی گەشتن بەدەستەڵات دا هەموو بنەما ڕەوشتیەکان پێشێل بکات. من وادەزانم لەو ڕودوە بۆماوەیەکی درێژ ئالودە بوبێ بەدەستی گرێیەکی دەرونی تێك شکێنەرەوە. گومانی تێدا نیەئەو گرێ یە لەدوای نوسینی (مقدمه)لاوازبوە. بەڵام بەتەواوی بنەبڕنەبوە.بەڵکو تاکو کۆتا ڕۆژی تەمەنی کەم تازۆرێك بەدەست ئەو گرێ یەوە ئاڵاندویەتی.

ئیبن خەلدون ڕوخسار جوان و زمان لوس وقسەزان بوە.سەرباری ئەوەش لێهاتوییەکی دبلۆماسیانەی نایابی هەبوە. چاکی زانیوە چۆن لەگەڵ پادشایان دا هەڵس و کەوت بکات و جێگەی خۆی لەدڵیاندا بکاتەوە. ڕەنگە هەرئەمەش

وایکردبێ پادشاکان هەوڵ بدەن لەخۆیانی نێزیك بکەنەوە، هەرچەندە بەکەم ئەمەکیش ناسراو بووە.

هەرچۆن بێت، ئیبن خەلدون لەمەغریب دا ناوبانگی لەکەدار بوو.بۆیە کاتێ چوە میسرو پۆستی (دادوەر)ی میسری وەرگرت، خەڵکی مەغریب سەرسام بوون وبەوهۆیەشەوە تۆمەتی (کەمزانستی)یان دایە پاڵ میسریەکان. تەنانەت (ابن عرفە)کاتێ دەچێتە حەج دەڵێت:

(ئێمە دادوەریمان لەسەروی زۆربەی پۆستەکانەوە دادەنا.بەڵام کاتێ بیستمان ئیبن خەلدون پۆستی دادوەری وەرگرتوە ئیتڕنەو پۆستەشمان بەپێچەوانەوەی یەکەم جارەوە دانا) (١)لەمیسریشدا ناحەزانێکی زۆرلەبەرانبەر ئیبن خەلدوندا بەدەرکەوتن و هەندێ تۆمەتی ڕەوشتییان دایە پاڵی. تۆمەتەکانیشی زیاتر ئەوەبوو دەیان گوت ئەو کابرایە زۆر گوێ دەشنەوێ بۆ ژنە گۆرانی بێژەکان و لەگەڵ نەوجوانانیش دا زۆر تێکەڵ دەبێ و... کەیفیشی بەدانیشتنی گوێ دەریا دێ (٢)هەروەها تۆمەتی ئەوەشیان دایە پاڵی کەلەکاتێکدا لەپۆستی دادوەری دایە زۆر توندوتیژە لەبەرانبەر خەڵك داوبێ دادی یان بەرانبەر دەنوێنێ. وەڵێ هەرکە لەوپۆستەلادەبرێ دەبێتە مرۆڤێکیتر، لەگەڵ خەلکی دا نەرمی ودۆستایەتی دەنوێنێت ولەئاقاریان دا خۆبەکەم دەگرێ.

(بەشیتی) لەوبارەیەوە لەمەڕ ئیبن خەلدون دەڵێت: (زۆر بێ دادی بەرانبەر بەخەڵك دەنوێنێ. تەنها لەوکاتەدا کەلەسەر پۆستەکەی لادەبرێ تێکەڵاوی کردن لەتەکی دا خۆشە. ئەمما هەرکاتێ پۆستی وەرگرت، توندوتیژی ونەزاندویی بەسەر دا زاڵ دەبێت، مامەڵەو هەڵس وکەوتی لەگەڵدا ناکرێ، بەڵکو پێویستە هەرنەش بینرێ) (٣)ئەم تۆمەتانە ڕەنگە درۆبن و دژەکانی ئیبن خەلدون دروستیان کردبێ یان زیادەڕەوی یان تێدا کردبێ.بەڵام تێبینی دەکەین یەکێك لەوکەسانەی باسیان لەو تۆمەتانە کردودو بڕوایان پێی هەبوە (ابن حەجەری عەسقەلانی)یە. ئەم پیاوەبەیەکێك لەپیاوە متمانەدارەکانی نێو فەرمودە ناسەکان دەژمێردرێ. یەکێکیشە لەوکەسانەی کەهاوسەردەمی ئیبن

خەلدون بوە. (ئیبن حەجەر)سەرباری ئەوەی حەزی بەسەرکۆنەکردنی ئیبن خەلدون کردوەو باسی لەخراپەکانی کردوە، کەچی لەڕویەکی تریشەوە لەبارەی ئیبن خەلدونەوە دەڵێت: (هەرگیز لەپۆستەکانیدا جگەلەتوندوتۆڵی وگورج وگۆڵی ودامەزراوی بەهیچی دیکەنەناسراوە).

لەمەوە دەتوانم بگەمەئەوبەرەنجامەی کەئیبن خەلدون یەکێك بووە لەوخەڵکانەی کەحەزیان لەپارەوپول نەبووە، بەڵکو حەزیان لەپلەوپایەبووە. چونکەسەرەڕێی ئەوهەموو خراپیەی‌کەدژەکانی لێی دەگێڕنەوە، نەیان توانیوە بە (بەرتیل خۆر)تۆمەتباری بکەن لەوکاتەدا کەلەپۆستی دادوەری‌دا بووە. وادەردەکەوێ بۆیە حەزی لەپۆستی دادوەری کردوە، چونکە ئەو پۆستە دەستەڵات و هەژمونی تێدا بووە.

ڕەنگە لەمیسردا شەرەمەزاتیشی "دەربڕینی وەرگێڕ" لەسەر پۆستی دادوەری کردبێ، وەك چۆن لەمەغریب دا لەسەر پۆستی (میرایەتی)دەیکرد. چونکە لەهەردوو پۆستەکەدا تێر بونی ئارەزووەکانی بۆدەستەڵات بەدی دەکر. لێرەوەیە کەدەبینین هەرکات پۆستی وەرگرتبێ کەپۆی بەرزکردۆتەوەدو، هەرگا لەسەر کارێکیش لادرابێ و لەپۆستەکەی‌لابرابێ، ملی کەچ کردوەو بەبچوك خۆی نیشان داوە.

دەگونجێت بگوترێت، ئەمە سروشتی هەموو ئەوکەسانەیە کە پلەو پایە بەپێوەری مەزنێتی مرۆڤ دادەنێن. بۆیە هەرکاتێ پلەوپایەیان دەست کەوت هەست بەبەرزێتی دەکەن وئیدی خۆیان بەگەورە سەیردەکەن. کەلەدەستیشیان دەردەچێت هەست بەکەمی دەکەن و بچوکی دەنوێنن. تێبینی دەکرێ ئەو جۆرەکەسانە لەکاتێکیشدا کەلەدەستەڵات دان بێ پەروان لەخۆ بەگچکە نیشاندان و مەرامی کردن لەبەردەم ئەوکەسانەدا کەلەپلەی باڵاتردان. وەك چۆن لەبەرانبەر لەخۆیان خوارتردا گەورەیی دەنوێنن، ئاوهاش لەبەرانبەر لەخۆیان بڵندتردا بچوکی نیشان دەدەن.ئێمە نمونەی ئەوجۆرە کەسانەمان زۆر دیتوە. چ لەسەردەمی خۆماندا یاخود لەهەموو سەردەمەکانی تردا.

## نمونەیەك لەئاکاری ئیبن خەلدون:

مێژوو نمونەیەك لەشێوازی مەرامی کردنی ئیبن خەلدونی بۆمیروپادشاکان بۆ پاراستوین، ئەم نمونەیەش دوژمنەکانی ئیبن خەلدون نەیان گێڕاوەتەوە، بەڵکو ئیبن خەلدون خۆی لەکتێبی (التعریف)دا باسی دەکات. لەکاتێکدا چۆنێتی چاوپێکەوتنی بە (تەیموری لەنگ)لەدەرەوەی شوراکانی دیمەشق داولەسالی (٨٠٢ ك)دادەگێڕێتەوە.

پوختە بەسەرهاتەکەش ئەوەیە، لەشکرو ئۆردوی تەیموری لەنگ ئابلۆقەی دیمەشقی دا، تاکو یان بەتۆبزی یاخود بەڕێکەوتن ئەو شارە بگرێت. ئیبن خەلدونیش لەوکاتەدا لەدیمەشق دا دەبێت. زۆردەترسێ لەوەی شارەکە بکەوێتە دەستی تەیموری لەنگەوەو چارەنوسی ئەمیش کوشتن یاخود سوکایەتی بێت.بۆیە حەزی سەردڕۆیی لەناخی دا زاڵ بوو. خۆی گەیاندە شوراکان و بەگوریسێك خۆی شۆڕ کردەوە بەویوداو گەشتە سوپاکەو داوای چاوپێکەوتنی (تەیموری لەنگ)کرد.

ئیبن خەلدون دەڵێت : لەبەر ئەو ترسەی کەتیای دا بووم، هاتە دڵمەوە دانوستانێکی لەگەڵدا بکەم کەئەو پێی بحەوێتەوەو بەوهۆیەشەوە بمگرێتە لای خۆی. بۆیە ڕوی‌قسەم تێکردو گوتم : خودا بەرخوردارت کات.ئەمڕۆبەتەمەن سیی یان چل ساڵە وەدەخوازم چاوم پێت بکەوێت. عبدالجبار (کەوەرگێڕی بوو)گوتی: بۆچی؟وتم: لەبەر دووهۆ. یەکەمیان تۆدەستەڵاتداری جیهانیت، پادشای سەرزەویت، بڕواشم نیە لەسەردەمی ئادەمەوە تائێستاکە پادشایەکی وەکو تۆ لەنێومەردومدا دەرکەوتبێ.منیش لەوکەسانەنیم کەقسان بەبێ‌بەلگەوبێ بناغە دەکەن.بەلکو من ئەهلی زانست وزانیاریم. ڕاستی ئەم قسەیەش ئاوها ڕوون دەکەمەوەدەڵێم...).

ئینجا ئیبن خەلدون دەست دەکاتەشیکردنەوەی ئەودوومەسەلەیەی کەئاماژەی پێداون.لەیەکەمیاندا باس لەوە دەکات کەچۆن دەوڵەتەکان بەبێ دەمارگیری دروست نابن و، بەگوێرەی زەوەندی دەمارگیریش پلەوڕێزوشکۆی دەوڵەتەکان دیاریدەکرێت. ئیبن خەلدون بەوپەیڤانەی دمیەوێت بەڵگە بۆ (تەیموری لەنگ)بێنێتەوە گوایە یەکێکە لە پادشا هەرەمەزنەکانی سەرزەمین.چونکە ئەوگرۆ ودەمارگیریەی لەپشتیەوەیە گەورەترین گرۆو دەمارگیریە لەسەر ڕوی زەمیندا. پاشان ئیبن خەلدون واخول دەکاتەوە بەلای مەسەلەی دووەمدا و باس لەوقسانە دەکات کەلەسەر زمانی ئەستێرەناسەکان وپیرانی سۆفیگەر بیستونی وباس لەنزیك بونەوەی وادەی بەدەرکەوتنیئەو شۆڕشگێڕە مەزنەدەکەن کەدەست بەسەر زۆرینەی سەرزەویدا دەگرێت. دواترئیبن خەلدون باسی ئەوەی بۆدەکات کەخەسڵەتەکانی ئەو شۆڕش گێڕە مەزنە بەتەواوی لەگەڵ سیفەتەکانی تەیموری لەنگ دا یەك دەگرنەوە. (٤)

هەرسەبارەت بەهەڤدیتنی ئیبن خەلدون لەگەڵ تەیموری لەنگ دا ڕیوایەتێکی تریش هەیەکە (ئەحمەدبن عەرەبشا)لەکتێبەکەی دا (عجائب المقدور فی نوائب تیمور)دەی گێڕێتەوە.ئەم ڕیوایەتە جیاوازە لەوەی کە ئیبن خەلدون خۆی دەی گێڕتەوە. گومانیش وایە ڕیوایەتەکەی (عەرەبشا)دەربارەی چاوپێکەوتنی دووەم بێت کەئیبن خەلدون بەهاوبەشی کۆمەڵێك لەشەرعناسەکانی دیمەشق دەچنەلای تەیموری لەنگ تاکو لەمەڕ بەدەستەوەدانی شارەکە وتوێژی لەگەڵ دا بکەن. عەرەبشا دەڵێت: تەیموری لەنگ فەرمانی دا خوانیان بۆ سازبکەن. سفرەی پڕلە ولەمەگۆشتیان لەبەردەم دا دانرا "دەربڕینی وەرگێڕ".

هەندێکیان بۆ دەربڕینی (جۆری لەئەدەب-وەرگێڕ)لەخواردنەکەیان نەخوارد.هەندێکی تریشیان سەرقاڵی گفتوگۆکردن بوون لەبارەیەوە. تاقمێکی تریان بەهەڵپە خەریکی خواردن بوون. ئیبن خەلدون یەکێك بوو لەبخۆرەکان.

ئیبن خەلدون ئەم هەڵەی قۆستەوەو بەدەنگی بڵند هاواری کرد : ئەی ئەمیری مەولامان!!.سوپاس بۆ خوای بەرزی مەزن. بەڕاستی من پێشتریش شەرافەتمەند بوم بەئامادە بوونم لای زۆرێك لەپادشایانی تریجیهان، بەمێژوەکەم ڕۆژوە مردوەکانیانم بۆ زیندو کردنەوە.لەپاشایانی مەغریب فلآن وفلآنم دیتوە، ڕۆژ هەلآت و ڕۆژئاوای دنیام دیوە.لەهەرپارچەیەکی سەرزەوی دا تێکەلآوی ئەمیرو گەورەکانیان بووم.بەلآم خوادا منەتی ناوەتەسەرم کەڕۆژگارەکانی تەمەنی درێژکردومەوە، خودا منەت باری کردم بەوەی کەژیاندمی، تاکو ئەو کەسەم بینی کەپادشایە لەسەر هەقیقەت... تاکو دەڵێت: خۆراکی هەموو پادشاکان دەخورێ بۆ ئەوەی خراپ وشپرز نەبێت وەلێ خۆراکی ئەمیری مەولامان بۆئەوەش دەخورێت و بۆبەدەست هێنانی شانازی وسەربەرزیش)!!

(ئیبن عەرەبشا)دەڵێت : تەیمور بەوە لەسەرسامیدا دەلەرزی وسەمای بۆدەکرد. پاشان پرسیاری پادشایانی مەغریب و هەواڵی ئەوی لێکرد.پرسیاری دەوڵەت و ئاسەوارەکانی مەغریبی لێکرد. ئەویش هێندەی بۆ گێڕایەوە تاکو ئاوەزی ئەوی فریو داو سەرسامی کرد...) (٥)

ئیبن خەلدون باسی ئەوەمان بۆ دەکات کەچۆن بوەتەجێگەی گرنگی پێدانی تەیموری لەنگ و ماوەی (٣٥)ڕۆژ لەمیوانداری خۆی دا هێشتویەتیەوە. واتە هەموو ئەو ماوەیەی کەلەدیمەشقدا ماوەتەوە بەرلەوەی بگەڕێتەوە بۆ میسر. هەرلەو ماوەیەدا ولەسەرداواکاری تەیموری لەنگ سیپارەیەکی سەبارەت بەجوگرافیای مەغریب نوسیوە، گومانیش لەسەر ئەوەیە تەیموری لەنگ ویستویەتی وڵاتەکانی مەغریبیش داگیر بکات بۆیە مەبەستی بوە پێش وەخت شارەزای جوگرافیای ناوچەکە بێت. ئیبن خەلدون سیپارەکەی لەدوانزە نامیلکەدا تەواوکردوەو پێشکەشی تەیموری کردوە. ئەویش بەڕۆڵی خۆی فەرمانی کردوەبەرچڤەی بکەنەسەرزمانی مەغۆلی.

دواتر ئیبن خەلدون حەزی کردوە دیاری یەکی تر پێشکەشی تەیموری لەنگ بکات، تاکو زیاتر شەنسی لەلای بکرێتەوە. ئەوە بوو لەبازاڕی دیمەشق، قورئانێکی قەشەنگ و بەرماڵێکی ڕازاوەو ڕونوسێك لەقەسیدەی (بوردە)وچوارپاکەت شیرینی نایابی میسریی کڕی و پێشکەشی تەیموری کرد، ئەویش زۆر بەباشی وەری گرت و شادومانی خۆیی دەربڕی.

شیاوی باسکردنە دیمەشق لەوکاتەدا خۆی دابوە دەست تەیمورەوە تاڵان و سوتانی تێدا بڵاو ببویەوە.ئاگر لەهەموو لایەکی ئەوشارە بەربببوو، تاگەشتە مزگەوتی ئەمەوی و قوڕقوشمەکەی چۆڕایە خوارێ و دیوارو بانەکەیشی ڕوخا. بەڕادەیەك دۆخەکە گەشتە ئەو پەڕی لەترسناکی وقێزەونی دا –بەپێی دەربڕینی ئیبن خەلدون. (٦)

## ڕۆژگارەکانی لاوێتی:

ئەو نمونەیەی باسمان کرد، وێنەیەکی ڕونی ئاکاری ئیبن خەلدونمان دەداتێ وتەڕ دەستی ولێزانی ئەومان بۆ دەردەخات لەدوڕویی و مەرامی کردندا. سەیریش لەوەدایە کاتێ ئەوەی کردوە تەمەنی لەحەفتاسالی بەرەو ژوربۆتەوە. ئینجا ئێمە لەبەشێکی پێشوتردا ئاماژەمان بەوەدا کەئەو لەدوای نوسینی (مقدمە)دوە ئاکارو ڕەفتاری خۆیی گۆڕی، ڕوی کردە سەرقاڵ بون بەزانست و زانیاری لەبری سەرقاڵ بون بەسیاسەتەوە. لێرەدا دەپرسین: ئەگەر ئاکاری ئیبن خەلدون ئاوها بوبێت لەدوای ئەوەی ڕەفتاری خۆی گۆڕیوەو گەشتۆتە تەمەنی حەفتاسالی، ئەدی هەیاران "دەربڕینی وەرگێڕ" ئەبێ ڕەفتاری لەکاتێکدا چۆن بوبێت کەگەنج بودو حەزی لەسیاسەت کردوە لەو پێناوەدا بەگەرمی تێکۆشاوە؟.

د.علی عبدلواحد وافی، لەبارەی سەردەمی لاوێتی ئیبن خەلدون دەڵێت: (لەوسەردەمی لاوێتی یەی دا هەستێکی دزێو لای ئیبن خەلدون هێزی پەیدا کرد، ئەو بۆخۆیشی وێنای ئەو هەستەدەکات وهەوڵ نادات بیشارێتەوە، هەرچەندە پاساویشی بۆ دەهێنێتەوە. هەستەکەش بریتی یە لەهەل قۆستنەوە بەهەرشێوازێك و، هەوڵ دان بۆگەشتنە ئامانج لەهەرڕێگەیەکەوە بێت. تەنانەت لەو پێناوی گەشتن بەسودو ئامانجەتایبەتیەکانیدا، سڵی نەکردۆتەوە لەوەی خراپە بەوکەسانە بگەیەنێت کەچاکەیان لەگەڵدا کردوە. پلان دانێ لەدژی ئەوانەی فەزڵ وڕێزیان بەسەردا ڕشتوە... ئەم هەستەش بەبەردەوامی بوەتە سەرقافڵەی سەرەڕۆییەسیاسیەکانی و پەیوەندی وی بەپادشاو میرەکانەوە لەوکاتەوە کەپەیوەندی کردوە بەفەرمانبەرکیەکانی دەوڵەتەوە تاکو ئەوکاتەی کەمردوە) (٧)

مامۆستا (محمد عەبدولا عەدنان)دەربارەی هەڵس و کەوتی ئیبن خەلدون لەگەڵ یەکێك لەپادشاکاندا دەڵێت: (هەڵس وکەوتی لەگەڵ سوڵتان ئەبی عەدنان دا شتێکی ناشیرین و خراپ بوو، ڕەفتاری بووکەلەهەوەس و ئارەزوی دزێوەوە هەڵقوڵا بوو.ئەمەش بەرەنجامی هەڵەیەکی کاتی نەبوو، بەڵکو بەپێچەوانەوە، نیشانەی هەستێکی قوڵی نێو دەرونی بوو، بەرهەمی باوەڕێکی بنج داکوتاو بوو. ئیبن خەلدون پیاوی (هەل-دەرفەت) ەکان بوو. بەهەرشێوەو شێوازێ بوبێ دەرفەتەکانی دەقۆستەوە.ئامانج لای ئەو دەبوەپاساودەری هەمووجۆرە ئامرازێ. لەمەدا سڵی نەدەکردەوە لەوەی پاداشتی چاکەبەخراپە بداتەوە. ئینجا بۆ خۆیشی ڕاشکاوە لەوێناکردنی ئەو هەستەداو هەوڵ نادات بیشارێتەوە...) (٨)

## بۆچونێکی هەڵە:

هەندێ لەوکەسانەی سەرسامن بەئیبن خەلدون، هەوڵ دەدەن دوری بخەنەوەو پاکی بکەنەوە لەمۆرکی دورویی و مەرامی کردن. وەك ئەوەی نەتوانن قەناعەت بەوە بکەن هزرڤانێکی مەزنی وەکو ئیبن خەلدون لەڕەفتاری دا لەسەر ئەو شێوازە دزێوە ڕێی کردبێ.ڕەنگە وابزانن گەرپیاوێ لەبیرکردنەوەی دا مەزن بێت، پێویستە لەڕەفتاریشی داگەورە بێت. ئەم بۆچونە ناسازەلەگەڵ ئەوەی زانستی نوێ لەمەسەلەی پێکهاتنی کەسایەتی مرۆڤ وپەیوەندی نێوان ڕەفتارو بیرکردنەوەدا بڕوای پێ یەتی. دەگونجێ مرۆڤێ لەڕوی بیرکردنەوەوە زۆر گەورەبێت، لەهەمان کاتیش دا لەڕوی ئاکارەوە زۆر داڕوخاو بێت.

لەبەردا فەیلەسوفانی کۆن دەیان گوت ڕەفتار بەئەنجامی بیرکردنەوەیە. تاچەندەبیرکردنەوەی مرۆڤ ڕاست بێت ئەوەندەش ئاکاری دروست دەبێت. بۆیە هەرگا مرۆڤێکیان بدیبا کەڕەوشت و ئاکاری نزم بوبێ، ئەوەیان تێدا دەگەڕاندەوە بۆ نەزانین و نەزۆکی بیرکردنەوە. ئەم ڕاوبۆچونە تائێستاکەش زاڵە بەسەر مێشکی زۆر کەسی دا.

هەنوکە ئێمە نامانەوێت تاوتوێی ئەو ڕایە بکەین وپوچەڵی بکەینەوە. تەنها ئەوەندە دەڵێین: پەیوەستەگیەکی پێویست لەئارادانیە لەنێوان ئەوەی مرۆڤ بیری لێدەکاتەوە لەتەك ئەو ڕەفتارەی دا کەبەکردەوە لێی دەبینرێ. هەندێ جار ڕەنگە ئەو دوانە لەمرۆڤێکدا وەك یەك بن.هەندێ جاری تریش وەك یەك نەبن وپێچەوانە نەبن. ناسازی ئەو دوو مەسەلەیە (بیرکردنەوەو ئاکار)لەزۆر گەورە هزرڤانی جیهاندا تێ بینی کراوە، وەك بیکۆن ورۆسۆو وایلد وگۆد.لێرەدا بەتایبەت ئاماژە دەدەین بەمامۆستا (گۆد). ئەو پیاوە یەکێك لەگەورە ترین هزرڤانانی ئەم چەرخەو سەرۆکایەتی بەشی فەلسەفەی زانکۆ لەندەنی دەکردو کۆمەڵێ دانراویشی هەیە کەشایستەی سەرسامی وڕێزن.

ماوەیەك لەمەوپێش مرد، لەدوای ئەوەی ڕیسواییەکی گەورەی لەسەر بڵاو بویەوە. ئەو کابرایە سەردڕێی پیرێتی وزانیاریەکەیشی، سواری (متیرۆ)دەبوو بێ ئەوەی پارە بدات. زۆرجار فڕوفێڵی دەکردلەو پێناوەدا بەخاتری چەند فلسێك. دوای ئەوەی فێڵەکەی ئاشکرا بوو دانی بەوەدا نا کەگرێ یەکی دەرونی هەیوە وپاڵی پێوە ناوەبەردەو ئەو کارە قێزەونە، بێ ئەوەی بزانێت چۆن چۆنی خۆی لێ ڕزگار بکات.

## بەرەوانیەکەی عەبدول قادر مەغریبی :

شێخ عەبدول قادر مەغریبی یەکێکە لەوکەسانەی سەرسامن بەئیبن خەلدون. هەوڵیشی داوە بەرەڤانی لەئیبن خەلدون بکات ودوری بخاتەوە لەمۆرکی دوڕویی و مەرامی کردن. کاتێ دێتە سەرباس کردنی هەڤپەیڤینەکەیئیبن خەلدون وتەیموری لەنگ، دەڵێت: ئەوکارەی ئیبن خەلدون لەو وەختەدا پێی هەستاوە لەڕوی سازش و دوڕوییەوە نەبوە. بەلکو لەپێناوی ڕزگار بون و بەرگری کردن بوە لەژیان. چونکە تەیموری لەنگ کابرایەکی دڵ ڕەق بوو، لەهەرکەس تورە بوایە سزاو ئەشکەنجەیەکی سەختی دەدا. (٩)

بەڕاستی ئەم پاساوەی شێخ عەبدولقادر بەئاسانی قبوڵ ناکرێ. چونکە شان بەشانی ئیبن خەلدون کۆمەڵێ شەرعناسی دیکەش لەو دیدارەدابوون، بەلام لەپێناوی بەرگری کردن لەژیانیان دا ئەو کارەیان نەکرد کەئیبن خەلدون کردی.ئێمەش کاتێ بڕیار لەسەر شتێ دەدەین کەبەهاوشێوەکانی دەیپێوین، وەك چۆن ئیبن خەلدون لێمانی دەخوازێت لەلێکۆڵینەوەی ڕوداوەکانی مێژوو پیاوەکانی دا وابکەین بەبێ گومان ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی ئەو بۆچونەی (مەغریبی)دا حوکم لەبارەی پیاوەکانەوە بدەین، ئەوا لەدنیادا هیچ کارێکی خراپە نامێنێتەوە وپیاوە دووڕووەکانیش دەبنە پیاوی بەڕێز.

مەغریبی وێنەیەکی جوان و گەشاوەی ئیبن خەلدونمان پێ دەبەخشێت. بەوەی کەئیبن خەلدون بەجەمالەدینی ئەفغانی دەچوێنێ. وای وەسف دەکات گوایە ئەویش وەکو ئەفغانی دڵ پاك بوەو ڕواڵەت و ناوەڕۆکی وەکو یەك وابووە. عەرەب پەروەرێکی سەخت گیر بوەو غیرەتی زۆر بوە بەرانبەر بەئاینەکەیی و دەستەڵاتی نەتەوەکەی. کاتێکیش دیویەتی ئەو دەستەڵاتە شیرازەی تێك چووە عەجەمەکان بەسەری دا زاڵ بوون. توشی جەخار بوەو بەجیهانی ئیسلامی دا

گەڕاوە، دەستی کردۆتە نوسین و لێکۆڵینەوەو خوێندن. دەستی کردۆتە ڕاتەکاندنی دەرونە دۆگمەکان. بەڵام هیچی دەست نەکەوتوە تەنها دەنگ دانەوەیەك نەبێ (وەك چۆن مرۆڤ هاوارێکی بەرز بەرەو کێفێ بکات کێوەکە دووبارە دەنگەکە دەداتەوە –وەرگێڕ)بەڵکو بەپشت تێکردن وڕەنجدانیش پێشوازی لێکراوە) (١٠)

من نازانم مەغریبی ئەو وێنە جوانەی ئیبن خەلدونی لەکوێندەرێ هێناوە. چونکە زۆرینەی ئەو دیکۆمێنت و بەڵگە مێژوییانەی کەلەبەر دەستمان دان پێچەوانەی ئەو وێنەیە نیشان دەدەن.دەکرێت بێژین ئیبن خەلدون وئەفغانی تەواو پێچەوانەی یەکتری بوون. لەبیرکردنەوەشدا ولەڕەفتاریش دا. ئەفغانیلەهەرتکە ڕوەکەوە کابرایەکی ئایدیایی بوو، ئەمە لەکاتێکدا ئیبن خەلدون لەهەردوکیان دا کەسێکی زۆر واقیع بین بوە، زیادەڕەویشی کردوە لەواقیعبینەکەیدا. ئەگەر ئەفغانی بیویستایە مەرامیی بۆ پادشاکان بکات وەك چۆن ئیبن خەلدون مەرامیی بۆ دەکردن، ڕەنگە ببوایەتە سەرۆك وەزیران لەکۆشکەکەی سوڵتان عبدالحمید دایاخود لەتەلارەکەی ناصرەدین شادا.

## کورت بینی:

ئیبن خەلدون لەڕەفتاریدا کورت بین بووە، وەك هەرکەسێکی ترلەمرۆڤە هەلپەرست و دووڕووەکان. هەوڵی دەدا سود لەئەمرۆ وەربگرێ کەتیای دا دەژیا، ئیتر گوێی بەوە نەدەدا سۆزی (سبەینێ)چی لەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە پێشێ.ئەوا کاتێ خۆی لەمیرەکان دەبردە پێشەوەو مەرامی دەکرد بۆیان، نەی دەزانی دێر بێ یان زوو ئەو نهێنی یەیەهەرئاشکرا دەبێ، ئەوجا خەلکی بڕواو متمانەیپێ ناکەن.بەکردەوەش وای بەسەر هات، ئەوە بوو لەناو خەلکی مەغریب دا ناوبانگی خراپی بڵاو بویەوە. هیچ چارەیەکیشی بۆ ئەو حاڵەتە نەدیتەوە ئەوەنەبێ لەمەغریب هەڵبێت و ڕوبکاتە وڵاتێکی ترکەخەلکەکەی هیچێکی وای لەبارەوە نەزانن. دەگونجێت لەم ڕوەوە ئیبن خەلدون بەبابای بازرگانی دەست بڕوفێڵباز بچوێنین.بازرگانیش دەتوانێت بۆ ماوەیەك دەستی خەلك ببڕێت و درۆیان لەگەڵ بکات، بەڵام ناتوانێت تاسەر لەسەر درۆو دەست بڕینی لەگەڵ ئەو خەلکەدا بەردەوام بێت. هەردەبێ مەسەلەکەی ئاشکرا بێت و بازاڕی نەمێنێت. ئەو کاتەش ناچاردەبێ بۆبازرازاڕێکی تر بگەڕێت.

ئەو گرێ یەی کەبەسەر ئیبن خەلدوندا زاڵ بوو، وای لێکردبوو نەتوانێت سەرنج بدات لەسەر ئەنجامی ڕەفتارەکانی. بەڵکو بەشێوەیەکی نەستی بەرەو ڕویان پاڵ دەنرا، وەك چۆن کابرای چاوچنۆك بەرەو پەزمەندە کردنی ماڵ و سامان پاڵ دەنرێ. ڕەنگە دوای ئەوەی کارلەکار دەترازێ ئەوجا بەخۆی بزانێ.

## خاڵێکی سەرنج ڕاکێش:

لەبارەی ئیبن خەلدونەوە خاڵێکی سەرنج ڕاکێش لەئارادایە، لەوانەیە بەهۆی ئەو خاڵەوە ئیبن خەلدون جیا ببێتەوە لەوکەسانەی خێوی گرێی دەرونین. ئەو جۆرە کەسانە لەنوسینەکانیاندا ئاسەواری گرێ دەرونەکانیان بەدی ناکرێ، زۆر جار بەکەسایەتیەکی دووجەمسەر دێنە بەرنیگا. بەجۆرێ بیردەکەنەوە و بەشێوازێکی تر ڕەفتار دەکەن. وەلێ ئیبن خەلدون بە پێچەوانە وەیە، ئاسەواری ڕەفتاری بەڕوونی لەسەر نوسینەکانی دەردەکەوێ، تەنانەت لەهەندێ ڕووەوە ئەو پێناسەیەی مەغریبی بەسەردا دەبڕێ کەگوتی: ڕواڵەت و ناوەرۆکی وەکو یەك وان. ئەوەتا دەبینین لەکتێبی (التعریف) دا بەڕاشکاویەکی سەیر، باسی ئەو کردەوە هەلپەرستانەی خۆیمان بۆدەکات کەلەسەردەمی لاوێتی دا کردونی، هیچ نایان شارێتەوەو پاساویشیان بۆ نادۆزێتەوە. دروست وەك ئەوەی ئەو کردەوانەی بەڕەفتار گەلێکی سروشتی زانیبێ کەهیچ پێویست بەشاردنەوە نەکەن.لە (مقدمە)شدا دەوێنین بەشێکی ناوناوە (سەبارەت بەوەی شادومانی وبەدەست هاوردن زۆر جار بۆ خەڵکانی مل کەچ ومەرامی کەرە و ئەوڕەفتارەش هۆکارێکی بەختەوەریە) (١١).

ئیبن خەلدون بەوەش دەست هەڵناگرێ، بەڵکو لەزۆر بەشی (مقدمە)دا دەبینین سەرکۆنەی بریندارکەرانە ئاراستەی مرۆڤە ئایدیاییە چەق بەستودکان دەکات.چونکە بەڕای وی، ئەو کەسانە لەگەڵ ڕەوتەکەدا ڕێ ناکەن و بەگوێرەی سروشتی کۆمەڵگەکەیان ناجوڵێنەوە. وام دێ بەخەیاڵدا، یەکێ لەو هۆکارانەی پاڵیان بەئیبن خەلدونەوە نابۆ داهێنانی تیۆرەکەی، ئەوە بوە کەویستویەتی بەئەفراندنی تیۆرەکە بەرگری لەخۆی بکات. یانی کەدیویەتی خەڵکی سەرزەنشتی دوو ڕوویيەکەی دەکەن ویستویەتی زانستێکی نوێ دابمەزرێنێ تاکو

لەمیانەی دا بێژێت: پێویستە خەلكیش بەو جۆرە ڕەفتاربكەن و ئەو خوە بگرن. چونكەئەو خوە لەتەك سروشتی ژیانی كۆمەلایەتی دا وێك دێتەوە.

ئیبن خەلدون لەزانستە تازەكەیدا كەسێكی واقیع بین بووە، بەجۆرێكی قەشەنگ و جوان وەسفی ئەو كۆمەلگەیەی بۆ كردوین كەتیایدا دەژیا.وەلێ لەو گەوشەنەدا نەوەستا بەلكو ئامۆژگاری مەردوم دەكات تاكو واقیع بینانە ڕەفتار بكەن ولەگەلێ تەوژمە كۆمەلایەتیەگەدا ڕێ بكەن، بەبێ ڕەچاوكردنی بنەما ڕەوشتی یەكان. بەدەربڕینێكی تر: دەیەوێت خەلكیش وەك خۆی هەلپەرست و دووڕوبن.

## بۆچونی وی سەبارەت بەشۆڕش:

لەپرسیشۆڕشدا پەیوەندی ڕەفتاریئیبن خەلدون لەتەك بیردۆزەکەی دابەشیوەیەکی ئاشکرا دەردەکەوێ.هەستیواقیع بینی وای لێکردوە لەبابەتی شۆڕشدا ڕێبازێ پێڕەو بکات کەلەزیادەڕەوی و نامۆیی خالی نەبێ.وەك دەردەکەوێ شۆڕشەکانی کردۆتە دوو بەشەوە : سەرکەوتوەکان و شکست خواردوەکان. بەئاشکرا دەست خۆشانە لەشۆڕشە سەرکەوتوەکان دەکات و نای شارێتەوە. هەرچی شۆڕشە شکست خواردوەکانیشە لەدیدی ئەودا زۆر جێگەی سەرکۆنەن. بۆیەبەشێوەیەکی سەخت گیرانە سەرکۆنەی شۆڕشە شکست خواردوەکان دەکات بەبێ ئەوەی گوێ بەوە بدات کەچەندە بنەمای چاك و نمونەی بالآیان تێدایە.

ئیبن خەلدون بە دەبەنگ یاخود چاوبەست لێکراو وەسفی شۆڕش گێڕە ژێرکەوتوەکان دەکات، پێی وایە ئەو شۆڕش گێڕانە پێویستە زۆر بەتوندی سزابدرێن یاخود چارەسەر بکرێن. ئەگەر لەڕیزی شێتەکانداbن پێویستە بەداودەرمان چارەسەر بکرێن. وەلێ ئەگەر ئاژاوەو ئاشوبیان لەکۆمەلگەدا پەرپاکرد ئەوا دەبێت سزابدرێن یان بەکوشتن یاخود بەشەللاق.هەندێك لەو شۆڕش گێڕانە پێویستە نوکتەی گالتە جاڕی یان لەسەر بلآو بکرێتەوەو لەڕیزی (سەفاعی)یەکاندا لەقەلەم بدرێن. (١٢)

شەرعناسەکان لەم سەردەمانەی دوایی دا، وەك لەبەشەکانی پێشوتریش دا باسمان لێوە کرد بڕوایان بە پێویستی گوێ ڕایەلی کردنی سولتان وحەرام کردنی دەرچون لەدژی هەبوو. لەم بڕوا بونەشیان دا پشت قایم بون بەو (دەق-وەرگێڕ)انەی کەلەقورئان و فەرمودە داهاتون سەبارەت بەهاندانی خەلك بۆ گوێڕایەلی کردنی (وەلی ئەمر)ودەستەلآت دار، ئیدی بانەو دەستەلآت دارە گوناهباروستەم کاریش بێت.هەندێکیان هۆکاری قەدەغەکردنی دەرچون

لەفەرمانی سولتانیان بەوە لێك دەدایەوەکەئەو دەرچونە دەبێتە هۆی بێ سەرو بەری وئاژاوەو خوێن ڕژان. لەم ڕووەوە کورتەی قسەیان ئەمە بوو: حکومەتی ستەم کار باشترە لەئاژاوە.

شاردراوەنیە ئەم ڕایەی کەشەرعناسەکان لەم دواییانەدا پێی گەشتن، بەهۆی ئەوەوە بوو کە لەڕۆزی و بژێوی یان دا پشتیان بەمیری دەبەست وچاوەڕوانی پلەبەرز کردنەوەو پاداشتیان لێ دەکرد. هەرلەبەر ئەوەش پرۆستۆی هەر شۆڕشێکیان دەکرد کە ببوایەتە هۆی هەڕەشە لەو حکومەتەی کەئەوان بژێویان لێوە دەست دەکەوت. (١٢)ئیدی ئەوە لەبیردەکەن کەئەو حکومەتەی ئێستا لەسەرکارە لەئەنجامی شۆڕشێکدا دژبە حکومەتی پێشو هاتۆتە سەرکار، ڕەنگە شۆڕشێك هەڵایسێ و سەرکەوتن بەدەست بێنێ لە دامەزراندنی حکومەتێکی تازەداو ئەوانیش لەگن ئەو حکومەتە ببنە کارمەندو خزمەتی بکەن وەك چۆن بونەتە کارمەندی ئەم حکومەتەی ئێستا. وەلێ وادیارە ئەوان گرنگی نادەن بەهیچ شتێ ئەوە نەبێ کەحاڵی حازر لەبەردەستیان دایە. کاریان نیە لەڕابردودا چ بوە یان لە داهاتودا چ دەبێ.

ئیبن خەلدون جۆرێکی تر بوو، ئەو بەرلەنوسینی (مقدمە)هەوڵێکی زۆری دابتوانێ لە مەغریب دامیرنشینێ دابمەزرێنێت یاخو سەربەرزیەکی وای دەست بکەوێت کەڕێزو شکۆی باپیرانی بۆ بگێڕێتەوە. کاتێکیش لەو هەوڵەدا شکستی هێناو لەمەغریبدا ناوبانگی زڕا.پەنای بردە شوێنێکی گۆشەگیرو دەستی کردە بیرکردنەوە لەهۆکاری شکست خواردنەکەی. بیرکردنەوەکەیشی ڕێنمونی کرد بەرەو بایەخی دەمارگیری لەژیانی کۆمەڵگەدا. ئینجا ڕایەکەیشی سەبارەت بە شۆڕش هەڵقوڵاوی ئەو بایەخەیە کە خستویەتیە پاڵ دەمارگیری. دەبینین ستایشی شۆڕشی سەرکەوتوو دەکات، بەچاو پۆشین لەو ئاژاوەو خوێن ڕێژیەی لێیەوە دەکەوێتەوە. چونکە بەڕای ئەو شۆڕشێکە لەسەر بناغەی دەمارگیری و (پێرگەرایی)هەڵایساوە. کەوابێ هەردەبێ بەرپاببێت وهەردەبێت سەرکەوتنیش

بەدەست بێنێت. ئەوکەسەش کەخاوەنی دەمارگیری و پێرگەراییە ئەگەر کەمتەرخەمی کرد لەهەستان بەو شۆڕشە، کەسێکی تر پێی هەڵدەستێ کەوەکو ئەوخاوەنی دەمارگیری و پێرگەرایی بێت.

بەو شێوەیەئیبن خەلدون هەوڵ دەدات دەرچونی معاویە لەدژی عەلی لێك بداتەوەو بەرگریش لەو دەرچونە بکات. ئەوەتا دەڵێت: (معاویە بۆی نەبوو مەسەلەکە لەخۆی یان لەبنەماڵەو خزمەکانی دوربخاتەوە، چونکە ئەوە شتێ بوو دەمارگیری بەسروشتی خۆی هێنابویە کایەوەو هۆزی ئومەییە هەستیان پێکرد... ئەگەر معاویە بەرەو ڕێگەیەکی تری ببردنایەو تاکڕەوی بکردایە لەمەسەلەکەدا، ئەوا دەنگەکانی توشی پەرتەوازەیی دەکرد ئەویش کۆکردنەوە وپێکهێنانی دەنگەکانی بەلاوە گرنگ تربوە لەشتێ کە سەرپێچیەکی گەورەی لەدواوە نەبوو...) (١٤)لێرەدا تێبینی دەکەین ئیبن خەلدون وای بە پێویست دەزانێ هەرکەسێکی خاوەن دەمارگیریبێ لەحکومەت و دەستەڵات ڕابپەڕێ. بائەو حکومەتە چاك و گونجاویش بێت. چونکە کەمتەرخەمی کردنی لەڕاپەڕین، ناکۆکی و ئاژاوەیەکی وای لێ دەکەوێتەوە زۆرلەو ناکۆکیە زیاتر بێت کەلەڕاپەڕینەکەی دەکەوێتەوە. لەلایەکی تریشەوەئیبن خەلدون پرۆستۆی هەموو شۆڕشە شکست خواردوەکان دەکات. شکست خواردنیش بەوە لێك دەداتەوە کەئەوانەی بەشۆڕشەکان هەستاون ڕەچاوی مەرجی فەراهەم هاتنی دەمارگیری یان نەکردوە. یانی ئەو شۆڕش گێڕەی کەبەپشت بەستن بەو بیرو باوەڕەباشەی کەبانگەشەی بۆ دەکات لە حکومەتی سەردەمەکەی خۆی ڕادەپەڕێت، بەبێ ئەوەی دەمارگیرییەکی باشی لەپشتەوە بێت. ئەوەبەپێچەوانەی ئەو ڕەوتەوە ڕێ دەکات کەکۆمەڵگە لەسەری دەڕوات. کەوابێ هەردەبێ چارەنوسەکەی شکست و نەفرەت بێت.

بەڕای ئیبن خەلدون بابای شۆڕش گێڕ بەرلەوەی هەستێ بەبزوتنەوەکەی پێویستە حسابی خۆی بکات، شوێن کەوتوەکانی ئامار بکات وهێزی

دەمارگیریەکەیان بزانێت. ئەگەر زانی دەمارگیریەکەی لاوازترە لەوەی بیگەیەنێتە سەرکەوتن، واباشترە بۆی لەماڵەوە دابنیشێت وبێ دەنگ بێت. وازلە مەسەلەکە بێنێت تابەگوێرەی ویستی ئەوانەی خێوی دەمارگیرین و گرێ دان وهەڵوەشاندنەوەیان بەدەستە، ڕێ بکات. ئەو هەستە واقیع گەراییە توندڕەوەی ئیبن خەلدون هەی بوو، وای لێکردوە بێ ئاگابێت لەلایەنێکی گرنگی مێژوی شۆڕشەکان. شۆڕشەکان ناچنە ژێر باری حسابی وردەوە، وەك ئیبن خەلدون دەیخوازێ.شۆڕشەکان وەك ئەو گرێ بەستە بازرگانیە نین کەخواجای بازرگان بەرلەوەی خۆی لەقەرە بدات بەوردی حسابی خۆی دەکات. زۆرجاری وادەبێ کەسی شۆڕش گێڕ متمانەی تەواوی هەیە بەو بڕوایەی کەلەپێناوی دا دەست بەشۆڕش کردن دەکات، بۆیە بەرەوڕوی دەچێت وگوێ نادات بەوەی ئایا لەو پێناوەدا دەمرێت یان نە"دەربڕینی وەرگێر". یان ڕەنگە شۆڕشگێڕێ بێ ئەوەی زەمینەسازیەکانی سەرکەوتنیشی لەبەردەستدا بێت شۆڕشێ بەرپادەکات، دواتر بێ ئەوەی خۆیشی ئاگای لێ بێت دەگاتە سەرکەوتن.کەواتە مەسەلەکە زۆر لەوەگەورەترە کەبچێتە ڕیزی حسابی بازرگانەکانەوە.

ئیبن خەلدون هەوڵ دەدات بیروباوەڕەکەی خۆی لەبارەی دەمارگیریەوە، بچەسپێنێت بەسەر بانگەوازەکەی محمدا (د.خ)یشدا، ئەمەش بەپشت بەستن بەو فەرمودەیەی کەدەفەرمێت: (*مابعث الله نبیا الافی منعة من قومه*). (١٥)ئیبن خەلدون ئەوە لەیاد دەکات کەچۆن پێغەمبەر بانگەوازەکەیی دەست پێکرد، لەکاتێکدا خاوەنی دەمارگیریەکی زۆر لاوازیش بوو لەبەرانبەر دەمارگیری فرەی دوژمنە سەرسەختەکانیدا. تەنانەت لەنێو شکەفتەکەشدا هێندەی نەما بوو دوژمنەکانی لەناوی بەرن ئەگەر خودا بەفریای ڕانەگەشتبایەو داوی جاڵجاڵۆکەو هێلکەی کۆتری بۆوەکار نەخستایە. کەواتە مەسەلەکە تەنها مەسەلەی دەمارگیری نیە، بەڵکو هۆکار گەلێ دیکە لەئارادان و ڕۆڵی خۆیان یاری دەکەن لەسەرخستن یاخود شکست پێ هێنانی هەربانگەوازێك

دا.گەرلەدێرزەمانەوەشۆرش گێران کاریان بەو ڕێبازە خەلدونیە بکردایە، ئەوە لەدنیادا ئەپێغەمبەران بەدەردەکەوتن و ئەرێبەرو چاکسازەکانیش. خەلکیش وەکو مێگەلیان لێ دەهات وملی کەچی هەرکەسێک دەبون کەبەزۆری هێزبەسەریاندا زاڵ بوایە. ئەوکاتەش کۆمەلگەش چەقی دەبەست و ئەوە لەدوای ئەوە لەسەر یەک ڕەوت ڕێی دەگرد.

هەروەها ئیبن خەلدون لایەنێکی دیکەی دیرۆکی شۆڕشەکانی فەرامۆش کردوە.هەندێ جارسەرەنجامی شۆرش شکست دەبێ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەریەکی کۆمەلایەتیبەکەلکی دەبێ.بەوواتایەی کەڕای گشتی دەبزوێنێت ومێشکی خەلکی دەکاتەوە لەناقاری مەسەلەیەکدا کەڕەنگە لێی بێ ئاگابوبن.زۆر جاریش شۆرشە شکست خواردوەکان دەبنە دەست پێك بۆنەو شۆرشە سەرکەوتوەی لەدوایانەوە بەرپا دەبێت. دەگونجێت بلێین: شۆرشی سەرکەوتو بەرپانابێت مەگەر لەدوای زنجیرەیەك شۆرشی شکست خواد ردوو نەبێت.چونکەهەریەکێ لەوشۆرشانە وەك هەنگاوێك وان بۆزەمینە سازکردن بەردوسەرخستنی دوایەمین شۆرش.

وادیارە ئیبن خەلدون تەنها بایەخ بەسەرکەوتنی بەپەلە دەدات.دەنا هیچ گرنگیەك بەسەرکەوتنی درەنگ وەخت نادات.لێرەدا دەبینین لەهەستەواقیع گەراکەیدا ڕێچکەیەکی وادەگرێتە بەر کەلەماوەی دوردا لەگەڵ بویەری کۆمەلایەتی دا وێك نایەتەوە.

## ئیبن خەلدون و ئیبن تۆمرت:

له (مقدمه)دا دەربڕینێ هاتوه، لەو دەربڕینەدا ئاماژەیەك دەبینرێ بۆ ئەوەی کەئیبن خەلدون سەرکەوتنی هەر بانگەوازێ بەبەلگەی چاکی و گونجاوی ئەو بانگەوازە دەزانێت.ئەو دەربڕینەش لەمیانەی بەرگری کردن له (محمدی کوڕی تۆمرت)دا هاتوه، (محمدی کوڕیتۆمرت)نەژادی خۆی دەدایەوە پاڵ ئیمام عەلی و خۆی بانگەشەی (مەهدی)یەتی بۆ خۆی دەکرد.دکتۆر ئەحمەد ئەمین باس لەوەدەکات گوایە ئەو کابرایە هەندێ فێڵ وجادوی بەکار هێناوە تاکو خەلکی پێ بخەڵەتێنێت ووایان لێبکات لەدەوری کۆببنەوەو پشتیوانی لەهەوڵەکانی بکەن، دواجار لەهەوڵەکانیشی دا سەرکەوتنی بەدەست هێناو توانی دەوڵەتێکی گەورە دابمەزرێنێ کەلەمێژوی مەغریب دا بەدەوڵەتی (موەحەدین)ەکان بەناوبانگە. (١٦)ئینجا ئیبن خەلدون دێتەکایەکەوەو بەرگریەکی گەرموگوڕی لێدەکات وهەوڵ دەدات ئەوتۆمەتانەی لێ دوربخاتەوەکە ناراستەی گراون وبەئەهلی پارێزکاری وچاکەی بناسێنێ.

ئیبن خەلدون لەو ڕووەوە ئاوها دەدوێت: (ئەوەی وادەکات فوقەهاکان (ئیمامی مەهدی)بەدرۆبخەنەوە، ئەو ڕژدیەیە کەلەنێو دڵیاندایە بەرانبەر پلەو پایەی وی. ئەبێ گومانت چۆن بێ بەرانبەر پیاوێ تورە بوبێت لەئەهلی دەوڵەت ولەگەڵ ئیجتهادی شەرعناسەکانیشیاندا ناکۆك بوبێ.ئیدی بانگەوازی کردبێ بەناوفەومەکەی داو داوای کردبێ هەربەخۆی جیهادیان بکات "واتە جیهاد لەدژی ئەهلی دەوڵەتەکە، یانی دەستەڵات داران بکات ". ئەوە بوو توانی دەوڵەتەکە لەڕەگەوە دەربێنێ، دەوڵەتەکەی واژگون و سەرەو ژێرکرد، لەو پێناوەشدا ژمارەیەکی زۆر لەشوێن کەوتەکانی گیانیان لەدەستدا کەئاماریان مەگەرهەرخودا بیزانێ... بریا بمزانیایە مەبەستی (لەو هەموو کردەوەیە –

وەرگێڕ)جگەلەقایل کردنی خودا چی دیکە بوە... ئەگەر مەبەستی جگە لەچاکە شتێکی تربوایە ئەوا کارەکەی بۆ نەدەچوە سەرو بانگەوازەکەی‌لێك هەڵدەوەشایەوە.بەگوێرەی ئەو سوننەتە خواییە کەلەنێو بەندەکاندایە) (۱۷) پێدەچێت یەکێك لەو پاڵنەرانەی هانی ئیبن خەلدون یان داوە بەو گەرم وگوڕیە بەرگری لە (ئیبن تۆمرت)بکات، ئەوە بوە کەویستویەتی کتێبەکەی پێشکەش پادشایەك بکات کە جۆرە پەیوەستەگیەکی هەبوە بەموەحەدینەکانەوە، وەك دکتۆر تەها حسەین ئاماژەی پێ دەدات، واتە بەم بەرەوانی کردنەی گەرەکی بوە وەك نەریتی خۆی مەرامیی بۆپادشاکان بکات.وەلێ هەرچۆن بێت، دەبینین لەمیانی بەرگری کردنەکەی دا پێوەرێك دێنێتە کایەوە کەئێمە لەبەرانبەر ئەو پێوەرەدا هەرئەوەندە دەتوانین کەپێی سەراسیمە بین. ئەوەتا لەبارەی (ئیبن تۆمرت) دەوەدڵێت: (ئەگەر مەبەستی جگەلەچاکەشتێکی تر بوایە ئەوا کارەکەی بۆ نەدەچوە سەرو بانگەوازەکەی لێك هەڵدەوەشایەوە. بەگوێرەی ئەو سوننەتە خواییەی کەلەنێو بەندەکاندایە).

لێرەدا ئیبن خەلدون سەرکەوتنی بانگەواز، دەکاتە پێوەر بۆچاکی بانگەوازەکە. ئیتر نازانم چۆن دەتوانێت ئەو پێوەرە بەسەر ئەو بانگەوازە سەرکەوتوانەدا بچەسپێنێ کەبەلایەوە خراپن، بۆ نمونە وەك بانگەوازی فاتمیەکان. یاخود بیچەسپێنێ بەسەر ئەو بانگەوازە شکست خواردوانەدا کەبەلایەوە باشن، وەك بانگەوازەکەی حسەین.

## شۆڕشە ئیسلامیەکان:

لەسەردەمی‌ئیبن خەلدونداو لەنێوکۆمەڵگەی مەغریبی دا هەر بەیناو بەینێ بانگەوازێکی ئاینی سەری هەڵدەدا وهێندەی نەدەبرد خامۆش دەبوو دادەکرکایەوە. ئەوکەسانەش کەهەڵدەستان بەوبانگەشانە، وەك ئیبن خەلدونیش لەمقدمەکەی دا دەیان پۆلێنێت، دوو بەش بوون: یەکەمیان پێك هاتبوو لەوکەسانەی بانگەشەی (مەهدی)بونیان بۆ خۆیان دەکرد،، یەکێکیان خۆی دەکردە ئەو مەهدیە چاوە ڕوان کراوەی کە پێغەمبەر (د.خ)مزدەی دەرکەوتنی داوە، کاتێ دێ دەوڵەتی دادگەری لەجێگەی دەوڵەتی ستەم دادەمەزرێنێ. هەرچی‌گرۆی دوهەمە.ئەوکەسانە بوون کەبانگەشەیان دەکرد بۆ کۆنترۆڵ کردنی ڕێگەکان و سڵەمانەوەی ئەعرابەکان لەوەی خراپەیان تیادا بڵاو بکەنەوە) (١٨)

شیاوی ئامازە پێدانە، ئەو بانگەوازە ئاینی یانەی لەمەغریب دابەدەرکەوتن، هیچ نەبون جگەلەوێنەیەکی ناوچەیی ئەوململانێ یەی کەلەئیسلامدا بەگشتی لەئارادا بوو لەنێوان ئایدیایی بونی ئاین و واقیعگەرایی بوونی دەوڵەتدا. ئیسلام بەسروشتی خۆی ئاینێکی ڕیفۆرمیستی یەوکۆمەڵێ نمونەی بڵندی هێناوە لەمەڕ یەکسانی ودادگەری لەنێوان خەڵکدا. سەرجەم ئەو نمونەباڵایانەش لە سوننەتی پێغەمبەر و ژیاننامەی خەلیفەکانی ڕاشیدین دا بەرجەستە بوون.وەلێ کۆمەڵگەی ئیسلامی لەدوای ئەوان لەو نموونە باڵایانە لایاندا و، بەڵکو دەوڵەتی داڵپۆسێنەری تێدا دەرکەوت و ستەمیشی تێدا بڵاو بویەوە. لەئەنجامی ئەو لادانەش دا کۆمەڵێ شۆڕش وبانگەواز لەئیسلامدا بەدەرکەوتن کە هەوڵیان دەدا کۆمەڵگەی ئیسلامی بگێڕنەوە بۆسەر ڕێڕەوی یەکەمجاری. هەر ئەو شۆڕش و بانگەوازانەش بونە هۆکارێکی کارا بۆ ئەوەی ژیاری ئیسلامی ببێتە خێوی سروشتێکی بزێوی داهێنەرانە. گەرنەو شۆڕشانە

سەریان هەڵئەدایە ژیاری ئیسلامیش نەدەگەشتەئەو ئاستەی کەلەبەپیتی بەرهەمە فیکریەکان و هەمەچەشنەیی بلیمەتیەکانیدا بەدەستی هێنا. کەچی ئیبن خەلدون دێت بەنوکە قەڵەمێ. خەت بەسەر هەموو ئەو شۆڕشانەدا دێنێ. ئەوەتا دەڵێت: (زۆر کەس لەوانەی خۆیان بۆ خوداپەرستی تەرخان کردوە وپابەندی ڕێگەکانی ئاینین، هەڵدەستنەوە دژبە میرە خراپە کارەکان و داوای گۆڕینی خراپەو بەرپێ گرتنی دەکەن و، فەرمان بەچاکە دەدەن. لەمەدا مەبەستیانە خودا پاداشتیان بداتەوە.ئیدی شوێنکەوتەیان زۆر دەبن وخەڵکانی ئاژاوەچی لەدەوریان کۆدەبنەوە، لەو پێناوەشدا خۆیان ئاوقەی تیاچون دەکەن. زۆر بەشیان بەگوناهباری دەمرن، چونکە خودا ئەوەی لەسەریان نەکردۆتە ئەرك، بەڵکو مەرجی توانااداری داناوە بۆ بەئەرك دانانی هەستان بەوفەرمانە... بارودۆخی پادشاو دەوڵەتەکانیش بنچ داکوتراوو بەهێزەو، هیچ شتێ نای لەخشێنێ مەگەر داواکاریەکی بەهێز کەدەمارگیری هۆزو عەشرەتەکانی لەپشتەوە بێ وەك لەپێشەوە باسمان کرد). (١٩)وادیارە لێرەدا ئیبن خەلدون کەوتۆتە نێو داوێکەوە نازانێت چۆن چۆنی خۆیی لێ دەرباز بکات. چونکە لەکاتێکدا ئەو حوکمە توندە بەسەر شۆڕشگێڕە شکست خواردووەکاندا دەدات. پێویستیە شۆڕشەکەی حسەینی کوڕی عەلیشی بێتە خەیاڵ. ئایا بەسەر ئەو شۆڕشە دا هەمان ئەو حوکمە بدات کەبەسەر شۆڕشە سەرنەکەوتوەکانی تردا داویەتی؟ ئایا دەکرێ بەحسەینیش بڵێت گوناهبارەو پاداشتی نادرێتەوە؟

کاشکای بمزانیبا ئیبن خەلدون دەیتوانی قسەیەکی ئاوها بکات؟ لەوەختێکدا کەموسوڵمانان خەریکە کۆدەنگ بن لەسەر پیرۆز ڕاگرتنی حسەین و بە شەهید لەقەڵەم دانی؟!.

## ئیبن خەلدون وحسەین:

لەبەشی حەوتەمی ئەم پەرتوکەدا باسمان لەوە کرد کەچۆن ئیبن خەلدون ئەو رایەی ئیبن عەرەبی بەهەلەداناوە کە دەلێت: (حسەین بەشمشێرەکەی باپیرەی کوژرا)لەراستیشدا ئیبن خەلدون لەموقەدیمەکەی دا بەرگریەکی زۆر لە حسەین دەکات. لەمیانەی بەرگری کردنەکەی دا دەلێت: (بەلام حسەین، لەکاتێکدا گوناهباری یەزید لای هەموو خەلکی سەردەمەکەی ئاشکرا بوو، حسەینیش پێی وابوو مادەم یەزید گوناهبارو فاسقە ئەوا راپەرین لەدژی پێویستە، ئەخاسمە لەسەرکەسێك کەتوانای بشکێت بەسەر مەسەلەکەدا، ئینجا بۆ ئەوکارە لەشایستەگی و تواناداری خۆی رابینی. هەرچی شایستەگیەکەیەتی ئەوە وایە و بەزیادیشەوە، بەلام لەرووی توناداریەکەوە خودا بەزەیی پێدا بێت بەهەلەدا چوو. چونکە دەمارگیری (مضر)لەقورەیش دا بوو، دەمارگیری قورەیشیش لەهۆزی عبدول مەنافدا بوو، دەمارگیری هۆزی عەبدل مەنافیش لەنێو بنەماڵەی ئومەییەدا بوو. قورەیش وهەموو خەلکیش ئەوەیان دەزانی و نکولی یان لێ نەدەکرد. ئاوها هەلەی حسەینت بۆ رون بویەوە. بەلام هەلەکە لەمەسەلەیەکی دنیایی دا بوە کەزیانێکی تێدانیە. وەلێ لەحوکمی شەرعیدا هەلەی نەکردوە، چونکە حوکمە شەرعیەکە پەیوەستە بەگومانەکەی ئەوەوە. ئەو گومانی وابوو توانای هەیە ئەو کارە بکات. جگەلە حسەینیش هەموو ئەو سەحابییانەی کەلەحیجاز بون یاخودلەعێراق و شامدا لەگن یەزید بوون، پێیان وابوو، هەرچەندە یەزید کەسێکی فاسقە، بەلام ناکرێ لەبەرانبەریدا شۆرش بکرێ، چونکە ئاشوب وخوێن رژانی لەدواوە بەرپا دەبێ، بۆیە کەمتەرخەمیان کردو شوێنی حسەین نەکەوتن. ئەئیجتیهادی کردوەو رێبەری موجتەهیدەکانیشە) (٢٠)

پوختەی بۆچونی ئیبن خەلدون لەم سۆنگەیەوە، ئەوەیە کەحسەین لەشۆرشەکەی دا لەرووی شەرعیەوە هەلەی نەکردوە، هەرچەندە بایەخی بەپرەنسیپی دەمارگیری و تواناداری نەداوە، بەلکو موجتەهیدێکەو پاداشتی دەدرێتەوە.دەیکەواتە ئایا لێرەدا مافی خۆمان نیەلەئیبن خەلدون بپرسین: بۆ

ناگرێ هەموو شۆڕش گێڕە سەرنەکەوتوەکان وەکو حسەین موجتەهیدو پاداشت داربن؟ لەکاتێکدا ئیبن خەلدون

بەخۆی دان بەوەدا دەنێت کەئەوانیش خۆیان بۆ خوا پەرستی تەرخان کردوەو پابەندی ڕێگەکانی ئاینن، هەروەها لەپێناوی پاداشتی خوداشدا شۆڕشەکانیان بەرپاکردوە؟.ڕیوایەتێك هەیە کە (ئیبن حەجەری عەسقەلانی)دەیگێڕێتەوە. ڕیوایەتەکە ئاماژە بۆ ئەوە دەکات گوایەئیبن خەلدون لەسەرەتادا کەیەکەم ڕونوسی (مقدمە)کەی نوسیوە، پشتیوانی لەو بۆچونەی ئیبن عەرەبی کردوە کەدەڵێت: (حسەین بەشمشێرەکەی باپیرەی کوژرا).ئیبن حەجەر دەڵێت : گوایە شێخەکەی (حافظ ئەبوحسەین کوڕی ئەبوبەکر)بەهۆی ئەو قسەیەوە زۆر توڕە بوو لەئیبن خەلدون ونەفرەتی لێدەکردو دەگریا. (٢١)ئەگەر ئەم ڕیوایەتە ڕاست بێت ئەوە بەلگەیە لەسەر ئەوەی ئیبن خەلدون لەسەرەتادا لەبارەی شۆڕشەکەی حسەینەوە هەمان ئەوڕایەی هەبوە کەلەبەرانبەر شۆڕشەسەرنەکەوتوەکاندا هەی بوە.وەلێ دواتر لەترسی خەلك لەو ڕایەی پاشگەز بۆتەوە. بۆیە لە (مقدمە)کەی دا ئەو ڕایەی سڕیوەتەوەو لەجێگەکەیدا ئەو بۆچونەی داناوە کەپێشتر نوسیمان.

شیاوی باسکردنە ئیبن خەلدون لەمێژوەگشتی یەکەی دا توخنی باسکردنی شۆڕشەکەی حسەین نەکەوتوە. بەلکو بەبەتاڵی جێگەیەکی بۆ بەجێ هێشتوە. سەیریش لەوەدایە ئەو کەسانەی مێژوەکەییان خوێندۆتەوە، وئەو کەسانەش کەسەرقاڵ بون بەچاپکردنیەوە، پەییان بەهۆی بونی ئەو بۆشاییە "سپی" یە لەنێو لاپەڕەکانی کتێبەکەدا نەبردوە.باقڵم ئیبن خەلدون لەکاتێکدا ویستویەتی سەبارەت بەشۆڕشەکەی حسەین شتێ بنوسێت، دۆش داماوەو سەراسیمە بوەو دەستی لەنوسین هەلگرتوە ئایا ئەو بۆچونەی کەلەناخی دا بڕوای پێ یەتی بنوسێت یاخود ئەو ڕایە بنوسێت کەخەلکی لێیان گەرەکە. وادەردەکەوێ چەند لاپەڕەیەکی مێژوەکەی تەرخان کردوە بۆ ڕوداوەکەی حسەین و بەسپێتی بەجێی هێشتون تاکو دوای ئەوەی لەسەر ڕایەك ئۆقرە دەگرێ بگەڕێتەوە سەریان وپڕیان بکاتەوە.

بەڵام بەتێ پەڕینی ڕۆژگار پڕکردنەوەی لاپەڕە سپی یەکانی لەبیر چۆتەوە.لاپەڕەکانیش تائەمڕۆ بەسپێتی ماونەتەوە.

## ڕەخنەو وەڵامێك:

لەوانەیە کەسێك ڕەخنە بگرێت وبڵێت: ئەگەر بیردۆزەکەی ئیبن خەلدون ئەولەکەگەورانەی تێدایە، ئیتر چۆن دەتوانین بەبازێکی لەقەڵەم بدەین لەدێرۆکی فیکری گۆمەڵایەتی دا؟.

ئەم ڕەخنەیەم لای زۆرکەس دیتوە، ئەوان دەیانەوێت تێورەکەی ئیبن خەلدون لەهەموو ڕووەکانەوە کامڵ وتەواو بێت، ئەوجا بەچاوی ڕێزەوە سەیری‌دەکەن. بۆیە هەرگا یەکێکیان لەنێو ئەو بیردۆزەدا ڕایەکی بینیکەبەلایەوە پەسەند نەبێ، دەست بەجێ حوکمی بەخراپ لەقەڵەم دان بەسەر هەموو تێورەکەدا دەدات و سوکایەتیشی پێ دەکات.

هەڵەی ئەو جۆرە کەسانە لەوەدایە کەچاوەڕوان دەکەن هەرشتێکی مەزن، لەهەموو ڕوەکانەوە گەورەبێت. ئیدی ئەوە نازانن کەلەدنیادا هیچ ئێشێکی مرۆیی نیە لەناتەواوی بەدووربێت. ئێستاکە ڕەخنەی نوێ دەرکی بەم ڕاستی یە کردوەو لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستی یەشدا ڕێ دەکات لەکاتێکدا کەدەیەوێت هەربەرهەمێکی دەستکردی مرۆڤ هەڵسەنگێنێ هەربەرهەمێ بگری، پێویستە لەهەمان کاتدا لایەنی باش و لایەنی خراپ لەخۆیدا کۆبکاتەوە. هەر ڕەخنەگرێکیش تەنها سەرنجی بەسەر لایەنە باشەکاندا یاخود بەسەر لایەنە خراپەکاندا چڕبکاتەوە، ئەوە ڕەخنەگرێکی‌مۆدێل کۆنە. ئیبن خەلدون خۆیشی پەیڕەوی لەم ڕێبازە نوێ یەکردوە لەکاتێکدا ڕەخنەی لەخەسڵەتی نەتەوەکان گرتوە.بۆیە بینیمان لەکاتێکدا خەسڵەتەکانی هەریەك لەدەشتەکێتی و شارستانێتی شی دەکردەوە، لایەنە باش و خراپەکانی هەردوکیانی ئاماژە پێ دەدا.ئەمەیش وای کردوە زۆر کەس بەخراپی لەتێورەکەی تێبگەن.هەندێکیان وای لێ حاڵی بوون کەمەبەستی سەرزەنشت کردنی دەشتەکێتی یە، کەچی

هەندێکی ترلایان وایە مەبەستی سەرکۆنەکردنی شارستانێتی یە.ئەو جۆرەکەسانە ناتوانن تێ بگەن لەوەی هەرشتێ سەیربکەیت، لەوانەیە لەهەندێ ڕووەوە باش و لەهەندێ ڕووی تردەوە خراپ بێت.

دەگرێ ئێمەش لەلێکۆڵینەوەی کەسایەتی و تیۆرەکەی ئیبن خەلدون دا، هەمان ئەو ڕێچکەیە پەیرەو بکەین کەخۆی لەتوێژینەوەی کۆمەلگەدا پەیرەوی کردوە.یانی ئەو پیاوە چەندەخاوەنی بیرکردنەوەیەکی مەزن بووە، بەو ئەندازەیەش ڕەفتارو ئاکاری داڕوخاو بووە.تەنانەت لەوانەیە نەی توانیبا بیردۆزە قەشەنگەکەی دابهێنێ ئەگەر خاوەنی ڕەفتارێکی ئاسایی و سادە بوایە. ڕەنگە ئەو هەلپەرستیەی زۆرەی کەئەوی جیاکردبویەوە لەبیرمەندەکانی سەردەمەکەی بوبێتە هۆکاری ئەوەی لەڕوی بیرکردنەوەشەوە لەوان جیاواز بێت.چونکە ئەم دوولایەنەش پێکەوە گرێ دراون، وەك پێکەوە نوسانی لایەنی باش و خراپ لەهەموو شتەکاندا. تیۆرەکەی ئیبن خەلدون بازدانێك بوو لەبەرانبەر ئەو شێوازە بیرکردنەوەیەی لەبەردا باو بوو. هزرڤانان لەپێش ئیبن خەلدوندا سەرقاڵی بیرۆکە ئایدیاییەکانیان بوون و دانەدەبەزینە خوارێ بۆ ئەوەی لەواقیعی ژیان ڕابمێنن و بکۆڵنەوە.لەوکاتە ئیبن خەلدون هات وشۆڕشێکی کرد بەسەر ئەو شێوازی بیرکردنەوەیەدا. بەڵام لەهەستی واقیع گەرایی دا زیادە ڕەوی کرد، وەك چۆن هزرڤانانی پێشو لەهەستی ئایدیالیستی یاندا زیادەڕەوی یان کردبوو.ئەمڕۆکە ئێمە پێویستە خاڵێکی مام ناوەندی هەڵبژێرین لەنێوان ئەو دوو ڕەوتە توند ڕەوەدا، تێ بگەین لەوەی کەلەهەرکامیاندا لایەنی باش و لایەنی خراپ ئامادەگی یان هەیە.

(ماکس لرنەر)لەپێشەکیەکەی دا بۆ کتێبی (الامیر)ی (ماکیافیللی)دەڵێت: میکیاڤیللی هەردوو بواری ئایدیاو بواری واقیعی لێك جیاکردۆتەوە. یەکەمیانی ڕەفز کردوەو ئەوی تریانی پەسەند کردوەو دەستی پێوە گرتوە.بەڵام بوارێکی دیکەش لەئارادایە ئەویش بواری (گونجان)ە.دەکرێ لەم بواری سێ یەمەدا

گونجانێ دروست بکرێ لەنێوان ئەوەی کەبوودو ئەوەیشی کەپێویستە ببێت. (٢٢) ئەم گوتەی (لرنەر)وەك چۆن بەسەر (میکیاڤیللی)دا دەبڕێت، ئاوهاش بەسەر ئیبن خەلدونیشدا دەچەسپێت. لەوانەیە باشترین پێوەریش بێت بۆ ئەوەی تێورەکەیئیبن خەلدونی پێ هەڵسەنگێنین لەلایەنە باش وخراپەکانیش دا.

ئەمڕۆئێمەکە دەمانەوێت لەتێورەکە بکۆڵینەوەو سودی لێ وەربگرین، پێویستە لەمیانەی چوارچێوە سنوردارەکەیەوە لێی بڕوانین.دەست بەو شتانەیەوە بگرین کەواقیعین و ئەوانەیشی لاوە بنێین کەزیادە ڕەوی نەگونجاو بەواقیعی تێدایە.ئێمە لەسەر دەمێکدادەژین جمەی دێت لەشۆڕش، چەمکی شۆڕشیش جیاوازە لەچەمکی شۆڕش لەسەردەمی (واعیزەکانی سوڵتان) دا. لەبەر ئەوە پێوستە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتی یەکانمان لەسەر بناغەی ئەو واقیعەی کەتیی داین و ئەو نمونە باڵایانەش کەپێویستە بەرجەستەیان بکەین، ڕابوەستێت. زیادە ڕەوی نەکەین بەلای هیچکام لەو دووخاڵەدا.

کۆمەلگەش بریتی یە لەهاوسەنگی نێوان پاڵنەری واقیع وپاڵنەری ئایدیا. هەرگا کۆمەلگەیەك بەلای هەرکام لەو دووخاڵەدا دایتاشی ئەوا سەرەنجامەکەی تیاچونە، واتە یان دۆگما بون دەبێت یاخود ئاژاوەو پاشاگەردانی. زۆر باشە کۆمەلگە بتوانێ لەسەر هێڵێکی مام ناوەندی بێت لەنێوان دۆگما بون وپاشاگەردانی دا.کۆمەلگەش لەنێو شارستانیەتی تازەدا دەیەوێت وابێت.

## پەراوێزەکانی بەشی یانزەیەم

١) عبدالرحمان بدوی، مؤلفات ابن خلدون، قاهیرە ١٩٦٢، ل١٨١.

٢) لەمامۆستا میسریەکانم پرسی ئەبێ چ نهێنیەك لەوەدا هەبێ کە ئیبن خەلدون حەزی بە دانیشتنی کەناری دەریا (ڕوباری نیل)کردووە؟ لەوەلامدا گوتیان: قاهیرە لەوسەردەمەدا دووربووە لەڕۆخەکانی ڕوباری نیلەوە، بۆیە ڕۆخەکان ببونە جێگەی ئەو کەسانەی حەزیان بەڕوت وقوتی ڕابواردن دەکرد و لەجێگە قەرەباڵغەکان دوور دەکەوتنەوە تاکو خەڵك نەیان بینێت. بەڕاستی ئەم لێکدانەوەیەش شتێکی خۆشە!!.

٣) محمد عبدالله عنان، ابن خلدون، قاهیرە١٩٢٢، ل ٩٤.

٤) عبدالرحمن بن خلدون، التعریف، ل٢٧١ – ٢٧٢.

٥) لەم ژێدەرەوە گواستروەتەوە: عبدالرحمن بدوی، مؤلفات ابن خلدون، ل ٢٠٨.

٦) عبدالرحمن بن خلدون، التعریف، ل٢٧٤.

٧) مقدمە ابن خلدون، (طبعة لجنة البیان العربي) ل ٤٢-٤٤.

٨) محمد عبدالله عنان، ابن خلدون، ل ٢٨.

٩) عبدالقادرالمغربي، محاضرات، دمشق١٩٢٨، ل٧٠.

١٠) هـ س، ل ٧٧-٨٠.

١١) مقدمە ابن خلدون، (طبعة لجنة البیان العربي) ل٩٠٨- ٩١٣.

١٢) هـ س، ل ٤٧١.

١٣) بنوارە پەرتوکی (واعیزەکانی سوڵتان) نوسینی نوسەری ئەم چەند دێڕەو، وەرگێڕانی وەرگێڕی ئەم کتێبە.

١٤) هـ س، ٥٤٤.

١٥) هـ س، ل ٤٦٨.

١٦) احمد امين، المهدى والمهدويه، ل ٣٥- ٣٧.

١٧) مقدمة ابن خلدون، (طبعة لجنة البيان العربي) ل ٢٤٩- ٢٥٠.

١٨) هـ س، ل٧٥٤-٧٥٩.

١٩) هـ س، ل٤٦٩.

٢٠) هـ س، ل ٥٦١.

٢١) لەم ژێدەرەوە گواستوومتەوە: عبدالرحمن بدوى، مؤلفات ابن خلدون، ل٢٨٤.

22) Max Lrner ،op.cit ،p.XLVI.

# بەشی دوانزەیەم

## (چارەنوسی زانستە تازەکە)

لەکاتێکدا ئیبن خەلدون لەنوسینی (مقدمە)کەیبوەوە، هەستی کرد زانستێکی نوێی دامەزراندوە، بۆیە ناوی (زانستی ئاوەدانی)بڕی بەسەر زانستەکەی دا.زۆریش شادومان بوو پێی وگەرەکی بوو بەهۆیەوە شانازی بەسەر دانەرەکانی تردا بکات. شیاوی باسە لەو کاتەدا دامەزراندنی زانستی نوێ شتێکی دەگمەن نەبوو لەئیسلامدا. بەڵکو هزرڤانانی موسوڵمانان هەرلەسەرەتای سەردەمی عەباسیەکانەوە دەستیان کردبوە دامەزراندنی زانستی جۆراو جۆر، وەك فەراهیدی لەزانستی عروزدا، سیبویە لەزانستی نەحودا، ئەبو یوسف لەخەراج دا.

شافعی لە"اصول الفقە" دا، هەروەها ئەشعەریش لەزانستی "کلام"دائینجا وادەردەکەوێت ئیبن خەلدونیش ویستویەتی چاولەوانە بکات وزانستێك دابمەزرێنێ تالەدوای خۆی گەشەبکات.

هەروەها ئیبن خەلدون دەیویست بەتایبەتی چاولەئەرستۆ بکات. ئەو دیتبوی فەلسەفەکەی ئەرستۆ چ پلەو پایەیەکی هەیەلای هزرڤانان. بۆیە پێی وابوە زانستەکەی خۆیشی بەگوزەرکردنی ڕۆژگار هەمان پلەو پایەی دەبێت.ئەولە (مقدمە)کەی دا ئاماژە بەوە دەکات کەپێش ئەرستۆش مەسەلەکانی (مەنتیق)زانرابون، بەڵام ڕێك و پێك نەبون و ڕێك نەخرابوون. ئەرستۆ هات و ڕێکی خستن و زانستێکی سەربەخۆی لێ پێك هێنان. هەرلەبەر ئەوەش ئەرستۆ ناونرا مامۆستای یەکەم. (١)ئیبن خەلدون سەبارەت بەزانستە تازەکەی خۆیشی هەمان قسەدەکات. پێی وایە فەیلەسوفان و زانست پەروەران لەپێشی ئەمدا باسیان لەبابەتگەلێ هاوشێوەی ئەو بابەتانە کردوە کە ئەم لە (مقدمە)کەیدا لێیانی کۆڵیوەتەوە. بەڵام بەشێوەیەکی شپرز لەکتێبەکانیان داباسیان لێیانەوە کردوە، جگە لەوەش ئەو بابەتانە بەخۆیان مەبەستی توێژینەوەکان نەبوون. ئەم

هاتوه و ئەو بابەتانەی کردۆتە بناغەی زانستەی و تازەکەی بەدرێژی باسی لێوە کردوە و ڕونی کردۆتەوەو لەبابەتی زانستەکانی تریش جوێ‌ی جردۆتەوە. (٢).

جگەلەوەش ئیبن خەلدون پێی وابوو زانستەکەی لەدوای خۆی فراوان دەبێت و لەسەر دەستی زاناکان دا ڕێکدەخرێت وهەڵەو کەم و کورتیەکانیشی چارەسەر دەکرێت. وەك هەمووئەو زانستانەی ترکەلەبەردا دامەزرێنرابوون. لەو بارەیەوە دەڵێت: (...جانەگەر من مافی خۆیم بەمەسەلەکانی دابێت وکونج و کەلەبەرەکانیم ڕوناك کردبێتەوەو لەزانستەکانی ترم جیاکردبێتەوە "دەربڕینی وەرگێڕ"، ئەوە لەیارمەتی و ڕێنمونی خواوە بوە. دەناگەر هەرچیەکیم لەدەست دەرچوبێت، یان هەڵەم لەهەندێ لەبابەتەکانیدا کردبێ، ئەوا ئەو کەسەی سەرنجی لێدەدات ولێی دەکۆڵێتەوە پێویستە ڕاستی بکاتەوە. منیش ئەو فەزڵەم بۆ دەمێنێتەوە کەرچەکەم شکاندوەو ڕێگەکەم بۆ ڕوناك کردۆتەوە) (٣)ئیبن خەلدون هەربەوەندە دەست هەڵناگرێ، بەڵکو دەبینین لەکۆتایی (مقدمە)کەی دا دەڵێت: (خەریك لەمەبەست لابدەین وبچینە دەرێ، بۆیە ویستمان جڵەوی قسەکردن بگرین لەم پەرتوکە یەکەمەدا کە دەربارەی سروشتی ئاوەدانیە. ئەوەندەی خۆمان بەکومسایمان زانیبێ مەسەلەکانیمان ڕون کرد ۆتەوە. لەوانەیە کەسانێك کەدوای ئێمە دێن وخودا بیرێکی ڕاست و زانیاریەکی ڕونیان دەداتێ، زیاترلەوەی ئێمە نوسیومانە ڕۆبچن بەنێو پرسەکانی دا.چونکە ئەو کەسەی هونەرێ (زانستێ —وەرگێڕ) دادەمەزرێنێ ئەوەی لەسەرنیە کەهەموو مەسەلەو ڕووەکانی بژمێرێ و لەبارەیانەوە بنوسێ. تەنها ئەوەندەی لەسەرە بابەتی زانستەکە دەست نیشان بکات و بەشەکانیشی هەمەچەشنە بکات.ئەوکەسانەی تر کەلەپاشدا دێن هێدی هێدی مەسەلەی دیکەی دەخەنەسەرتاکو تەواو وتۆکمە دەبێت. خودا دەزانێت و هێوە نازانن) (٤)پرسیارێ کەلێرەدا ڕوبەڕومان دەبێتەوە ئەمەیە: ئایا ئەو هیوایەی ئیبن خەلدون هەیبوو بەزانستە تازەکەی هاتە دی؟ ئایا زانستی ئاوەدانی گەشەی کردو فراوان بوو بەو شێوەیەی کەدانەرەکەی چاوەڕوانی دەکرد؟

## بزر بوونی زانا :

کەمێ لەنوسەران هەوڵیان داوە بۆچونەکانی ئیبن خەلدون وەربگرن و نوسینەکانیان ڕەنگ دانەوەی ئەو بۆچونانەی لەسەربێ. زۆربەی ئەو نوسەرانەش لەوانەن کەلەمیسر لای ئیبن خەلدون قوتابی بوون یاخود لەهەمان سەردەمی وی دا یان ماوەیەکی کەم لەدوای مەرگی وی ژیاون. (ئەصبحی و مەقریزی)ش، هەرەدیارترین ئەو کەسانەن کەلەژێر کاریگەری بۆ چونەکانی ئیبن خەلدوندا بوون. (ئەصبەحی)لەسەدەی حەوتەمدا ژیاوە، واتە ماوەیەکی کەم لەپاش کۆچی دوایی ئیبن خەلدون (٥). ئەو خەڵکی ئەندەلوس بودو کۆتایی سەردەمی موسوڵمانانی لەئەندەلوس دا دیتوە.بۆیە هەوڵی داوە پاشماوەی ئەو سەردەمە بپارێزێت ولەو پێناوەدا بەرەو میسر چوە بەنیازی ئەوەی سوڵتانی میسر بۆ ئەو مەبەستە ڕاچەنێنێ، ودڵ بێ سود بووە. ناوبراو پەرتوکێکی نوسیوە بەنێوی (بدائع السلك فى طبائع الملك).لەوکتێبەداهەوڵی داوە لەدانراوە کۆنەکانەوە هەرچی گوتراوە لەمەڕ سیاسەت کۆی بکاتەوە.بۆیە دەبینین لە (مقدمە)گەی ئیبن خەلدونیشەوە شتی زۆری وەرگرتوە. (٦) (مەقریزی)یش قوتابی ئیبن خەلدون بوەو زۆریش سەرسام بوە پێی. لەزۆرێك لە دانراوەکانی دا ڕێچکەی مامۆستاکەیی (وەرگێڕ)گرتوە ئەخاسمە لەکتێبی (اغاثة الامة بكشف الغمة) (٧) (ئیبن حەجەری عەسقەلانی) ڕایەکی سەیری هەیە بۆ لێکدانەوەی ئەو هۆیەی وای لە (مەقریزی) کردوە سەرسام بێت بە ئیبن خەلدون. عەسقەلانی دەڵێت گوایە مەقریزی سەربەبنەماڵەی فاتمیەکان بوە، بۆیە زیادەڕەویش دەکات لەگەورەکردنی ئیبن خەلدوندا چونکە ئیبن خەلدون توانیویەتی لە (مقدمە)گەی دا نەژادی فاتمیەکان بسەلێنێت وبەرگریەکی گەرم و گوڕیشی لێکردون.عەسقەلانی لەو ڕوەوە زیاتر دەدوێت و دەڵێت: مەقریزی بێ

ئاگایە لەمەبەستی ئیبن خەلدون لەسەلماندنی نەژادو ڕەچەڵەکی فاتمیەکان دا. بەڕای عەسقەلانی، ئیبن خەلدون نەبانە بەبنەماڵەی ئیمام عەلی. بۆیە نەژادی فاتمیەکانیشی داوەتەوە بەلای بنەماڵەی ئیمام عەلی دا تاکو لەکەیەك بخاتە پاڵ ئەو بنەماڵەیە. چونکە فاتمیەکان لەناو خەڵکی دا بەوە ناسراون کەبیرو باوەڕیان باش نەبووەو زۆر دەمارگیربون بۆ ڕێچکەی ڕافیزیەت وجنێودان بەسەحابەکان و بانگەشە کردنی خوایەتی. (جائەگەر ئەوان ئەوە حاڵ و باڵیان بوبێت وسەربەبنەماڵەی ئیمام عەلیش بن، ئەوا لەکەیەك نوساوە بەبنەماڵەی ئیمام عەلیەوە. ئەمەش هۆکارێك بوە بۆ تەرێز لێکردنیان) (٨)

هەرچۆن بێت دەتوانین بڵێین : زانستەکەی ئیبن خەلدون ئەو ڕەواجەی پێ نەدرا کەخاوەنەکەی چاوی تێ بڕیبوو.لەدەرەوەی ئەو چوارچێوە بەرتەسکەی ئاماژەمان پێدا ئیدی نەناسرا بوو. ڕەنگە ئیبن خەلدون زیاتر بەمێژووەکەی ناوبانگی پەیدا کردبێ وەك لەمقدمە مەزنەکەی. بەجۆرێ مقـدمەکەی لەسەر ڕەفەکاندا بەفەرامۆش کراوی مایەوەو بەدەگمەن نەبێ کەس نەی دەخوێندەوە.

بەڵگەش لەسەر ئەم قسەیە ئەوەیە (مقدمە)بەدرێژایی چەند سەدەی دواتر بەبێ هیچ لێکدانەوەو ڕاڤە کردن وپەراوێزلەسەردانانێك ماوەتەوە. بەپێچەوانەی دانراوە بەناوبانگەکانی تری ئیسلامەوە. بۆ نمونە ئەگەر (مقدمە)بەراورد بکەین بە (الفیەی ئیمام مالك)لە (نەحو)دا و ئەو هەموو هەوڵە ببینین کەنوسەران لە شرۆڤە کردنی (الفیە)دا وەگەڕیان خستوە، ڕادەی ئەو پشت گوێ خستنەمان بۆ دەردەکەوێت کەبەر (مقدمە)کەوتوە.

لەیەکێك لەبەشەکانی ئەم کتێبەدا، ئاماژەمان بەوە دا کەلەدوای ئیبن خەلدون شارستانیەتی ئیسلامی پێی نایە نێوسەردەمەتاریکەکانیەوە. خەڵکی گرنگی یان بە (نەحو)و (صەرف)وجوانی دەربڕین دەداله بریتی ئەوەی بایەخ بەکاروبارەکانی بویەری کۆمەڵایەتی بدەن، ئەمەش سروشتی ئەو قۆناغە ژیاریە

بوە کەپیایدا تێ پەڕیون.وادیارە کۆمەڵێ خەڵك لەم وڵاتەی هێمەدا تائێستاکەش بێ ئەوەی بەخۆیان بزانن لەناوها قۆناغێکدا دەژین.

ئیبن خەلدون تۆوی زانستە تازەکەیی داچاند، بەهیوای ئەوەی لەپاش خۆی گەشە بکات. وەك چۆن تۆوی دامەزرێنەرانی زانستەکانی ترگەشەی کرد.وەلێ ئەو لایەنێکی گرنگی ژیارو کۆمەلگەکەی خۆی فەرامۆش کردبوو. دەرکی بەوە نەکردبوو کەتۆوەکەی کەش و هەوای لەباری بۆ ناڕەخسێنێ تاکوگەشە بکات.

هەموو بیرۆکە تازەکان وەکو تۆو دەکرێن بەسەر زەوی دا. تۆویش ئەگەر خاکی لەباری دەست نەکەوێت بۆ نەش وتماکردن لەناو دەچێت ودەمرێت.

مامۆستا (مالیك بن نەبی)لەم بارەیەوە دەڵێت: (کارایی هەربیرۆکەیەك لەبیرۆکەکان یاخود زانیاریەك لەزانیاریەکان پەیوەستە بەرەخسانی بارودۆخی کۆمەڵایەتی وئابوری و دەرونی تایبەت کەببێتە یارمەتی دەر بۆ مەیین و بڵاو بونەوەی وکاریگەر بوونی. واتەکارایی بوونی پەیوەندیەکی نۆگانی هەیەبەسروشتی پەیوەندیەکانی بەو کۆمەڵە هەل و مەرجە دەرونی و کۆمەڵایەت تیانەوەکە دەبنە مۆرکی ئاستی شارستانیەت لەکۆمەلگەدا. نمونەش لەو ڕوەوە ئەوەیە کەکەلەپوری ئیبن خەلدون لەجیهانی ئیسلامی دا بەدەرکەوت، کەچی هیچ بەشداریەکی نەکرد لەبەرەو پێش چونی ئەقلی وکۆمەلآیەتی جیهانی ئیسلامی دا چونکە ئەو کەلەپورە... بریتی بوو لەبیرۆکە یەك کەهیچ پەیوەندیەکی نەبوو بەنێوەندی کۆمەلآیەتیەکەوە...) (٩)

## موقەدیمەو تورکەکان:

بەڕاستی جێگەی تێڕامانە کەدەبینین لەسەدەی حەڤدەوە تورکەکان بایەخ بە (مقدمە)دەدەن و شتی لێ وەردەگرن و دەچنە ژێرکاریگەری ئەو کتێبەوە. تەنانەت ماوەی یەك سەدە بەرلەوەی (مقدمە)بۆ زمانە ئەو روپیەکان وەربگێڕدرێ، بەزمانی تورکی وەرگێڕدرا. (١٠) ئەبێ هۆی ئەوە چی بێت؟.

تورکەکانیش وەك موسوڵمانەکانی ترو لەوسەردەمانەدا زیاتر گرنگی یان بەزانستی (نەحو)دەدالە بری ئەوەی بایەخ بەزانستی کۆمەڵناسی بدەن.کەواتە چی وای لێکردون ئەو گرنگی یە زۆرە بە (مقدمە)کەی ئیبن خەلدون بدەن؟.

مامۆستا (ساتع ئەلحەسری) لەلێکدانەوەی ئەو دیاردەیەدا دەڵێت: ئەو پرۆسە مەزنانەی فەتح کەدەوڵەتی عوسمانی پێ یان هەستا، وای دەخواست کۆمەڵێ مێژو نوسی فەرمی و نافەرمی سەرهەڵ بدەن. ئینجا ئەو مێژونوسانەش بەحوکمی ئەو ڕۆشنبیریەی کەلەو سەردەمەدا باوبوە، دانراوە عەرەبیەکانیان دەخوێندەوە. کەواتە شتێکی ئاسایشە کە موتاڵای مقدمەکەی ئیبن خەلدون یان کردبێت وپێی سەرسام بوبن و کاریگەریەکی گەورەیشی لەسەر دانابن (١١)بەبڕوای من ئەم لێکدانەوەیە لەڕاستی بێ بەش و خاڵی نیە. چونکە دەگونجێت ئەو ڕوداوە کۆمەڵایەتی و ڕامیاریە گرنگانەی کەلەفتوحاتی عوسمانی کەوتنەوە سەرنجی مێژو نوسە تورکەکانیان ڕاکێشابێت بەلای ئەو لێکدانەوە جوانانەی کەلە (مقدمە)دا هەن.وەلێ من پێم وایە سەرباری ئەو هۆکارەی کە (حەصری)باسی دەکات هۆکاری تریش لەئارادان. ئەم هۆکارانەش کاریگەری یان هەبوە لەوەی تورکەکان ڕوبکەنە (مقدمە)و گرنگی پێ بدەن.یەك لەو هۆکارانەش بەڕای من بریتی یە لەبۆچونی ئیبن خەلدون سەبارەت بەخەلافەت. بەتایبەت کە ئەو بۆچونە بەتەواوی وێك دێتەوە لەتەك بەرژەوەندی تورکەکان وبەرژەوەندی ئەو دەوڵەتەشدا کەلەژێرسایەی دا دەژیان.

لەبەشی پێنجەمی ئەم کتێبەدا باسمان لەوە کرد کەچۆن ئیبن خەلدون ناکۆك بوە لەگەڵ سەرجەمی شەرعناسەکاندا لەوەدا کەپێی وابوو قورەیشی بوون مەرجێ نیە بۆ خەلیفە. هەروەها ئاماژەشمان بوە کرد کەچۆن توانیبوی لێکدانەوەیەکی بەهێز بۆ ئەو بۆچونەی بکات. وادیارە عوسمانیەکان لەو بۆچونەدا ئەو مەرامەبزربوەی خۆیان دیوەتەوە کەلەمێژ بوە بەدوی دا وێڵ بوون. چون ئاشکرایە سوڵتانەکانی عوسمانی پروپاگەندەی خەلافەتیان بۆ خۆیان دەکرد ولەنەژادی قورەیشی یەکانیش نەبوون. ئینجا کۆدەنگی شەرعناسەکانیش لەسەر ئەوەی قورەیشی بوون مەرجێکە بۆ خەلیفە، زیانی دەدا لەعوسمانیەکان وپەستی دەکردن. یەك لەو ڕوداوە سەیرو سەمەرانەی لەم ڕووەوە دەگێڕنەوە ئەوەیە کەحکومەتی عوسمانی ماوەیەکی زۆر دودڵ بوو لەمۆڵەت دان بەچاپکردنی (صحیح النجاری) لەئەستانەدا. لەو کاتەدا کەتازە چاپخانە لەوێ دامەزرا بوو، لەبەر ئەوەی ئەو لەو کتێبەدا فەرمودەویەك هەیە کەدەفەرمێت خەلیفەکان لەقورەیشن. عوسمانیەکان بەزۆری دەمارگیرو شمشێر خۆیان سەپاند بەسەر جیهانی ئیسلامی دا.کەواتە بەپێی بیردۆزەکەی ئیبن خەلدون شایستەی خەلافەتن. وادیارە ئەمە هۆکارێ بوبێ کە (کەم تازۆرێ) بوەتە پاڵنەری ئەوەی مێژونوسانی عوسمانی.لەبەر ڕۆشنایی ئەو بیردۆزەدا لەدەوڵەتی عوسمانی بکۆڵنەوە.

هەرچۆن بێت ئێمەش دەتوانین وەکو (حەسری)بڵێین: ئەو گرنگی پێدانەی مێژونوسانی عوسمانی، لەچوار چێوەی لێوەرگرتن و نیگابەخشی دابوەو، پەلی نەهاویشتوە بەبەرفراوان کردن وبەدواچون) (١٢)بەدەربڕینێکی تر : ئەوانیش نەیانتوانیوە لەوقۆناغە فیکریە دەرچن کەتیایدا دەژیان.

## دەست پێکی بایەخ پێدان لەوڵاتە عەرەبیەکان دا:

لەوڵاتە عەرەبیەکان دا، هیچ گرنگی یەك نەدرایە (مقدمە)تاکو کۆتاییەکانی سەدەی ڕابردو (واتە سەدەی نۆزدە —وەرگێڕ)، تەنانەت ئەم بایەخ پێدانەش لەسەردتاوە هیچ نەبوو جگەلە (مۆدە)یەك، بەدەربڕینی مامۆستا (بۆتۆل) (١٢). وەك هەرمۆدەیەکی تریش لەئەوروپاوە هاتە نێو وڵاتە عەرەبیەکانەوە.

خەڵك لەوڵاتە عەرەبیەکاندا لەبەر ئەوە بایەخیان بە (مقدمە)ئەدا کەزانستێکیان تێدا دیبێتەوە بەسود بێ بۆ لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەکەیان. بەڵکو لەڕوی چاولێکەری ئەوروپیەکانەوە دەستیان کرد بەگرنگی پێدانی. کاتێ بینیان ئەوروپیەکان زۆر پێی سەرسامن و، وەری دەگێڕنە سەرزمانەکانیان ئەمانیش گوتیان: کەواتە دەبێ ئەو پەرتوکە شتێکی گرنگی تێدا بێت. بۆیە دەستیان کردە هەڵپە کردن بۆدەست خستن و موتاڵاکردنی.

ڕەنگە زۆربەیان لەخوێندنەوەی (مقدمە)دا دوچاری بێ ئومێدی بوبن، چونکە کاتێ دەستیان بەخوێندنەوەی کردوە، چاوەڕوان بوون پڕاو پڕی ئەوناوبانگە زلەی بێت کەبەرگوێ یان کەوتبوو.بۆنمونە میتۆدێکی قەشەنگ وەك ئەوەی (جاحظ)، یان بیرۆکەی باڵای وەك ئەوانەی فارابی و ئیبن ڕوشدی تێدا ببینن.کەچی ئەك هەرئەوانەیان تێدا نەدیوە، بەڵکو ڕاڤەی دورو درێژی کۆمەڵێ لەو دیاردانەیان تێدا دیتوەکە بەلایانەوە ئاسایی وبێ ئەرزشن وشایستەی ئەوە نین هزرڤان خۆی پێیانەوە سەرقاڵ بکات. هەر بۆنمونە (مقدمە)باس لە ئەریتی دەشتەکی وشارەکیەکان دەکات، ئەم شتانەش لەدیدی ئەواندا هیچ وەخت جێگەی بایەخ پێدان نین، چونکە ئەو شتانە ڕۆژانە لەکۆمەڵگەکانیاندا دەی بینین و پێیان ئاشنان، واتە هیچی وای تێدانیە کەتازە یاخود سەیر بێت. یەکێك لەوانەی

(مقدمە)ی خوێندبویەوە بەسەر سامیەوە لێی پرسیم : ئەریٚ ئەوروپیەکان کەئەوەندە سەرسامن بە (مقدمە)چییان تێدا دۆزیوەتەوە؟ ئایا خۆیان پەرتوکی لەوە باشتریان نیە؟!.

لەوەدا لۆمەی ئەو جۆرە کەسانە ناکرێت. چونکە لەهەمان ئەو قۆناغەدا دەژین کەلەسەردەمی ئیبن خەلدوندا خەلکی تیای دا دەژیان. دەیانەوێت نوسەر پێیان بلێت چی پێویستە لەسەریان بیکەن، نەك وەسفی کردەوەکانیان بۆبکات.

دەگێڕنەوە شێخ محمد عبدە کەلەسالی (١٨٨٨ زاینی دا)لەمەنفاکەی گەڕایەوە، هەولی دا قەناعەت بە (ئەنبابی)شێخی ئەوکاتە (ئەزهەر)بکات، تاکو لەزانکۆی ئەزهەردا (مقدمە)بخوێندریٚ وبەوردی باس لەگرنگی خوێندنی موقەدیمەی بۆ کردوە. (ئەنبابی)لەوەلامی دا دەلێت: (عادەت وەها نەبوە)دواتر ئەنبابی مەسەلەکە دەگۆڕێت لەترسی ئەوەی نەکا باسکردنی ئەو بابەتە ڕای بکێشێت بەرەو ئەوەی ڕێگە بدات بەخوێندنی موقەدیمە لەئەزهەردا. (١٤)لەولاتە عەرەبیەکان دا، گرنگی ڕاستەقینە بە (مقدمە)نەدرا، دوای ئەوە نەبیٚ کە (مۆدە)یەکی تر هاتە ئاراوە. ئەم مۆدەیەش بریتی بوو لەسەر هەلدانی ڕەوتی زانستی نویٚ. ئیدی بەسەرهەلدانی ئەم ڕەوتە هزرڤانان هەستیان کرد ئاتاجیان بەوە هەیە بەجۆرێکی واقیع بینانەو دوور لەهەرجۆرە وەعزو هەلسەنگاندنیٚ لەکۆمەلگەکەیان بکۆلنەوە. لەوانەیە زیادەڕەوی نەکەم ئەگەر بلێم: میسر یەکەمین ولاتی عەرەبی بوو کەگرنگی بەوە دا بەشێوازی زانستی لە (مقدمە)بکۆلێتەوە.ئەمەش شتێکی سەیر نیە.چونکە میسر لەوکاتەدا وتاهەنوکەش لەهەموو ولاتانی عەرەبی زیاتر کەوتۆتە ژێرکاریگەری شارستانیەتی نویٚ وە.پشکیٚ فراوانیشی بەرکەوتوە لەپەیڕەو کردنی ڕەوتی (ئەزمون کاری)لەلێکۆلینەوەدا. لەمیسریشەوە ئەم ڕەوتە نویٚ بەولاتە عەرەبیەکانی تردا بلاو بویەوە.

لەساڵی (١٩٣٢) دا بانگەشەیەك پەیدا بوو بۆ زیندو کردنەوەی یادی ئیبن خەلدون بەبۆنەی تێ پەڕینی (٦٠٠)ساڵ بەسەر لەدایك بوونی دا. نێوەندە زانستی و ویژەییەکانیش لەهەموو وڵاتانی عەرەبی دا بەدەم ئەم بانگەوازەوە هاتن، ئاهەنگ بۆ یادکردنەوەی سازکرا، ڕۆژنامەو گۆڤارەکانیش بابەت و لێکۆڵینەوەی جۆراو جۆریان لەسەر بڵاو کردەوە.هەنوکەش، لەساتە وەختی نوسینی ئەم دێرانەدا. (سەنتەری نەتەوەیی بۆ لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیەکان)لەقاهیرە ڤیستیڤاڵێکی گەورەی سازکردوە بۆ یاد کردنەوەی ئیبن خەلدون. لەزۆربەی وڵاتە عەرەبیەکانەوە نوێنەر بۆ ئەو ڤیستیڤاڵە بانگ هێشت کراوە. بەڕاستی ڤیستیڤاڵێکە ئێمە چاوەڕوانی هەموو شتێکی باشی لێدەکەین لەپێناو لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەی عەرەبی و لێکۆڵینەوە لەو کەسایەتیەش کەبۆ یەکەمین جار بەگوێرەی ڕێڕەوێکی (ئەزمونکاری واقیعی)لەو کۆمەڵگەیەی کۆڵیوەتەوە. (١٥)

## ئیبن خەلدون لەئەوروپادا :

لەچاخەکانی ناوەڕاست وسەرەتای چاخە تازەکانیشدا، ئەوروپیەکان هیچیان لەبارەی ئیبن خەلدونەوە نەدەزانی. چونکە ئەوانیش لەوکاتەدا لەهەمان ئەو قۆناغە فیکریەدا دەژیان کەزۆرینەی خەڵکی لەوڵاتانی تریش دا تیای دا ژیاون.هەرلەبەر ئەوە لەوکاتەدا تەنیا گرنگی یان بەئیبن سیناو ئیبن توفەیل وئیبن ڕوشد... هتد دەدا.

لەچاخە تازەکانیش دا، دێرین ترین کەسێ سەرنجی ئەوروپیەکانی بەلای (مقدمە)دا ڕاکێشابێ، ڕۆژهەڵاتناسێکی فەرەنسی بوو بەناوی (دەربلو). ئەو لە دانراوەکەیدا (کتێبخانەی ڕۆژهەڵاتی)لەساڵی (١٦٩٧)دا، وتارێکی نوسی وهەندێ وەردە زانیاری لەبارەی ئیبن خەلدون دوەو هەندێ پەرەگرافی نێو (مقدمە)یش تێ ئاخنی. بەڵام (دەربلو) لەلێکۆڵینەوەکەی دا سەری لێ تێك چوەو کەوتۆتە چەند هەڵەیەکەوە، سەرکەوتوش نەبوە لەدەرخستنی گرنگی ئیبن خەلدون و ڕەسەنایەتی توێژینەوەکانیدا. (١٦)

لەسەرەتای سەدەی نۆزدەدا، ئەوروپیەکان بەجدی ئاوڕیان دایەوە بەلای ئیبن خەلدوندا. شۆڵتزی ئەڵمانیش یەکەمین کەس بوو کەئاماژەی دا بەبەهای زانستی ئیبن خەلدون. ناوبراو لەساڵی (١٨١٢)دا بەزمانی ئەڵمانی سیپارەیەکی نوسیوەو تیای دائیبن خەلدونی نرخاندوەو بە (مۆنتسیکۆی عەرەب)ناوزەدی کردوە. لەساڵی (١٨٢٢) شدا وتارێکی بەزمانی فەرەنسی لەگۆڤاری (الاسیویە)دا بڵاو کردۆتەوەو پەردەی لاداوە لەڕوی ڕەسەنایەتی لێکۆڵینەوەکانی ئیبن خەلدون وگەشتۆتە ئەو بڕوایەی کەبڵێت: لەنێو دانراوە ڕۆژهەڵاتیەکاندا هیچیان لە (مقدمە)شایستە ترنین بۆ ئەوەی بەتەواوی پەرچڤە بکرێن. بۆساڵی داهاتوش لەهەمان گۆڤاردا وتارێکی تریبڵاو کردەوەو دوپاتی هەمان بۆچونی کردەوە"دەربڕینی وەرگێڕ".

لەوکاتەوە ئیتر ئەوروپیەکان دەستیان کردە گرنگی دان بە (مقدمە)وپەرچڤەکردنی بۆ زمانە جیا جیا کانیان. شیاوی باسکردنە لەم بایەخدانەدا فەرەنسی یەکان پشکی هەرە گەورەیان بەرکەوت. لەساڵەکانی (١٨٦٢-١٨٦٨) داله فەرەنسا وەرگێڕدرانێکی تەواوی (مقدمە)لەسێ بەرگ دا بڵاو کرایەوە لەو وەرگێڕانەدا پێش دەستیەکی دوورودرێژ نوسراوەو تیای دا پێناسەی دانەری پەرتوکەکەو ڕاڤەکردن وپەراوێز دانان بۆهەندێ لە ڕستەو دەربڕینەکانی کراوە. ئەم کارەش لەلایەن (دۆسلان)ی‌ڕۆژ هەڵاتناسەوە جێ بەجێ کراوە.ئەم پەرچڤەیە کاریگەریەکی گاڵتەی پێ نەکراوی هەبوو لەوەی ئەوروپیەکان بەگشتی و فەرەنسیەکان بەتایبەتی سەرسام بن بەئیبن خەلدون.

وادەردەکەوێ یەکێك لەهۆکارانەی کەوایان کروە فەرەنسایيەکان زیاترلەئەوروپیەکانی دیکە بایەخ بە ئیبن خەلدون بدەن. ئەوە بوو فەرەنسا لەوکاتەدا دەستی بەسەر جەزائیردا گرتبوو، چاویشی بڕیبویە ئەوەی دەستەڵاتی خۆی بسەپێنێت بەسەر وڵاتە کانی تری مەغریبی عەرەبیدا. ئینجا لەبەرئەوەی (مێژووەکەی ئیبن خەلدون و (مقدمە)یەکەمین سەرچاوەیەکن بەتێرو تەسەلی لەمێژوی مەغریب و وەسف کردنی کۆمەڵگەکەی دوابن.کەواتە هیچ جێگەی سەرسامی نیە کەئەو دووسەرچاوەیە بوینە جێگەی‌گرنگی پێدانی فەرەنسی یەکان. لەوانەیە گەرەکیان بوبێت لەنێو دانراوەکانی ئیبن خەلدوندا میکانیزمێ بدۆزنەوە بۆ زاڵ بون بەسەر ئەو وڵاتانەدا. ئەمە لەلایەکەوە، لەلایەکی تریشەوە لەوکاتەدا تازە بەتازە سەرەتاکانی زانستی کۆمەڵناسی نوێ لەفەرەنسادا سەری هەڵدەدا. لەساڵی (١٨٣٥)دا (ئۆجست کۆنت)کتێبێکی نوسی وتیای دا ناوی زانستی کۆمەڵناسی (S ociologie)دۆزیەوەو سەرنجی هەموانیشی ڕاکێشا بەرەو گرنگیدان بەوزانستە و پێویستی لێکۆڵینەوەو گەشە پێدانی. ئەم ڕوداوەش وایکرد خەڵکی زیاتر گرنگی بەئیبن خەلدون بدەن وسەرسام بن پێی.

## کێ دامەزرێنەری زانستی کۆمەڵناسی یە؟

زۆرێك لەتوێژەران ڕایان وایە (ئۆجست کۆنت)یەکەمین دامەزرێنەری زانستی کۆمەڵناسی نویٚ یە. ئینجا لێرەدا ئەم پرسیارە ڕووبەڕومان دەبێتەوە: ئایا کۆنت بەشێك یان هەموو (مقدمە)ی‌ئیبن خەلدونی خوێندۆتەوە؟ ئەگەر خوێندویەتیەوە ئایا هیچ سودێکی لیٚ وەرگرتوە لەدارشتن ودروست کردنی زانستە تازەکەی دا؟.

(دکتۆر عبدالعزیز عزت)ڕێی وایە تێگەشتنی داینامیکی کۆمەڵگەی ئیبن خەلدون جیٚ پەنجەی دیاری هەبوە لەسەر لەدایك بونی زانستی کۆمەڵناسی لای کۆنت. بە بۆچونی (دکتۆر عزت)کەش وهەوای زانستی لەسەردەمی کۆنت دا ئاشنا بوەبە ڕاکانی ئیبن خەلدون و هەندیٚ لەدانراوەکانیشی بەزمانی فەرەنسی هەبوون. ئینجا ناگونجێت پیاوێکی وەکو (کۆنت)کەبەتەنگ زانستی کۆمەڵناسی یەوە بووە، بیٚ ئاگا بوبێت لەوەی لەمەڕ ئەو زانستە لەئارادا بوە. (دکتۆرعزت)باسی ئەوە دەکات کە (کۆنت)دابڕاو نەبوە لەکەش و هەوا ڕۆژهەلاتیەکە، بەلکو سیٚ قوتابی هەبووە هەرسێکیان خەلکی میسر بوون، یەکێکیان ئەندازیار (مەزهەربەگ) بوو. کۆنت هیوای بەو ئەندازیارە هەبوو تابیروڕاکانی لەڕۆژ هەلاتی ناوین دا بۆ بلاو بکاتەوە.ئەم پەیوەندیەی نێوان (کۆنت)وقوتابیە میسریەکانی، هەردەبیٚ بوبێتە هۆی ئاشنا کردنی بەڕاکانی ئیبن خەلدون. (١٧)

لام وایە ئەو بۆچونەی کە (دکتۆر عزت) هێناویەتە گۆڕیٚ زۆر گرنگە. چونکە درگای لێکۆلینەوەیەکمان بەڕودا دەکاتەوە کەئێمە دەتوانین بەهۆیەوە پێوەندی ڕاستەو خۆی نێوان ڕاکانی ئیبن خەلدون و ڕاکانی (کۆنت) بدۆزینەوە. هەرچەندە من گومانم وایە ئەگەر ئەو پەیوەندیە هەبوبێتیش هێندە بەهێزو

پشت ئەستور نیە کەوامان لێبکات بڵێین: (کۆنت)زانستە نوێیەکەی لەنێو هەمان ئەو چوار چێوە فیکریەدا دامەزراندوە کەئیبن خەلدون زانستی (ئاوەدانی)تیادا دامەزراند.

ئاشکرایە (کۆنت)ڕیشاڵە بناغەییەکانی بیرکردنەوەی لەو کەلەپورە فیکریەوە وەرگرتوە کە لەو سەردەمەدا لەئەوروپادا بڵاو بوە. دوریش نیە موتاڵای هەندێ لەبۆچونەکانی ئیبن خەلدونی کردبێت و کەلکیشی لێ وەر گرتبێ. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆنت لەڕوی بیرکردنەوەوە لەشێوازی ڕۆژ ئاواییەوە نزیك تربوە، وەك لە شێوازی عەرەبی خەلدونی یەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کەدەوێنین زانستە کۆمەڵناسیەکەی کۆنت لەڕوی ئەدگارو هێڵە گشتی یەکانیەوە جیاوازیەکی زۆری هەیە لەگەڵ زانستی کۆمەڵناسی خەلدونی دا.

هەندێ لەتوێژەرانی عەرەب هەوڵ دەدەن نازناوی (دامەزرێنەری زانستی کۆمەڵناسی) لە (کۆنت)دارنن و بیبەخشنە ئیبن خەلدون بەو پێی یەی کەئیبن خەلدون نزیکەی (پێنج)سەدە لەپێش (کۆنت)دا لەو زانستە دواوە. سەیریش لەوە دایە کەهەنێ لەئیتاڵیەکانیش لە بەرانبەر (فیکۆ)ی فەیلەسوفیان دا کەلەسەدەی پازدەهەمدا ژیاوە، هەمان ڕەوشت پەیڕەو دەکەن. ئەوانیش نازناوەکە بە (فیکۆ)دەدەن و لە (کۆنت)ی دادەڕنن. کۆمەڵێکی تریشی هەن حەز دەکەن نازناوەکە بەکەناسێکی تر ببەخشن.

لەڕاستی دا ئیبن خەلدون فەزڵێکی نکول لێ نەکراوی هەیە لەدانانی بەردی بناغەی زانستی کۆمەڵناسی دا، بێ شك و دودڵی لەو ڕوەوە پێشی هەموان کەتوە. وەلێ لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانین بڵێین: ئەو بەرلەوادەی گونجاو بناغەکەی دارشت، بۆیە بینا لەسەر ئەو بناغەیە نەکرا. ئیبن خەلدون لەمەدا لە ئەندازیارێکی لێهاتو دەچێ کە بناغە بۆ ئاپارتمانێك بەدیزاینێکی نوێ وە دادەڕێژێت. ئینجا دەمرێت و لەدوای خۆی کەسێك نابێ لەسەر ئەو بناغەیەوە باڵەخانەکە دروست بکات. بەو جۆرەش بناغەکە لەسەر زەوی دا بەفەرامۆش کراوی دەمێنێتەوە.

لەدوای گوزەر کردنی کاتێکی دورو درێژ واتە کاتێ خەڵك ناتاجیان بەئاوا کۆشکێك دەبێت، بۆ خۆیان بناغەیەکی تازە دادەڕێژن و ئاوڕ نادەنەوە بەلای ئەو بناغەیەدا کە ئەندازیاری پێشوو دای ڕشتبوو.

دەگونجێت بگوترێ، ئەو بناغەیەی ئیبن خەلدون دای ڕشتبوو زۆر قایم و قوڵ ترو ڕەسەنانە ترە وەك لەوەی (کۆنت)دای ڕێژاوە.بەڵام (کۆنت)لەکاتێکدا بەدەرکەوتوە کە گەش و هەوا فیکریەکە ناتاجێکی زۆری هەبوو بۆ زانستێ گەلەبارەی کۆمەڵناسیەوە بدوێ. بۆیە خەڵك گوێ یان بۆ هاوارەکەی شنەوت. ئیدی لەدوای خۆی زانستی کۆمەڵناسی یەکبینە گەشەی دەکردو بەرەو پێش دەچوو تاگەشتە ئەم ئاستەی کەهەنوکە دەی بینین. دەگونجێت بڵێین: دوو زانستی کۆمەڵناسی هەیە، یەکێکیان ئەو زانستەیە کە لەسەدەی حەوتەمی کۆچی دا ئیبن خەلدون بناغەی بۆ دارێژا، دواتر فەرامۆش کراو ئاوڕی لێ نەدرایەوە. دوەمیشیان ئەو زانستە کۆمەڵناسیە مۆدێرنەیەکە ئێستاکە لەقوتابخانەکانماندا دەخوێندرێ.

## بایەخی ئۆ ژست کۆنت:

(ئۆژست کۆنت)لەکاتی گونجاودا بەدەرکەوت. واتە لەو کاتەدا بەدەرکەوت کەهزرڤانان لەو بیرۆکە ئایدیا یبە توندڕەوانە قەلّس وبێ ئومێد بوون کەدیاردە کۆمەلآیەتیەکانی پێ لێك دەدرایەوە. بەلّکو خوازیاری بیرۆکەیەك بون کە دابەزێتە سەر زەمینەی واقع و بەجۆرێکی ئەزمونکاری لێی بکۆلّێتەوە.

(کۆنت)فەیلەسوف بوو، فەلسەفەکەی خۆیشی بەنێوی فەلسەفەی وەزعی (واقیعی -Philsophie Positive)ناودێرکرد.لەئەنجامدا بیردۆزێکی هێناوەتە کایەوەو بەگوێرەی ئەو بیردۆزە ڕاڤەی ئەو قۆناغانە دەکات کەهزری ئادەمیزاد پیایاندا تێ پەڕیوە. سەرەنجام دەگاتە ئەو بڕوایەی کەکاتی ئەو هاتوە توێژەران بەگوێرەی واقیع و ئەوەی کەهەیە لەکۆمەلّگە بکۆلّنەوە. پوختەی بیردۆزەکەی "کۆنت" ئەوەیە کەپێی وایە هزری ئادەمیزاد بەدرێژایی مێژوو لەمیانەی پێشڤە چونی دا بەم سێ قۆناغەدا گوزەری کردوە: قۆناغی ئاینی و قۆناغی میتافیزیکی و قۆناغی وەزعی "واقعی " لەقۆناغی یەکەمدا هزر هەولّ دەدات مەسەلەکان ببەستێتەوە بەهزرێکی دەرەکی وەك خواوەندەکان یان پەری و یاخود شەیتانەکانەوە. ئەم جۆرە لێك دانەوەیە لەنێو هەموو گەلەسەرەتاییەکان وزۆرینەی گەلە دێرینەکاندا باو بووە. تاهەنوکەش بەپلەی ناچونیەك کاریگەری لەنێو جۆراو جۆرەکاندا ماوە. بۆ نمونە: ئەگەرجەنگێکی وێرانکەر ڕوبدات خەلّکی لەلێکدانەوەی دا دەلّێن : خودا ویستویەتی هەلآیستی تاکو بە هۆیەوە سزایان بدات لەسەر تاوانەکانیان. یاخود ئەگەر یەکێکیان توشی سەرکەوتنێکی لەناکاو ببێت لەژیانی دا دەلّێن بەهۆی نوشتەو جادویەکی بەهێزەوە بوە یان دەلّێن بەهۆی ئەو خانوە تازەیەوە بوە کە گواستویەتیەوە ناوی... هتد.

لەقۆناغی دواتردا، واتە لەقۆناغی میتافیزیکی دا، خەڵکی هەوڵ دەدەن ڕوودانی دیاردەکان بگێڕنەوە بۆ هێزێکی نادیارو دەست نیشان نەکراو. ئەم قۆناغەش بەبەراورد لەگەڵ قۆناغی پێشوتردا بەقۆناغێکی پێشکەوتوو دەژمێردرێ. چونکە لەم قۆناغەدا هزری خەڵکی ئاوەڵا بوە بۆ ئەوەی بەدوی ئەو هێزانەدا بگەڕێن کەلەناو خۆی دیاردەکانەوە دیاردەکان دەبزوێنن نەك لەدەرەوەیان دا. ئەمەش یەکەمین هەوڵ بوە بۆ لێکۆڵینەوە لەو ڕێسایانەی کەگەردون (بەهەموو دیاردەکانیەوە)دەبزوێنن.وەڵێ هەرچۆنی بگری هەوڵێکی ناتەواو بووە، چونکە پشت بە لێهەڵگواستنی لۆژیکی و بیرکردنەوەی ئەبستراکت دەبەستێ. فەیلەسوفە کۆنەکانی ئیغریق وایان دەکرد زۆرینەی فەیلەسوفەکانیش تائەم ماوە نزیکانەش چاویان لەوان دەکرد. هەرگا دیاردەیەکیان دیبێ کەبەشێوەیەکی ڕێك وپێك وجار لەدوای جار دوبارە بوبێتەوە، گوتویانە دوبارە بونەوەی بەو شێوەیە دەگەڕێتەوە بۆ هێزێکی پەنامەکی کەهەمیشە بەیەك شێواز کاریگەری لەسەر ئەو دیاردەیە دادەنێت. دواتر بەئەنقەست ئەو بۆ چونەیان دەگشتێنن واتە کاریگەری ئەو هێزە دەکەنە یەکێك لەو زەروراتە ئەقڵیانەی کەنابێت دووکەس لەئاقاری دا دەمبەدەمە بکەن.لەکۆتاییشدا قۆناغی سێ هەم دێت، ئەمیش ئەو قۆناغە واقیعی و زانستی یەیە کەپشت بەئەزمونکاری دەبەستێت و، هەوڵ دەدات شۆڕببێتەوە بەپشتی دیاردەکەدا تاکو ئەو فاکتەرە واقیعی یانە دەست نیشان بکات کە بونەتە هۆی ڕوودانی دیاردەکە. لەم قۆناغەدا ناگونجێت توێژەر لێکۆڵینەوەکانی لەسەر بناغەیەکی لۆژیکی ئەبستراکتیکی بنیات بنێ. بەڵکو پێویستە لەسەرەتاوە خۆی دابڕنێ لەهەر گشتاندنێکی پێش وەخت و دواتر بەمێشکێکی سافەوە دەست بکات بەتوێژینەوە، تاکو ئەزمون و لێکۆڵینەوەی واقیعی بەرەو هەر لایەکی دەبەن، بیبەن.

کۆنت ویستی ئەم بیردۆزە بکاتە (پێشەکی) یەك بۆ ئەو زانستە کۆمەڵناسی یەی کەگەرەکی بوو دایمەزرێنێ. لەمەشدا جیا دەبێتەوە لەئیبن خەلدون کە (زانستی ئاوەدانی)داهێنا بۆ ئەوەی بیکاتە (پێشەکی)بۆ لێکۆڵینەوە لەمێژوو.

هەروەها کۆنت هەوڵی دا لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتی پێشکەش بکات بەو پێی یەی کەنمونەیەکەو پێویستە زانستی کۆمەڵناسی نوێی لەسەر دابمەزرێنرێ. ئێمە لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە بزانین ئایا کۆنت لەو لێکۆڵینەوەیەی دا سەر کەوتوو بوە یان ژێرکەوتوو بوە. گرنگ ئەوەیە بزانین (کۆنت) سەرکەوتوو بوە لەناو نانی زانستی کۆمەڵناسی و سەرنج ڕاکێشانی توێژەراندا بەرەو بەردەوامیدان بە لێکۆڵینەوە لەو زانستەدا. بەوەش بوەتە شایانی ئەوەی نازناوی (دامەزرێنەری زانستی کۆمەڵناسی) پێ بدرێ.

هەوڵەکانی (کۆنت) بۆ ڕون کردنەوەی ئەو هەڵەو ناتەڕاویە بوو کەلە ڕێچکەی متیافیزیکی دا هەیە لەلێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەدا. بەبڕێکی تریش دا هەوڵی دەدا ئەو لێکۆڵینەوەیە لەسەر پێڕەوێکی نوێ بنیات بنرێ. واتە لەسەر ئەو پێڕەوە واقیعی یەی کەزانستە سروشتیەکانی لەسەربنیات دەنرێ. دەکرێت بڵێین : بایەخی (کۆنت)بۆزانستی کۆمەڵناسی، وەك بایەخی (بیکۆن)وایە بەنیسبەت زانستە سروشتی یەکانەوە. گرنگی هەر دوو کیشیان لەو بانگەوازە دایە کەکردویانە بۆ پێڕەو کردنی ڕێڕەوێکی نوێ، پتر لەوەی لەلێکۆڵینەوە لەسەر بنەمای ئەو ڕێڕەوەدا بوبێت.

## پرسیارێكی گرنگ:

ئاشكرایە زانستی كۆمەڵناسی یەكێكە لەو زانستانەی كەتازەكی سەریان هەڵداوە، ئەگەر نەڵێین تازە ترین زانستیشە. هەنوكە تەمەنی لەسەدەیەك و كەمێك زیاتر تێ ناپەڕێت. ئەمەش تەمەنێكی كورتە لەچاو تەمەنی زانستەكانی تردا. پرسیاریش لێرەدا ئەمەیە : بۆچی هزرڤانان گرنگی یان داوە بە لێكۆڵینەوە لەدیاردە جۆراو جۆرو دورو نزیكەكان. كەچی توێژینەوەی ئەوكۆمەڵگەیە یان فەرامۆش كردوە كەتیای دا دەژین؟ئایا لەكۆمەڵگەدا هیچ شتێ وانیە كەسەرنجیانی ڕاكێشابێت و هانی دابن بۆ لێكۆڵینەوەی؟.

هەندێ لەزانایانی كۆمەڵناسی هاوچەرخ هەوڵیان داوە وەڵامی ئەو پرسیارە بدەنەوە، یەكێك لەوانە مامۆستا (فلۆید هۆز)دكەلەوەڵامدا ئاوها دەدوێت: (٨)كۆمەڵگەی مرۆڤایەتی تاكو سەردەمێكی نێزیك وەكو كۆمێكی مەنگ وابوو، گۆڕانێكی وای بەسەردا نەدەهات كە جێگەی سەرنج و تێڕامان بێت. چونكە دیاردە كۆمەڵایەتی یەكان كە خۆیان لەنەریت وخووە جۆراو جۆرەكاندا دەبینی یەوە بەدرێژایی تەمەنی تاكە كەسێك گۆڕانیان بەسەردا نەدەهات. كەواتە تاكە كەس هەست ناكات بەوەی ئاتاجێ هەیە بۆ لێكۆڵینەوە لەو دیاردانە بەشێوەیەكی زانستی. بەڵكو وەك شتێكی ئاسایی دەیبینێ كەهیچ پێویست بەلێكدانەوەو شرۆڤە كردن ناكات. ئینجا بیر لەكۆمەڵگە ناكاتەوە لەسنوری ئەو خو ونەریتانەدا نەبێت كەمتمانەی تەواوی پێكردون و برِوای بەڕاستی و دروستی یان هەیە.

تاكەكەس لەوكاتەدا دەست بەبیركردنەوەی زانستیانە دەكات لەكۆمەڵگە، كەدەبینێت دیاردە كۆمەڵایەتیەكان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لەبەرچاوی دا دەگۆڕێن. لەم چاخانەی دوایی دا گۆڕانكاریەكان بەو شێوەیە بون. بۆیە مرۆڤ سەرسام دەبوو، پرسیاری دەكرد لەو نەریتانەی كەلەسەری ڕاهاتبوو: ئەبێ ڕادەی ڕاستی و دروستی ئەو نەریتانە چەند بێ؟هۆكارو دەرەنجامەكانی چین؟ بۆچی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گۆڕانیان بەسەردا دێت؟ جیاوازی نێوان ئەو نەریتانەو شتە خراپ و

باشەکانی تر چیە؟... بەوجۆرە مرۆڤ پێویستی بەکەسێك دەبێت تاوەڵامی ئەو پرسیارانەی بداتەوە ونهێنی یەکانی بۆ ئاشکرا بکات. ئیدی ئاتاجێ پەدەردەکەوێ بۆ زانستی کۆمەڵناسی، ئەو دەمە لەنێو هزرڤانانیش دا کۆمەڵێکیان خۆیان بەو زانستەوە سەرقاڵ دەکەن. لەوەی ڕابورد بۆمان دەردەکەوێ کەمەسەلەکە تاکەکەسی نیە، بەڵکو دەستە جەمعیە جاخەڵکی لەسەردەمانی پێشودا پێویستیان بەزانستی کۆمەڵناسی نەبوە، بەڵکو قەناعەتیان بەو بیرۆکە کلاسیکی یانە هەبوە کەلەباوانیانەوە سەبارەت کارو بارە کۆمەڵایەتیەکان بۆ یان مابویەوە.ئەگەر ڕوی دابا یەکێکیان بەکۆمەڵگە جیاجیاکاندا بگەڕایەو چاوی بەنەریتە جیاوازەکان بکەوتایەو هەوڵی بدایە لەهۆکاری ئەو جیاوازیە بەجۆرێکی بابەتیانە بکۆڵێتەوە. خەڵکەکە لێی تورە دەبون و نەفرەتیان لێ دەکرد، چونکە لایان وابوو گومان لەڕاستی نەریتە پیرۆزەکانیان دەکات، یاخود گەرەکیەتی قەوارەی کۆمەڵایەتییان برمێنێ. تەنانەت ئەگەر توێژەرێکی وا بیتوانیایە بەهەر ڕێگەیەك خۆی قوتار بکات لەتوڕەیی ئەو خەڵکە، ئەوا بەلایەنی کەمەوە نەی توانیوە ڕەزامەندی وسەرسامی وان بەدەست بێنێت.

نکولیی ناکەین لەوەی لەسەرەتای چاخەتازەکاندا زانستە سروشتی یەکانیش ڕو بەڕوی ئاوا هەڵوێستێ بونەتەوە"دەربڕینی وەرگێڕ". بۆنمونە: ئێمە دەزانین کەچۆن خەڵکی تورە بون لە (گالیلۆ)لەکاتێکدا کۆمەڵێ ڕاو بۆچونی تازەی هێنایە کایەوە لە بواری زانستی گەردونناسی و فیزیادا.ئینجا لەسزای خەڵکی قووتار نەبوو تاکو ڕای گەیاند کەلەو ڕاوبۆچونانەی دا بەهەڵەدا چوە.بەڵام پێویستە ئەوەشمان لەبیر نەچێت، کەزانستە کۆمەڵایەتیەکان بەئەندازەی زانستی کۆمەڵناسی توخنی بیروباوەڕەکانی خەڵکی ناکەون.ئەم زانستە دەچێتە نێو کرۆکی قەوارەی کۆمەڵایەتیەوە کە زۆرێك لەخەڵکی لەبەدەستهێنانی ڕۆزی (بژێوی)وپلەو پایەو دڵنیایی دەرونیاندا پشتی پێ دەبەستن. کەواتە هەردەبێ لەو توێژەرە تورە بن و جۆرەها تۆمەتی پێوە بلکێنن.

## لێکدانەوەیەکی تر:

مامۆستا (مارتندیل)لێکدانەوەیەکی تری هەیە بۆ دواکەوتنی سەرهەڵدانی زانستی کۆمەڵناسی، بەڕای وی ئەدەگونجا ئەو زانستە بەرلەکاتی سەرهەڵدانی لەئەوروپادا سەری هەڵبدایە. چونکە کارێکی تاکەکەسی نیە تاکو پیاوێکی بلیمەت پێی هەستێ و لەکات و شوێنی خۆی ڕیز پەڕبێت. بەڵکو بەرئەنجامی پێشڤە چونێکی فیکری و دورو درێژە. ئەم پێشڤە چونەش لەکاتێکدا ڕوی دا کەزۆرینەی ئەو زانست و بیرۆکانەی لەشارستانیەتی مۆدێرنی ئەوروپادا سەریان هەڵدا بوو، پێکەوە موترو بەکران و لەسەریەکتری کەڵەکە بوون.

مامۆستا (مارتندیل)لەکۆتایی دا پێ دادەگرێت لەسەر پەیوەندی نێوان سەرهەڵدانی زانستە سروشتی یەکان لەئەوروپادا لەلایەك و لەدایك بونی زانستی کۆمەڵناسیش لەلایەکی ترەوە.

زانستە سروشتیەکان دوای ئەوە بەم شێوە سەیرو سەرنج ڕاکێشە سەری هەڵدا، کە (فرانسیس بیکۆن)بەبانگەوازە بەناوبانگەکەی زەمینە سازی بۆ کردو داوای کرد پەیڕەوی لەلۆژیکێکی ئەزمونکاری نوێ بکرێت کەجیاواز بێت لەو لۆژیکە هەڵگواستە کاری (ئیستینباگی)یەی کەلەکۆن دا بەسەر ئاوەزو مێشکی خەڵکیدا زاڵ بوو. لەدوای ئەوەی زانستە سروشتیەکان گەشەیان کرد، خەڵکی هەوڵیان داڕێڕەوی ئەزمونکاری زانستە سروشتیەکان لەبواری لێکۆڵینەوەی دیاردە کۆمەڵایەتیەکانیش دا پراکتیزە بکەن. لەئەنجامیش دا زانستە کۆمەڵایەتیە جیاجیاکان و لەنێویشیاندا زانستی کۆمەڵناسی نوێ سەری هەڵدا. (٩)

ئەم بۆچونەی (مارتندیل)لەڕاستی خاڵی نیە، یان لەوانەیە تاڕادەیەکی زۆر ڕاستی تێدا بێت. بەڵام ناگرێت بەتەنها دەست بەو ڕایەوە بگرین بەدوور لەو ڕایەی مامۆستا (هۆز)کەپێشتر ئاماژەی پێدرا.چونکە ئەو دوو ڕایە پێکەوە

یەکتری تەواو دەکەن. ئێمە دەزانین هەندێ لەزانستە کۆمەڵایەتیەکان وەك زانستی ئابوری یاخود ئەنسرۆپۆلۆژیا، ماوەیەکی زۆر بەرلەزانستی کۆمەڵناسی سەریان هەڵداوە.دەی کەواتە لێکدانەوەی ئەوە چیە؟.

لێرەدا گرنگی بۆچونەکەی (هۆز)بەدەردەکەوێت. لەبەر ڕۆشنایی ئەو بۆچونەدا دەگرێت بێژین: زانستی کۆمەڵناسی پتر توخنی بیروباوەڕو نەریتەکانی خەلکی دەکەوێت وەك لەزانستی ئابوری و ئەنژۆپۆلۆژیاو...هتد. بۆ نمونە نسرۆپۆلۆژیا کەلەهەموو زانستەکانی تر زیاتر لەزانستی کۆمەڵناسی یەوە نێزیکە. سەیر دەکەین لەگەلانی سەرەتایی دەکۆلێتەوە. خەلکیش بەلایانەوە ئاساییەکە لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو گەلانەو بیروباوەڕەکانیان بکرێت. تەنانەت لەوانەشە چێژی لێ وەر بگرن چونکە شتی سەیروسەمەرەی تیادا دەبینین. نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو زیاتر لوت بەرز دەکەنەوە کەدەبینین خورافەچێتی مێشك و هزری گەلانی بەرایی داگیر کروە لەکاتێکدا ئەمان (بەبۆچونی خۆیان)لەو خورافەچێتی یە بەدورن. بەڵام کاتێ زانستی کۆمەڵناسی بێت و پێیان بێژێت بنەڕەتی نەریتەکانی ئێوەش هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەڵ نەریتەکانی گەلانی سەرەتایی دا. لەوکاتەدا ئازار دەچێژن و تورە دەبن.

## بەرئەنجام:

زانایانی دیکەش بۆچونی جۆراو جۆری تریان دەربڕیوە، وەلێ سەرجەمی ئەو ڕایانە خەریکە بگەنە هەمان ئەو بەرەنجامەی کە ئەو دوو بۆچونەی ڕابردو پێی گەشتون. ئەنجامەکەش ئەوەیە: ئەددگرا زانستی کۆمەڵناسی بەر لەو وادەیە سەری هەڵبدایە گەلەسەدەی نوزدەدا لە ئەوروپادا سەری هەڵدا.چونکە دەستکردی تاکە کەسێك نیە کە تۆوەکەی فڕێ بدات تاکو لەدوای خۆی گەشە بکات. بەڵکو بۆ گەشەو نەش و نماکردنی تۆوەکە پێویستە کۆمەڵێ خەڵکی تر چاودێری بکەن. پێویستیشە خەڵکی ئاتاجیان بەو چاودێری کردنە هەبێت.

زانست بەشێوەیەکی گشتی هیچ نیە جگەلە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی، بۆیە بەتواناو کۆششی تاکەکەسێك گەشەناکات، بەڵکو وەکو هەردیاردەیەکی تری کۆمەڵایەتی گەشە دەکات. ئەگەر کەسێکی بیلمەت، بواری بۆ ڕەخسا تاکو پێشی سەردەمەکەی بکەوێ و زانستێکی تازە بنیات بنێ. بەر لەوەی لەکۆمەڵگەدا ئاتاجێ هەبێ بۆ ئەو زانستە. ئەوا چارەنوسی زانستەکە فەرامۆش کردن و لەبیر چونەوە دەبێت. چارەنوسی زانستە کۆمەڵناسیەکەی خەلدونیش بەو ئاستە گەیشت.

لەبەشێکی ئەم بەشەدا گوتمان شارستانیەتی ئیسلامی لەماوەی گەشەکردنیدا ژان دەیگرت تاکو کۆمەڵناسێکی بلیمەتی وەکو ئیبن خەلدون بەرهەم بێنێت. بەڵام دواتر ئەی توانی چاودێری ئەو تۆوە بکات کە ئیبن خەلدون دای چاند، بۆیە تۆوەکە لەناو خاکدا بزر بوو. وەك لەمەوپێش گوتم : شتێکی سەیر نیە کەلەکۆتایی گەشە کردنی شارستانیەتی ئیسلامیدا ئیبن خەلدون دەربکەوێت. چونکە ئەوبیرۆکانەی لەنێو ئەو ژیارەدا گەشەیان کردبوو، ئەوە لەدوای ئەوە کۆدەبونەوەو موتروبەی یەك دەبون. ئینجا بوار ڕەخسا بۆ ئیبن خەلدون تاکو مێشکی ببێتە (کاسەی کۆکردنەوەی)ئەو بیرۆکانە بۆئەوەی دواتر بتوانێت زانستێکی تازەیان لێ بەرهەم بێنێت. وەلێ گرفتی ئەو زانستە لەوەدا بوو کە هیچ کەس نەبوو نرخی بزانێت یاخود بیکرێت.

## پەراوێزەکانی بەشی دوانزەیەم

١) مقدمة ابن خلدون، طبعة لجنة البيان العربي، ل١١٠٣ — ١١٠٤.

٢) هـ س، ل ٢٦٦ — ٢٦٩.

٣) هـ س، ل ٢٦٩ — ٢٧٠.

٤) مقدمة ابن خلدون، طبعة المكتبة التجارية، ل ٥٨٨.

٥) ئیبن خەلدون ساڵی ٨٠٨ ك کۆچی دوایی کردوە، ئەصبەحیش ساڵی ٨٦٩ ك کۆچی دوایی کردووە.

٦) عبدالرحمن بدوی، مؤلفات ابن خلدون، ل ٢٤١ — ٢٥٠.

٧) محمد عبدالله عنان، ابن خلدون، ل ٩٦.

٨) ابن حجر العسقلانی، رفع الأصر عن قضاة مصر، وەرگیراوە لەپەرتوکی : مؤلفات ابن خلدون "ی عبدالرحمن بدوی، ل ٢٨٤ — ٢٨٥.

٩) حامد عمار، بعض مفاهيم علم الأجتماع، معهد الدراسات العربيه العالميه، ل ٥٥.

١٠) ساطع الحصری، دراسات عن مقدمة ابن خلدون، ل ١٤٠ ـ١٤١.

١١) هـ س، ل ١٤٠.

١٢) هـ س، ل ١٤١.

١٣) گاستۆن بۆتۆل، ابن خلدون فلسفته الأجتماعية، ل ١٢٧ — ١٢٨.

١٤) علی عبدالواحد وافی، مقدمه ابن خلدون، طبعة لجنة البيان العربی، ل ١٩٠ — ١٩١.

١٥) نوسەری ئەم چەند دێرە چانسی بانگهێشتکرانی بۆ ئەو فێستیڤاڵە پێ برا وەك نوماینەدەی کۆماری عێراق، وەبە ئەندازەی توانای خۆیشی پشکداری لە وتوێژەکانی فێستیڤاڵەکەدا کرد.

١٦) على عبدالواحد وافى، مقدمه ابن خلدون، طبعة لجنة البيان العربى، ل ١٧٦ – ١٧٧.

١٧) ئەم دێڕانە لەو وتارەوە گواستراوەتەوە کە دکتۆر عبدالعزیز عزەت لە فێستیفاڵی ئیبن خەلدوندا پێشکەشی کرد. هەروەها بنوارە پەرتوکی "المجتمع العربی" دانراوی دکتۆر عزەت، قاهیرە ١٩٦١، ل ٢٥٤.

18) Floyd House , the Development of Sociology N.Y 1936 ,P 3.

19) Don Martindale, the Nature and type of sociological theory , London 1961 (p3-27.

# بەشی سیانزەیەم

## (لەپێناو زانستی کۆمەڵزانی عەرەبی دا) (١)

لەبەشی پێشوودا ئاماژەمان بەوە کرد، زانستی کۆمەڵناسی نوێ، لەنێو چوار چێوەیەك دانراوە، کەجیاوازە لەو چوارچێوەیەی زانستی کۆمەڵزانی خەلدونی تێدا دانرا بوو. وەڵێ لەم قسەیەدا مەبەستمان ئەوە نیە کە ئەو دوو زانستە لەڕوی لۆژیك و پێڕەوی توێژینەوە یشیانەوە لێك جودان. بەڵكو مەبەستمان لەوەیە هەریەك لەو دوو زانستە چەمکەکانیان لە دوو کەلەپوری کۆمەڵایەتی جیاوازەوە وەرگرتوە. بۆیە سەرەڕای مل کەچ بونیان بۆ یەك لۆژیکی واقیعی و ئەزمونکاری، کەچی دەبینین بەرەنجامەکانیان لێك جودان.

لەم ڕووەوە هەقە ئاماژەش بەوە بدەین کەزانستی کۆمەڵزانی نوێ تاهەنوکەش نەبودتە زانستێکی جیهانی وا کەچەمك و تێورەکانی بەسەر هەموو کۆمەڵگەکاندا بچەسپێنرێ. بەڵکو وەك لەبەشی پێشودا گوتمان تائێستاکەش ئەو زانستە لەقۆناغی گەشە کردن دایەو قوتابخانەی جیا جیاوناکۆکی تێدا سەرهەڵئەدات. هەریەك لەو قوتابخانانەش خاوەنی مۆرکی تایبەتە وزۆر جاریش ڕەگ و ڕیشەی لەو کەلەپورە کۆمەڵایەتیەوە وەردەگرێ کەتیای دا گەشەدەکات.

بەدەربڕینێکی تر، زانستی سۆسۆلۆژیا، وەك فیزیا یان کیمیا یان هەر لقێکی تری زانستی سروشتناسی نیە کەزاناکان لەسەرچەمکە گشتی یەکانیان کۆکن و ئەو چەمکانە لەهەموو جێگەیەکی سەرزەوی دا ڕاست دەردەچن. بەهەرحاڵ ئێمە خوازیاری ئەوەین کۆمەڵناسیش لە ئایندەدا گەشە بکات و وەکو زانستە سروشتیەکان ببێتە زانستێکی جیهانی. بەڵام بەم حاڵەی ئێستایەوە ناگاتە ئەو پلەیە لەئنش نماو پێگەشتن دا.

تێ بینی دەكرێ، ئەو كۆمەڵزانیەی لەسەردەستی (كۆنت)دا سەری هەڵداو دواتر لەسەر دەستی زانایانی تری ڕۆژ ئاوادا گەشەی كرد لەهەندێ بابەت دواوە گەزۆر بەگەمی دەبینین ئەو بابەتانە لەزانستە كۆمەڵناسیەكەی ئیبن خەلدوندا ئامادەگی وئاسەواری گەورەی هەبێت. (كۆنت)و زاناكانی تری ڕۆژئاوا سەرقاڵی ئەو پرس و كێشانە بوون كەكۆمەڵگەی خۆر ئاوایی پرسیاری لەبارەیانەوە دەكردو گرنگی پێ دەدا.بۆیە كەم تازۆرێ توێژینەوەكانیان مۆركی ئەو كێشانە یان پێوە دیار بووە. بەڵام ئیبن خەلدون سەرقاڵی هەندێ كێشەی جیاواز بووە. سەرقاڵی ئەوكێشەو گرفتانە بووە.كەشارستانیەتی ئیسلامی بایەخی پێداون، وەك كێشەی ململانێی نێوان ئاین و دەوڵەت، یان عەرەب وعەجەم، یاخود ململانێی نێوان دەشتەكێتی وشارنشینی (كۆچەری ونیشتەجێ)... هتد) (٢) بەو جۆرە دەبینین زانستی كۆمەڵناسی خەلدونی لەزۆر ڕودوە لەزانستی كۆمەڵزانی نوێ جیاوازە.

ئەمڕۆكە هەندێ لەفێرخوازانمان لەزانستە كۆمەڵناسیەكەی ئیبن خەلدون ناكۆڵنەوە، بەوبیانوەی ئەوەی زانستەكە یەكێكە لەوشتەكۆنانەی كەبەسەرچوون، وەك نۆژداریەكەی ڕازی وئەستێرەناسیەكەی توسی و كیمیاكەی جابری كوڕیحەییان.وەك ئەوەی لەنێو تێورە كۆمەڵایەتیەتازەكان دا هێندە كومسایی ببینن ئاتاجیان نەبێ بەوورد بونەوە لەتێورێكی كۆمەڵایەتی كۆنی وەك تێورەكەی ئیبن خەلدون -دەربڕینی وەرگێڕ.

ئەو جۆرەكەسانە نازانن تێورەكەی ئیبن خەلدون سەرباری كۆنی و تازەنەبونیشی گەچی تائێستا توانیویەتی پارێزگاری لەهەندێ بەهایزانستی خۆی بكات. هەربەوەش جیادەبێتەوە لەپزیشكایەتیەكەی ڕازی یان كیمیاگەی جابری كوڕی حەییان.

ئێمە ئەمڕۆ لەگۆشەنیگایەكی مێژوییەوە لەپزیشكایەتیەكەی ڕازی یان هەر زانستێكی كۆنی تردەكۆڵینەوە. بەڵام پێویستە دەلاقەیەكی زانستی

واوەلەکۆمەڵناسیەکەی ئیبن خەلدون بکۆڵینەوە کەلەم چەرخەشدا کەڵکمان پێ بگەیەنێت. ئەخاسمە لەلێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەی عەرەبیدا. چونکە ئێمە کاتێ بەراورد دەکەین لەنێوان کۆمەڵگەی عەرەبی لەسەردەمی ئیبن خەلدون ولەم سەردەمەشدا، لێکچونێکی گەورە بەدی دەکەین.لێرەشدا ئێمەبایەخی زانستەکۆمەڵناسیەکەی ئیبن خەلدونمان بۆ دەردەکەوێت وەك بابەتێکی توێژینەوەیی لەقوتابخانە مۆدێرنەکان دا.

نکولی ناکەین لەوەی زانستی کۆمەڵناسی نوێ کۆمەڵێ تێوری بەنرخی تێدایە. هەروەها ملەجەڕێیش ناکەین لەوەی ئەو زانستە هێندە بەکەڵکە کەئێمە ناتوانین لەلێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەکەماندا دەست بەرداری بین.وەلێ ئەم قسەیە ئەو ناگەیەنێت کەئێمە دەتوانین بەهۆی ئەو زانستەوە دەست بەرداری زانستەکەی ئیبن خەلدون ببین. تەنانەت لەوانەیە بەهەڵەشدا نەچووبم ئەگەر بێژم : دەگونجێت کۆمەڵزانیەکەی ئیبن خەلدون بەیەکێك لەقوتابخانەکانی زانستی کۆمەڵناسی نوێ لەقەڵەم بدەین.تەنانەت پێدەچێت قوتابخانەکەی ئیبن خەلدون لەهەندێ قوتابخانەی تری نێو ئەو زانستە نێزیك تربێت لەتێگەشتنی کۆمەڵگەکەمانەوە.

توێژەری کۆمەڵایەتی نوێ، ناتوانێت بەهەموو زانستی کۆمەڵناسی ڕا بگات بەبێ ئەوەی سەرنجی هەموو قوتابخانەکانی نێوی بدات. شتێکی هەڵەیشە گەرتوێژەرێك دامارگیر بێت بۆیەکێك لەوقوتابخانانەو پیای دا ڕۆبچێت وئیدی هیچ لەبارەی قوتابخانەکانی ترەوە نەزانێت.چونکە هەرقوتابخانەیەك جۆرە بۆچونێك لەبارەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتیەوە دەداتە توێژەر کەڕەنگە قوتابخانەیەکی تر ئەو دیدو بۆچونەی نەداتێ.

## بابەتی دەشتەکێتی وشارستانێتی:

لەکاتێکدا بەراورد دەکەین لەنێوان قوتابخانەکەی ئیبن خەلدون وهەریەك لەقوتابخانە کۆمەڵناسی یەکانی تردا جیاوازیەکی گرنگ دەبینین، چونکە وەك لەمەوپێش باسمان لێوەکرد تەوەری تیۆرەکەی ئیبن خەلدون لەدەوری ململانێی نێوان دەشتەکێتی وشارستانێتی دەسورێتەوە.ئەم مەسەلەیەش لەلایەن زانایانی کۆمەڵناسی نوێ وەگرنگی تەواوی خۆی پێ نەدراوە.

هەرچی بایەخی زانایانی نوێ یە لەم ڕووەوە لەبەراورد کردنی نێوان کۆمەڵگەی بزێو (داینامیکی)وکۆمەڵگەی مەنگ (بێ جوڵە)داقەتیس دەبێت.ئەم بەراورد کردنەش بەفرەناوەوە پێشکەش کراوە کەلەئێستادا بواری باسکرنیانمان نیە. بەڵام بەشێوەیەکی گشتی مەبەست لەڕوون کردنەوەی جیاوازی نێوان ئەو کۆمەڵگە دۆگماو مەنگەیە کەڕاهاتوولەسەرپیرۆزکردنی هەرشتێ لەباوانەوە بۆی مابێتەوە، لەگەڵ ئەو کۆمەڵگە پێشکەوتوەدا کەتاڕادەیەك بەخێرایی بەرەو نوێ کردنەوەی نەریت وبیرۆکەکانی پەل دەهاوێ. هەروەها زاناکان لەم میانەیەدا گرنگی یان دەدابە لێکۆڵینەوەی ئەو گرفتانەی کەلەگواستنەوەی خەڵکەوە سەرهەڵئەدەن لەکۆمەڵگەی بێ جوڵەوە بۆ کۆمەڵگەی بزێو. بۆنمونە وەك ئەو گرفتانەی بەهۆی کۆچی خەڵکەوە لەگوندەوە بۆ بازێڕ سەرهەڵئەدەن.

دەگونجێت بگوترێ ئەو بەراوردە کۆمەڵایەتیە نفتە، لەو بەراوردە دەچێت کەئیبن خەلدون لەنێوان دەشتەکی و شارستانیەکاندا کردویەتی. بەڵام ئەم لیکچونە کت ومتی نیە. چونکە لەنێوان دەشتەکی و شارستانیەکاندا ململانێ یەکی درێژی وا هاتۆتە ئاراوە کەزۆربەدەگمەن دەبینین ئاوها ململانێ یەك لەبابەتی کۆمەڵگەی بێ جوڵەو کۆمەڵگەی بزێودا بەگوێرەی چەمکی نوێی هاتبێتە کایەوە. لەمێژودا ڕوی نەداوە لادێییەکان یاخود خەڵکە سەرەتاییەکان شاڵاویان بردبێتەسەر یەکێك لەشارستانێتی یەکانی دەرودراوسێیان وداگیریان

کردبێ ودەوڵەتیان تیادا بنیات نابێ. ئەگەر لەهەندێ ماوەیكرپڕپەڕیش داشتی وا ڕوی دابێ، هێندەی دیاردەی کۆمەڵایەتی لێنەکەوتۆتەوە، وەك لەکێشەی نێوان دەشتەکی وشارستانیەکان دا کەوتۆتە.لەلایەکی تریشەوە، کۆمەڵگەی دەشتەکی، لەزۆربەی خەسڵەت و تایبەتمەندیەکانی دا لەهەرکۆمەڵگەیەکی بێ جوڵەی تر جیاوازە. ئەو بیابانەی بابای دەشتەکی تێدا دەژی وژیانیان لەتەکی دا ڕاهاتودو گونجاوە، لەڕوی سروشتی جوگرافیەوە جیاوازە لەو ناوچانەی کەخەڵکە بەراییەکان یان لادێییەکان یان هەر کۆمەڵگەیەکی بێ جوڵەی تری تیادا دەژی.

دروست ترین پێناسە بۆدەشتەکێتی، ئەو پێناسەیە کەئیبن خەلدون کردویەتی ولەبارەی دەشتەکیەکانەوە دەڵێت: (ڕۆزی یان لەژێر سێبەری نێزەکانیان دایە) (٣)چونکە ئەوان لەم دنیایەدا هیچ نازانن جگەلەسوار چاکی وشانازی کردن بەزاڵ دەستی وکێ بەرکێ لەسەر سەرۆکایەتی. لێرەشەوە خەسڵەتەچاك وبەدەکانیشیان پێکەوە سەرهەڵئەدەن.

ژیانی دەشتەکێتی جگەلەجەنگ وداگیرکاری هیچی ترنیە. بۆیە زۆر ئەنگ و شوردەییە بۆ بابای دەشتەکی ئەگەر بژێوی خۆی لەڕێی هێزی بازوو ئارەقی نێو چاوانیەوە پەیدا بکات. چونکە ئەو خاوەنی شمشێرێکە کەهێرشی پێ دەکاتە سەرخەڵك وهەم بەرگریشی پێ دەکات لەبەرانبەر کەسێکدا کەبیەوێت شاڵاو بکاتە سەری. بۆیە لەنێو ژیانی دەشتەکیەکاندا جێگەی مرۆڤی ترسنۆك و لاواز نابێتەوە.کۆڵەکەی ژیانی بیابان بریتی یەلە لەوەڕگا. لەوەڕگاش بەهۆی کاری مرۆڤەوە ناڕوێت وەك لەکشت وکاڵدا دەبینرێ. بەڵکو لەڕوان و گەشەکردنی دا پشت بەئاوی باران دەبەستێ کەلەئاسمانەوە دەبارێت. کابرای دەشتەکی هیچ دەستێکی نیە لەدروست کردن یاخود لەئاراستە کردنی دا. هۆزە دەشتەکیەکانیش بۆنەوەی بژێوی یان دەست کەوێت، پێویستە لەسەریان لەنێو بیابانی پان وبەرین دا بەدووی لەوەڕگا پرژو بڵاوەکاندا بگەڕێن. کەواتە وا دەخوازێ لەسەر ئەو لەوەڕگایانە بەشەڕبێن.

لەوەرگەکان کەمن وتەنهابەشی ژمارەیەکی دیاری کراولە دانیشتوانی بیابان دەکەن. ئینجا کاتێ د دشتەکیەکانیش وەك هەر خەڵکێکی تر بەشێوەیەکی سروشتی زۆر دەبن.ناتاجیان بەهۆکارێك دەبێت تاکو ئەم زۆربونەی لەسنورێکی گونجاودا پێ بوەستێنن. هۆکارەکەش شەڕو کوشتارە. دیارە بەهۆی شەڕەوە ژمارە زیاد بووەکانیان لەنێو دەچن.

یەکێك لەو وتەبەربڵاوانەی لەناو دەشتەکیەکاندایە ئەم پەیڤەیانە کەدەڵێن: (هەق بەشمشێرەو مرۆڤی دەستەوسانیش شاهێدی گەرەکە)یان دەڵێن: (حەڵاڵ ئەوەیە کەچنگ دەکەوێ). هەرکەسیش لەنێویاندا دابنیشێت و گوێ بۆوتوێژەکانیان ڕادێرێ، دەبینێت ئەوان پیاوەتی تەواو بەپێوەری زاڵ دەستی دەپێون. کاتێ ستایشی پیاوێ بکەن دەڵێن: فلان کەس (شێرە)، هەقی خۆی بەدەست وبازوی خۆی وەردەگرێ و کەس ناتوانێت بەسەریدا زاڵ بێت. زۆر نەنگی وشوورەییە بۆهەر کامێکیان کەپێی بگوترێت کەسێکی پیشەوەرە. لەدیدی ئەواندا ئەو پێناسەیە یانی کابرالاوازەو وەکو ژنان بەئارەقی ناوچاوی بژێوی خۆی پەیدا دەکات. ناتوانێت بەزۆری شمشێر خۆی بەخێو بکات. لێرەشەوە ناوی (پیشە- المهنە) یان برِی بەسەر هەموو کارێکی دەستی دا. ئاشکرایە وشەی (المهنە)ش لە (المهانە)وە وەرگیراوە کەبەمانای سوکایەتی و شان کزی دێت. (٤)ئیبن خەلدون چیرۆکی پیاوێکی دەشتەکی ئێراقیمان بۆ دەگێڕێتەوە کە دەچێت بۆ شام بۆلای (عبدالملك کوڕی مەروان). عبد ملك لەبارەی حەجاجەوە پرسیاری لێکرد کەکردبویە والی بەسەر ئێراقەوە. کابرا دەشتەکیەکە ویستی ستایشی (حەجاج)لەلای (عبدالملك)دا بکات. بۆئەو مەبەستە گوتی: لێی گەڕاویت بۆ خۆی ستەم دەکات) (٥). ئیبن خەلدون لەم چیرۆکەوە دەگاتە ئەوبەرەنجامەی کەدەشتەکیەکان بەسروشت حەزیان لە تاڵانی کردنی وستەم کردنە لەخەڵکی. ئەمەش لای شارستانیەکان شتێکی قێزەونە. وەلێ لەدیدی دەشتەکیەکاندا مایەی شانازی وبەڵگەی چەلەنگی وسوارچاکیە.

ئەمە وای کردوە کۆمەڵگەی دەشتەکی جیاوازبێ لەهەموو کۆمەلگەیەکی بێ جۆڵەی تر.هەرئەمەش بوەتە چاوگی ئەو ململانێ وکێشمە کێشە دوورودرێژەی کەلەنێوان دەشتەکێتی و شارسانێتی دا لەمێژودا ڕوی داوە. هەندێ جار دەشتەکیەکان بەهۆی ململانێی هۆزایەتیەوەماوەیەك (ئیتر ماوەیەکی کورت یان درێژ)سەرقاڵ دەبن لەنێو خۆیان داو ناپەرژێنە سەرئەوەی شاڵاوبەرنەسەر شارستانەکان.

بەلاّم وەك ئیبن خەلدون دەڵێت، دواجار ڕوکەشێکی ئاینی وەك پێغەمبەرایەتی یان ویلایەتخوازی دەیان گرێتەوەو هەموویان کۆدەبنەوەو ئەمەش وایان لێدەکات هێرش بەرنە سەرشارستانەکان ودەوڵەتیان تیادا دابمەزرێنن. (٦)

## دەشتەکێتی وکۆمەڵگەی عەرەبی :

ئێمەچاوەڕوان ناکەین زانایانی کۆمەڵناسی مۆدێرن وەکو ئیبن خەلدون شۆڕببنەوە بەنێو لێکۆڵینەوەی دیاردەی دەشتەکێتی دا. چونکەئیبن خەلدون لەکۆمەڵگەیەکدا ژیاوە، دەشتەکێتی بەنێوی دا ڕۆ چووبوو، کاریگەریەکی زۆریشی لەسەر پێکهاتنی ئەو کۆمەڵگەیە دانابوو. لەکاتێکدا ئەمان لەکۆمەڵگەیەکدا دەژین کەدەشتەکێتی ئەو کاریگەریەی نیە.

لەبەردایەك لەو ڕایانەی لەناوەندە زانستەکاندا باوبوو، ئەوە بووکە دەیان گوت دەشتەکێتی قۆناغێکی کۆمەڵایەتیەو هەموو نەتەوەکان لەمیانەی پێشکەوتنیاندا بەرەو شارستانیەت پیای دا تێپەڕ بوون. پێیان وابوو، هەموو نەتەوەکان لەسەرەتادا لەقۆناغێکی بەرایی دا ژیاون ولەڕوی بژێویەوە پشتیان بەڕوو شکاربەستوە، دواتر پێیان ناوەتە قۆناغی دەشتەکێتی (کۆچەری)یەوە، ئینجا قۆناغی کیشاوەرزی پاشان دەگوازنەوە بۆ قۆناغی بازرگانی و پیشەسازی ئێستاکە ناڕاستی ئەو ڕایە ئاشکرابوە.دەشتەکێتی سیستەمێکی کۆمەڵایەتیەوە لەگەڵ ژیانی بیاباندا دەگەنجێت و بەزۆریش هەرلەوێ دا دەردەکەوێت. ئەونەتەوانەی لەسەرزەمینیاندا بیابان نیە، بەزەرورەت بەقۆناغیدەشتەکێتی دا گوزەر ناکەن. ڕەنگەبەیەك جار لەقۆناغی سەرەتاییەوە بازبدات بۆ قۆناغی گشت وکاڵی. جێگەی سەرنجە کەدەبینین گەورەترین ڕوبەری بیابانی لەسەر گۆی زەوی دا بریتی یەلەوناوچەیەی لەوڵاتەعەرەبیەکاندایە.گەر لەنەخشەی وڵاتە عەرەبیەکان وورد بینەوە هەرلە زەریاوە تاکو کەنداو، بیابانێکی بەرینی تێدا بەدی دەکەین، کەتەنها دەریای سورو هەندێ ڕوبارو زنجیرە چیای تێدایە.

ئاشکرایە ئەم ناوچەیەش هەرلەسەرەتاوە بیابان نەبوە، بەڵکو ناوچەیەکی فرەباران و ئاوەدان بوە بەجۆرەها ڕووەك و گیانلەبەر. سروشتی بیابان لەم

ناوچەیەدا لەدوای هەلگشانی چاخی سەهۆڵبەندانی چوارەم بەرەو باکور دەرکەوت.بەوجۆرە بەردەوام باران لەو ناوچەیەدا لەکەمی داو پەیتا پەتیا وشکەلانی تیادا زیاتر دەبوو. بەڕای (توینبی) ئەم ڕوداوە وایکرد خەلکی ناوچەکە دابەش ببن بۆ دووگروپ گروپێکیان ڕێگەی کۆچەرێتی (دەشتەکێتی)گرت و بەدوای لەوەڕگادا دەستیان بەکۆچ کرد، گروپەکەی دیکەشیان ڕویان کردە حەوزی ڕوبارەکان و لەوێندەر جێگیر بون وسەرقاڵی پیشەی کشت وکاڵ بوون. هەربەبۆچونی (توینبی)چیرۆکەکەی ئادەم وکەوتنەخوارەوەی لەبەهەشتەوە، وەك ئەوەی پەڕاوە ئاینی یەکان دەیگێڕنەوە، هیچ نیەجگەلەجەفەنگێ بۆ ئەو ئاڵ وگۆڕە جوگرافیەی کەلەم ناوچەیەدا ڕوی داوە. بەلام چیرۆکی کوڕەکانی ئادەم، هابیل و قابیل، جەفەنگە بۆ ئەو ململانێ یەی دواترلە نێوان دەشتەکێتی و شارستانێتی دا بەرپا بوە (٧). لەتەوراتیش دا باس لەوەکراوە کەهابیل شوان بودو قابیل جوتیار بووە.

## سەرهەڵدانی دەوڵەت:

لەنێو زانایانی کۆمەڵناسی تازەدا، گروپێك هەن هەوڵیان داوە لەدەشتەکێتی وکاریگەریە کۆمەلآیەتیەکانی لەڕوی مێژوییەوە بکۆڵنەوە.ئەم گروپە بەتایبەت لە (ژومبلوتز)و (ئەوبنهایمەر)داخۆی نمایش دەکات.ئەوبابەتەش کەبویە جێگەی سەرنجی ئەدوو زانایە، بریتی یەلە دەوڵەت لەڕوی سروشت و سەرهەڵدانیەوە لەمێژودا. بەخۆشیان دان بەوەدا دەنێن کەلەلێکۆڵینەوەکانیان دا کەڵکیان لەتێورەکەی ئیبن خەلدون وەرگرتوە.

(ژۆمبلوتز)ڕەخنە لەتێوری (گرێ بەستی کۆمەلآیەتی)دەگرێت لەلێکدانەوەی سەرهەڵدانی دەوڵەت دا.واتە ڕەخنە لەوبیردۆزە دەگرێ کە (ڕۆسۆ و هۆبز و لوك)هێنایانە ئاراوەو لەکاتی خۆیدا لەنێوەندە زانستی و ڕامیاریەکاندا ڕەواجێکی زۆری پێدرا. پوختەی تێورەکەش باس لەوە دەکات کەدەوڵەت لەبەرنجامی گرێ بەستێکی کۆمەلآیەتیەوە سەری هەڵدا. خەڵکی ڕێکەوتن لەسەر ئەوەی یەکێکیان بکەنە دەستەلآتدار بەسەرخۆیانەوەو ئەوەشیان بەمەرج بۆ دانا کەدادگەر بێت لەناویاندا. هەرکاتێکیش ئەو مەرجەی پێشێل کرد ئەوا بۆ خەڵکەکەش ڕەوابێت لەسەر کار لای بدەن وکەسێکی تر لەجێگەکەیدا دابنێن.

(ژۆمبلوتز) دەڵێت ئەو تێورە لەڕوی مێژوییەوە ڕاست نیە.بەڕای وی دەوڵەت لەبەرەنجامی گرێ بەستێکی کۆمەلآیەتیەوە لەنێوان دەستەلآتدارو ژێردەستەکاندا نەهاتۆتە بوون. بەڵکو لەئەنجامی ململانێی نێوان گروپە مرۆییە جیاوازەکان وزاڵ بونی هەندێکیان بەسەر هەندێکی تریاندا دروست بوە.

هەروەها (ژۆمبلوتز) بڕوای وایە ململانێ یەکێکە لەخەسڵەتەڕەسەنەکان لەنێوان مرۆڤاندا. ئەم ململانێ یەش هەمیشە بەشێوازی جیا جیا ڕوو دەدات. هەرگا بەهۆی ململانێ وە گروپێك بەسەر گروپێکی تردا زاڵ بوو، هەوڵ دەدات تاکەکانی نێو گروپە ژێردەستەکەی لەڕێی بەکۆیلە کردن وباج لێ وەرگرتنەوە

ژێربار بخات.بەوجۆرەش دەوڵەت سەرهەڵئەدات کەئەمیش لەدیدی (ژۆمپلوتز)دا هیچ نیە جگەلەسیستەمێکی کۆمەلأیەتی کەلەسەر بناغەی زاڵ دەستی وژێربارخستنی ئابوری دادەمەزرێت. ئەم بیردۆزەی (ژۆمبلوتز)تازەترین وتۆکمەترین بیردۆزە کەزانستی کۆمەڵناسی نوێ لەبابەتی (دەوڵەت)دا هێنابێتیە کایەوە. (٨)ئاشکرایە ئەم تیۆرە بەشێوەیەك لەشێوەکان لەبیردۆزەکەی ئیبن خەلدونەوە، وەرگیراوە. دواتر (ئەوبنهایمر) هات و شەقاوێکی ترتێورەکەی (ژۆمبلوتز) ىپاڵ پێوەناو وای لێکرد نێزیکتربێت لەبیردۆزەکەی ئیبن خەلدونەوە.ناوبراولای وایە (دەوڵەت)لەئەنجامی کێشەو ململانێی نێوان دەشتەکی و شارستانیەکاندا هاتۆتە گۆڕێ.ئەمەش لەدەمی سەرهەڵدانی شارستانیەت و دۆزینەوەی کشت وکاڵدا ڕوی دا. کشت وکاڵ وایلەمرۆڤ کرد بۆ یەکەمین جار لەمێژودا بتوانێت پترلەپێداویستی خۆی بەرهەم بێنێت، بەوپێ ودانگەش دەستی کردە بەرهەم هێنانی ئەدگارەکانی شارستانیەت وەك خانوو، پۆشاك، دەفرو....هتد. ئینجا دەشتەکیەکان هاتن و گەرەکیان بوو دەست بەسەر ئەوزیادە بەرهەمەدا بگرن.لەو پێناوەشدا شەڕیان لەگەڵ شارستایەکاندا بەرپاکردو بەسەریاندا زاڵ بوون.لەئەنجامیشدا دەوڵەت لەمێژودا بەدەرکەوت.

(ئەوبنهایمر)دەڵێت: ئەو ململانێیەی لەنێوان گروپە مرۆییەکاندا بەرلەدۆزینەوەی کشت وکاڵ سەری هەڵدەدا، نەدەبودهۆی دروست بونی دەوڵەت، چونکە ئەو گرۆیەی سەرکەوتنی بەدەست دەهێنا، هیچ سودێکی لەوەدا نەدەبینی کەخۆی بسەپێنێت بەسەر گروپە ژێردەستەکەدا. بۆیە تەنها بەوەندە کۆمسایی دەهاتێ کەتاڵانی دەکردوپاشان دەگەڕایەوە بۆبنکەکانی خۆی. وەلێ لەپاش دۆزینەوەی کشت وکاڵ وسەرهەڵدانی زیادە بەرهەم، گروپی سەرکەو توو، کەزۆرینەی جار دەشتەکی بوو، هەولی دەداخۆیبسەپێنێت بەسەر گروپە ژێردەستەکەدا تاکویتوانێت زیادە بەرهەمەکەیان لەڕێی (باج)ەوەبۆخۆی بەرێ.

یانی گەرەکی بوو ساڵ لەدوای ساڵ گروپەژێردەستەکە تالآن بکات، لەبریتی ئەوەی تەنیاجارێك تالآنی کات. (٩)

## تیشکێ بۆسەر دێڕۆکمان:

ئەو بیردۆزەی کەمێ لەمەوپێش لەمەڕ سەرهەڵدانی دەوڵەت ئاماژەمان پێدا. تیشك دەهاوێتەسەربویەری دێرۆکی مرۆبەشێوەیەکی گشتی و، بویەری مێژوی عەرەب بەتایبەتی. لەرێی ئەم تیۆرەوە تێ دەگەین لەوەی بۆچی دەوڵەتی گەورە لەعێرق ومیسردا دەرکەوتون بەرلەوەی لەجێگەکانی دیکەی جیهاندا بەدەربکەون. هەروەها لەوەش حاڵی دەبین بۆچی ئەوناوچەیە بودتە سەنتەری یەکەمین زیار لەدێرۆکی گێتی دا. لەودەفەرەدا ململانێی نێوان دەشتەکێتی وشارستانیەتی لەوپەڕی سەختی دا بووە، مێژوباسی شاڵاوە یەك لەدوای یەکەیانی (سامیەکان)مان بۆ دەکات کەلە بیابانەوە دەهاتن و ڕویان دەکردە شاردکان و دەوڵەتی گەورەیان تێدا دروست دەکرد.دیارە ئەم دەوڵەتە مەزنانەش بونەتە هۆی نەش ونماکردنی شارستانیەت بەهەمان ئەو ئەندازەیەی کەبونەتەهۆی بڵاوبونەوەی بێدادی وژێربارخستنی ئابوری، چونکە هەردوو مەسەلەکە هاوتەریبن یان دوو ڕووی یەك شتن.

ئەو باج وسەرانە زۆرو زەوەندەی دەوڵەت لەژێردەستەکانی کۆدەکاتەوە، وادەکات چینی دەستەڵات داربنە خاوەنی ماڵ وسامانی زەوەندو تەرەف. ئینجا پێویستە بەشێکی گەورە لەودارایيە لەهاندانی زانست وپیشەسازی دا خەرج بکرێ.لەودەمەش دا چینێکی پیشەوەرو زاناو هونەرمەند دەردەکەون کەکاردەکەن بۆ تێرکردنی ئارەزوەکانی دەستەڵاتدارە موتریفەکان.واتە ئەگەر ئەم دەستەڵاتدارانە نەبن ئەوانیش نابن.ئێمەچاوەڕوانی ئەوەناکەین شارستانیەت گەشەبکات لەکۆمەڵگەیەکی بەرایی داکە دەوڵەتی تێدا نەبێت. چونکە لەو کۆمەڵگەیەدا دەستەڵاتدارێکی زاڵ دەست بونی نیە.بەڵکوسەرۆکێ‌بوونی هەیە کەتاکەکانی کۆمەڵگە بەئارەزوی خۆیان گوێڕایەڵی

لێدەکەن.ئینجالەئاوا کۆمەلگەیەکدا سەرۆکەکە ناتوانێت شوێنکەوتەکانی ژێرباربخات لەلایەك و، لەلایەکی تریشەوە ناتوانێت ناچاریان بکات وبەتۆبزی ئەدگارەکانی شارستانێتی یان پێ بەرهەم بێنێت.

هەرگا دەوڵەت لەکۆمەلگەیەکدا سەری هەلدا، هاوکات لەگەلیشی دا ژێربارخستن وبەرەو پێش چونی شارستانیەت پێکەوە سەرهەلئەدەن.کەواتە لەهەمان کاتدا دەوڵەت خاوەنی خەسلەتی باش و خەسلەتی خراپیشە. بۆیە لەکاتێکدا سەرنجی ئەوئاسەوارە قەشەنگانە دەدەین کەدەوڵەتدارە دێرینەکان بۆیان بەجێ هێشتوین وەك ئەهرامەکان وکۆشك وپەیکەرو پەرستگاکان. پێویستە باش بزانین کەلەپشتی ئەوئاسەوارانەوە ستەمی کۆمەلایەتی قێزەون خۆی حەشارداوە.هەریەکێ لەوئاسەوارانەبگری لەسەر بناغەی بەکۆیلەکردن و قامچی وەشاندن ومالّ تالانکردن، هاتۆتە بوون.شیاوی باسە ئیبن خەلدون دەرکی بەم ڕاستیە کردووەولەدوتوێی (مقدمە) کەیداو لەمیانەی چەندبابەتێکی جیا جیادا ئاماژەی پێداوە.لەباسکردنەکانیشی دا بەگوێرەی لۆژیکەتازەکەی ڕێی دەکرد کەلەهەرشتێکدا دوولایەن دەبینێت: لایەنێکی باش و ڕویەکی خراپ. هەرلەسەرەتاوە دیتمان چۆن جیاوازی دەکرد لەنێوان سەرۆکی پێڕەوی لێکراوو پادشای خۆسەپێن دا. ئیبن خەلدون باس لەوەدەکات کەیەکەمیان لەگرد بونەوەی هۆزەکەی یەوە لەدەوری سەرۆکایەتیەکەی وەدەست دێنێت. بۆیەزۆری بەسەریانەوە نیە.بەلام دەستەلاتی پادشالەسۆنگەی خۆسەپاندن و حوکم کردنی بەتۆبزی و چەوساندنەوە وەیە. (١٠)

ئیبن خەلدون دەلێت: سەرۆکی پێڕەوی لێکراو تەنها لەنێو دەشتەکیە گانداوبەرلەدامەزراندنی دەوڵەت بەدەردەکەوێت. وەلێ لەدوای دامەزراندنی دەوڵەت خەلکی دەبنە توێژی جیاجیاو هەندێکیان لەهندێکی تریان بالاتردەبن، پادشاکان دەکەونە سەرەوەی هەموو چینەکانەوە.بەم جۆرەش خەلك لەبەرهەم هێنانی شارستانیەت دا هاوکاری یەکتردەکەن. (١١)ئیبن خەلدون ئاماژەیەکی ڕون

وئاشکرا دەکات بۆ ئەوستەم وزۆرداریانەی لەوسیستەمە چینایەتیەوە دایەر دەبن.کەچی‌لای وایە ستەم وزۆرداریەکان پێویستیشن. چونکە بەرەنجامێکی لاوەکی ئەو فشارەیەکە دەخرێتەسەر مەردوم بۆهاوکاری کردنی یەکتر لەپێناوی بەرهەم هێنانی شارستانی دا. ئیبن خەلدون لەوبارەیەوە دەلێت: (ئەم کاریگەریەش بەتۆبزی نەبێت نایەتەدی چونکە خەلکی بێ ئاگان لەبەرژەوەندیەکانی "جۆر-مرۆڤ" (وەرگێڕ)... زۆرجار پشت لەو هاوکاری کردنە دەکات بۆیە پێویستە ناچار بکرێت لەسەری.هەردەبێ دەستەلات داری ناچاریان بکات لەسەر بەرژەوەندیەکانی خۆیان "واتە مرۆڤەکان ناچار بکات بەرژەوەندیەکانیان پێڕەو بکەن-وەرگێڕ)ئەمەش بۆئەوەی حیکمەتی خوایی لەمانەوەو بەرقەراری جۆری "مرۆڤ" دا بێتەدی.... (١٢)وادیارە ئیبن خەلدون کەمێك ئاکۆکە لەتەك زانایانی کۆمەلناسی نوێدا لەبابەت لایەنەباش و خراپەکانی دەولەتدا. ئەمان پێیان وایە بنەڕەت لەسروشتی دەولەتدا بریتی یەلە زالٚ دەستی وژێر بارخستن، دواتر بەرهەم هێنانی شارستانی وەك ئەنجامێکی لاوەکی لێ دەکەوێتەوە. بەلام ئەم بەپێچەوانەوە بیردەکاتەوە، چونکە وای دەبینێ، هاریکاری کردن لەپێناوی بەرهەم هێنانی شارستانیدا بنەڕەتە لەسروشتی دەولەتدا، ستەم وبێدادیەکان وەك بەرەنجامێکی لاوەکی ئەو بنەڕەتە دێنەئاراوە.

لەوانەیە بڕوابونی ئیبن خەلدون بەحیکمەتی خودا لەوەدی هێنانی مەردوم ودەولەت دا گەیاندبێتیە ئەو بڕوایە. چونکە ئاشکرایە خودا بەرلەهەرشتێ خێروچاکەی بۆخەلکی دەوێت. خراپەش بەشێوەیەکی لاوەکی دەخزێتە نێو چوارچێوەی (چاکە)وە. وەك هەموو ئەو خراپانەی دەکەونە نێو (قەزای خواییەوە). ئیبن خەلدون دەلێت: (ئەمەش چونکە چاکەیەکی زۆر مسۆگەرنابێ بەبێ بونی خراپەیەکی کەم لەپێناوی مەوادا (١٣)بەبونی ئەو خراپەیەش چاکەکە لەدەست ناچێت، بەلکو دەکەوێتە سەرئەو کەمەخراپەیەی

گەتیای دایە، ئەمەش مانای ڕودانی ستەم وبێ دادیە لەنێو مرۆڤاندا. جاتێ بگە) (١٤)

هەرچۆن بێت، ئەم تیۆرە خەلدونیە وێنەیەكی ڕاستگۆیانەی دێرۆكی عەرەبی ئیسلامیان پێ دەبەخشێ، ئەخاسمە وێنەی دێرۆكی ئەو ماوەیەی كەهێمەڕاهاتوین بە (چاخی زێڕین)ناوزەدی دەكەین. چونكە ئەوماوەیە سەرهەلّدانی كۆمەلێ دەولّەتی گەورەی بەخۆوە بینی كەبڕێكی زۆر ستەم وژێۆبارخستنی ئابوری یان هێنایەكایەوە.لەهەمان كاتیش دا ئەفراندنی مەزنیان لەبوارەكانی هونەرو زانست وپیشەسازی دا هێنایە ئاراوە.

جێگەی ئەفسوسە كەدەبینین زۆرێك لەفێرخوازانمان لەسەرنجدانیان دا لەو ماوەیە تونڕەوی دەنوێنن. هەندێكیان سەرنج چڕدەكەنە بەسەر خەسلّەتە باشەكانی ئەو ماوەیەداو ئیدی هیچ كام لەخراپەكانی نابینێت.هەندێكی تریشیان بەپێچەوانەوە، سەرنجیان بەسەر خەسلّەتە دزێوەكانی ئەو ماوەیەدا چڕدەكەنەوە بۆیە جگەلەستەم وخراپە هیچی تری تێدا بەدی ناكەن.هەركام لەو دووپێڕەی ئەگەر بەگوێرەی ئەو لۆژیكە نوێیە كە ئیبن خەلدون بەرلە (٦)سەدە سەرنج لەوماوەیە بدەن بانگەشەی بۆ كردوە، بۆیان دەردەكەوێت كەئەو ماوەیە هەم خەسلّەتی باش وپەسەندی تێدا بودو هەم خەسلّەتی خراپ و بەدیش. ئەمڕۆش ئێمە كەسەرنجی مێژوەكەمان دەدەین بۆئەوەی سودوپەندی لێ وەرگرین پێویستە بەو چاوەوە لێی بنوارین. پێویستە زیادەڕەوی نەكەین لەتەماشاكردنی هیچ كام لەودولایەنە، نەباشەكەو نەخراپەكەش. هەنوكە ئێمە پێویستمان بە (ئاسۆئالیزمی ڕۆشنگەرانە)یە.وەك مامۆستا (ساتح حەسری)ئاماژەی پێ دەدات. ئەم ئاسیۆ ئالیزمە دەتوانێ لەسەرنجدانی دا لەپرس ومەسەلە جیاجیاكان، پشت بەبابەتی بوون و زانستی بوون ببەستێ، نەك پشت بەدەمارگیری كوێرانە.

هەرچۆن بێ، نابێ ئەوەمان لەبیربچێ كەدەولّەتی نوێ، لەڕوی سروشت وسەرهەلّدانیەوە لەودەولّەتە كۆنەجیاوازەكەئیبن خەلدون باسی دەكات.ئەو

دیموکراسیەی لەچاخی نوێ دالەدوای زنجیردیەك شۆڕش وڕاپەڕین بەدەرکەوتوەنکاریگەریەکی زۆری هەیە لەگۆڕینی سروشتی دەوڵەت دا.بۆیە دەگونجێت بێژین: دەوڵەتی مۆێرن بەرەو قۆناغێ دەچێت کەتیای دا زیادە بەرهەمی شارستانی وبڵاوکردنەوەی دادگەری کۆمەڵایەتی پێکڤە کۆبکاتەوە. هەردەبێت بگاتە ئەوقۆناغە، ئیتردێربێ یان زوو.ئەگەر دەوڵەتانێکیش هەبن تاهەنوکە لەڕووی حوکم کردنیانەوە ڕێچکەی دەوڵەتانی کۆن پێڕەوبکەن.ئەوا بێگومان بەرەو لەناوچوون دەچن.ئەوهەستی میللەت گەراییەی ئێستا بەسەر مێشکی خەلکیدا زاڵە، ڕێگەنادات لەسەرحسابی ملیۆنەها خەڵك. چینی دەستەڵات دارتەراتێن بکەن بەکۆشك وتەلارو کەنیزەك وعودوتاریانەوە.

## دەشتەکێتی لەچاخی نوێ دا:

ئیبن خەلدون لە (مقدمە)کەیدا بەشێکی ناوناوە: (فی ان الامم الوحشیە اقدر علی التغلب ممن سواها). لەوبەشەدا دەڵێت : (بزانە، مادەم دەشتەکێتی هۆکارێکە بۆ ئازایەتی وەك لەموقەدیمەی سێ یەمدا گوتمان، ئەوا سەیرنیە کەئەو ئەوەبیابانشینە ئازاترین لەنەوەیەکی تر. چونکە ئەوان بەتواناترن لەزاڵ بوون و فڕاندنی ئەوەی لەنێو دەستی نەتەوەکانی تردایە.تەنانەت بارودۆخی یەك ئەوە (وەچە)ش بەگوێرەی سەردەمەکانیان دەگۆڕێت. تاچەندە دابەزنەنێو ئاواییەکان و خوبگرن بەنازونیعمەتەوە، بەوئەندازەیەلەئازایەتی و بوێری یان کەم دەبێتەوە. واتەبەو ئەندازەیەی کەلەبیابان نشینی ودەشتەکێتی یان کەم بوەتەوە... جانەگەر زاڵ بون وسەرکەوتنی نەتەوەکان بەبوێری و ئازایەتی بێت.ئەوا هەرنەتەوەیەکیان دێرینتربێت لەدەشتەکێتی داو زیاترلە ئاوەدانیەوە دووربێت، ئەوەیان زیادلەنەتەوەکانی تر نێزیکترەلەسەرکەوتنەوە، ئەگەر لەڕوی ژمارەو هێزو دەمارگیریشەوە هاوشان بن...)

ئیبن خەلدون مەبەستی لەووشەی (التوحش) یاخود (الوحشیە) ئەوواتایە نەبوە کەلەم سەردەمەدا لەپێناوی دا ئەو دوو وشەیە بەکاردەبرێ. بەڵکو وەك لەو چەند ڕستەیەی ڕابردویەوە دەردەکەوێ مەبەستی لەبەکارهێنانی ئەو وشەیە ڕۆچونە بەنێو ژیانی دەشتەکێتی دا.لەبەشێکی تری (مقدمە)کەیدا ئیبن خەلدون قسەیەکی تردەکات کەتەواوکەری ئەوقسەیەتی کەکەمێك پێشتر ئاماژەمان پێدا. لەوبارەوە واتایەکی ئاوها دەردەبڕێ : تاچەندە نەتەوەیەك سەختگیرانەترین لەژیانی نێو بیاباندا، ئەوەندەش دەوڵەتەکەیان فراوانتردەبێ و لەکۆتایشدا بەوئەندازەش دوردەبێ لەسەنتەرەکانیەوە (واتە سنوری دەوڵەتەکە بەئەندازەی دەشتەکی بونی نەتەوەکە لەسەنتەری دامەزراندنی دەوڵەتەکەوە دوردەکەوێتەوە)—وەرگێڕ) (١٦).

هۆکاری ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی، بیابان نشینەکان. لەهەموان زیاتربوێرترو ئازاترن. بەهۆی ئەم خەسڵەتانەشەوە دەتوانن بەسەرئەوانی تردا زاڵ بن و دەوڵەتی گەورەش دابمەزرێنن. ئینجاپرسیارێ لێرەدا ڕووبەڕومان دەبێتەوە ئەمەیە: تاچەنده ئەم قسەیەلەسەردەمی نوێ دا وەڕاست دەگەڕێت؟.

بێ گومان ئەم بۆچونە لەسەردەمە کۆنەکاندا زۆر ڕاست بووە، واتە لەوکاتانەدا کەئازایەتی ولێهاتوی و بوێری لەهۆکارە هەرەگەورەکانی سەرکەوتن بوون لەشەڕدا.وەلێ تێ بینی دەکەین لەچاخی نوێ دا بارودۆخەکە گۆڕانکاری بەسەردا هاتوە. ئەخاسمە لەپاش دۆزینەوەی (باروت)وچەکەئاگرینە جۆراوجۆرەکان. لەکۆن دا شەڕپشتی بەشمشێرونەوجۆرە چەکانەی وەك شمشێردەبەست کەپێویستیان بەئازایەتی وسوارچاکی وبوێری هەیە. شاردراوەش نیەکە دەشتەکیەکان لەولایەنەوە لەخەڵکانی تربەتواناترن. وەلێ هەنوکە، شەڕپشت بەچاکی پیشەسازی و ڕێك وپێکی بەکارهێنانی چەك دەبەستێ، پترلەوەی پشت بەسوارچاکی ببەستێ. ئەمەش وادەکات تای ترازوی جەنگ لەبەرژەوەندی شارستانیەکان بێ، ئەوانەی کەخێوی پیشەسازی وپیشەی وردن.

دەگونجێت بڵێین: ئەمڕۆسەردەمی (عەنتەرەی بن شەداد)و (ئەبی زەیدی هیلالی)وئەوپاڵەوانە چەلەنگانەی تربەسەرچوە، کەتائێستاکەش لەوڵاتە عەرەبیەکاندا خەلکی لەنێوقاوەخانەکاندا باس لەئەفسانەکانیان دەکەن. ئەوسەردەمە تێ پەڕی وسەردەمی زانیاری وپێشکەوتنی شارسانیەت هاتۆتە ئاراوە.

کاتێ لەسیاسەتمەدارانی دەوڵەتە کۆنەکان دەکۆڵینەوە، دەبینین زیاتر شانازیەکانیان لە دەوری گەورەیی داگیرکاریەکانیان بوە. بەڵام سیاسەتمەدارانی نێودەوڵەتانی مۆدێرن، بەهەندێ شتی ترەوە شانازی دەکەن وەك: فەراهەم کردنی هۆکارەکانی خۆش گوزەرانی خەڵك وبڵاوکردنەوەی دادگەری لەنێویاندا.

لەکۆندا دەوڵەت لەسەربنەمای زاڵ دەستی وژێربارخستن دادەمەزرا، بەڵام ئێستا لەسەربنەمای دیموکراسیەت ومیللەت گەرایی دادەمەزرێت.

## دوا هەوڵ:

لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەدا، شەپۆلێکی دەشتەکی بەهێز لە (نەجد)ەوە سەری هەڵداو هەوڵی دەدا دەست بەسەر وڵاتەکانی تردابگرێت. بەهەمان ئەوشێوازەی کەزۆرجار لەمێژودا ڕوی داوە.ئەم شەپۆلەش زۆرینەی ئەوخەسڵەتانەی تێدابوو کەبەهۆیانەوە شەپۆلەکانی ڕابردوو توانیبویان دەوڵەت دروست بکەن.لەم شەپۆلەشدا خەسڵەتەکانی بوێری وئازایەتی ولێهاتوی ئامادەگی یان هەبوو. بەهۆی بانگەوازەکەی (محمد کوڕی عبدالوهاب)یشەوە ڕوپۆشێکی ئاینی پێدرابوو.

شەپۆلەکە لەسەرەتاوە سەرکەوتنی گەورەی بەدەست هێنا.بەڵام زۆری نەخایاند لاوازی وبێ توانایی ڕوی لێکرد.دواجار سوپایەکی شارستانی لەمیسرەوەڕوی تێکرد.ئەوە بوو بەزاندنی ولەبیاباندا ڕاوەدوی ناولەکۆتایشدا پایتەختەکەی داگیرکرد. ڕەنگە ئەوەش یەکەمین جاربێ لەمێژودا ئۆردویەکی شارستانی بچێتە نێوبیابانەوەو پیاوە بەهێزەکانی بیانیشی تێدابەزێنێت.

لەم سەدەیەش دا (سەدەی بیست-وەرگێڕ)سەرلەنوێ هەمان شەپۆل سەری هەڵدایەوە.دەستی کردە شاڵاوبردنەسەر وڵاتە نێزیك ودراوسێکانی، وەڵێ دواترلەسنورێکدا وەستاوهەرچی کرد نەی توانی ئەوبەربەستە تێ پەڕێنێ. بەربەستەکەش بریتی بوو لەسنوری جیاکەرەوەی نێوان ئەدگارەکانی شارستانیەت ودەشتەکێتی. هەرچۆن بێ توانی دەوڵەتێ بۆ خۆی دابمەزرێنێ وپێ بنێتەنێودۆخی ئەوشێوە تەرەفەوە کە (ئیبن خەلدون)لەمقەدمە دا باسی دەکات.بەڵام ئەمەی بۆ ئەڕەخسا تاکوپترۆڵ لەبیابان دا دۆزرایەوە گەردۆزینەوەی پترۆڵ نەبا، ئەم شەپۆلەش نەیدەتوانی "بەگوێرەی تیۆرەکەی خەلدون" خولەکەی تەواو بکات، ئەم شەپۆلە لەسەرەتادا تفەنگی لەشەڕەکانی دا

بەکاردەهێنا. ئێستاش دەیەوێت چاولەشارستانیەکان بکات لەڕوی چەك وجبەخانەتازەکانیانەوە. دەستی کردۆتە کۆکردنەوەی فڕۆکەوتانگ و..هتد. بەڵام ئەم چەك لەخۆکۆکردنەوەدیە سودێکی زۆری پێ ناگەیەنێت. چونکە مەسەلەکە تەنها هەبوونی چەك نیە، بەلکومەسەلەئەو پیشەسازی وزانیاری وپێشکەوتنە شارستانیەکەلەپشتی (هەبوونی چەك — وەرگێڕ)دکەوەیە.ئەمەنمونەیەکی واقیعی یەوبۆیە ئامارەمان پێدا تاکوگوزارشت بکەین لەوەی (دەشتەکێتی)دەستەوسانەلەوەی ئێستاش هەمان ئەو ڕۆڵە یاری بکات کەلەڕابردودا دەیگێڕا.

دەشتەکێتی کەجاران لەململانێ لەتەك شارستانیەت دا براوە بوو، ئێستالایەنی دۆڕاوەونازانێت چی بکات.ئەومەترسی یە ڕەویەوە کەهەمیشە هەڕەشەی لەشارستانیەت دەکرد.ئێستامەترسی یەکی پێچەوانە جێی گرتوەتەوە.دەشتەکیەکان لەکونجی ماڵەکانیاندا لەبەردەم هەڕەشەی شارستانیەت دان.

ئێمە بەئاشکرا تێبینی ئەو گۆڕانکاریە دەکەین لەنێو ئەدگاری ئەوشارانەدا کەتازەکی لەم ناوچەیەدا گەشەدەکەن.جاران شارەکان بەشوراو قەڵای بەرز دەوردە درابوون.کۆڵانەکانیشی پێچاو پێچ وداخراو بون. کەچی ئێستا شارەکان ئاوەڵان وشەقامەکانیشیان پان وبۆڕو ڕاست و ڕێکن.سەرجەم قەڵاوشوراکانی دەوروبەریشیان ڕمێنراون، ئەوانەیان نەبێ کەبۆ یادەوەری هێڵراونەتەوە.لەبەردا گرفتی شارستانیەکان ئەوەبو چۆن بتوانن بەرەنگاری شاڵاوی دەشتەکیەکان ببنەوە.بەڵام ئێستاگرفتیان ئەوەیە چۆن بتوانن دەشتەکیەکان بکەنە شارستانی وچۆن چۆنی یارمەتی یان بدەن بۆگۆڕینی ئەوخەسڵەتانەیان کەلەگەڵ ژیانی شارستانی نوێ دا هەڵناکەن.

## كامیان ڕەوشتیان باشترە؟

پەراوە ئاینی یەكان لەگێرانەوەی بەسەرهاتەكەی هابیل وقابیل دا، باس لەوە دەكەن ئەو ئەو دووانە قوربانیان كرد بۆخودا. خوداش قوربانیەكەی (هابیل)ی وەرگرت كەشوان بوو، لەهەمان كاتدا قوربانی (قابیلی)ڕەت كردەوە كەئەمیان جوتیار بوو. لەم كاتەش دا (قابیل)لەبەر ڕژدی پەنای بردەبەركوشتنی (هابیل)ی برای. (توینبی)لەسەر ئەم چیرۆكەوە دەڵێت: ئەم چیرۆكە ئامازەیەكی تێدایە بەوەی ڕەوشت وئاكاری دەشتەكێتی باشترەو نێزیك ترە لەخوداشەوە وەك لەئاكارو ڕەوشتی شارستانیەت.هەرلەبەر ئەوەش خودا قوربانیەكەی (هابیلی)شوانكارەی وەرگرت وهینی براكەیی ڕەت كردوە. وادەردەكەوێ (توینبی)ئەم بۆچونەی لە (ئیبن خەلدون) دوەوەرگرتبێ. (ئیبن خەلدون)یش هەرچەندە پێی وایە دەشتەكێتی هەردوو خەسڵەتی باش و خراپ لەخۆیدا كۆدەكاتەوە، وەلێ بەشێوەیەكی گشتی ڕای وایە شارستانیەت نێزیك ترلەخەسڵەتەپەسەندەكانەوە. (١٧)پرسیاری لێرەدا ڕوبەڕومان دەبێتەوە ئەمەیە: تاچەندە ئەوبۆچونەی ڕاستە؟

پوختەی بۆچونی (ئیبن خەلدون)لەوبارەیەوەئەوەیە كەپێی وایە دوو خەسڵەت لەشارستانیەت دا هەیە كەوادەكەن شارنشینەكان لەدەشتەكیەكان خوارتربن لەڕوی ڕەوشتەوە.دووخەسڵەتەكەش بریین لەتەرەف وستەمی دەستەڵات داران. تەرەف وادەكات ئەوانەی دەبنەهەلگری خوبگرن بەخراپەو ئارەزووبازی و باوەش كردن بەدنیادا. ستەم كاری دەستەڵاتدارانیش وایان لێ دەكات پەیڕەوی لەدرۆو فڕوفێڵ و دوو ڕوویی بكەن.هەرچی دەشتەكیەكانیشە، لەبەرئەوەی ئەو دووخەسڵەتە لەكۆمەلگەكەیاندا كەمە، ئەوا هەردەبێ لەڕوی سروشتەوەساغ ترو لەڕوی ڕەوشت و ئاكاریشەوە باشترین لەشارسانیەكان.

لەڕاستی دا ئەم لێكدانەوەیە تاڕادەیەكی زۆر ڕاستە.كاتێ كەلەدەشتەكێتی كۆن ونوێ دەكۆڵینەوە كۆمەڵێ خەسڵەتی جوان و پەسەندی تێدا دەبینین وەك

ڕاست گۆیی و ڕاشکاوی وپاکداوێنی ونەمەکداری و پیاوەتی ودەست گوشادی. ئەم خەسڵەتانەش بێ مانەندە لەنێوخەڵکی شارستانیەتەکانی دەوروبەردا. وەلێ گرفتەکە لەوەدایە ئەو خەسڵەتە باشانە تەنها لایەنێك لەنێو بەهاکانی دەشتەکێتی دا پێك دەهێنن.چونکەلایەنێکی تریش لەنێو بەهاکانیاندا ئامادەگی هەیە کەبریتی یەلەڕێزگرتنی تاڵانکاری وکاولکاری وبەسوك سەیرکردنی پیشەسازی وزانیاری. وادیارە ئەو دوولایەنە ناکرێ لێك جودا ببنەوە.بابای دەشتەکی ڕێزلەهێز دەگرێت لەهەموو ڕواڵەتەکانیدا. ئینجا بۆیەحەزی لەدرۆکردن و دوروی و چاوبەست کردن نیە چونکەپێی وایە ئەوانە لەنیشانەکانی لاوازین وبەڵگەن لەسەر ناتەواوی لەپیاوەتی دا.هەروەها بۆیە. شانازیش بەکوشتن وبڕین وداگیرکاری وتاڵانی کردنەوە دەکات و، پیشەسازی وکاری دەستیش بەسوك دەزانێ چونکە ئەم خەسڵەتانەش بەبەڵگەی هێزو سوارچاکی دەزانێ.ئەم بەهایانەش لەهەر دوو ڕوەکەیانەوە پێکەوە بەستراوو توندوتۆڵن و لەیەك سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێن.هەرکاتێ ڕوویەکیان کەم بکات ڕوەکەی دیکەشیان کەم دەکات.

لەبەردا دیتمان چۆن ئەوبەها دەشتەکیانە، بەلایەنەچاك خراپەکانیشیانەوە، ببونە گرنکترین هۆکاری بزافی کۆمەڵایەتی لەچاخە قەیمیەکاندا. چونکە بەهاکانی هێزلە نێودەشتەکیەکاندا، لەبەرانبەر بەهاکانی بەرهەم هێنانی نێوشارستانیەکاندا ڕادەوەستان وەك چۆن لەئەلکتریك دا جەمسەری (-)وجەمسەری (+)لەبەرانبەر یەکتردا ڕادەوەستن. بەهۆی کارلێك کردنی ئەو دووجۆرە بەهایەوە ئەو دەوڵەتە مەزنانە بەدەرکەوتن کەببونە گەورەترین ڕواڵەتی پێشکەوتنی مرۆڤ لەدێرۆکی کۆن دا..وەك لەبەردا باسمان لێوەکرد.

شیاوی ئاماژەپێدانە، لەچاخی نوێ دا شارستانیەت بەهۆی گەشەکردنی دیموکراسیەتەوە مۆرکێکی پێوە نوساوە کەجیاوازە لەمۆرکە کۆنەکەی. ئەمڕۆ

شارستانیەت پێویستی بەوەنیە لەدەرەوە فاکتەرێ بێ و ببزوێت ودەوڵەتی تێدا دابمەزرێنێ. دیموکراسیەتی نوێ وایکرد وە بزاڤی کۆمەڵایەتی لەناوخۆی شارستانیەتەوە هەڵدەقوڵێ و سەرهەڵئەدات. چونکە بەهۆی دیموکراسیەتەوە پارتەکان بەدەردەکەوێ و بۆململانێ ورکابەری یەکتر دەکەونەکار "دەربڕینی وەرگێڕ". بەمەش کارلێکی ڕامیای وکۆمەڵایەتی لەناو شارستانیەتدا بەشێوازێکی ئاشتیانە دێتە ئارا.کارلێکەکەش خەریکە بەتەواوی لەو توندو تیژیە خاڵی بێت کەببوە مۆرکی کارلێکی کۆن لەنێوان دەشتەکێتی و شارستانێتی دا.

بزاڤی کۆمەڵایەتی نوێ، زۆرینەیجار پشت بەململانێی بیروباروەڕو پڕوپاگەندە دەبەستێ لەبری ئەوەیپشت بەململانێی شمشێر ببەستێ. بلاوبونەوەی ڕۆشنبیری لەنێوخەڵکداوکەم بونەوەی نەخوێندەواری ونەزانین لەنێویاندا کاریگەری وئاسەوارێ گاڵتە پێنەکراوی هەیە لەم ئاڵ وگۆڕە کۆمەڵایەتی وڕامیاریەدا. لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین ئەو بۆچونەی (ئیبن خەلدون)لەبارەی بەباشتر لەقەڵەم دانی ڕەوشتی دەشتەکیەکانەوە ئەو گرنگیو بایەخەی نەماوە کەلەسەدەمەکۆنەکاندا هەیبوو. ئەو ستەمەی لەکۆندا دانیشتوانی شارپێیەوە ئالودە بوون پەیتا پەیتا بەرەو نەمان وبزر بوون دەچێت. هەروەها جیاوازی وناهاوتایی (تەرەف)لەنێو چینەکانی کۆمەڵگەدا بەرەو کەم بونەوە دەچێت و وای لێهاتوە ناگاتە ڕادەی پەرتەوازەبون ولێك ترازانی ڕەوشتی.وەك لەکۆندا لێك ترازانی ڕەوشتی لێدەکەوێتەوە.

ژیاری نوێ هەوڵ دەدات ئەدگارەکانی تەرەف (خۆشگوزەرانی) لەنێوخەڵکدا بلاوبکاتەوە، ناویشی نانێ تەرەف. بەڵکو ناوی دەنێت بەرزکردنەوەی ئاستی بژێوی خەڵك. ئەوە لەدوای ئەوە ئاستەکە بەرزتردەبێتەوە تاکو وای لێهاتوە کرێکارێ لەوڵاتە پێشکەوتوەکان دا هێندەی هۆکاری تەرەف (خۆش گوزەرانی — وەرگێڕ)لەبەردەست دایە کەزۆرێك لەدەوڵەمەندەکانی کۆن هەربیریشیان لێ نەکردۆتەوە.وەك : بەفرگرە وڕادیۆ وتەلەفزیۆن و...هتد.بەبەردەوامیش ئاستی

بژێوی خەلکی لەژێرسایەی شارستانیەت دا بەرزدەبێتەوە تاوای لێ دێ زۆربەی خەلك دەبنە (موتریف)!!.

ئاشکرایە ئەم ئاڵ وگۆڕە نوێ یەلەشارستانیەت دا جۆرە ڕەوشتێکی لەناوخەلك دابەرهەم هێناوە کەڕەنگە بەلای قەدیمیەکانەوە پەسەندنەبن. وەلێ هەرچۆن بێ لەگەل بەرەوپێش چونی کۆمەلگەی نوێ دا دەگونجێت، ئەمڕۆخەلك گوێ نادەن بەوەی کەسێ لەگەل خۆیدا یان لەگەل هاوڕێ کانیدا جی دەکات، مادەم توخنی ئازادی و بەرژەوەندیەکانی کەسانی تر نەکەوێت.

ڕەوشتی نوێ لەسەر ئەوبناغەیە دادەمەزرێت کەمرۆڤ لەگەل کەسانی تردا بەئەدەب بێ، سودبەخش بێ بۆیان نەك زیانەوەمەند. لەوەش بترازێ ئیتر کۆمەلگە گوێ نادات بەوەی گەرئەوکەسە لەنێو دەریای ئارەزووەکانیدا نقوم ببێ...چونکە ئەم مەسەلەیە تەنها پێوەندی بەخۆیەوە هەیە.

هاوڕێ یەکی بازرگانی بەغدادیم بۆی باسکردم، جارێکیان سەردانی پایتەختێکی ئەوروپی کردوە.لەوێ سواری شەمەندەفەری ژێرزەمینی (میترۆ)بوە.لەناوئەوشەمەندەفەرەدا دیمەنێکی دیوەکە بەتەواوی توڕەی کردوە. کچ وکوڕێکی دڵخوازی دیوە کەیەکیان لەئامێز گرتوە.لەو دیمەنەتوڕە دەبێ ودەست دەکاتە خێسەکردن و (لاحەولەوەلا)گوتن. سەیریش لەوەدا دەبێ سەرنشینەکانی تری میترۆکە، لەبری ئەوەی پشتگیری ئەم بکەن بەپێچەوانەوە بەتەرێزو قێزەوە سەیریان دەکرد.چونکە بەنامۆ وبێئەدەبیان دەزانی، لەهەمان کاتدا ئەم برادەرەمان هەردوو دڵخوازەکەی بە نامۆ و بێئەدەب دەبینی.ئەم لەگۆشەنیگای کۆنەوە سەرنج دەدا، بەلام ئەوان لەگۆشەنیگای نوێ وە سەرنجی لێ دەدەن.بەڕاستی ئەو دوو گۆشەنیگایەش زۆرلێك جیاوازن!.

## کۆمەڵگەی ئێمەوبەهاکانی دەشتەکێتی:

ئەو ڕۆڵە دورودرێژەی دەشتەکێتی لەدێرزەمانەوە لەنێو کۆمەڵگەی ئێمەدا گێڕاویەتی، ناگونجێت لەنێو بچێت، بەبێ ئەوەی ئاسەواری خۆی لەسەر ڕەوشت وتێڕامانمان لەمەسەلەکان بەجێ بهێڵێت.

لەوانەیە زیادەڕەویم نەکردبێ، ئەگەر بڵێم: ئەم کۆمەڵگەیەی ئێستامان یەکێکە لەو کۆمەڵگەیانەی زۆرترین کاریگەری دەشتەکێتی بەسەرەوەدیەهەم لەڕوی خەسڵەتەباشەکانیەوەو هەم لەڕوی خەسڵەتە بەدەکانیشیەوە. تەنانەت ڕەنگە خەسڵەتە بەدەکانیشی بەڕونتر پێوە ببینرێ. لەم کۆمەڵگەی عێراقدا، کەتیای دا ژیاوم وگەشەم کردوەو لەزووشەوە حەزم بەلێکۆڵینەوەی کردوە.تێ بینیم کردوە، هۆزە لادێییەکان کەئێستا ڕێژەی (لەسەدا شەست)ی دانیشتوانی عێراق پێك دەهێنن. لەژیانیاندا پێڕەوی ڕێبازێ دەکەن کەزۆر نێزیکە لە ڕێبازی باپیرە دەشتەکیەکانمان. ئەمانیش هەمان بەهاکانی (دەمارگیری و میوان خواهی وتۆڵەکردنەوەو کوشتنی ژن لەپێناوی شەرەف دا...وهتد)یان تێدابەرقەرارە.

جێگەی سەرنجە، ئەم هۆزانە هەندێ لەخەسڵەتەباشەکانی دەشتەکیەکانیان بزرکردوە، وەك (ڕاست گۆیی و ئەمانەت داری و ئەمەك داری...هتد)وەلێ خەسڵەتە خراپەکانیان بزر نەکردوە.وادیارە فەرمان ڕەوایی عوسمانی کەچوار سەدەی ڕەبەق لەئێڕاق دا بەردەوام بوو ڕۆڵێکی گەورەی هەبودلەم بوارەدا.عوسمانیەکان دەستەڵاتیان لاواز بوو، نەیان دەتوانی گیان ومالی مەردوم بپارێزن.کەچی لەڕویەکی تریشەوە ئەوپەڕی توندوتیژبوون لەکۆکردنەوەی باج و سەرانەدا، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا دەجەنگان لەدژی هەموو ئەوانەی کەملەجەرێ یان دەکرد لەباج دان.لەم سەروبەندەشدا خەلکی ناچار بوون بۆ پاراستنی گیان و ماڵیان دەست بگرن بەبەهاگەلێکی وەك دەمارگیری وتۆڵە

ئەستێنێ وداگیرکاریەوە. لەبەرانبەریشدا بۆ ئەوەی توندوتیژی وسەخت گیری فەرمانبەرانی دەوڵەت و باجگرەکانی لەخۆیان دوور بخەنەوە، ناچار بون خەسڵەتەکانی درۆ و چاوڕاو و فرت وفێڵ لەخۆیاندا بەرجەستە بکەن.

لەکاتێکدا دەبینێ هۆزە ئێراقیەکان شەڕدەگەڵ یەکتردەکەن و هەندێکیان شاڵاو دەبەنەسەر هەندێکی تریان. لەساتێکدا دەیان بینێت لەبەرانبەر کەسێکدا توخنی دەمارگیری وپیرۆزەیەکانیان بکەوێت زۆر توندڕەون. هەرلەوکاتەدا دەبینێت لەئاقاری میریدا هەڵوێستی سەرشۆڕی و موجامەلەی زیاد لەپێویست هەڵدەبژێرن. دوگونجێت بڵێین تاکی عەشایری بوەتە خێوی دووکەسێتی جیاواز.کەسێکی زۆر بوێرو چاونەترسەو هەست بەکەرامەت دەکات لەبەرانبەر هاوشانە عەشایریەکانی تریدا. لەهەمبەری واندا لەهەموان زیاتر پێداگرەلەسەر تۆڵەستاندن. کەچی هەرکە فەرمانبەرو باجگرانی دەوڵەت ویاساوڵەکانی دەبینێ، دەچێتە پێستێکی ترەوەو کەسایەتیەکی تر وەردەگرێ. لەبەرانبەر ئەماندا مل کەچە و زللەو سوکایەتی پێکردنیش قبوڵ دەکات وزۆر بەدەگمەن دەبینرێ یەکێکیان دڕدۆنگ ببن ولەوهەڵس وکەوتانەی فەرمانبەرانی میری یاخی ببن وهەڵچن.ئەوەی لەلادێکانی ئێراقدا دەبینرێ، ڕەنگە بەسەر هەموو ئەو ناوچانەی وڵاتە عەرەبیەکانیشدا بچەسپێ کەبەهەمان ئەو بارودۆخەدا گوزەریان کردوە کەئێراق لەسەردەمی دەستەڵاتی عوسمانیەکاندا پیای دا تێ پەڕیوە.

## ململانێی بەهاکان:

لەدەمی سەرهەڵدانی ئیسلامدا کۆمەڵگەی عەرەبی جۆرێ لەململانێی نێوان بەهاکانی بەخۆوە بینی.ئیسلام پرۆتستۆی زۆرێك لەبەهای دەشتەکیەکانی کرد وەك: دەمارگیری وتۆڵە ئەستێنی وداگیرکاری وکوشتنی ناڕەوا. بۆیەماوەیەکی دوور و درێژ کۆمەڵگەی عەرەبی ئالودەی ململانێی نێوان بەهاکانی ئیسلام و بەهاکانی دەشتەکێتی بوو. (١٧)

لەچاخی نوێشدا، کۆمەڵگەی عەرەبی جۆرێکی دیکەی لەململانێی بەهاکان بەخۆوەبینی. لەلایەکەوە ئەوبەها دەشتەکیانە ئامادەگی یان هەبوو لەڕۆچوون بەنێو قوڵاییەکانی دەروندا. لەلایەکی تریشەوە ئەوبەها هاودژانە هاتنە ئاراوە کەژیاری نوێ لەتەك خۆیدا هێنانی.ڕەنگە دێهاتیەکان بەئاشکرا هەست بەو ململانێیە نەکەن، چونکە شارستانیەتی نوێ نەگەشتۆتەلایان یاخود کاریگەریەکی مەزنی لەناخیاندا دروست نەکردووە.بەڵام ململانێکە لەوناوچانەدا بەڕوونی دەبینرێت کەلەڕووی ئەریت وبیرکردنەوە وە ملی ڕێی شارستانیەتی نوێیان گرتووە.

لەوناوچانەدا کەسی وا دەبینین کە بەڕواڵەت چوەتە قاوغی شارستانیەتی تازەوە، کەچی ناتوانێت لەهەندێ پاشماوەی ئەوبەها دەشتەگیانە خۆی قوتار بکات کەڕۆچوون بەنێو قوڵاییەکانی (ناوەزی ناوەکی)یدا. بۆنمونە: بابای فێرخواز ڕەنگە بانگەشەبکات بۆ ڕزگارکردنی ئافرەت و یەکسان وهاوتا کردنی بەپیاو.لەم ڕوەوە دەنوسێ و وتار دەدات. بەڵام زۆر تورەو پەست دەبێت گەر پێی بگوترێت کەسێکی لاوازە ولەکاروبارەکانیدا پرس وڕاوێژ بە ژنان دەکات.یاخود وەکو ژن وایەلەوەدا کەوەڵامی زللەیەك بە دە شەقازللە ناداتەوە !.یان فەرمانبەر لەفەرمانگەی حکومیدا دەزانێت هەموو هاوڵاتیان لەدیدی یاسادا یەکسانن.

کەچی ناتوانێت بەچاوی یەکسانی لەوهاولاتیانە بنوارێت کەبۆ بەڕێ کردنی مامەڵە جۆراوجۆرەکانیان سەردانی جەنابی دەکەن"دەربڕینی وەرگێڕ" بەلکو دەرودراوسێ وخزم و کەس وکارەکانی خۆی لەپێش کەسانی ترەوە دادەنێت. دەترسێ لەوەی بەیەکچاو سەیریان بکات.چونکە لەپەشدا خەلك تۆمەتباری دەکەن بەوەی کەسێکی ناجوامێرە و شایستەی شانازیەکانی باب و باپیران نیە.

کاتێکیش تاوانبارێ ڕادەکات و پەنادەباتە بەر (ماڵێك)ئیتر خەلکی ئەوماڵە مەترسی تاوانبارەکە لەسەر کۆمەلگە فەرامۆش دەکەن. تازە تاوانبارەکە هاتۆتە ماڵیان و هانای بۆ هێناون، کەسێکیش بێتە ماڵیانەوە پێویستە بپارێزرێ. لەبەر ئەوە لەچاوی پۆلیس وپیاوانی یاسای دەشارنەوە. ئەگەر کەسێکیش لە خۆیان هەواڵی تاوانبارەکە بەمیری بدات. ئەوا بەکەسێکی ناپاك وسیخوڕ لەقەڵەمی دەدەن.

## دەمارگیری لەشارەکانی عێراقدا:

لەبەردا گوتم لەمێژە تامەزرۆی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەی عێراق بووم (١٨)بۆیە لێرەدا پێم باشە کەمێك باس لەدەمارگیری بکەم لەناو شاردکانی عێراقدا، چونکە پێم وایە ئەوەی لەشارەکانی عێراقدادەبینرێ، نمونەیەکی ئەوململانێیەی نێوان بەهاکانی دەشتەکێتی و بەهاکانی شارستانیەتە کەلە سەرجەم کۆمەلگە عەرەبیەکاندایە.

لەسەردەمی عوسمانیەکاندا، شارەکانی عێراق لەبەر هەڕەشەی داگیرکاری هۆزەکان و مەترسی دز و تالانچیەکاندا بوون، بەبێ ئەوەی حکومەت بتوانێت هیچ کارێك بکات بۆ پاراستنیان. لەبەرئەوە خەلکی شاردکان ناچار بوون پەنا بەرنەبەر سیستەمی دەمارگیری بۆئەوەی سەرو ماڵیان پارێزراوبێت. لەم میانەیەدا خەلکی هەر گەڕەکێك لەشارەکاندا وەك هۆز و تیرەیەك خۆیان دادەنا. ئەمانیش وەك دێهاتیەکان (تۆڵە وشانازی و ڕدێن چەرمو و شەڕکەر)ی خۆیانیان هەبوو، زۆرجاریش لەسەر ڕوداوێکی سادە شەڕوپێکدادادن لە نێو شەڕکەرانی گەڕەکەکاندا ڕووی دەدا، ڕووداوێکی سادەی وەك دەمبۆڵەی دوو ژن، یان برینداربوونی منداڵێ لە گەمە کردندا. ڕوداوێکی وەها فسەی ئەملاولای تێکەلْ دەبوو. لەئەنجامیشدا دەمارگیری خەلکی گەڕەك دەبزواو، کوژراو و برینداری لێدەکەوتەوە.

شیاوی باسە، ڕۆڵەکانی گەڕەکە جیاوازەکانی شارێك، دەمارگیری گەڕەکایەتی لەبیردەکەن لەکاتێکدا لەگەڵ خەلکی شارەکانیتردا تێکەڵ دەبن وپێك دەگەن، وەك چۆن هەمیشە لە کەربەلادا ولەبیستی مانگی سەفەری هەمووساڵێکدا، واتە لەوەرزی سەردانکردنی (حسەین)دا دەبینرێ. لەم جۆرە بۆنانەدا دەمارگیری (شارگەرایی)لەبری دەمارگیری (گەڕەکچێتی)بەدەردەکەوێت. ئەمەش بەگوێرەی

ئەم پەندەی نێو دەشتەکیەکانە کەدەڵێت: (من وبراکەم لەدژی ئامۆزاکەم، من و مامۆزاکەیشم لە دژی بێگانە) (١٩)

دەگونجێت بڵێین: هەستی تایفەگەری نێوان شیعە وسوننە لەعێراقدا مۆرکی دەمارگیری هۆزایەتی وەرگرتووە. خەڵکی شارە جیاوازەکان (ئیدی سەربەشیعەبن یاخود سوننە)لەکاتێکدا کێشەی سەرەکییان لەبەرانبەر تایفەکەی تردا دێتە پێشێ، هەستی شارچێتی لە یاد دەکەن. رەنگە لەڕاستی لام نەدابێت گەربڵێم: ئەوکێشەو ناکۆکیە حیزبیەی لەدوای شۆڕشی (١٤ی تەموز)لەعێراق دا روی دابەجۆرێك لەجۆرەکان خاڵی نەبوو لەهەندێك ئاسەواری ئەو دەمارگیریە گەرەکچێتی و شارچێتی و تایفەچێتی یە.

لەدیالێکتی خەڵکی عێراق دا (گەڕەك)بە (محلە)یاخود (طرف)ناودێردەکرێ. بۆیە زۆرجار لەعێراقیەکان هاواری (ابن محلی)یان (ابن طرفی)مان گوێڵێ دەبێ.پێویستە ئەو کەسەی هاوارەکەی لێدەکرێ جێکەی گومانی باشی خەڵك بێت. بۆیە چاکی بەلادا دەکات وتانەوپەری سنور وەهانای ئەوهاوارەوە دەچێت. ئیتر خەڵکیش باسی فریاد رەسی ئەو کابرایە دەکەن بادزیش بێت یان تاوانبارێکی خوێنرێژیش بێت.

زۆرینەی جار بابای دزو خوێنرێژ لەگەرەکەکەی خۆیدا بەرێزە، چونکە لەدەرەوەی گەڕەکەکەی خۆیدا نەبێت ماڵان تاڵان ناکات، بێگانە نەبێت کەسانی ئاسیاو ناکوژێت. لەگەڵ خەڵکی گەڕەکەکەی خۆی دا خودان قوربانی دان وپیاوەتیە.کابرایەکی بەتەمەن ئاشنامە.هەرکات لەگەڵی دادەنیشم باسی یادەوەریەکان و کردەوە قارەمانیەکانی کۆنم بۆدەکات. کاتێ هەندێ گەنج دەبینێ بەبەردەمیدا دەڕۆن، ئاخ لەدوای ئاخ هەڵدەکێشێ بۆئەو رۆژگارەی کەلاوان بەمانای وشەپیاو بوون.وەك گەنجەکانی ئەمرۆ نەبوون کە ناتوانن مامرێ سەربڕن وتەنها هەڵپەیان بۆئەوەیە سوێڵ بتاشن و زوڵفیان شانەبکەن وئینجا وەکو ژنان بەنازو عیشوە وبەلەنجەو لار بەرێ دا بڕۆن!.

جارێکیان باسی پیاوەکانی ئەو سەردەمەی بۆدەکردم. باسی ئەوەی بۆدەکردم گوایە کۆمەڵێ لەو پیاوانە شەوێك هەڵیان کوتاوەتە سەرماڵێك و دەستیان کردۆتە کۆکردنەوەی شت ومەك وقاپ وقاجاخی ئەو ماڵە بۆ ئەوەی بیدزن.ژنی ماڵەکە لەوکاتەدا بەئاگادێتەوە وزۆر دەترسێ، کوڕەکەی لەخەوبیدار دەکاتەوەو پێی ئەڵێ: (هەستە یارمەتی خاڵەکانت بدە لەهەلگرتنی کەل وپەلەکاندا). سەرۆکی دزەکان گوێی لەم قسەیە دەبێت فەرمان بە دزەکان دەکات وازلەکەل وپەلەکان بێنن. بەوپێی یە تازە ئەوان بونەتە برای ژنی ماڵەکەو خاڵۆی کوڕەکە.لەنەریتی پیاوانیش دا ئەوە ناگونجێت مرۆڤ خوشك و خوشکەزای خۆی تاڵان بکات. (ئەوددمە ڕەوشتی پیاوان ئاوها بوو).

دەمارگیری لەشارەکانی عێراقدا لە سەردەمی منداڵیەوە لەگەڵ مرۆڤدا دروست دەبێ وگەشەدەکات. منداڵ هەرکەچاوبەدنیادا هەڵدێنێ دەبینێ هەرلەخۆوە بوەتە ئەندام لەکۆمەڵێکدا کەپێکهاتوە لەکوڕانی دەروودراوسێ یان یان کوڕانی گەڕەکەکەی.زۆربەی بەهاکانیش لەو کۆمەڵەدا لەدەوری چەمکی (ئازایەتی وناجوامێری)دەسوڕێتەوە. پێویستە منداڵ هەرلەسەرەتاوە ئازایەتی وهێزی خۆی (لەنێومنداڵاندا —وەرگێڕ)دەربخات بۆ ئەوەی شایستەبێت بۆ نازناوی (ئازاو چەلەنگ)وەگەر نامنداڵێکی ناجوامێردو هیچ سودێکی تێدا نیە.

زۆرجار قین ورقەبەرایەتی لەنێو منداڵانی گەڕەکە لێك نزیکەکاندا بەرپادەبێ. لەم پێناوەشدا تۆڵە کردنەوەو کینەکێشانیان لەنێودا ڕوودەدات، وەك ئەوەی لەنێو پیاوەگەورەکاندا ڕوودەدات. ئینجا ئەو منداڵانە لەدانیشتنەکانی کۆڵاندا باسی ئەو شەڕانە دەکەن کەلەگەڵ منداڵەکانی گەڕەکی ئەولادا کردویانەو ئەوسەرکەوتنانە یاد دەکەنەوە کەلەوشەڕانەدا بەدەستیان هێناوە. جاروبار منداڵە ورتکە هێرش دەبەنە سەربێستان (دارستان)دکان، بەمەبەستی دزینی میوە.منداڵ لەو میوە دزراوە زیاتر چێژوەردەگرێ وەك لەو میوەیەی لەماڵەوە

هەیانە.چونکە مەسەلەکە تەنها مەسەلەی میوە خواردن نیە.بەڵکو لەسەروی ئەوەشەوە بەڵگەی ئازایەتی و توانای دەست بەسەدا گرتن و داگیرکاری تێدایە.

شتێ زۆر ئەنگ بێت بۆ منداڵ ئەوەیە هاوڕێیەتی کچانی هاوتەمەنی بکات یاخود وازی یان لەتەکدا بکات. ئەمەیان شتێکە (پیاوەتی!)منداڵەکەی پێ لەکەدار دەبێ. منداڵان لەنێو خۆیاندا پەندێکیان هەیە بۆ بەسوك سەیرکردنی ئەو منداڵەی لەگەڵ کیژاندا گەمان دەکات. دەڵێن: (کیژان، ئەحمەد تان لەناودایە)! هەرمنداڵێکیش ئەو تۆمەتەی بدرێتەپاڵ، سوێندی گەورە دەخوات (بەخوای گەورە)کەبەتەواوی لەوتۆمەتە دوورە. ئیتر هیچ پێوستی یەکمان نیەبەڕون کردنەوەی ئاسەواری ئەوبەهایە لەنێو کەسێتی منداڵ دا لەدوای ئەوەی گەورە دەبێت و دەچێتە ڕیزی پیاوانەوە. ڕەنگە کەگەورەبوو ببێتە (ئەفەنی). ئەك هەرئەوەش، پێدەچێ پۆستێکی باڵای دەوڵەتیش وەرگرێت. کەچی بەوحاڵەشەوە ناتوانێت لەئاسەواری ئەوبەهایە خۆی قوتار بکات کەچوە نێو قوڵاییەکانی ناخیەوە.

## دەمارگیری لای ئیبن خەلدون:

لەبەشێکی ڕابردوی ئەم پەرتوکەدا ئاماژەمان بەڕایەکی مامۆستا (ساتح حەسری)کرد کەپێی وایە بابەتی (دەمارگیری)تەوەری سەرەکی تیۆرەکەی ئیبن خەلدونە. لەهەمان کاتدا ئاماژەمان بەڕایەکی پێچەوانەی (دکتۆر تەها حسەین)کرد کەپێی وایە بابەتی دەوڵەت تەوەری بیردۆزەکەیە. لەکاتی خۆیدا گوتم من لەتەك هەردوو بۆچونەکەدا ناکۆکم، چونکە پێم وایە.بەراوردی نێوان دەشتەکێتی وشارستانێتی وململانێ وکارلێکی نێوانیان بریتی یەلەتەوەری سەرەکی تێورەکەی (ئیبن خەلدون). ئێستا لەبەر ڕۆشنایی ئەوبەشەدا دەمەوێت بێژم،هەردووبابەتەکە هەم دەمارگیری وهەم دەوڵەتیش، بایەخی خۆیان هەیە لەنێوتێورەکەی (ئیبن خەلدون)دا.ڕەنگە دروست بێت بڵێم : بابەتی دەمارگیری تەوەری بەهاکانی دەشتەکێتی یەلەنێو بیردۆزەکەدا. بابەتی دەوڵەتیش تەوەری بەهاکانی شارستانی یە، تێیدا.

(ئیبن خەلدون). پێی وایە دەمارگیری لەئەوپەڕی هێزو تواناو ڕونترین ئەدگارەکانیدا لەلای وشتر بەخێوکەرانی دەشتەکیخۆی دەنوێنێ.ئاسایی ئەوان بەنێوژیانی بیاباندا ڕۆچون و زۆر دوورن لەکاریگەریەکانی شارستانیەت و ئەو ستەم وتەرەفەی لێی دەکەوێتەوە.هەرچی دەوڵەتیشە تەنها لەنێوشارستانیەتدا بەدەر دەکەوێ. دیارە دەوڵەت یەکێکە لەهۆکارە هەرەگرنگەکانی ئەوستەم و تەرەفەی لەنێو شارستانیەتدا هەیە. بەڵام هەستی واقع گەرایی واله (ئیبن خەلدون). دەکات لەو کەوشەنەدا ڕانەوەستێت لەپۆلاندنی دوو جەمسەری دا. واتە ئەو پۆلاندنەی کەڕوکاری (مام ناوەندی) تێدانیە.

جگەلەوەش (ئیبن خەلدون). دەڵێت: هەندێ جار دەمارگیری لەنێو شارەکانیشدا دەردەکەوێت. لەکاتێکدا سێبەری دەوڵەتی بەهێزیان لەسەر

لادەچێت. هەروەها لەبیابانیشدا ڕواڵەتەکانی دەوڵەت بەدەردەکەون لەکاتێکدا دەمارگیریە جۆراو جۆرەکان لەژێر سایەو سێبەری (شێخ)ێکی بەهێزدا کۆدەبنەوە. (٢٢)

ئیبن خەلدون لەمقدمەکەیدا بەشێکی داناوە بەنێوی (فی وجود العصبیە فی الامصار وتغلب بعچهم علی بعچ)تیای دا دەڵێت: (ئاشکرایە پەیوەست بون و لێك نزیك بونەوە لەسروشتی مرۆڤدایە، بائەو مرۆڤانە لەیەك ڕەچەڵەکیش نەبن، بەڵام ئەولێك نزیك بونەوەیە وەك لەبەرداباسمان کرد لاوازترە لەنێزیکی ڕەچەڵەك ونەژاد. کەچی هەندێ لەو دەمارگیریەی پێ دەستەبەر دەبێ کەبەڕەچەڵەك دەستەبەردەبێ. زۆربەی خەڵکی شار بەژن و ژن خوازی لێك نێزیك بونەتەوە. ئەمانیش وەك هۆزو تیرەکان دۆستایەتی و دوژمنایەتیان لەنێودا دەبینرێ. هەرکاتێ دەوڵەت پیر بوو سێبەرو سایەی کەم بویەوە، خەڵکی شارەکان ناچار دەبن خۆیان هەستن بەهەڵسوڕاندنی کارو بارەکانیان وپاراستنی وڵاتەکەیان.لەم کاتەدا دەگەڕێنەوە سەرپرس وڕاوێژکردن وجیاکردنەوەی کەسانی ئەرزش و باڵاکەسانی بێ ئەرزش و خوار. دەرونەکانیش بەسروشتی حاڵ هەڵپە بۆزاڵ بون و سەرکردایەتی کردن دەکەن. ڕیش سپی (شێخ)ەکان، بەهۆی نەبونی دەوڵەتێکی بەزەبرو زەنگەوە، چاودەبڕنە ئەوەی خۆیان بسەپێنن. هەریەکەیان دەست دەکەنە شانەخڕێو ململانێ لەگەڵ بەرانبەرەکانیاندا، هەرچیان لەدەستبێ لەوپێناوەدا خەرجی دەکەن"دەربڕینی وەرگێڕ". لەئەنجامدا هەندێکیان بۆیان ڕێ دەکەوێ سەرکەوتن بەدەست دێنن. ئەوجا لادەکاتەوە بەلای ڕکابەرەکانی دا ئیتر یابەکوشتن یان بەدوورخستنەوە تێیان دەکەوێ تاکو دڕکەتیژەکانیان لێدەکاتەوە ونینۆکە چڕنوکاویەکانیان دەکات. بەوجۆرە بەتەنها دەست بەسەر هەموو شارەکەدا دەگرێ. ئیتر وای دەبینێ پادشایەتیەکی دروست کردوەکە بەمیراتی بۆ پاشینەکانی بەجێ بمێنێ...) (٢٣)

لەدەمێکدا ئەو پەیڤە لەنێو (مقدمە)دا دەخوێنینەوە، خەریکە هەست بکەین (ئیبن خەلدون) ئەودێڕانەی سەبارەت بەبارودۆخی شارەکانی عێراق لەسەردەمی عوسمانیەکاندا نوسیوە، یان سەبارەت بەهەموو ئەوشارانە نوسیویەتی کەبەهەمان بارودۆخ داتێ پەڕیون، وادیارە لەسەردەمی (ئیبن خەلدون)دا شارەکانی مەغریبی عەرەبی لەڕوی بارودۆخی کۆمەڵایەتیانەوە هیچ جیاوازیەکیان نەبووە لەوشارەعەرەبیانەی ترکە سێبەری دەوڵەتە بەهێزەکانیان لەسەر لادەچێت. واتە لەو وەختەدا کەشار ناچار دەبێت پەنابەرێتە بەر سیستەمی دەمارگیری بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو کارو بارانەی شار، کەدەوڵەت چیدی ناتوانێ ڕایان پەڕێنێت. لێرەدا پێویستە ئاگاداری (خاڵێکی کۆمەڵایەتی)بین کەزۆرێك لەتوێژەران لە ساتەوەختی بەراورد کردنیان دا لەنێوان کۆمەڵگەی عەرەبی و کۆمەڵگەی ئەوروپی لەسەدەکانی ناوەڕاستدا، لێی بێ ئاگابوون.

لەدوای ڕوخانی (ڕۆما)خەڵك لەئەوروپادا ناچاربون بەوەی هۆکارێ بدۆزنەوە تاکو بتوانن پارێزگاری لەخۆیان بکەن.تەنها هۆکارێکیش کەلەوکاتەدا لەبەردەستیاندا بوبێت وبۆیان ڕەخسا بێت، بریتی بوو لەڕژێمی دەرە بەگایەتی. بۆیە خەڵکی لەدەوری قەڵای دەوڵەمەندەکان کۆبونەوەدو پەنایان بۆ ئەوقەڵایانەو سوارچاکەکانیان برد، تاکو بتوانن پارێزگاری لەخۆیان بکەن.لەبەرانبەریشدا بەشێك لەئازادی وبەرهەمی خۆیان دەبەخشیە بابای دەرەبەگی خاوەن قەڵا "دەربڕینی وەرگێڕ".

گرفتێ لێرەدا ڕوبەڕومان دەبێتەوە ئەمەیە: بۆچی کۆمەڵگەی عەرەبیش لەکاتی پاشەکشەی سێبەری دەوڵەت بەسەریانەوە، وەکو ئەوروپیەکان پەنایان نەبردە بەر سیستەمی دەرەبەگایەتی؟. من پێم وایە ناتوانین ئەو گرفتە چارەسەر بکەین بەرلەوەی بەتەواوی جیاوازیەکانی نێوان سروشتی کۆمەڵگەی عەرەبی و کۆمەڵگەی ئەروپی بزانین. ئێمە نکولی ناکەین لەوەی هەندێ لەڕواڵەتەکانی دەرەبەگایەتی لێرەو لەوێ لەنێو وڵاتەعەرەبیەکاندا بەدەرکەوتن.

لەبازێ شوێنی دووره دەستیش دا هەندێ قەلای دەرەبەگایەتی دروست بوون وچوارچێوه شیان فراوان نەبوو، وەك لەئەورووپادا خەریك بوو دەرەبەگایەتی ببێتە سیستەمێكی گشگیرو سەرتاسەری.

دەگونجێت بگوترێت: بەهاكانی دەشتەكێتی كەڕۆچوبون بەنێو قولاییەكانی دەرونی تاكی عەرەبیدا، ڕێگر بوون لەوەی مل كەچی سیستەمی فیودالیزم ببن كەتیای دا (تاك)بەشێكی زۆری ئازادیەكانی لەدەست دەدات، لەبەرانبەر ئەوەدا كە خاوەنی قەلا دەیپارێزێت بەلكو لەبریتی دەرەبەگایەتی، عەرەبەكان پەنایان بردەبەر سەردارێكی زال دەست. ئەم مەسەلەیەش شتێكە عەرەب لەدێرزەمانەوە لەگەلێدا ڕاهاتون.بەڕاستی شكۆمەندی دەشتەكێتی زیاتر لەڕۆحی دەمارگیریەوە نێزیكترە وەك لە ڕۆحی دەرەبەگایەتیەوە.

هەندێ لەتوێژەران هەول دەدەن لەبەر ڕۆشنایی لێكۆلینەوەی مێژوی كۆمەلگەی ئەوروپی لە چاخە ناوەڕاستەكاندا لەمێژوی كۆمەلگەی عەرەبی لەسەردەمە دواییەكانیدا بكۆلنەوە.لەبەر ئەوەیە دەبینین پێیان وایە كۆمەلگە عەرەبیش لەمیانەی بەرەوپێش چونیدا بەهەمان ئەو قۆناغانەدا گوزەری كردوە كەكۆمەلگەی ئەوروپی پیایاندا تێ پەڕیوە. وەك سەردەمی كۆیلایەتی وپاشان دەرەبەگایەتی و دواتریش سەرمایەداری. ئەم بۆچونە هەلەیە بەم دواییانە لەكن هەندێ لەتوێژەرە ئێراقیەكاندا پەیدا بوە. پێیان وایە ئێراق هەنوكە لەڕژێمی فیودالیەوە پێ دەنێتە نێو سیستەمی كاپیتالیزم.

وەك ئەوەی لەسەردەمی عوسمانیەكاندا هۆزە ئێراقیەكان لەژێرسایەو سێبەری سیستەمی دەرەبەگایەتی دا ژیابێتن. لەڕاستی دا هۆزە عێراقیەكان لە (١٩٢٠)دوەبەدەرەبەگایەتی ناشنابوون. ئەم ناشنابونەش لەكاتێكدا بوو كەحوكمەت دەستەلاتی بەسەر هۆزەكاندا پەیدا كردودەستی كردە ڕوپێوكردنی زەویەكشت وكالیەكان و تۆماركردنیان بەناوی سەرۆك هۆزەكانەوە (وەرگێڕ). لەم كاتەدا ئیتر شێخی هۆزەكە پێی وابو دەتوانێت پشت بەمیری ببەستێت و

بەوهۆیەشەوە ئەندامانی هۆزەکەی لەپێناوی مەرام و چێژە تایبەتیەکانی خۆیدا ژێرباربخات. بۆیە لەوکاتەدا دەمان بینی زۆرێك لەسەرۆك هۆزەکان گوندەکانی خۆیان بەجێ دەهێڵاو لە (بەغداد)نیشتەجێ دەبوون. لەبەغدایش ڕۆژانیان بەمەرامی کردن وخۆنزیك کردنەوە لەدەستەڵات داران بەسەر دەبرد. شەوانیشیان لەئامێزی ژنە سۆزانی و سەماکەرەکاندا دەگوزەراند.

بەڵام ئەم ئاڵ وگۆڕە بەیەکجارو لەناکاو ڕوی نەدا. بەڵکو هەندێ لەسەرۆك هۆزەکان لەنێو ناخیاندا پاشماوەی دەمارگیریە کۆنەکەیان لەبەرانبەر ئەندامانی هۆزەکەیان هەرمابوو. بەردەوام دیوەخانەکانیان ئاوا بوو لەمیوان، هەرجار ناجارێ چایی (قاوە)بۆ میوانەکان دەگێڕدرا. لەژەمەکانی ئێوارەو نیوەڕۆشدا برنج وولمە گۆشت لەبەردەستی میوانەکاندا دادەنرا.

## پوختەی مەبەست:

پوختەی ئەو مەبەستەی گەرەکمە لەنوسینی ئەم بەشەدا دەری بڕم ئەوەیەکە ئێمە ناتاجمان بەزانستێکی کۆمەڵناسی تایبەت بەخۆمان هەیە کەچوار چێوەکەی لەکەلەپوری کۆمەڵایەتیمانەوە وەربگرێت و پشت بەلێکۆڵینەوەی واقیعەکەشمان ببەستێ. من بەم قسەیە لەنرخ وبەهای زانستی کۆمەڵناسی نوێ کەم ناکەمەوە. یان سوکایەتی ناکەم بەبایەخی ئەو زانستە لەلێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەکەماندا. تەنها ئەوەندە هەیە نابێت لەئاقاری ئەو زانستەدا چاولێکەربین و هەموو بیردۆزو چەمکەکانی لێ وەربگرین و دواتر هەوڵ بدەین بەسەر کۆمەڵگەی خۆماندا پراکتیزەیان بکەین. بەچاوپۆشین لەو جیاوازیانەی لە نێوان کۆمەڵگەی ئێمەو ئەو کۆمەڵگەیەدا هەیە کەزانستی کۆمەڵناسی نوێ تیایدا سەری هەڵداوە. زانستی کۆمەڵزانی خەلدونی، سەرباری هەموو کەم وکوڕی وناتەواویەکانی، لەهەر زانستێکی تری کۆمەڵایەتی نێزیکترە لەتێگەشتنی کۆمەڵەکەمانەوە.چونکە لەنێو ناخی کۆمەڵگەی عەرەبییەوە سەری هەڵداوە وچوار چێوەکەیشی لەبویەرو مێژوی کۆمەڵگەکەوە وەرگرتوە. ڕەنگە یەکێك بڵێت: ئێمە دەمانەوێت بارودۆخی هەنوکەیی کۆمەڵگەکەمان بگۆڕین و لەسەر بنەمایەکی شارستانی نوێ دروستی بکەینەوە، کەواتە ئیتر بۆچی لێی بکۆڵینەوە؟

بەڵێ، ئێمە دەمانەوێت کۆمەڵگەکەمان بگۆڕدرێ یان ڕیفۆرمی تێدا بەرپابێت. بەڵام ئەم گۆڕانە ڕونادات بەبێ ئەوەی بەشێوەیەکی واقیعی نەخۆشیەکەی بپشکنین تاکو بتوانین چارەسەری گونجاری بۆ دابنێین. ئەدی بابای نۆژدار ناتونێ دەرمان بنوسێ ئەگەر پێشتر نەخۆشەکە نەپشکنێ. وریفۆرمیست (چاکساز) ىکۆمەڵایەتیش پێویستە هەروابکات. چونکە بەڕاستی

بێتاقەت بوین لەدەمدرێژی ئەو چاکسازە تۆباویانەیکەبەرلەوەی نەخۆشینەکە بپشکنن بڕیارلەسەر دەرمان و چارەسەرەکەی دەدەن.

ئێمە نکولی ناکەین لەگرنگی وبایەخی بیرۆکە (تۆباویەکان)لەوریاکردنەوەی هزرەکان و بزواندنی کۆمەڵگەدا.بەلام پێویستە بەردو هەوایەکی دورلە بویەری ژیان نەیفرێنن. ئەو چاکسازە مەزنانەی کەلەڕابردودا ڕێرەوی مێژویان گۆڕیودو، ئەوانەیشی ئێستا دەتوانن ڕێرەوی مێژو بگۆڕن، دەگونجێت لەهەندێ ڕوودوە بەکەسانێکی تۆباوی قەڵەمدادیان بکەین، چونکە ئەوان چاویان بڕیوەتە بارودۆخێکی باشتر لەوەی هەنوکە هەیە. ئەوەندە هەیە ئەمان هەستە تۆباویەکانیان بەرەو دوور (لەواقیعی ژیان —وەرگێڕ)هەڵنافرێنن. (٢٤)ئەوان لەدوایتێگەشتنێکی قوڵی بویەری کۆمەلایەتیان، ئەوجا دەست دەکەنە بەرپاکردنی بزافە چاکسازیەکانیان.زۆرجار ئەوەش بوەتە هۆی سەرکەوتنیان. بەلام ئەوانەی جگەلە (قوللەی عاجی)کەتیای دا کڕن ولەسەرەوە بیر لەبویەری ژیان بکەنەوە، هیچی دیکە نازانن. ئەوانە لەژیانیاندا جگەلە دەم درێژی بەتاڵ هیچی تر بەرهەم ناهێنن.

(ئیبن خەلدون)شۆڕشی بەرپاکرد بەسەر ئەو (خەسلەتە — وەرگێڕ)تۆباویەعاجیەدا. کەچی وەك لەبەردا گوتمان، لەشۆڕشەکەی دا زۆر ڕۆچوو، تاوای لێهات بانگەشەی دەکرد بۆ مل کەچ بوون بۆ بویەری کۆمەلایەتی بەگوتەو بەکردەوەش. ئێستاش ئێمە واباشترە شۆڕشە فیکریەکەی لێ وەرگرین و، ئەوەی لێ وەرنەگرین کە پرۆتستۆی شۆڕشی کۆمەلایەتی دەکات.

یەکێك لەو پێشنیارانەی کەفێستیڤاڵی (ئیبن خەلدون) لەدانیشتنی کۆتاییدا پێشکەشی کردن، ئەوە بوو ئەسکەملێ هەمیشەیی بۆ لێکۆڵینەوەلە (ئیبن خەلدون)لە هەموو زانکۆ عەرەبیەکاندا تەرخان بکرێ. ئەم پێشنیارەش زۆر گرنگە، گەر بێت و کۆمکاری ولاتانی عەرەبی کاری پێ بکات و بەپیریەوە بێت.

هەنوکە کاتی ئەوە هاتوە بگەڕێینەوە سەر ئەو بناغەیەی کە (ئیبن خەلدون) بۆ زانستی کۆمەڵزانی داناودو ماوەیەکی دورودرێژە لەلایەنی ئێمەوە فەرامۆش کراوە.هەقە تەپ وتۆزی ڕۆژگاری لەسەر بتەکێنین و، موتروبەشی بکەین لەگەڵ ئەو تێورو چەمکە کۆمەڵایەتیە تازانەی بەم دواییانە بەدەرکەوتون. گەرواماں کرد، ڕەنگە بتوانین زانستێکی کۆمەڵناسی تایبەت بەخۆمان دروست بکەین کەبگونجێت لەتەك ئەو کۆمەلگەیەی تیای دا دەژین.

ئەمڕۆ هەمووماں چاومان لەو ئامانجە بڕیوە. "دەربڕینی وەرگێڕ".

## پەراوێزەکانی بەشی سیانزەیەم

١)ئەم بەشە لەبەر ڕۆشنایی ئەو پەیڤین و لێکۆڵینەوانەدا نوسراوە کەلە فێستیڤاڵی ئیبن خەلدوندا پێشکەش کران. ڤێستیڤاڵە کەلە هەفتەی یەکەمی مانگی کانونی دووەمی ١٩٦٢ دا لەلایەن سەنتەری لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیەکانەوە لە قاهیرەبەڕێوە برا.

٢)ئەم کێشە وگرفتانە بونە بابەتی ئەو نامەیەی کەنوسەری ئەم چەند دێڕە لەساڵی ١٩٥٠ دا پێشکەشی زانکۆی تەکساسی ئەمریکی کرد بە مەبەستی وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆرا لە زانستی کۆمەڵناسیدا.

٣)مقدمە ابن خلدون، طبعة لجنة البیان العربی، ل ٤٥٤.

٤)بنوارە ئەو گۆوتارەی کەنوسەری ئەم چەند دێرە لە زانکۆی ئەمریکی لەبەیروت پێشکەشی کرد لەسەر بانگهێشتی دەستەی لێکۆڵینەوە عەرەبیەکان لەو زانکۆیەدا. گۆوتارەکەش لە گۆواری "الأبحاث" ژمارەی مانگی حوزەیرانی ١٩٥٨دا هاتە بڵاو کردنەوە.

٥)مقدمە ابن خلدون، طبعة لجنة البیان العربی، ل ٤٥٥.

٦)هـ س، ل ٤٥٦.

7)Arnold Toynbee ,A study of history , vol. i.

8)barnes ,introduction to the history of sociology.

9)openheimer , the state.

١٠)مقدمە ابن خلدون، طبعة لجنة البیان العربی، ل ٤٣٩.

١١)هـ س، ل ٩٠٩.

12)هـ س، ل909 – ٩١٠.

١٣) مامۆستا وەردی لەبەشێکی ئەم پەرتوکەدا مەبەستی ئیبن خەلدونی ڕوون کردۆتەوە لە بەکارهێنانی ئەم ووشەی (مەواد)دا، لێرەدا ئاتاجمان بە دووبارە

کردنەوەی ئەو ڕوونکردنەوەیە نابێت. ئەوەندە بەسە کەبێژین وەکار بردنی ئەو وشەیە لە و سیاقەدا کەتیایدا بەکارهێنراوە لەڕووی زمانەوانیەوە هیچ واتایەکی نیە. مامۆستا وەردییش هەمان ڕای هەیە. وەرگێڕ.

١٤) هـ س، ل ٩١٠.

١٥)هـ س، ل ٤٢٧ — ٤٢٨.

١٦) هـ س، ل ٤٤٧ — ٤٤٨.

١٧)هـ س، ل ٤١٤ — ٤١٨.

١٨)احمد امین، فجر الأسلام، قاهیره ١٩٥٠، ل ٧٨ — ٨٣.

١٩) کتێبێکم نوسیوە سەبارەت بە سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی. بەڵکو خوابیکات بتوانم بەم زوانە لەچاپی بدەم.

٢٠)بۆنمونە لەساڵی ١٩٢٠ دا جەنگێکی خوێناوی لە نێوان خەڵکی کەربەلا و خەڵکی کازمیەدا ڕویدا. کوژراوێك و چەند بریندارێکی لێکەوتەوە. تائێستاش یادەوەری ئەو شەڕە لەهزری خەڵکدا ماوەتەوە. تەنانەت لەوانەیە کەس و کاری کوژراوەکە نەتوانن تۆڵەی کوژراوەکەیان لەبیر بکەن.

٢١)مقدمە ابن خلدون، طبعة لجنة البیان العربی، ل ٤٣٩ — ٤٤٠.

٢٢)هـ س، ل ٨٨٥ -٨٨٦.

٢٣) ئێمە لێرەدا مەبەستمان لە (نەزعەی تۆباوی)ئەو مەبەستە نیە کەنوسەرانی هاوچەرخ وشەکەی لەپێناودا بەکاردێنن. بەڵکو زیاتر مەبەستمان ئەو مانایە کە مانهایم لە کتێبە ناسراوەکەیدا (Utopia & Ideology)بەکاری هێناوە. دیارە ئەو مەبەستی لە بانگەشەکردنە بۆ گۆڕینی بویەری کۆمەڵایەتی.

-تەواو-

کەس بووە بەشێوەیەکی واقعی لەکۆمەڵگەی ئادەمیزادی کۆڵیوەتەوە،
لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەشی لەو قاوغە وەعزیە هێنایە دەرێ کە بەدرێژایی
سەدەکۆنەکان و سەدەکانی ناوەڕاست بەسەر هزرەکاندا زاڵبوو.

